# مرۆڤ كوشتن پیشەی منە

نووسەر: رۆبێرت مێرل




وەرگێران بۆ فارسی: ئەحمەد شاملو
وەرگێران بۆ كوردی: محەمەد شەهدی

# مرۆڤ کوشتن پیشەی منە

"رۆبێرت مێرل"

Death is my trade

"Robert Merle"

نووسەر: رۆبێرت مێرل

وەرگێڕان بۆ فارسی: ئەحمەد شاملو

وەرگێڕان بۆ کوردی: محەمەد شەهدی

- مرۆڤ کوشتن پیشەی منە
- نووسینی : رۆبێرت مێرل
- وەرگێڕان بۆ فارسی: ئەحمەد شاملو
- وەرگێران بۆ کوردی: محەمەد شەهدی
- تایپ: ئەوین شەهدی
- دەرهێنانی هونەری ناوەوە و بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
- نرخ ( ٧٠٠٠ ) هەزار دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١١
- شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەڵات–هەولێر ٤٦٣٩٥٣١

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٦٣ ) ی ساڵی ٢٠١١ پێی دراوە.

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

**سەلام محەمەد رەسول**

## نووسینێک لە وەرگێڕ

پێشەکی ئەم کتێبە دەیتوانی هەلێکی زێڕین بێت بۆ توێژینەوەی خاڵێکی زۆر لەبارەی "**توتالیتریزم**"(١) و "**فاشیزم**"(٢). بەداخەوە کەمی کات و مەجالی کەم، پێشی لە سوود وەرگرتن لە هەلێکی ئاوا زێڕین گرت. بەڵام پێویست بەوە دەکات هەر سەبارەت بە خوودی کتێبەکە باس لە چەند خاڵێك بکەم. لە راستیدا ئەم کتێبە "**ژیاننامەی جەلادێکی مۆدێرنە**" و چوارچێوە و زەمەنی ئەو رووداوە مێژووییە راستییەیە کە لە نیوەی سەدەی ئێستا بەسەر ئەورووپادا تێپەڕی و جگە لەوەی کە بەشێوەی رووداوی خێزانیی و رووبەڕووبونەوەکانی تایبەتی قارەمانی چیرۆك باسی لێوەکراوە، هیچ شتێکی وەهم و خیاڵی نییە و بەسەرهاتێکی راستەقینەیە، هەرچەند ئەم رووداوە خەیاڵییەش بەجۆرێك بەڕاستی دەچێت کە واپێدەچێت نووسەر بنەمایەکەی لەسەر لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی تایبەتی هەندێ لە جەنایەتکارانی نازی پێکنابێت. چەند ساڵ دوای چاپی ئەم کتێبە، نووسەر لە دیمانەیەکدا لەگەڵ پەیامنێری "**گۆڤاری ئەدەبی**" (Littterature magazine) بەداخ و حەسرەت باس لەوە دەکات کە بۆچی پێشەکییەکی بۆ ئەم کتێبە نەنووسیوە و کۆمەڵێك راستیی تێدا ئاشکرا نەکردووە.

لەراستیدا قارەمانی کتێب کە **"رۆدۆلف لانگ"** ناو براوە، هەمان **"رۆدۆلف فرانتس هۆس"**ە (Rudolf. F. hoess). [1]

لەبارەی ئەم کەسەدا لە کتێبی **"ویلیام شایرر"** (William L. SHAIRER) کە بە شێوەیەکی رێکوپێك و دروست باسی لە مێژووی رایشی سێیەم کردووە.(١) دەخوێنینەوە کە چاودێری ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملی **"هاینریش هیملێر"**ی (Henrish Himmler) ئاگادارکردەوە بۆ دروستکردنی **ئۆردوگایەکی قەرنتینەی نوێ**، لە دەوروبەری **"ئاوش**

---

[1] - توتالیتر tothalitaire و توتالیتریزم لە لایەن "داریوش ئاشووری" لە کتێبی "فەرهەنگی سیاسیی" بەم شێوەیە شی کراوەتەوە.

ئەم سیفاتە بەو رژێمە سیاسیانە دەوترێت کە ئەم تایبەتمەندیانەیان هەبێت: چاودێری حکوومەت لەسەر گشت چالاکیی ئابووری، کۆمەلایەتی و دەسەلاتی سیاسیی لەدەست حزبێکی دەسەلاتدار و لادانی گشت کێشەکانی چاودێریی دیموکراتیکی کۆمەلگە.... و لەناو بردنی سەربەخۆیی تاك. لە حکوومەتی توتالیتر سشۆقی دەسەلات بەسەر کۆمەلگە هیچ مانایەکی نییە. حکوومەت بە یەکسان کردنی پەروەردەکردن و تەنانەت چاودێری بەسەر چالاکییەکانی ئەدەبی و هونەری و بەدەستەوەگرتنی ئامرازی پەیوەندیی و پروپاگەندە، گشت هێزەکانی کۆمەلگە بەدەستەوە دەگرێت. تەحەمولی ئەو کەسانە ناکات کە لەچوارچێوە و سشۆقی ئەودا دەربچن. حکوومەتەکانی توتالیتر بە زۆریی بزواتی کۆمەلایەتی دژە دیموکراتیکی پێکدێنن کە لەسەرەتا وەکوو حزب لەناو سیستەمەکی دیموکراتیدا پێکدێن و دوای بە دەسەلات گەیشتن دیموکراسی لەناو دەبەن. بەرچاوترین نموونەی ئەم جۆر بزواتە کۆمەلایەتییە و حزبییە، حزبی ناشنال سۆشیالیستی ئەلمان بە رێبەرایەتی "هیتلێر" بوو کە دوای بە دەسەلات گەیشتن لە رێگەی دیموکراسی، لەناویان برد و رووخاندیان.

**٢**. بیروبۆچوون یان رێکخراوێکە کە خوازیاری سەروەریی نەتەوەیی، یان نیژادی و وەکوو ئەو، دەسەلاتداری و توندوتیژی، رێبەرایەتی دیکتاتۆری و رووبەڕووبوونەوە لەگەل ئەو کەسانەی دژایەتی دەکەن.

٢. وایپێدەچێت نووسەر تەنیا بەم هۆیە باس لە بەشێك لە ژیانی تایبەتی ئەو دەکات و نیوەی ناوەکەی هەلگرتووە کە کتێبەکە بە تەواوی تەنیا باس لە ژیاننامەی ئەو نەکات. ئەگینا رووداوە سەرەکییەکان رێك وەکوو ژیاننامەی هۆس دەچن.

ویتس" (Awsh wits) **شوێنێکی زۆر باشی** دۆزیوەتەوە و هەر لەم بارەیەوە بەڕێوەبەرانی گەورەی ئەڵمانی "ئەی. گ. فاربێن"یش (I. G. Farben) کە بۆ پێکهێنانی کارخانە و کارگەی نوێ بە مەبەستی تایەی دەسکرد و دەرخستنی نەوت لە رەژووی بەردین بەدوای **شوێنێکی باش** بوون و لە راپۆرتێکدا ئەم شوێنەی بە "شوێنێك" راگەیاند کە "بۆ مەبەستی ئێمە زۆر باشە"!. بەم مانایە کە ئەم دوو راپۆرتە بریتی بوو لە پێکهێنانی ئۆردوگای دەستبەسەران (ئەسیران) لە نزیك ئەم کارگەیە، دەتوانێ بۆ پیشەگەری پێویستی سوپای ئەڵمانیا، لە جوولەکەکان و ئەسیرانی ناو شەڕ هەروەکوو کۆیلەکان کەڵکیان لێوەربگیرێت و بەکاریان بێنن. [٢] هەربۆیەش گروپێك لە هەڵبژێردراوەکانی شەڕانی و پیاوخراپانی

---

[2] - شایرر، هەر ئەمجۆرەی کە خۆی باس دەکات، ئەم کتێبەی بەپێی حەوت سەد تەن بەڵگە و سەندەی مەحرەمانە نووسیوە کە لەناوبردنی خێرای حکوومەتی نازییەکان وایکرد کە بە ساغی بمێننەوە. چوارسەد و هەشتا و پێنج تەن تایبەت بوون بە وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا کە لە تۆنەلەکانی کوێستانی هارتس (Harts) بەدەست سوپای ئەمریکا کەوتن، ئەویش رێك ئەو کاتەی کە بە ئەمرێکی مەحرەمانە دەیانویست بیانسووتێنن!.... لەنێوان سەرچاوەی دیکەی ئەم کتێبە دەکرێ ئاماژە بە روونووسی قسەکانی تەلەفۆنی سەرکردەکانی نازی بکەین. ئەم قسانە لە لایەن ئیدارەیەکی تایبەت کە "هێرمان گورینگ" لە وەزارەتی فرۆکەوانی خۆی بنیادی نابوو، تۆمار دەکرا و گوێی لێدەگیرا!

١. هەر شەمەندەفەرێکی هەڵگری زیندانییەکان کە بە ئۆردوگا دەگەیشت، هەر ئەو کات زیندانییەکان لەلایەن دوو پزیشکەوە پشکنینیان بۆ بەڕێوەدەچوو. پشکنینەکە بەم شێوەیە بوو کە ئەمریان بە زیندانییەکان دەدا بەڕێدا بڕۆن و لە رێگەی بەرێداڕۆیشتنیان (کە زۆربەیان چەند هەفتەیەك بوو لە رێدابوون بۆ ئەوەی بەو شوێنە بگەن) دیاریان دەکرد کە توانای کار کردنیان هەیە یان نا. بێتواناکانیان لەگەڵ منداڵ و پیرەکان دەبردە ژووری غاز و لەناویان دەبردن. ئەوانەی کە وەردەگیران لە کارگەی کیمیایی ای. گ فاربن و گارگەکانی کروپ کە لەنزیك ئۆردوگا بوون تا سشۆقی مردن کاریان لێدەکێشرا و دوایی بۆ ژوورەکانی غاز و کوورەکانی سووتاندنی تەرمەکان دەگوازرانەوە.

ئێس.ئێس بۆ پێکهێنانی ئۆردوگایەکی کاری ئیجباری (زۆرەملی) بۆ "ئاوش ویتس" هاتن کە "جۆزێف کرامێر" (Josef Kramer) و "رۆدۆلف فرانتس هۆس"یشیان لەناودا بوو. ئەوکات شایرر لەبارەی ئەم دووەدا دەنووسێت کە:

.....ئینگلیزییەکان بە کرامێریان دەوت "حەیوانی بێلزێن" (Beast of Belsen) و هۆس پیاوکووژی مەحکوم بە ئیعدام بوو کە پێنج ساڵ لە زیندان مابۆوە. ئەم پیاوە لە هەموو تەمەنیدا یان زیندانی بوو یان زیندانبان... ئەو ساڵی ١٩٤٦ لە دادگای "نۆرنبێرگ" (Nurnberg) بە تاوانی چاودێریکردن لەسەر نەمان و ونکردنی دوو ملیۆن و نیو مرۆڤ بەدار هەڵواسرا و لە هەموو کاتەکانی دادگایی کردنیدا بە فشە و گاڵتەجاری شانازی بە تاوانەکانی دەکرد و ستایشی خۆی دەکرد.

"ئەم دوو ملیۆن و نیو قوربانییە جیاواز لەو نیو ملیۆن کەس بوون کە لە "ئاوش ویتس" وێڵ کران بۆئەوەی لەبرسان بمرن!"

## شایرر بە کورتی بەم شێوەیە باس لە ژیاننامەی ئەم مرۆڤکوژە دەکات:

"هۆس ساڵی ١٩٠٠ لە "بادێن بادێن" (Baden baden) لە دایك بوو. باوکی کە لەم شارەدا دوکانێکی هەبوو، کاتۆلیکێکی توند و وشك بوو و دەیویست بەهەر شێوەیەك بێت کوڕەکەی بکات بە قەشە. لەگەڵ ئەمەشدا "رۆدۆلف" بەپێی پێداگریی باوکی بۆ قەشایەتی، ساڵی ١٩٢٢ پلەی ئەندامێتی حزبی نازی وەرگرت و ساڵێك دوای ئەو بە تاوانی کوشتنی مامۆستایەك بەناوی "لیئۆ شلاگتر" (Leo Schlageter) چووە زیندان کە گۆیا جنێوی پێداوە. ئەم لیئۆیە خرابکارێکی ئەڵمانی ناوچەی "روهێر" (Ruhr) بوو کە فەڕەنسەوییەکان ئێعدامیان کرد و نازییەکان

خستیانە ناو ژماری شەهیدانی خۆیان. **رۆدۆلف** بە تاوانی ئەم پیاوکووژییە پێنج ساڵ لە زیندان مایەوە تا ئەوەیکە بەهۆی بەخشینێکی جەماوەریی ساڵی ١٩٢٨ لە زیندان ئازاد کرا. ساڵی ١٩٣٤ چووە پاڵ گروپی **"جومجومە"** (کەللەسەر) (لە گروپەکانی تایبەتی بە **ئێس. ئێس** (S. S) کە ئەوکات ئەرکی تایبەتی ئەوان بەرێوەبەرایەتی ئۆردوگای کاری زۆرەملێ بوو) و بۆ زیندانی **"داخائۆ"** (Dacgau) گوازرایەوە. بە کۆتایی هاتنی شەڕ **"هۆس"** دەستبەسەر کرا و لە ماوەی دادگایی کردنیدا بێ ترس، دانی بە گشت تاوانەکانی دانا. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٤٧ بۆ پۆلۆنیا گواسترایەوە و لە **"ئاوش ویتس"**، کە گۆڕەپانی ناشیاوترین جەنایەتەکانی بوو، بە داری سزا هەڵواسرا."

**هۆس** لەماوەی داداگایی کردنی لە دادگای **نۆرنبێرگ** بەم شێوەیە دوا:

"چارەسەری کۆتایی هاتنی جوولەکەکان بەمانای لەناوبردنی هەموو جوولەکەکانی ئەورووپا بوو و من ساڵی ١٩٤١ لە مانگی ژۆئەن فەرمانم پێدرا کە لە **ئاوش ویتس** ئامراز و کەرەستەی ئەم ئەمرە پێکبێنم. سەرەتا سەردانی **"ترێبلینکا"**م (Treblinka) کرد بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر کاری ئەم ئۆردوگایە وەربگرم. ئەوان لەماوەی شەش مانگدا هەشتا هەزار کەسیان لەناو بردبوو و ئەمکارەشیان بە غازی **"مۆنوکسیدی کاربۆن"** بەڕێوەدەبرد. ئەم شێوەیەم بە کاریگەر زانی، بەڵام کاتێک هۆڵی لە سێدارەدانی **ئاوش ویتس**م بە کۆتایی گەیاند، غازی **"زیکلون - ب"**م (Zyklon B) بەکارهێنا و جێگەی **مونوکسیدم** پێ پڕ کردەوە. ئەم ئەسیدە لە هەواکەشەکەوە دەچووە ناو هۆڵەکە و لەماوەی سێ هەتا پازدە خوولەك هەموویانی دەکووشت. یانی کاتێك قیژە و هەرایان کۆتایی پێدەهات ئەوا دەمانزانی کە تەواو بوونە. دوای نیو کاتژمێر دەرگاکانمان

دەکـــردەوە و ئەنگوســـتیلە و رووکەشـــی زێـــڕینی ددانـــەکانیانمان کـــۆ دەکردەوە و کاری سووتاندنی تەرمەکان دەستی پێدەکرد. شتێکی دیکە کـە دەبـێ باسـی بکـەم جیـاوازی ئێمـە لەگـەڵ ترێبلینکـا ئەوەیـە کـە هـەر تەلارەی (هۆڵەی) جێگەی ٢ هـەزار کـەس دەبۆوە، لە کاتێکدا کە پێشوتر ئێعـدامی ئـەم ژمـارە یەهوودیـە دەبوایـە لـە دە ژووری دوسـەد کەسـی بەڕێوەچووبایە.[٣]

بۆ ئـەوەی خوێنـەر بتـوانێ هاوسـەنگییەک لـەنێوان رووداوی نـاو کتێب و رووداوی مێژوو رێکبخات، وەرگێڕ لە هـەر شـوێنێک کە پێویسـت بـووە لە کۆتـایی لاپـەرەدا شـی کردووەتـەوە. بـەڵام ئـەو لەسـەر ئـەم بڕوایەیـە کـە نووسـەر نەدەبوایـە لـە دوایـین لاپـەڕەکانی کتێبـدا و بـە تایبـەت لـە کـاتی وتووێژی "لانگ" و عەمیدی ئەمریکایی لە زیندان، بە ئیشارە و کەنایە و تانە و تەشەر لە گرنگترین مەسەلەی ناو کتێبکەیدا تێپەڕێت.

وتووێژێک کە لەناو ئەم کتێبەدا هاتووە، بێگومان نموونەیەکی دەگمەن لە دەسـتڕەنگینی نووسـەرێکی بـە توانایـە کـە تێـدا نـە تـەنیا لـە شـێوەی

---

[3]- ئـەم زێـڕەی کـە لـە ددانـی هەنـدێ زیندانییـەکان کـۆ دەکرایـەوە بـۆ بـانکی رایـش دەگوازرایەوە، نە تەنیا ئەم زێڕانە، بەڵکوولەناوبردنی ئەو بێ تاوانانە سەرچاوەی سوود و قازانجی قێـزەونتری بـۆ حکوومـەتی رایش هـەبوو، بـۆ نموونـە مـوی سـەریان بـۆ سـوپای ئـەڵمانیا بـە بەشـێک لـە داهـات کـەڵکی لێـوەردەگیرا. هەنـدێ لـە شـایەدەکان لـە دادگـای نۆرنبێرگ شایەدیان دا کە خەڵووزی سووتاوەکان کە پێشتر دەخرایە ناو رووباری "سولا" (Sola)، دواتـر وەکـوو کـود دەفرۆشـرا و سەرچـاوەیەکی باشـی داهـات بـوو. بەپێی ئـەو بەڵگەیـەی کـە دادوەری رووسـی دادگـا خستیەڕوو، رێکخراوێکی "دانتیسـگ (Gdansk) جۆرێک کوورەی کارەباییان بۆ دروستکردنی سابوون لە چەوریی مرۆڤەکان بەرهەمدەهێنا. بەرهەمهێنانی سابوون بەپێی نوسخەیەک درا بە دادگا: "بۆ هەر ١٢ پاونـد چەوریی مرۆڤ، ١٠ کـورات نـاو و یـەک پاونـد سـودی ئاگرین. ئـەم تێکـەڵاوە دەبـێ لەنێوان دوو هـەتا سێ کاتژمێر بکولێنرێت و دوایی سارد بکرێتەوە!"

بیرکردنەوەی "سەربازێکی بەتوانا" و "ئاگرێنەرێکی مەکینەیی فاشیزم" پەردە هەڵدەگرێت، بەڵکوو مشتی هەردووکیان دەکاتەوە کە چۆن بیروبۆچوونی جیاوازیان هەیە و هەردووکیان دووڕووی سکەیەکن. بەمحاڵەوە وەرگێڕ لەسەر ئەم بڕوایەیە کە لەم لاپەڕانەدا نەدەبوایە بابەتەکە فیدای توانایی و دەسترەنگینی نووسەر بکرێت. چونکە نووسەر زۆر بەخێرایی لە وتووێژەکان تێپەڕیوە کە رەنگە هەندێ لە خوێنەران بە تەواوەتی لێی تێنەگەن.

ئەم خاڵە هەڵسەنگاندنی دوو **هۆکاری جینایەتە**. دوو سەرکردەی **شەڕانگێز**، دوو **جەلاد**، بەم جیاوازییە کە یەکێکیان **سەرکەوتووە** و ئەویتریان **دۆڕاوە**!. مەسەلەکە ئەمەیە کە ئەگەر دەتوانرێ "**رۆدۆلف لانگ**" وەکوو "رائیدێکی دەسەڵاتداری بەڕێوەبەری لەناوبردنی زیندانیان بووە" بە تاوانبار بزانرێ، چۆن دەکرێ "فڕۆکەوانێك کە بۆمبی ئەتۆمی خستە سەر شاری "**هیرۆشیما و ناگازاکی**"، بە بێ تاوان دابنێین؟ ئایا **سەرکەوتوو و دۆڕاو** لە "**نەفسی جەنایەتەکە**" دەگۆڕێت؟

نووسەر بەم پرسیارە بێ وەڵامە دەیەوێ بڵێت: "بەداخەوە بەڵێ، چونکە کێشەی بەرچاوی کارەکە ئەوەیە کە لە قامووسی سیاسەتدا هەمیشە حەق بە رکابەری سەرکەوتووە!"

دەیانویست سۆزانییەك بەردباران بکەن و حەزرەتی مەسیح گەیشتێ و وتی: "یەکەم بەرد کەسێك بیهاوێت کە خۆی شەرمەزاری هیچ گوناهێك نییە!"

خەڵکەکە بە پەشیمانییەوە دوور کەوتنەوە.

ئەم چیرۆکە لە کتێبی ئینجیلدا هاتووە، بەڵام لە سیاسەتدا هیچ کتێبێك پیرۆز نییە. لێرەدا تەنیا شتێکی پیرۆز (جێگەی پرستن) هێز و دەسەڵاتە کە هۆکاری سەرکەوتنە، چونکە حەق، هەمیشە بە رکابەری سەرکەوتووییە.

هیتلێر لە پاساوهێنانەوەی هەر جەنایەتێکی دیکە دەیوت:

- بیریشی لێ مەکەنەوە پیاوان؟ ئەمەش بەشێك لە "هەوڵەکانی حکوومەتە"، بۆچوارناڵکردنی دەسەڵاتی پاسایی حکوومەت" واتە ئەمەی بینیوە کە تا ئیستا کێ سەرکەوتووەکانی خستووەتەوە وەڵامدانەوە و دادگایی کردن؟

ئەمە تەنیا یاسای سیاسەتە، پاکەترین و باشترین یاسای دونیای سیاسەتە کە کاربەدەستانی هەموو ئەندامانی خێزانێکن، بە حەزێکی وێکچوو و پەروەردەیەکی وێکچوو و مەنتیقێکی وێکچوو. لە کۆتایی کاری نادروستی نازیسم کە لە خەوێکی دوازدە ساڵەدا کەوتبووە سەر سەرتاسەری ئەوروپا و جیهان، بەم ئەنجامە گەیشتم کە ئەم مەنتیقە تەنیا لە ئۆردووی فاشیزمدا نەبوو، بەڵکوو لەناو ئۆردووی دیموکراسیشدا هەبوو!.

"دەتوانن ئەمە بێننە بەرچاوتان کە ئەگەر بۆمبێکی ئەڵمانی کەوتبایە سەر واشنگتۆن، چ شتێك رووی دەدا و چۆن قووڕتان بەسەر خۆتان دەکرد؟ کەواتە چۆن کاتێك بۆمبێکی ئەمریکا هیرۆشیما دەهەژێنێ و هەموو شتێك لەم شارەدا لەناو دەبات، نەتەنیا بەلاتانەوە گرنگ نییە، بەڵکوو وەکوو کۆترێکی سپی بە باڵ و پەڕی سوڵح و ئاشتی سەیری دەکەن؟

تۆ کە ئەوەندە دەزانی، پێم بڵێ بزانم: "ژمارەی کوشتارییی کام لە ئۆردوگاکانی ئێمە ئەڵمانییەکان توانیبووی بگات بە ژمارەی کوژراوانی بۆمبێکی ئێوە؟

نا برام، لانی کەم ئێوەش مەنبەرمان لێمەگرن و بە مانگ ئامۆژگاری ئێمە مەدەن.

من ئاوش ویتس دەدەم بە تۆ، تۆش هیرۆشیمام پێدەدەی و حسیبٚ بێ حسێب! چونکە خۆشت دەزانی لەناو جیهان دوو گروپ بنیادەم، دوو "نیژاد" بوونیان هەیە: ئەوانەی کە بۆمب دەهاوێژن و ئەوانەی کوشتارگای زانست دەکەن. ئەملایە ئەوانەی کە بۆمب دەڕژێتەسەریان و ئەوانەی کە لە کوشتارگای رەحمەت دەخەنە سەریان لە لایەکی دیکە، تەنیا ئەمە و بەس!

سەدەی بیستەم لانیکەم ئەم تایبەتییەی هەبوو کە توانی راستییەکان بخاتە ناو مێشکی بەتاڵی بنیادەم و تێیبگەیەنێ کە "قارەمانێکی لاهووتی" نییە و "جەستەی خواوەندی و دەروونێکی خراپ نەبوو"ی نییە، بەڵکوو زەرەیەکی بچووکە لە جەستەیەکی ناپاک و قێزەون، کە لە خۆیدا سەرگەردانە و گرفتاری دەست و پێ بەستراوی شەڕی ئەبەدی رانەوەستاوە کە تێدا حەق بە لایەنی بەهێزترە، لایەنی بەهێزتریش هەمیشە بەهێز نامێنێتەوە و راست بەم هۆیەوە هەتا هێز و توانا و پارە و یاسا لەدەستیدا بێت، دەبێ هەموو هێزەکەی وەگەڕ بخات بۆئەوەی زیاتر کەڵک و سوودی لێوەربگرێت.

**(بەختی یار "نازی"، یان مردنی خەڵکانی دیکە"**

**بەرهەمی میشل راشلین**

لەراستیدا ئەمانە لە نیـژادێکی تاقانـەدان. لـە بنەماڵەیـەکی تـاك بـە بەرپرساریەتی رەوشتی بە نسبەت نێل و ئاییینی خێزانی خۆیان. دەبینن کـە "فرانکـۆ" لـەکاتی مـردن تـەنیا بـیری لـە شـتێك دەکـردەوە: دەستنیشانکردنی جێنشینێك کە بتوانێ حکوومەتی توتالیتاری ئەو هەتا دە، سـی، پـەنجا سـاڵی دیکـە بهێڵێتـەوە و بـەردەوامی بکـات و ئەگـەر متمانەی بەوە بێت کە ئەم "جێنشینە"ش لەکاتی مردنی جگە لەمە بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکاتەوە، بە ویژدانێکی ئارام چاو لەسەر یەك دەنێت و بە متمانەوە لەگەڵ ئەوەیکە بەرپرسیاری خۆی بە تەواوەتی بەرێوەبردووە ئەم جیهانە بەجێدێڵێت!

"هیتلێر وەکوو رێکخەرێکی نوخبە جۆرێك پۆلیسی وڵاتی پێکهێنا کە بـێ بەدواداچـوونەوە و درەنـگ کـردن لەسەرتاسـەری ئـەو وڵاتانـەی کـە دیموکراسـی حـاکم بـوو، لاسـایی کرایـەوە... ئۆردوگـای ناوەنـدیی لـە سەرتاسـەری جیهـان پێکهێنرا. نازیسم گەڕایەوە و ئەمجارە بێ ترس لە شکست خواردن. لە ئەمریکای باشوور هەتا ئیرلەندا و هەتا جەمسەری باکوور و لە رۆژهەڵاتەوە هەتا رۆژئاوا لە هەموو جێگایەك نازیسم بەخەبەر هاتووە. لەهەر جێگەیەك کە دەکوژن، لە هەر جێگەیەك لە مل دەدەن، لە هەر جێگەیەك کە رێگە لە مرۆڤەکان دەگرن و لە هەرجێگەیەك کە کۆمەڵێك خراپکار دەست بەسەر گیان و ماڵی کۆمەڵێك خەڵکەوە دەگرن و نازیسم سەرمەسـتانە سـروودی سـەرکەوتن دەچـڕن. بـۆ ئـەو "رۆژەقیامەتـە" چـاوەڕوانییەك لـەئارادا نـەبوو... خـوێن جوانـە. خوێنێـك کـە لەسـەر پەنجەکان بتکێتەوە و لەهەر جێگەیەك کە سەرنێزەیەك بچێتە ناو گۆشتی

زینـدووی مرۆڤـەکان، نازیـسم لـە سەرخۆشـی هەوەسـبازییەوە بـەخۆی دەلەرزێت".

(هەمان کتێب)

رۆژێك لە فەڕەنسا، لە یوگسلاڤیا، لە هەنگاریا، لە پۆلۆنیا، لە بەلجیکیا و هۆڵەندا و نەرویج، رۆژێك لە ژاپۆن، لە کۆریا و لە جەزایر، رۆژێکی دیکە لە ڤیتنام و کامبوج، لە ئیرلەندا، لە سەرتاسەری ئەفریقا و سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەمڕۆ لێرە و سبەی لە شوێنێکی دیکە... لە هەموو شوێنێك تەرم، تەرم، تەرم، تەرم و تەرم.....

"یەکەم بەرد کەسێك بیهاوێت کە خۆی شەرم لە تاوان و گوناه نەکات!" ئەم رستەیە لەناو کتێبی پیرۆز هاتووە، لە زمانی مەسیح. بەڵام لە کتێبی سیاسەت مەسیحێك بوونی نییە. لێرە تەنیا باس لە یەهوودی دەکرێت و ئەو یەکەم بەردی تاوانباری سەری نەمساوییەك دەشکێنێت کە خۆی باری تاوانی رژاندنی خوێنی سەدان هەزار ژن و منداڵی بێتاوانی ژاپۆنی بە ئەستۆوە گرتووە، بەڵام "بیریشی لێ مەکەنەوە پیاوان. کێ بینیویەتی کەسێ لێپێچینەوە لە سەرکەوتووەکان بکات؟"

"لە ژوور دیداری نیوە تاریکی زینـدان، "**رولفە**" بە لەسەرەخۆیی بە "**یانینگ**"ی وت:

– ئێوە وابیر دەکەنەوە من لە وەرگرتنی ئەم وەکالەتە لەم دادگایە چ سوودێکم پێدەگات؟ من ناچارم لەم داداگایەدا هەوڵێك بدەم کە تەنانەت

بیرکردنەوەشی، ئـەزوو بـە جەسـتەمدا دێنێـت! بـەڵام دەیکـەم، چـونکە بەهەرحاڵ دەبێ لە ژێرکاسەکە شتێك بۆ نەتەوەی ئەڵمانیا بمێنێتەوە...

ئەوکات مستێکی خۆی بە توندی لـە میلـەی ژووری چاوپێکەوتن "دیدار – موهاجە"دا و هەر ئەمجۆرەی فرمێسك پانتایی رووخساری داگرتبوو، قیژاندی:

– دەتـوانم وێنەیـەکت لـە هیرۆشـیما و ناگـازاگی پـێ نیـشان بـدەم بـە هەزاران هەزار تەرمی سووتاوی ژن و منداڵەوە!

(دادگای نۆرنبێرگ)

بەرهەمی: ئەبی مان

سـەر و ژێـری کەرباسـێکن (جۆرێـك قووماشـی هـەرزان)، سـەرکەوتوو و دۆڕاو، هەردوو سەر و ژێری کەرباسێکن، پشت و رووی سکەیەکن! – تۆ خەتات کردووە. هیچ شکێك لەوەدا نییە. بەڵام ئایا من خۆم رێگەی راستم گرتووەتەبەر؟

ئـەمریکا کـە لـە ٢٠ نەوامبـەری ١٩٤٥ تـا یەکـەمی ئۆکتبـەری ١٩٤٦ لـە نـــۆرنبێرگ لەســـەر کوورســـی دادوەری و کـــردەوەی ســـەرکردەکانی حکوومەتی نازی دادەنیشێت، چوار مانگ پێش ئەو رێگەی بە خۆی داوە کە فاجیعـەی خوێنینی "هیرۆشیما" (Hieoshima)ی، بەرلـەوەی ژاپۆن کاتی خۆبەدەستەوەدانی هـەبێت، لە "ناگازاکی" (Nagasaki) دووبارە بکاتـەوە بـێ ئـەوەی کـە بـۆ ئـەم جینایەتـە بەرچاو و ئاشکرایە جگـە لـە سادەئەندێشی هیچ هۆیەکی دیکەی هەبێت.

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە فاجعەی هیرۆشیما بۆ تەسلیمی بێ مەرج و ئەگەری ژاپۆن بەس بوو و دووبارەکردنەوەی لە ناگازاکی تەنیا هۆکارێکی

هەبوو: پێویست بوونی تاقی كردنەوەی زۆرداری بۆمبی ئەتۆمی ئەمریكا! كە بۆمبی یەكەمین ئۆرانیۆم بوو و سوپای ئەمریكا پێویستی بەوە بوو كە ئەنجامی كرداری توانای بۆمبێك كە لە "پلوتونیوم" بوو لە ئەزموونێكی زیندوودا بەدەست بێنێت!

دوای ئەوە لە سەرتاسەری جیهان تەنیا و تەنیا باسی هیرۆشیما كرا و لە پێكهێنانی دۆزەخ لەسەر خاك لە شەشەمی ئوتی ١٩٤٥ و لەبارەی ئەو كوشتارەماڵوێرانكەری دیكە بەشێوەیەك بێدەنگی كرا كە ئەمرۆ دوای چەندەها ساڵ، رەنگە زۆر لە ئێوە كە ئەم رستەیە دەخوێننەوە هیچكات نەتانبیستبێت كە رێك سێ رۆژ دوای ئەو، لە بەرەبەیانی رۆژی نۆهەمی ئوتی هەمان ساڵ، بە ئەمری ئاغای "ترومەن" جارێكی دیكەش دۆزەخ بەرووی ئەوانە كرایەوە كە لەسەر زەوی دەژین: لە بەندەری ناگازاكی! — چونكە تەنانەت وشەنامەی لاروس‌یش باس لە ژماری مووی لووتی كەری مەلای مەشهوور دەكات كەچی لەمبارەیەوە جگە لەوەیكە "بۆمبێكی دیكە خرایە سەر ناگازاكی" ئاماژەیەك ناكرێ — ئاخر، ئەگەر سەركەوتن، ئەوا كەس لێپیچینەوەتان لەگەڵ ناكات!.

بەڵام ئەم خشتەیە، پلانی دۆزەخی هیرۆشیمایە. "بۆمبی یەكەم". — من دەیگێرمەوە تا هۆكارێك بێت بۆ ئەم مەبەستە كە بۆ خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆن، تەنیا ئەم نواندنە ناوەكییە بەس بوو و هیچ پێویستییەك بە دووبارە بوونەوەی فاجیعەیەكی دیكە نەدەكرا:

| مەودا بە مەتر لە خاڵی دەسپێک (خاڵی ناوەندی تەقینەوە) | خێرایی با و گەردەلوولی پێکهاتوو لە تەقینەوە (بە کیلۆمەتر لە کاتژمێردا) | وێرانییەکان: (زەرەری ماددی) | وێرانییەکان: (زەرەری گیانی) |
|---|---|---|---|
| ٧٥٠ | ٨٠٠ | لەناوچوونی هەموو شتێک | لەناوچونی هەموو شتێک |
| ١٢٥٠ | ٤٥٠ | لەناوچوونی هەرچەشنە خانووبەرەیەک بە دیواری خشت بە بەرینایی نیو مەتری تەواو | مردنی ٥٠٪ ئەو کەسانەی کە واپێدەچێت لە تەقینەوەکە رزگاریان بووبێت، لەماوەی دوو هەتا دوازدە هەفتەی دیکە. |
| ١٦٠٠ | ٣٠٠ | لەناوچوون و رووخانی تەواوی هەرجۆرە بینایەکی بێتۆنی و خشتی | سووتانەکانی پلە سێ. |
| ٢٤٠٠ | ١٦٠ | رووخانی جددی بیناکان و ئەو ئەشیایانەی کە دولتر وەدەستکەوتن، | سووتانەکانی پلە دوو. |
| ٣٣٠٠ | ٨٠ | لەناوچوونی هەرچەشنە بانێک و سەرووی بیناکان | سووتانەکانی پلە یەک. |

رادەی وێرانییەکانی سووک هەتا نیوەتیرەی ١٢٠٠٠ مەتر لە خاڵی سفروە دەگات.

دادوەرەکانی لایەنحەقی دادگای نۆرنبێرگ کە لەسەر کوورسی دادوەری عادیلانە دانیشتن هەتا هێڵێکی سوور بەسەر بەربڵاوبوونی نازیسم و جەنایەتی نیژادپەرەستانەی نازی ئەڵمانی بکێشن، خۆیان نوێنەرانی ئەو وڵات و حکوومەتانە بوون کە هەریەک لە محاکمەی "عەداڵەتی غەیری

سیاسی"، لە محاکمەی ویژدانی مرۆیی، فایلگەلێکی زۆر لە قێزەونترن جەنایەتی دەسەڵاتخوازی و بەربڵاوبوونی خۆیان و نیژادپەرستانەیان هەیە:

فایلی جەنایەت و تاوانەکانی ئینگلتەرا لە سەرتاسەری بەریتانیای گەورە کە "خۆر لە پانتایی وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتەکەیدا ئاوا نەدەبوو!" -

فایلی جەنایەت و تاوانەکانی فەرەنسا لە وڵاتە ژێر دەسەڵاتەکانیدا بەتایبەت جەزایر، کە تازە چەند ساڵ دوای رووخانی هیتلێر، سوپاییەکانی بست بە بستی خاکی ئەم وڵاتەیان خستە ژێر چەکمەی تاوانباری خۆیان.-

فایلی جەنایەتەکانی ئستالین، کە لە خەونی دەسەڵاتخوازی بە وسێتنامەی لەنین کە تفی لە دەسکەوتەکانی سەرەتای شۆڕشی سۆشیالیستی جیهان کردبوو کە تەنیا دوای چەند ساڵێک پەردەی لەسەر نمایشی دەسەڵاتخوازی خۆی و ئۆردوگای ویچووی نازی لادا.-

هەروەها فایلی جەنایەت و تاوانەکانی ئەمریکا کە خوێنی رەشەکان و سوورەکان، ئەوکاتیش وەکوو ئەمڕۆ لەسەر دەست و داوێنیان تازە بوو و هێشتا سێ مانگ لە قەسابی مەجنونانەی لە **هیرۆشیما و ناگازاکی** نەدەگوزەرا.-

کەواتە لە سەنگساری سۆزانی سیاسەتێک کە ئەنجامەکەی شکست بوو، یەکەم بەردەکان لەلایەن کەسانێکەوە بهاوێژرێن کە باری رسواییان سووکتر نەبێت. ئایەتی پیرۆزی ئایینی سیاسەت ئەمەیە. ئەگینا ئەگەر "ئایشمن" سەبارەت بە تاوانەکانی لە سێدارە دەدرێت، چ شتێک هۆکاری

کوشتاریی بە کۆمەڵی **"دیریاسین"**[٤] لە سزا دوور دەخاتەوە؟ هەروەها کام دادگای نەقیب **کالی** – قەسابی گوندی **"می لای"** لە سزا دوور دەخاتەوە؟ و تازە کام شێت و بێ عەقڵ باوەڕ دەکات کە لە دەسەڵاتخوازی بە فەلەستین و **ڤیتنام**، تەنیا یەکیان گوندی "دیریاسن" یان **"می لای"** بووە کە خوێنی بێ تاوانەکانی تینویەتی زاڵامانەی ئەم وڵاتە یان ئەم وڵاتی دیکەی چارە کردووە.

بەهەرحاڵ ئەمە خاڵێك بوو کە بە بڕوای من دەبوایە بوترێت.

بەڵام بابەتی دیکە لەناو ئەم کتێبەدا هەیە کە بەداخەوە نەبوونی کات مەجالی تەواو بۆ باس کردنی نادات، کە بۆ نموونە لێکدانەوەی ڕووداوەکانە بە جۆرێك کە ئاغای **مێرل** دەیەوێ بە تاوانبار نیشاندانی دەسەڵاتدارانی حکوومەتی توتالیتر، جەلادەکان و پیاوانی بەڕێوەبەری تاوان بە بێ تاوان نیشان بدات. بۆ نموونە لە بەشی وتووێژی **لانگ** و **هیملێر** و وتووێژ و دمەقاڵێی **لانگ** و **وولفسلانگ** لێکدانەوە بەشێوەیەکە کە پێدەچێت لانگ بەرەبەرە خۆی لە داوێك گرفتار کردووە! و بەتایبەت بە دووبارەکردنەوەی هەڵسوکەوتی **هیملێر** لەگەڵ ئەو **"ئێس.ئێس"**انەی کە کارەکانیان بە باشی بەڕێوەنەبەن، واپێدەچێ نووسەر دەیهەوێ ئەوە نیشان بدات کە حەڵقەی تەڵە چۆن کەم کەم لە ملی "گەورەمی" تەنگ دەبێت، لە کاتێکدا ڕاستییەکە شتێکی دیکەیە و خوێنەری کتێب بەباشی دەتوانێ لانیکەم بە لێکدانەوەی ئەو بابەتەی کە من لەسەرەتای ئەم نووسینە لە ویلیام **شایرر** هیناومەتەوە بە کەسایەتی ڕاستەقینە و

---

[٤] - گوندێك لە ڤیتنامی باشوور کە هەموو خەڵکەکەی بە ئەمری نەقیبی ئەمریکی "کالی" کوژران.

دروستکار کە مێرل بە قارەمانی کتێبەکەی بەخشیوە، بە راستی بابەتەکە بگات.

هیوادارم لە چاپەکانی داهاتووی ئەم کتێبە بتوانم توێژینەوەی باشتر بەرێوەببەم.

**ئەحمەد شاملو**

**١٣٥٢**

**جگە لە گەورەمیانی ئەو کەسانەی کە**
**کوشتن بۆ ئەوان ئیش و کارە**
**دەتوانم ئەم کتێبە پێشکەش بە کێ بکەم؟**



## ١٩١٣

لە کۆتایی شەقامی کایزێر Kaiser سووڕامەوە. سۆز و بارانی سەهۆڵاوی باڵ و پێی رووتمی داگرت و بە دڵەڕاوکێیەوە وەبیرم هاتەوە کە ئەو رۆژە، شەممەیە. چەند هەنگاوێك کە تا ماڵەوە مابوو، بە راکردن پێوام و خۆم هاویشتە ناو مەمەڕەکە، پێنج نهۆمی بینایەکەم چوار قادرمەیی بە هەنگاوێك پێوا و دوو تەقەم لە دەرگا هێنا.

لخ و لخی هەنگاونانەوەی ماریا خەپەم ناسییەوە و دڵم هێور بۆوە. دەرگا کرایەوە. ماریا پرچی لادا و بە چاوی پڕ لە سۆز و حەزەوە سەیری کردم و داهاتەوە و بە دەنگێکی نزم و بەدزی پێی وتم:

- بە درەنگی کەوتووی.

لەگەڵ ئەم قسەیە، باوکم بە رووخسارێکی ترسێنەرەوە هاتە بەر دەمم و بە دەنگی پچڕ پچڕ وتی: "کات ناسی، گەورەییەکی ئەڵمانیەکانە، "ماین هێر"[5]"

بە پچەپچەوە پرسیم:

- لە کوێیە؟

ماریا بە هێواشی دەرگای ماڵەوەی داخست.

---

5 – Mein Herr، ئاغای من. بە زمانی ئەڵمانی

- لە ژووری کارە. بە حسێبەکانی دووکانی رادەگات.

دوایی ووتی:

- رەحەتییەکانتم هێناوە. ئیتر ناچار نی بچیتە ژوورەکەت.

• باوکم، پچڕ پچڕ قسەی دەکرد. ئەو فاریزانەی کە لە وتاری ئەودا دادەنرێت، لەمەودا نیشانەی ئەم پچڕ پچڕانەیە.

بۆ چوونە ژوورەکەم ناچار بووم لەبەردەم ژووری کاری باوکم تێپەڕم. چۆکێکم لەسەر عەرد دانا و خەریکی کردنەوەی قەیتانی پێڵاوەکانم بووم. ماریا بەو قەلأفەتە گەورەیەی هەر ئاوا بێ جووڵە وەستابوو. سەرم بەرز کردەوە و وتم:

- خاولییەکەم چی لێهات؟

- بۆخۆم دەیهێنم. دەبێ ژێری ژوورەکەشت واکس لێبدەم؟

بلۆزەکەم دەرهێنا و خستمە لای کۆتە گەورە و رەشەکەی باوکم و وتم:

- دەستت نەهێشێ ماریا.

سەری راوەشاند و پرچەکانی کەوتنە سەر چاوی و پاڵێکی بە شانمەوە نا.

بۆ لای چێشتخانەیماڵەوەمان رێکەوتم، دەرگام بەهێواشی کردەوە و لە پشت سەرم دامخست. دایکم لەبەردەم قاپشۆرەکە وەستابوو و شتی دەشۆرد.

- سلاو دایە.

رووی تێکردم. چاوێکی لێکردم. سەیری کاتژمێری ژوورەکەی کرد و بە ترسەوە وتی:

- درەنگ هاتوویەتەوە.

– ئەوانەی کە بۆ دان پێدانان هاتبوون، زۆر بوون. دوایيش باوکە "تالر"[6] رایگرتم.

دووبارە خەریکی کاری قاپ شۆرییەکەی بوو. بە جۆرێك کە تەنیا دەمتوانی پشتی ببینم. بێ ئەوەی سەیرم بکات وتی:

– تەشت و قاپ و دەسماڵەکانتم لەسەر مێز داناوە. خوشکەکانت کاریان دەست پێکردووە، زووکە!

– بەچاوان دایە.

تەشت و قاپ و دەسماڵەکانم دەست دایە و رۆیشتمە ناو مەمەڕەکە. بە هێواشی هەنگاوم دەنایەوە کە ئاوی ناو تەشتەکە نەڕێژرێت.

لە ژووری خواردنی خۆراك تێپەڕیم. دەرگا کرابۆوە. "گێردا و بێرتا" (Gerda, berta) لەپێش پەنجەرە لەسەر کوورسی وەستابوون. پشتیان لەمن کرد. دوایی لەبەردەم هۆڵەکە تێپەڕیم و رۆیشتمە ژووری دایکم. ماریا چوارپایەیەکی لەبەردەم پەنجەرە دادەنا. لە عەمبار بۆ منی دۆزیبۆوە. چاوم لێیکرد و لەناو دڵمدا وتم "دەستت نەهێشێت ماریا"، بەڵام دەمم نەکردەوە: لەکاتی شوشتنی شووشەکان نەماندەتوانی قسە بکەین.

دوایی چوارپایەکەم بردە ژووری باوکم، گەڕامەوە بەشوێن تەشت و قاپ و دەسماڵەکان، رۆیشتمە سەر چوارپایەکە و دەستم کرد بە خاوێن کردنەوەی شووشەکان.

شەمندەفەرێك فیکەی کێشا. لەم رووبەڕوویە، هێڵی ئاسنین لە دوکەڵ و دەنگەدەنگ پڕ بوو. لەناکاو وەخۆم هاتمەوە هەروەکوو ئەوەیکە بۆ سەیرکردن لە پەنجەرە خوار بوومەتەوە. بە ترسەوە لەناوخۆمەوە

---

[6] - Thaler کەواتە، باوك وشەیەکە کە لەپێش ناوی قەشەکانەوە دێت.

وتم: "خـوای گـەورە و میهێرەبـان، خوایـە نـەکا لـە کـاتی شوشـتنی شووشەکان گوناهێك بکەم!"

دوایی دوعایەکم کرد، لەژێر لێوەکانم خەریکی خوێندنەوەی سروودێکی ئایینی بووم و بینیم حاڵم باشترە.

خاوێن کردنەوەی شووشەکانی ژووری باوکم کە کۆتاییان پێهات، بۆلای هۆڵەکە رۆیشتم. گێردا و بێرتا لەولای مەمەرەکە بوون. تەشت بەدەست بەدوای یەکتر کەوتبوون. دەرۆیشتن کە پەنجەرەی ژووری خۆیان خاوێن بکەنەوە.

چـوارپایەکەم بـە دیوارەوەنـا و خـۆم کێـشایەوە قـەراغ. لەبـەردەم مـن تێپـەڕین و مـن رووم وەرگێـڕا. ئـەوان لـەمن بـچووکتر بـوون، بـەڵام باڵایـان بەرزتر بوو و گەورەتر دیاربوون.

چـوارپایەکەم لەبـەردەم پەنجـەرەی تەلارەکـە (هۆڵەکـە) دانـا. بـۆ ژووری بـاوکم گەڕامـەوە، تەشـت و قـاپ و دەسماڵـەکانم لـە قولنـچکێك دانـا.دڵـم بـەخێرایی لێیـدەدا. دەرگـام داخـست و خـەریکی سـەیرکردنی وێنـەکان بووم. سـێ برایـەکان، مام، باوك و باپیری باوکم لـەوێ بوون. هـەموویان رائید. هەموویان لە جلکی تەواو فەرمیدا بوون. لە هەموویان زیاتر وێنەی باپیرم سەرنجی راکێشام کە عەمید بوو و دەیانگوت من بە ئەو دەچم.

پەنجـەرەم کـردەوە، چـوومە سـەر چـوارپایەکە. سـۆز و بـاران هاتـە ژوورەکەم. من پاسەوانێکی هێڵی پێشووی بەرەی شەڕ، کە وەستاوم و لە ناو دڵـی گـەردەلوول ئاگام لە نزیك بوونـەوەی دووژمنـە. شانۆیەکە گۆڕا. بینـیم لـە نـاو گۆڕەپـانی سـەربازخانەیەك دام و رائیـدێك تـەمبێی کـردووم.

رائیدەکـە چـاوی روون و قەڵافـەتێکی تێکـسماوی بـاوکمی هەیـە. جـوان رادەوەستم و بە ڕێزی تەواوەوە دەڵێم: **"یاوول، هێر هاوپێتمان!"**[7]

مۆرەکانی پشتم سۆزیان پێکەوت. قاب و دەسماڵ، هەر لە خۆیانـەوە زۆر بـەجووانی لەسـەر شووشـە دەسـووان و هاتووچۆیان دەکرد. سـەیرکردنی بێ رەحمانە و سەربازانەی بنەماڵەکەمان بە حـەز و چێژەوە لەسـەر شـان و پشتم هەست پێدەکرد.

کارم کە تەواو بوو چوارپایەکەم دەستدایە و بردمە ناو عەمبار، گەڕامـەوە تەشت و قاپ و دەسماڵم هەڵگرت و چومە چێشتخانە.

دایکم بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە وتی:

– دایانبنێ سەر ئەردی، وەرە دەستەکانت بشۆوە!

چوومە پێش رووشۆری. دایکم جێگەی کردمەوە. دەستەکانم خستە ناو ئاو، گەرم بوو. باوکم شۆردنی دەست و چاوی بۆ ئێمە قەدەغە کردبوو. بە سەبری وتم:

– ئەو ئاوە کە گەرمە!

دایکـم ئـاخێکی هەڵکێـشا، تەشـتەکەی دەسـتدایە بـە وتـنی ووشـەیەك هەڵیگێرایـەوە سـەر رۆشـۆرەکە و شـێرەی ئـاوی کـردەوە. سـابونم دەست دایـە. دایکـم خـۆی کێشایە لایەك و تەنیشتاو تەنیـشت وەسـتا. دەسـتی راستی لەسـەر لێوی دەستـشۆرەکە دانـابوو و چـاوی لـە دۆڵابەکـە بڕیبـوو. دەستی راستیشی دەلەرزی.

شۆردنی دەستەکانم کە تەواو بوو شانەی بۆ لام درێژ کـرد و بـێ ئـەوەی سەیرم بکات:

– پرچت شانە بکە.

---

[7] - رەستەی ئەڵمانی! Jawohl Herr Hauptmanen بەڵێ جەنابی رائید .

رۆیشتمە لای ئاوێنەی دۆڵابەکە. دایکم دووبارە دەستی بە شۆردنی قاپ و کەوچکەکان کردەوە، هەر لە دەنگەکەیەوە زانیم.

خۆم لە ئاوێنەدا سەیر دەکرد و لە خۆم دەپرسی راستی راستی بە باپیرم دەچم یان نا. زانینی ئەم مەسەلەیە بۆم زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەگەر بە ئەو چووبام، ئەوا دەمتوانی دڵم خۆش بێت کە وەکوو ئەو دەبم بە عەمید.

دایکم لە پشت سەرم وتی:

– باوکت چاوەڕێتە.

شانەم لەسەر دۆڵابەکە دانا و دەستم بە لەرزین کرد.

دایکم وتی:

– شانەکەی لەسەر دۆڵابەکە دامەنێ.

دوو هەنگاوێك هاتەپێش، شانەکەی دەست دایە بە پێشبەندەکەی خاوێنی کردەوە و خستیە ناو کشەوی دۆڵابەکە. بە نائومێدی سەیرم کرد. رووی لێوەرگێڕام و پشتی تێکردم و گەڕایەوە بۆ شوێنی پێشووی واتە پێش دەستشۆرەکە.

لە چێشتخانە هاتمەدەر و بە هێواشی بەرەو ژووری کاری باوکم وەڕێکەوتم. لەناو مەمەڕەکە دووبارە لەگەڵ خوشکەکانم رووبەڕوو بوومەوە. زۆر بە نارێکی سەیریان کردم و هەربۆیە زانیم ئاگاداری ئەوە بوونەتەوە کە بۆ کوێ دەچم.

لەبەردەرگای کار وەستام، فشارێکی زۆرم بەخۆم هێنا هەتا توانیم پێش سەگەلەرزینم بگرم و لە دەرگام دا. باوکم هاواری کرد: "وەرنە ژووریٰ!" دەرگام کردەوە، بەستمەوە و بە رێکییەکی سەربازیانە بەرامبەری وەستام.

هێشتا هیچ نەبووە کە سەرمایەکی ترسناك خۆی ناوەتە ناو جلکەکانم و هەتا مێشکی ئێسقانم رۆچووە.

باوکم لەپێش پەنجەرەیەك کە کرابۆوە، لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو. پشتی لە من بوو و نەدەجوولایەوە. منیش هەر وا بەرێکی، بێ جوولە وەستام. بە هەر سۆزێکی توندی با، وردەبارانێکیش دەهاتە ناو ژوورەکە. بینیم کە لەژێر پەنجەرە وەکوو حەوزێکی بچووك ئاو کۆ بووەتەوە.

باوکم بە دەنگی پچڕ پچڕی وتی:

– بگرە، دانیشە.

چوومە پێشەوە، لەسەر کورسییەکی لای چەپی دانیشتم. باوکم کورسییەکی سووڕاند و سەیری کردم. چاوەکانی لە هەمیشە زیاتر قوولاییان تێکەوتبوو و رووخساری بەجۆرێك ماندوویی پێوەدیار بوو کە دەکرا تاك تاك ماسوولکەکانی بژمێری.

چرای بچووکی سەرمێزەکەی هەڵکرابوو و منیش لەوەیکە لە تاریکیدا بەرامبەر بەئەو دانیشتووم زۆر خۆشحاڵ بووم.

– سەرماتە؟

– نەخێر باوکە.

– خۆ نالەرزی؟

– نەخێر باوکە.

ئاگاداری ئەوەش بوومەوە کە بۆخۆشی زۆر بەسەختی پێش لە لەرزینی دەگرێت و دەست و رووخساری رەش هەلگەڕابوو.

– شووشە خاوێن کردنەوەت، تەواو، کرد؟

– بەڵی باوکە.

– قسەشت، کرد؟

– نەخێر باوکە.

بەجۆرێك کە هەر دەتوت لەوێ نییە سەری خوار کردەوە و چونکە ئیتر هیچی نەوت، بەدوای قسەکانمدا زیادەم کرد کە:

- تەنیا دووعایەکم کرد.

سەری بەرز کردەوە و هەر ئەوجۆرە بە پچڕ پچڕی وتی:

هەوڵ بدە، تەنیا، وەڵامی پرسیارەکانی، من بدەیەوە.

- بەچاوان باوکە.

دووبارە دەستی کردەوە بە لێپرسینەوە. وابیر بکەینەوە زۆر گێژ و کەللەپڕ. وەکوو کارێك بکەن بە خوو:

- خووشکەکانت، قسەیان، کرد؟

- نەخێر باوکە.

- ئاوەکانت، رشت؟

- نەخێر باوکە.

- سەیری، کۆڵانت، کرد؟

بۆ ساتێك زۆر ترسام:

- نەخێر باوکە.

چاوەکانی لەمن بڕی:

- زۆر، ئاگادار بە، هیچ، سەیری، کۆڵان، مەکە؟

- نەخێر باوکە.

چاوەکانی بەست. راستی راستی دەبێ زۆر پەرێشان حاڵ بووبێت، ئەگینا ئاوا بە ئاسانی واز ناهێنێ.

بێدەنگییەك ژوورەکەی داگرت. قەڵافەتی رەق و تەق و بەرزی خۆی لەناو کورسیەکەدا هێنا و برد. باران بە توندی هاتەژوور و هەستم کرد چۆکی چەپم تەڕ بووە. سەرما کاری خۆی کردبوو، بەڵام ئەو شتەی کە ئازاری

دەدام سەرما نەبوو: ترسی ئەوە بوو کە باوکم ببینێ چۆن وەکوو سەگ دەلەرزم.

– رۆدۆلف (Rudolf)، دەمهەوێ، قسەت، لەگەڵ بکەم.

– بەڵی باوکە.

کۆخەیەکی جەرگبڕ چوار گۆشەی جەستەی لەرزاند. دوایی سەیرێکی پەنجەرەی کرد. وامزانی دەیەوێ هەستێتە سەرپێ و پەنجەرەکە دابخات، بەڵام پەشیمان بۆوە و دووبارە وتی:

– لەبارەی داهاتووت، رۆدۆلف، دەمەوێ، قسەت، لەگەڵ بکەم.

– بەڵێ باوکە؟

ماوەیەکی باش لە بێدەنگیدا سەیری پەنجەرەی کرد. دەستەکانی بەهۆی سەرما رەش هەڵگەڕابوون، بەڵام کەمترین جووڵەی پێنەدەکردن.

– سەرەتا، دووعایەك، دەخوێنین.

هەستایە سەرپێ. منیش خێرا هەستام. رۆیشتە لای وێنەی مەسیح کە لەپشت کورسییەکی کوورت بە دیوارەوە هەڵواسرابوو و لەسەر ئەرد لەپێش ئەو چۆکی دادا. منیش هاتمە سەر چۆك، هەڵبەت نە لە تەنیشتی، لە پشت سەری. سەلیبی کێشا و خەریکی خوێندنی دووعای "باوکی ئێمە"[*][(٨)] بوو. زۆر بە هێواشی و پچڕ پچڕ، بێ ئەوەی تەنیا واوێکی لەبیر بکات. دوعا خوێندنەکەی زۆر پچڕ پچڕ نەبوو.

من چاوەکانم خستە سەر قەڵافەتێکی باڵابەرز و شەق و رەق کە لە پێشم چۆکی دادابوو و وەکوو هەمیشە هەستم دەکرد دوعاکەم زیاتر لەوەیکە بۆ خودا بێت، ئەوا بۆ ئەوە.

---

[*] - Pater Noster، ناوی دوعای مەسیحە کە زۆر لەسەر زمانە کە بەم رەستەیە دەستپێدەکات: "باوکی ئێمە کە لە ئاسمانەکانی!"

باوکم "ئامین"ێکی بەرزی وت و هەستایەسەرپێ. لە پشت مێزەکەی دانیشت و وتی:

- دانیشە!

لەسەر کورسییەکی کوورت دانیشتم. مێشکم دەشڵەقا.

چاوێکی دوور و درێژی لێکردم و ئەم بیرۆکەیە سەیروسەمەرەیەم بۆ هاتەپێش کە غیرەتی ئەوەی نییە قسە بکات.

هەر ئەمجۆرەی کە لە شەش وبێشی قەسە کردن و قسە نەکردندا بوو. باران لەناکاو وەستا. باوکم کرایەوە و منیش هەتا کۆتایی مەسەلەکەم خوێندەوە. باوکم هەستا و پەنجەرەکەی داخست: خوای بۆخۆی دوعاکردن و عەزابدانەکەی بەلاوە بەس بوو!

باوکم دووبارە دانیشتەوە و وام هەست کرد ئیتر غیرەتی پەیدا کردووە و وتی:

- رۆدۆلف، تۆ، پێت ناوەتە، سێزدە، بە تەمەنێك گەیشتووی کە، عەقڵت بگاتێ. بە گەورەیی خوا، منداڵێکی بەهۆشی، و بە رەزامەندی من....

دووبارە وتی:

- یان زیاتر، بە لوتفی شۆقێك کە، خواستی خوایی، بۆ پەروەردەکردنی، تۆ بەمنی بەخشی، لە قوتابخانە، قوتابییەکی باشی. چونکە من، رۆدۆلف، فێرم کردووی کە دەرسەکانت، هەروەکوو شووشەکان پاك، دەکەیەوە، بە دڵەوە بخوێنی!

بۆ ساتێك بێدەنگ بوو و دوایی بە دەنگێکی بڵند، وەکوو هاوارکردنێك وتی:

- لەناخی دڵەوە!

زانیم کە دەبێ شتێك بڵێم و بە دەنگێکی لاواز وتم:

– بەڵێ باوکە.

لەوکاتەوە کە پەنجەرە داخرابوو هەستم دەکرد ژوورەکە ساردتر بووە.

– کەواتە، دەمهەوێ، بڕیارێك کە، لەبارەی، داهاتووی تۆدا، گرتوومە، پێت بڵێم.

دوایی وتی:

– بەڵام، دەمهەوێ، هۆکاری، بڕیارەکەشم بزانی، درك بکەی.

بێدەنگ بوو. دەستەکانی ڕێککووشی و لێوەکانی وەرلەرزین کەوتن.

– ڕۆدۆلف، پێشتر، من، تووشی گوناهێك، بوومە!

مات و بێدەنگ سەیرم کرد.

– بۆ ئەوەیکە، بڕیاری من، درك پێبکەی، دەبێ، ئەمڕۆ، گوناهەکەمت، پێ بڵێم. گوناه ڕۆدۆلف! گوناهێکی، ئەوەندە گەورە، ئەوەندە ترسناك، کە هیچکات، ناتوانم، و ناشبێ بتوانم، ئومێدەوار بم کە خوای گەورە، لانیکەم لەم دونیایەدا، بەمبەخشێت.

چاوەکانی بەست، لێوەکانی زۆر بە توندی دەلەرزین. بەشێوەیەك حاڵەتی نائومێدانەی هەبوو کە بوغز قورگمی گرت و چەند ساتێك لە لەرزین کەوتم.

باوکم بە زەحمەت دەستەکانی لێك جیا کردەوە و ساف لەسەر چۆکی دانان.

– دەبێ باش بیر بکەیەوە کە بۆ من، چەندە زەحمەت و پڕ لە ژانە، کە خۆم، بەم شێوەیە، لای تۆ بە خەجاڵەتی و سەربەژێر،دەبینم، خۆم بچووك دەکەمەوە، ئەگەرچی، ژان و ڕەنجی من، گرنگ نییە، من، هیچ نیم.

چاوەکانی بەست و دووبارەی کردەوە.

- من، هیچ نیم.

ئەم ڕەستەیەی پێ خۆش بوو و هەرجارێك دووبارەی دەکردەوە خۆم بە هۆکاری ڕەنج و ژان و خەفەتی باوکم دەهاتەبەرچاو. هەر دەتگوت من بوومەتە هۆی ئەوەی باوکم "هیچ نەبێت".

چاوەکانی کردەوە و ڕووی لە بۆشایی ژوورەکە کرد.

- من، ڕۆدۆلف! سەردەمانێك، یان ڕێکتر بڵێم: ڕاست چەند هەفتە بەر لە، دایکبوونی تۆ، ناچار بووم، سەبارەت بە کارەکانم، گەشتێك بکەم..... (بە نفرەتەوە وتی): بۆ فەڕەنسا، بۆ پاریس....

زۆر ناڕەحەت بوو، چاوەکانی بەست و هەموو نیشانەکانی چیان لەناو ڕووخساریدا خۆیان حەشاردا.

- پاریس، ڕۆدۆلف، پایتەختی هەموو گوناهەکانە!

لەناکاو لەناو کورسیدا خۆی ڕاست کردەوە و چاوەکانی لە من بڕی کە گڕی ڕقیان –لێدەباری:

- تێدەگەی؟

تێنەگەیشتبووم، بەڵام سەیرکردنەکەی وەخت بوو ڕووحم لێ بستێنێت و بە دەنگێکی نزم وتم:

- بەڵێ باوکە.

- بەدەنگێکی گیراو وتی:

- خوای جیهان، لە کۆتاییدا غەزەب، جەستە و ڕووحی منی، تاقی کردەوە.

چاوەکانی کز بوونەوە و بە جۆرێك کە نفرەتیان لێدەباری وتی:

- نەخۆش بووم، چارەسەر کرام، و چاك بووومەوە، بەڵام ڕووح، شیفا پەیدا ناکات.

لەناکاو بە قیژاندنەوە وتی:

- رووح، ئەدوبوایەش شیفا پەیدا بکات!

بێدەنگییەکی دوور و درێژ ژوورەکەی داگرت، دوایی واپێدەچوو ئاگاداری ئەوە بووەتەوە کە من لەوێم، بە حەزەرەوە پرسی:

- دەلەرزی.

- نەخێر، باوکە.

لە قەسەکانی بەردەوام بوو وتی:

- گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیا و لای دایکت دانم بە تاوانەکەم دانا، و بڕیارم دا لەمەودوا، جگە لە گوناەکانی خۆم، گوناەی منداڵەکان، و گوناەانی ژنەکەشم، بە ئەستۆوە بگرم، و بۆ ئەوانیش هەروەکوو خۆم، لە بارەگای خوای گەورە بپارێمەوە و داوای لێبوردن بکەم.

دوای ماوەیەك دووبارە وەقسە هاتەوە و ئەمجارە قسە کردنەکەی بە دوعاکردن دەچوو، چونکە ئیتر پچڕ پچڕ قسەی نەدەکرد:

- بەشێوەیەکی فەرمی عەهدم بە دەرگای خوا کرد کە ئەگەر خوا کوڕێکی دامێ لە ڕێگەی ئەودا بیکەمە خزمەتگوزار.

ڕێك سەیری چاوەکانی منی کرد:

- رەحم و کەرەمی خواش وایکرد کە کوڕێکی پێبەخشین.

بە غیرەتێکی سەیروسەمەرە جووڵەیەکی سەیرم کرد: یانی لە جێوە بەرز بوومەوە. بێ ئەوەی دەنگی بەرز بکاتەوە وتی:

- دانیشە.

- باوکە....

- دانیشە!

دانیشتم.

- کە تەواو بووم تۆ قسە دەکەی.

وتم: "بەچاوان باوکە". بەڵام هەر ئەوکاتیش زانیم کە کۆتایی بە قسەکانی هات ئەوا لاڵ دەبم و ناتوانم هیچ شتێ بڵێم.

لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- رۆدۆلف! لەوکاتەوە تۆ بە تەمەنێك گەیشتووی، کە تووشی، گوناه بی، من، یەك بە یەك گوناەکانی تۆم، بەئەستۆ گرتووە. بۆ تۆ لە بارەگای خوا، پاڕاومەتەوە و داوای لێبوردنم، کردووە، وەکوو ئەوەی گوناەکاری سەرەکی، منم. هەروەها تا ئەو کاتەی سەغیری، ئەمکارە دکەمەوە.

کەوتە کۆخەکردن.

- تۆش، رۆدۆلف، لەبەرامبەردا، کاتێك فتوای قەشایەتیت وەرگرت، لانیکەم ئەگەر تا ئەو رۆژە، ژیام، دەبێ تاوان و گوناەکانی من بەئەستۆ بگری...

من خۆم جوولاند و ئەو قیژاندی:

- قسەکانم مەبڕە.

دیسان بە کۆخە کەوت. ئەمجارە کۆخەکەی جەرگبڕ بوو کە لەسەر مێزەکە خواری کردەوە و لەناکاو ئەم فکرەی خستە ناو مێشکم کە ئەگەر بمرێت ناچار نابم ببم بە قەشە.

وەکوو ئەوەی فکری منی خوێندبێتەوە و وتی: "ئەگەر بمرم..." شەپۆلێك شەرمەزاری منی داگرت.

- ئەگەر بمرم، و تۆش هێشتا، فتوای قەشایەتیت وەرنگرتبێ، یان قەییمی داهاتووت، هەموو کارەکانم جێبەجێ کردووە، مردنی من بارودۆخەکە ناگۆڕی. تەنانەت دوای مردنیشم، رۆدۆلف، تەنانەت دوای

مردنیشم، ئەرکی تۆ، ئەرکی قەشایەتی تۆ، ئەوەیە کە، بۆ من، لە بارەگای خوا، بپارێیەوە و شەفاعەتم بۆ بخوازی، و لێم ببورێت.

وەکوو ئەوە دەچوو چاوەڕوانی وەڵامی من بێت. بەڵام من نەمتوانی هیچ شتێك بڵێم؟

لە قەسە کردنی بەردەوام بوو:

– ڕەنگە، **ڕۆدۆلف**، جاریوایە ئاگاداری ئەم، خاڵە بووبی، کە لەگەڵ تۆ، لە خووشك و دایکت، سەختگیرتر بوومە. بەڵام ئەمە بزانە، **ڕۆدۆلف**. ئەمە درك بکە، کە تۆ، کە شەخسی تۆ، ماڤ ئەوەت نییە کە.... تێدەگەی؟ "حەقی ئەوەت نییە – حەق!– ئەوەیکە، گوناەێ بکەی.

بە هەیەجانەوە بەردەوام بوو:

– وادیارە گوناەەکانی خۆم، بەسم نییە، کە دەبێ ئەم بارە، ئەم بارە ناوقەدشکێنە، هەموو جەماوەری ئەم ماڵە، هەمووتان بە گشتی، بە گشتی! (بە توندی وەکۆخە کەوت) هەموو ڕۆژێکی خوا، قورستری بکەن!

هەستایە سەرپێ و لە ژوورەکەدا دەستی بە هەنگاو نانەوە کرد و دەنگی لە تووڕەیی دەلەرزی:

– ئەوەی لە حەقی مندا، دەیکەن، ئەوەیە، هەمووتان زیاتر دەمخەنە ناو گوناە. هەموو ڕۆژێکی خوا تێدا قووڵتر دەبم.

هەر لەخۆیەوە هاتە لام. منیش بە سەرلێشێواوی سەیرم دەکرد. تا ئەو کاتە هیچکات دەستی لەسەر من بەرز نەکردبۆوە.

لە یەك هەنگاوی من وەستا، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، کوورسیەکەمی دەور لێدا و خۆی هاویشتە بەرپێی وێنەکەی حەزرەتی مەسیح. منیش هەر بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت هەستامە سەرپێ.

هەر لەوێوە وتی:

- لە شوێنی خۆت بمێنەوە، پەیوەندی بە تۆوە نییە.

هەر بەو شێوە لەسەرەخۆییە کە لەکاتی دوعاکردن لەسەرەخۆ دەبوو، خەریکی خوێندنی دوعای "پاتر" بوو.

ماوەیەکی زۆر دوعای خوێند، دوایی هات و لەپشت مێزەکەی دانیشت و بەجۆرێك سەیری منی کرد کە

سەرلەنوێ دەستم بە لەرزین کرد.

- هیچ قسەیەکت هەیە بیڵێی؟
- نەخێر، باوکە.
- وابزانم دەتویست شتێکی بڵێی؟
- نەخێر، باوکە.
- زۆر باشە، دەتوانی بڕۆی.

هەستامە سەرپێ و ڕێك بەرامبەری وەستام. بە دەست ئیشارەیەکی ئاسایی پێکردم. سووڕامەوە و هاتمە دەر و دەرگام داخست.

چوومە ژوورەکەم، پەنجەرەم کردەوە و پردەکانم کێشان، چرام هەڵکرد، لە پشت مێز دانیشتم و خەریکی مەسەلەیەکی بیرکاری بووم، بەڵام نەمتوانی بەردەوام بم. بەجۆرێك بوغز قورگمی گرت کە دەتوت خەفە دەبم.

هەستام و پێڵاوەکانم لەژێر تەخت هێنایەدەر و خۆم خەریکی خاوێن کردنەوەیان کرد. لە کاتی گەڕانەوەم لە قوتابخانە تا ئەوکاتە بە تەواوی وشك ببۆوە و دوای ئەوەی کەمێك واکسم لێدان و بە پارچەیەك کەوتمە گیانیان. دوای ماوەیەکی کوورت وەکوو ئاوێنە دەدرەوشانەوە، بەڵام من دیسانیش خەریکی درەوشانەوەیان بووم. توندتر و توندتر. تا ئەوکاتەی شانم لە رووی ماندوویی بەژان کەوت.

سەری کاتژمێر حەوت و نیو، ماریا، زەنگی بچووکی خواردنی شەوی بەدەنگ هێنا. دوای خواردنی شەو نوێژی شەوانە خوێندرا. باوکم پرسیاری هەمیشەیی لێکردین: هیچکەس لەماوەی رۆژدا گوناەی نەکردووە و دواتر خۆی هاویشتە ژوورەکەی خۆی.

کاتژمێر هەشت و نیو چوومە ژوورەکەی خۆم و کاتژمێر نۆ دایکم هات و چرایەکەی کوژاندەوە. منیش لەناو نوێنوباندا خۆم درێژ کردبوو. بێ وتنی یەك وشە و بێ ئەوەی سەیرم بکات دەرگای داخست و من لە تاریکیدا بەتەنیا مامەوە.

دوای کاتێکی کەم، ساف و راست درێژ بووم: قاچەکان راست و پێکەوەنووساو. سڕ، چاو بەستراو. دوو دەستەکان لەسەر سینگم لەسەر یەك. تازە مردبووم. هەموو جەماوەری ماڵەوە، لە دەوری تەخت، لەسەر عەردەکە چۆکیان دادابوو و دوعایان دەکرد. ماریا فرمێسکی هەڵدەوەراند، ئەم بارودۆخە ماوەیەکی زۆری کێشا. ئاخیرییەکەی باوکم هەستایە سەرپێ، رەش و تێکقرماو، بە هەنگاوی شل بەرێ کەوت و چووە ناو ژوورە ساردەکەی و لەبەردەم پەنجەرە دانیشت. چاوەڕوانی وەستانی باران بوو هەتا بیبەستێت. وابزانین کە ئیتر ئەم کارە سوودی نییە، ئاخر ئیتر من نەبووم کە ببمە قەشە یان لە بارەگای خوای گەورەدا شەفاعەتی بۆ بخوازم.

دووشەممەی دواتر وەکوو پێشتر کاتژمێر پێنج لە خەو هەستام. زۆر سارد بوو و کرکرەی پەردەم کێشا، بینیم سەربانی وێستگەی شەمەندەفەر بەفری گرتووە.

کاتـژمێر پێـنج و نیـو لەگـەڵ بـاوکم لـە ژووری خـواردن نـانی بـەیانیمان خوارد. کە بۆ ژوورەکەم گەڕامـەوە، لەناکاو ماریـا لـە مەمەڕەکە لەبـەردەمم وەستا. لەوێ چاوەڕوانیی دەکردم.

دەستی پان و بەرینی خۆی لەسەر شانم دانا و وتی:

– کە بۆ ئەوێ ڕۆیشتی، لەبیر نکەی ها!

رووم لە لایەکی دیکە کرد و وتم:

– بەچاوان، **ماریا**.

بەڵام هیچ جووڵەیەکەم نەکرد. شانمی ڕێککوشی و بەهێواشی وتی:

– "بەچاوان **ماریا**" وتن هیچ سوودێکی نییە، دەبێ بڕۆی، هەر ئێستا.

– بەچاوان، **ماریا**.

توندتر شانمی ڕێککوشی و وتی:

– یاڵڵا ڕۆدۆلف!

بەریدام و بۆ لای ئاودەست بەڕێکەوتم. وام هەست کرد کە نیگـای ماریـا قورسایی خستووەتە سەرشانم. دەرگام کردەوە و لەسـەر خۆم دامخست. کلیلـی نـەبوو و بـاوکم گلـۆپی کارەباشـی کردبـۆوە. روناکییـەکی کـەم لـە پنجـەرەی ژوورێکـەوە دەهاتـەژوور. وەکـوو قـەبر تاریـك و وەکـوو بـەفرگر سارد بوو.

بە لەرزۆکییەوە دانیشتم و بە ئەنقەست چاوم خستە عـەرد. بـەڵام هیـچ سـوودێکی نـەبوو، بـە شـاخەکانییەوە، بـەو چـاوە زەقانەیـەوە، بـەو لووتـە درێـژ و لێـوە ئەستوورەیـەوە لـەوێ بـوو. کاغەزەکـەی نـەختێك زەرد ببـوو، چونکە ساڵێك دەبوو باوکم لەوی ڕووبەڕووی چاڵاوەکە، ڕێك بەرامبـەر بـە چاو، لەدیواری دابوو.

عارەقە لەسەر مۆرەی پشتم تکایەوە. لەناو دڵمدا وتم: "تەنیا وێنەیەکی کێشراوە، وێنەش خۆف و ترسی نییە!" و سەرم بەرز کردەوە. شەیتان رێك چاوی بڕیە من و لێوەکانی نانەجیبی دەستیان کرد بە پێکەنین. لەجێوە هەستام. پانتۆڵەکەم هەڵکێشا و تیژ خۆم هاویشتە ناو مەمەڕەکەوە.

ماریا منی گرت و بەخۆیەوە رێککووشی، پرسی: – کردت؟

– نا، ماریا.

سەری راوەشاند و چاوە بەسۆزە غەمگینەکەی لەمن بڕی:

– ترسای؟

بە یەك هەناسە وتم: – بەڵێ.

– ئێ سەیرت نەکردبا.

خۆم پێوەنووساند. ترسم لەوە بوو ئەمرم پێبکات دووبارە بگەڕێمەوە. بەڵام تەنیا ئەوەی وت:

– کوڕی ئاوا زەبەلاح!

لە ژووری کاریی باوکم دەنگی پێ هات و ماریا بە خێرایی وتی:

– لە قوتابخانە بیکەی ها، لەبیر نەکەی!

– نا ماریا.

بەریدام. رۆیشتمە ناو ژوورەکەم. دوگمەکانی پانتۆڵم بەست. پێڵاو و گۆریم لەبەر کرد، خاولییەکەم لەسەر مێز هەڵگرت و لەسەر چۆکم دانا و لەسەر کورسی دانیشتم. رێك وەکوو ئەوە بوو کە لە ژوورێکی چاوەڕوانیدا دانیشتبم.

دوای ماوەیەکی کەم دەنگی باوکم لەولای دەرگا بڵند بوو کە: – شەش و دە خوولەکە، ماین هێر!

باوکم بەجۆرێك ئەم ماین هێری دەوت کە دەنگی قامچی دەدا.

هێشتا هیچ نەببوو کە بەفرێکی زۆر کۆڵانی گرتبوو. باوکم بە جوانی هەنگاوی دەنایەوە، ڕێك بەرامبەری خۆی سەیر دەکرد و هیچی نەدەوت. بە هەموو هەوڵێکی کە دەمدا سەرم بە زۆری دەگەیشتە شانەکانی.

بێ ئەوەی روو وەرگەڕێنێت وتی:

- قاچت دروست بکە!

قاچم گۆڕی و لەژێر لێوەکانمدا دەستم کرد بە ژماردن: "چەپ.... چەپ....". بەڵام هەنگاوەکانی باوکم زۆر درێژتر بوون و دیسانیش قاچم بە غەڵەتی دانا. ئەویش بە پچڕ پچڕ وتی:

- وتم، قاچت، راست بکە!

بۆ ئەوەی هەنگاوەکانم بەقەدەر هەنگاوەکانی ئەو بێت بەرادەیەك بەرەو پێش خوار بوومەوە لە ناوقەد دووقەد بوومەوە. بەڵام دیسانیش سوودی نەبوو. دووبارە قاچم تێکچوو و سەر و رووخساری باوکم بینی کە لە تووڕەییان سوور هەڵگەڕاوە.

وەکوو هەمیشە دە خوولەك پێش لە نوێژ گەیشتینە کەنیسە. جێگەیەکمان دۆزییەوە، چۆکمان دادا و خەریکی دوعا کردن بووین. دوایی باوکم هەستا و کتێبی دوعای لەپێش خۆی دانا و دانیشت و دەستی لەسەر سینگی خۆی دانا.

ئەمنیش موو بە موو لاسایی ئەوم دەکردەوە.

هەوا سارد بوو، بەفر لەسەر شووشەکان دەنیشت. من لە سەحرایەکی ساردی سەهۆڵاوی وەستابووم. بە نفرەتەوە وەکوو دوایین کەس خەریکی تیرهاوێژی بووم. سەحرا لەناو چوو. ئێستا تفەنگ بەدەست لەناو دارستانێکی پڕ لەدار بووم. ئاژەڵی هار بەدەوام کەوتبوون و بومییەکان

بەدوام دەکەوتن. لەبەر گەرما و برسێتی وەتەگە هاتبووم. لەبادەی سپی قەشایەتیم لەبەر بوو. بومییەکان رژانەسەرم و گرتیانم. بە دیرەکێکەوە بەستیانمەوە و لوت و گوێ و سیرەتیان بڕیم. لەناکاو خۆم لە قەسری قایمقام بینی کە رەشپۆشەکان دەور تا دەوریان گرتبوو. سەربازێك لە تەنیشت من گوولەی پێکەوت و کەوت. تفەنگەکەیم دەست دایە و ئێستا گوللە مەهاوێ کەی بیهاوێ. بە جۆرێك نیشانەم دەگرت کە هەر باسی مەکە.

نوێژ دەستی پێکرد. هەستامە سەرپێ. بە نییەتێکی پاك لەناو دڵمەوە وتم: – "خوایە گیان، کارێك بکە لانیکەم ببم بە "میسیونر".[٩]

باوکم خوار بۆوە کە کتێبی دوعای لەسەر رەحلەکە هەڵبگرێت. منیش سەیری کتێبی ئەوم کرد و بەبێ ئەوەی واوێکی جێبهێڵم دوعام بە کۆتایی هێنا.

دوای نوێژ دە خولەکێك لە کەنیسە ماینەوە و لەناکاو بوغز قورگمی گرت.

وام بیر کردەوە کە ناکا باوکم من بەشێوەی قەشەکانی نافەرمی دەربێنێت. هاتینە دەر. چەند هەنگاوێك کە لە کۆڵان بەرێدا رۆیشتین خۆم بەسەر ئەو لەرزینە زاڵ کرد کە هەموو جەستەمی داگرتبوو و وتم:

– بێ زەحمەت باوکە.

بێ ئەوەیکە سەری بسوورێنی وتی: _ یا[١٠]؟

– بێ زەحمەت باوکە رێگەم بدە قسەیێ بکەم.

ماسوولکەکانی شێوەلاکی گرژ بۆوە. بە شێوەیەکی ناڕازی وتی: – یا؟

---

[٩] - پروپاگەندەکەری ئایینی کە بۆ پروپاگەندەی ئایینی مەسیحییەت بۆ شوێنە دواکەوتووەکان دەچێت.

[١٠] - Ja: بەڵێ بە ئەڵمانی.

– توخوا باوکە، ڕێگەم پێبدە ببم بە میسیونر.

زۆر بە وشکی وتی:

– هەرچی پێیان وتی بیکە، بڵی بەچاوان!

کار تەواو بوو. قاچم گۆڕی و لەناو خۆمەوە دەستم بە ژماردن کرد:

– "چەپ... چەپ..."

– باوکم لەناکاو وەستا و سەیری منی کرد:

– هۆکارەکەی چییە کە دەتەهەوێ ببی بە میسیونر؟

درۆم کرد کە: – دژوارترە ئاخر!

– کەواتە چونکە دژوارترە، دەتەهەوێ ببی بە میسیونر.

– بەڵێ باوکە.

دووبارە بەڕێکەوت. بیست هەنگاوێك کە ڕۆیشتین، بە هێوری رووی وەرگەڕاند و بە دوودڵی وتی:

– با بزانین.

چەند هەنگاو دوورتر سەر لەنوێ وەقسە هاتەوە:

– کە تۆ، دڵت دەخوازێ، ببی بە میسیونر....

سەرم بەرز کردەوە و بەسەیرەوە سەیری کردم، برۆیەکانی تێکنا و لە شێوەیەکی جددی وتی:

– تا ببینم.

کە گەیشتینە کۆتایی شەقامی "ئشلوش" (Schloss Strasse) (شەقامی قەسر) وەستا:

– بەهیوای دیدار، ڕۆدۆلف!

ڕێك و بەڕێزەوە بۆی وەستام و وتم: – بەهیوای دیدار، باوکە.

ئیشارەیەکی بچووکی کرد. وەکوو هەمیشە گەڕامەوە و پشتم تێیکرد، شانەکانم هاویشتە پشتەوە و ڕێگەی شەقامی ئشلوشم گرتەبەر. کاتێک پشت سەرم سەیر کرد و بینیم باوکم دیار نەماوە، شێتانە دەستم بە ڕاکردن کرد. ئاخر ڕووداوێکی سەیروسەمەرە ڕووی دابوو: بۆ یەکەمجار باوکم نەیگوتبوو "نا"!

هەر ئەو جۆرە بە ڕاکردن، ئەو تفەنگەی کە لە قەسری قایمقام لە سەربازە بریندارەکەم وەرگرتبوو و گوللەم پێ دەهاویشتە لای شەیتانی ڕەجیم. هەر یەکەم گوللەی کە هاویشتم لای چەپی ڕووخساری بە تەوای لەناو برد. نیوەی مێشکی پەڕیە دەرگای ئاودەستخانە و چاوی چەپی دەرهات و بە هەڵواسراوی مایەوە، لە کاتێکدا بە ترسەوە بە چاوی ڕاستی سەیری منی دەکرد و زمانی لەناو دەمی خوێناوی دەجوولا. گوللەی دووهەمم کە هاویشت وەلای ڕاستی کەوت و ئەویشی لەناو برد. بەڵام لای چەپی بەخێرایی وەکوو خۆی لێهاتەوە و ئەمجارە چاوی چەپی بوو کە بە نفرەت و ترس و لەرزەوە سەیری منی دەکرد.

لە دەرگای قوتابخانە تێپەڕیم. بۆ سڵاو کردن لە درکەوان کڵاوەکەم هەڵگرت و وازم لە گوللە هاویشتن هێنا. زنگیان لێدا و چوومە ناو ڕیزی قوتابیان و باوکە "تالر" هات.

کاتژمێر دە و نیو چووینە سەر دەرس، "**هانس وێرنێر**" (Hans Werner) لە تەنیشتم دانیشت. چاوی ڕاستی ڕەش هەڵگەڕابوو و ئەستوور ببوو. کە سەیرم کرد بە شێوەیەکی خۆبەزل زانین وتی:

- "**مێنش**" (Mensch) (ووشەیەك بەرامبەر بە بابەگیان، یان برام بە زمانی ئەڵمانی) لێدانێکم نەوشی گیان کردووە کە هەر باسی ناکرێ!

بە خێرایی بەردەوام بوو:

– کاتی پشوو بۆتی دەگێڕمەوە.

سەرم وەرگێڕا و چوومە ناو کتێبکەم. زەنگ کە لێدرا، ڕۆیشتینە حەوشەی گەورەکان. بەفر، زۆر خلیسکە ببووو. خۆم گەیاندە دیواری نوێژخانە و دەستم کرد بە ژماردنی هەنگاوەکانم. لە دیواری نوێژخانە هەتا دیوار پۆلی نیگارکێشانەوە ڕێك سەد و پەنجا و دوو هەنگاو بوو. ئەگەر ئەم مەودایەم بە سەد و پەنجا و یەك یان سەد و پەنجا و سێ هەنگاو پێوابا، ئەو دەورە حسێب نەبوو. هەتا ئاخری کات دەبوایە چل دەورم پێوابا. ئەگەر هەڵەم کردبا یان بۆ نموونە هەمووی سێ و هەشت دەور ڕۆیشتبام، کاتی پشووی دوایی نەتەنیا دەبوایە دوو دەوری باقی قەرەبوو بکەمەوە، بەڵکوو ناچار بووم دوو دەوریش سزا بدرێم.

دەستم بە ژماردنی هەنگاو کرد: " – یەك، دوو، سێ، چوار ....." کە لەناکاو هانس وێرنێر دەم بە پێکەنینی موو خەنەیی هاتە تەنیشتم، قۆڵی گرتم، منیش کێشامە پێش خۆم و قیژاندی:

– مێنش! نازانی چ لێدانێکم نەوشی گیان کردووە!

بەتەواوی هەنگاوەکانم لێ تێکچوو، ڕێگەی ڕۆیشتوو گەڕامەوە و هاتمە قەراغ دیواری نوێژخانە، لە نوێوە بەڕێکەوتم و دیسانیش دەستم کرد بە ژماردن: _ یەك، دوو.....

وێرنێر چاوی بە دەست نیشان دا و وتی:

– ئەوەی دەیبینی؟ شاکاری باوکمە!

حەزم کرد بوەستم؟

– لێیدای؟

دایە پێکەنین کە:

- هە هە! لێدان! ناوی ئەوە نییە. واباشترە بڵێی "تێهەڵدان"! مێنش، تێهەڵدانێکی گیانانە!

بە پێکەنین و گاڵتەجارییەوە لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- ئێستا بڵێ چیم کردووە؟ ها ها ها ها گوڵدانی چینی ژووری میوانم شکاندبوو....

دوایی هەناسەیەك، بێ ئەوەی پێبکەنێت و بە خۆشییەکی سەیر دووبارەی کردەوە:

- گوڵدانی چینی ژووری میوانم شکاندبوو!

لە کاتێکدا زۆر بە هێواشی هەنگاوەکانم دەژمارد بەرێکەوتم: "سێ، چوار، پێنج....." بەڵام وازم هێنا. زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە ئەم کوورە لەگەڵ ئەوەی لێدانێکی باشی پێکەوتووە، کەچی زۆر خۆشحاڵە:

- باشە، ئەوکات خۆت بە باوکت وت؟

- من و وتن؟ وابیر دەکەیەوە؟ پیرە پیاو خۆی هەموو شتێکی ئاشکرا کرد!

- پیرەپیاو.

- باوکم ئیتر!

سەیر بوو بە باوکی دەوت پیرەپیاو و وای لەم بێ حوورمەتییە و لەوە سەیرتر کە رێزیشی لەگەڵ تێکەڵ دەکرد

- پیرەپیاو ئاشکرای کرد، لەو ئاکەسانەیە ئەم پیرەپیاوە، مێنش! بەهەرحاڵ هەموو شتێکی ئاشکرا کرد!

سەیری وێرنێرم کرد. مووە سوورەکانی لەژێر خۆر دەبروسکایەوە. لەناو بەفردا، هەر لەجێوە سەمای دەکرد و بەوە چاوە هەڵمساوە و رەشهەڵگەڕاوەیەوە جینگڵی دەهاتێ. وەبیر هەنگاوەکانم کەوتمەوە کە

بەباشی لێمتێکچووبوو. بە حاڵێکی ناخۆش و تاوانبارانە بە راکردن بۆ بن دیواری نوێژخانە گەڕامەوە.

ویرنێر کە پێ بە پێی من رایدەکرد"

– هێی! ئەوە چیتە، بۆ ئاوا رادەکەی، دەتهەوێ لەناو ئەو بەفرەدا سەر و گوێلاکمان بشکێت.

– بێ ئەوەی شتێ بڵێم لەبن دیوار وەستام و دووبارە دەستم کرد بە ژماردنەوە.

ویرنێر کە بێ هۆ دەیویست هەنگاوەکانی خۆی لەگەڵ هەنگاوی من رێکبخات وتی:

– بەهەرحاڵ پیرەپیاو تێهەڵدانێکی وای لێدام و بەس وەرە سەیر بکەن! سەرەتا سۆحبەت بوو، بەڵام کاتێك بە شاپ لە قەڵەمەی پێم دا.....

بەسەرسووڕمانەوە وەستام:

– شاپت لە قەڵەمی پێی دا؟

ویرنێر کە دەیویست هەنگاوەکانی لەگەڵ هەنگاوی من رێکبێخێت وتی:

– ئەی چی، مێنش؟ ئەویش کاتێك پیرە ئەمجۆرە سەگبابەتێ دەکات!.... دەستی کرد بە لێدانی من! چ لێدانێکم نەوشی گیان کرد!.... هەر لێیدام، هەر لێیدام، تا ئاخرێکەی ناك ئاوتی کردم!

ئەمەی وت و دایە بەر پێکەنین:

– بەمکارەی بە تەواوەتی تووڕە ببوو، ئاوی لە دەم و چاو دا و بە زۆری کۆنیاکی لە خوارد دام. بەستەزمان پیرە! بەجۆرێك دەست و پێی خۆی ون کردبوو کە نەیدەزانی چ خۆڵێك دەکاتە سەری!

– دەی، دوایی؟

– دوایی؟ دەی ئیتر، منیش ئیتر نایدوێنم.

ئاوی دەمم قووت دا:

- نایدوێنی؟

- بەڵێ، ئەی چی؟ ئاخر، پیرە دوای ئەم هەموو تێهەڵدانە هەر تێکەڵی کردبوو، دوایی چووە چێشتخانە و شیرینییەکی دۆزیەوە و پێیدام.

- شیرینی پێ دای؟

- هەڵبەتە کە پێی دام. تازە گوێ بگرە بزانە چیم پێی وت! پێم وت "ئێستا کە ئاوای لێهات دەچم ئەو گوڵدانەکەی دیکەش دەشکێنم!"....

بە سەرسوڕمانەوە سەیریم کرد و وتم:

- ئەمەت پێ وت، ئەو چی کرد؟

- پێکەنی.

- پێکەنی؟

- یانی شاگەشکە بوو! ئەوەندە پێکەنی کە فرمێسك لەچاوەکانی دەڕژا! ئەوکات وتی... ئەتۆ تۆخوا گوێ بگرە بزانە چەندە سەگبابە ئەم پیرەیە!.... وتی: "فەرخە بەراز! ئەگەر گوڵدانەکەی دیکە بشکێنی منیش ئەو چاوەکەی دیکەشت کوێر دەکەم!"

لە خۆمەوە وتم: - ئێ، دواتر؟

- من پێکەنیم و دووبەدوو دەستمان کرد بە یاری و سۆحبەت کردن.

بە دەمی کراوە سەیریم کرد:

- یاریتان کرد؟

- بەڵێ کە یاریمان کرد!

بە خۆشحاڵییەوە لە قەسەکانی بەردەوام بوو:

- "فەرخە بەراز"!... پێی وتم "فەرخە بەراز"!

لە گێلێتی هاتمەدەر. حسێبی هەنگاوەکانم بە تەواوی لێتێکچووبوو، سەیری کاتژمێرم کرد: لە زەنگی پشوو نیو کاتژمێرێك تێپەڕیبوو. بیست دەور لە چوون و گەڕانەوەم وەپاش کەوتبووم کە بە سزایەکەی دەیکردە چل دەور. کە حسێبم کرد بینیم ئیتر ناتوانم قەرەبووی بەکەمەوە. هەستێکی نیگەراناوی هەموو جەستەمی داگرت و هەستم کرد کە یەك دونیا رقم لە وێرنێرە.

وێرنێر کە بەدوامەوە رایدەکرد وتی:

– چیتە؟ بۆ کوێ دەچی؟ بۆچی هەر دەگەڕێیتەوە بن ئەم دیوارە؟

وەڵامیم نەدایەوە و دەستم کرد بە ژماردن. بەڵام ئەو وازی لێنەدەهێنانم و وتی:

– راستی، ئەمڕۆ لسەر نوێژ بینیمی. هەموو رۆژێ بۆ کەنیسە دەچی؟

– بەڵێ.

– وەکوو من. ئەی چۆنە هیچکات لەکاتی گەڕانەوە ناتبینم؟

– باوکم هەمیشە دوای نوێژ دە خوولەك لە کەنیسە دەمێنێتەوە.

– ئیتر بۆچی؟ نوێژ کە تەواو بوو بۆچی دەمێنێتەوە؟

بە تووڕەییەوە وەستام و وتم:

– سەبارەت بە گوڵدان... دوعاتان نەکرد؟

وێرنێر بە چاوی گردکراوە سەیری کردم و وتی:

_ دوعا! دوعا بۆچی؟ سەبارەت بەوەی کە گوڵدانم شکاند؟

دای لە قاقای پێکەنین. هەستم بە سەیرکردنێکی سەیروسەمەرە لەلایەن وێرنێرەوە کرد. لەناکاو قۆڵی گرتم و بە زۆرەملی وەستاندمی و وتی:

– ئەگەر بۆخۆت بتشکاندبا، دوعات بۆی دەکرد؟

بە نائومێدییەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە دیسانیش ژماری هەنگاوەکانم لێ تێکچووە.

– بەرمدە!

– وەڵامی من بدەوە! بۆ گوڵدان دوعات دەکرد؟

– بەرمدە!

بەریدام. بۆ بن دیواری نوێژخانە گەڕامەوە. ئەویش بەدوامەوە هات. بە رووخسار گرژییەوە سەر لەنوێ بەڕێکەوتم. کەمێك شان بە شان و بێدەنگ لەگەڵم بەڕێکەوت، دوایی لەناکاو دەستی بە پێکەنین کرد.

– باشە، کەواتە ئەمجۆرەیە، ها؟ ئەگەر ئەتۆ بوایەی دوعات دەکرد!

وەستام و بە تووڕەییەوە سەیریم کرد:

– ئەمن نا، ئەمن نا، باوکم دوعای دەخوێند.

دیسانیش بە چاوی پڕ سەیرەوە سەیری کردم:

– باوکت؟

دووبارە دای لە قاقای پێکەنین و ئەمجارە ئیتر پێکەنینی لەرادەبەردەر بوو!

– باوکت؟ ئاخەی چەند سەیرە! دوعا کردنی باوکت، بەهۆی تۆ شتێکت شکاندووە!

– خەفە بە!

بەڵام ئەو نەیدەتوانی پێش لە خۆی بگرێت:

– وای، چەندە سەیرە، مێنش! ئەتۆ گوڵدانی بشکێنی و ئەوکات باوکات دەست بە دوعاکردن بکات! راستی کە رۆدۆلف پیرەکەی تۆ شێتێکی تەواو عەیارە!

قیژاندم:

- خەفە بە!
- شێتە ئیدی....

بە مشتی گرێدراو بە گیانی کەوتم و خۆم هاویشتە سەری. خۆی دزیەوە و ویستی خۆی بگرێتەوە، بەڵام لەسەر بەفر خلیسکا و سەراوبن کەوتە خوارێ و قاچێکی کەوتە ژێر قاچەکەی دیکەی. دەنگێکی وشك هات و قیژەیەکی جەرگبڕی لێهات و تیژایی ئێسقانی شکاوی چۆکی لەژێر پێستەوە هاتەدەر.

مامۆستا و سێ لە کەرەمیرزاکانی قوتابخانە بە هێواشی و لەسەرەخۆ دەستیان کرد بە راکردن. دوای ماوەیەکی کورت وێرنێریان لەسەر کوورسییەکی سێ کەسی درێژ کردبوو و منداڵەکان دەورەیان دابوو. ئەمنیش سەرلێشێواو سەیری ئێسکەکەم دەکرد کە چۆکی کوون کردبوو. وێرنێر رەنگی بە رووخساریەوە نەمابوو. چاوەکانی بەسترابوون و ئارام ئارام دەیناڵاند.

مامۆستا وتی:

- گێلی خەپەتۆڵە! چیت کردووە؟

وێرنێر چاوەکانی کردەوە. منی بینی و پێکەنی و وتی:

- رامکرد، کەوتمە خوارێ.
- چەندە پێم وتوون لەسەر ئەم بەفرانە رامەکەن؟

وێرنێر وتی: - بە عەردی کەوتم.

سەری کەوتەخوارێ و بوورایەوە. زگ زلەکان بە هێوری بەرزیان کردەوە و بردیان.

ئـەمنیش بەسـەر لێشێواوی لـە شـوێنی خـۆم وەسـتابووم. لـە گـەورەیی گوناه و تاوانەکەم لەپێ دەرهاتبووم. دوای ماوەیەکی کوورت چوومە لای مامۆستا، بەڕێکی وەستام و وتم:

– بێ زەحمەت، ڕێگەم پێدەدەی بچم بابە تالری ببینم؟

مامۆستا سەیرێکی من و سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و بە جووڵەی سەر وتی بەڵێ.

قادرمەی لای باکووری قوتابخانم گرت و هەر چوار قادرمە بە هەنگاوێك ڕۆیشتم. ترپەی دڵم زیاتر ببوو. کە گەیشتمە نهۆمی سێیەم بۆ لای چەپ سووڕامەوە. چەند هەنگاوێکی دیکەم نایەوە و لە دەرگایەکم دا.

دەنگێکی زەلام بە هاوارەوە وتی: – وەرنە ژووری!

چوومە ژووری، دەرگام داخست و ڕێك وەستام. بابە تالر لەنێوان هەورێك لـە دووکـەڵی جگـەرەدا بـوو. بـۆ ئـەوەی دووکەڵەکـە وەلانێـت، لەبـەردەم و چاوی جووڵەی بەدەستی دەکرد.

– ئەتۆی ڕۆدۆلف؟ چیت دەوێ؟

– بێ زەحمەت، بابە، دەمەوێ دان بە تاوان دابنێم؟

– ئەتۆ دووشەممە دانت بە تاوانەکانت ناوە؟

– گوناهێکم کردووە.

بابە تالر پێش خۆی سەیر کرد و بە دەنگێکی ئارام وتی:

– ئێستا کاتی نییە.

– تکا دەکەم بابە. کارێکی زۆر خراپم کردووە.

بە پەنجەی گەورەی دەستی ریشی خوراند و پرسی:

– چ کارێکت کردووە؟

- بێ زەحمەت بابە، دەمهەوێ بە شێوەی "دان پێدانانی فەرمی" پێتان بڵێم.
- بۆچی هەر ئێستا پێم ناڵێی؟

بێدەنگ بووم. بابە تالر مژێکی قووڵی لە پیپەکەی دا و بۆ کاتێکی کەم سەیری کردم:

- یانی ئەوەندە گرنگە؟

ڕەنگ و رووم سوور هەڵگەڕا، بەڵام هیچم نەوت.

بە پێکەنینێکی لەسەرەخۆ کە بە دەنگییەوە دیار بوو وتی: - باشە گوێم لێتە؟

سەیرێکی پیپەکەی کرد و داینایە سەر مێزەکەی و لەسەر کوورسی دانیشت. بەرامبەر بە ئەو بەچۆك داهاتم و لەسەرەتاوە تا کۆتایی باسی رووداوەکەم کرد و ئەویش بەوردی گوێی لێگرتم. چەند پرسیاری لێکردم. وەکوو کەفارە پێیسپاردم بیست جار پاتر و بیست جار "ئاوە"[11] بخوێنم و عەفووی کردم.

هەستایە سەرپێ و هەر ئەمجۆرەی چاوی تێبڕیبووم، پیپەکەی هەڵکرد.

- بۆ ئەوە بوو کە دەتویست دانپێدانانەکەت بە نهێنی بێت؟
- بەڵی بابە.

شانەکانی هەڵاویشت و دوایی چاوێکی توندی لێکردم و حاڵەتی رووخسار و دەم و چاوی گۆڕا:

- هانس وێرنێر وتی کە خەتای تۆ بووە؟
- نەخێر، بابە.
- چی وت؟

[11] - یەکێ لە دوعاکانی مەسیحییەکانە خەتاب بە حەزرەتی مریەم.

- وتی بە کەوتوومە خواریّ.

هەر ئەوجۆرەی کە چاوی تێبڕیبووم وتی:

- زوا زوا[12] کەواتە ئێستا تەنیا منم ئەم رووداوە دەزانم. منیش کە نهێنی پارێزم و زمانم بەستراوە.[13]

پیپەکەی لەسەر مێزەکە دانا و بە غەزەب و نفرەتەوە وتی:

- کەڵەك بازی وردیلە! کەواتە بەم شێوەیە فێڵکت پێکهێنا کە هەم ویژدانت ئاسوودە بێت و هەمیش تەمبیّ نەکرێی!

بە ناڕەحەتییەوە قیژاندم:

- نەخێر بابە! نەخێر! ئەمجۆرە نییە. بۆ راکردن لەدەست تەمبێ کردن نەبوو! لە قوتابخانە هەرچەند تەمبێم بکەن ئاساییە.

بە سەرسووڕمانەوە سەیری کردم:

- کەواتە بۆ چییە؟

- بۆ ئەوەیە کە نامهەویّ باوکم بزانیّ.

پەنجەی بردە ناو ریشی و بە دەنگێکی لەسەرەخۆتر وتی:

- ئاها، کەواتە بۆیە. یانی ئەوەندە لە باوکت دەترسێی؟

دووبارە دانیشتەوە و پیپەکەی دەست دایەوە و بۆ ماوەیەك لە بێدەنگیدا پیپەکەی کێشا:

- چیت لێدەکات؟ لێت دەدات؟

- نەخێر، بابە.

دەیویست پرسیاری دیکە بکات، بەڵام بڕیارەکەی گۆڕی و سەرگەرمی پیپ کێشان بوو، لە کۆتاییدا بە میهرەبانییەوە وتی:

---

12 - SO بەمانای کەواتە بە زمانی ئەڵمانی

13 - قەشە ناتوانیّ نهێنی ئەو کەسە ئاشکرا بکات کە نهێنی لای باس کردوە.

- رۆدۆلف!
- بەڵێ، بابە.
- بەمحاڵەشەوە واباشترە پێی بڵێی.

سەرتاپێ وەلەزە کەوتم.

- ئاخ! نا بابە! باوکم! ئەتۆ تۆ خوا!

هەستایە سەرپێ و بە سەیرەوە سەیری کردم.

- سەیرە! چییتە! ئەوە دەلەرزی! خۆ ناتهەوێ ببورێیەوە؟

شانەکانی گرتم و رایوەشاندم، دوو زلەی سەبری لێدام و بەریدام. چوو پەنجەرەی کردەوە و دوای کاتێکی کەم لێپرسیم:

- باشتر بووی؟
- بەڵێ بابە؟
- کەواتە دانیشە.

بەقسەیم کرد و خۆیشی لە ژوورەکە دەستی بە هەنگاونانەوە کرد و جاروبارەش بە سیلەی چاوی سەیری دەکردم و هەر پرتەپرتی بوو. دوایی پەنجەرەکەی داخست و زەنگ لێدرا.

- ئیتر ئێستا برۆ، با لە وانەکانت پاش نەکەوی.

هەستام و بۆلای دەرگا بەرێکەوتم.

- رۆدۆلف!

گەڕامەوە. لە پشت سەرم وەستابوو. بە دەنگێکی نەرم وتی:

- لەبارەی باوکیشت، هەرچۆنێك حەزت لێبوو ئاوا بکە.

چەند چرکەیەك دەستی لەسەر سەرم دانا، دوایی دەرگای کردەوە و بەدەری نام.

ئەوشەوە کاتێك ماریا دەرگای لێ کردمەوە زۆر بە سەبری وتی:

- مامە خۆشەویستەکەت **"فرانتس"** (Franz) لێرەیە.

بە گەرموگوڕی وتم:

- ئۆنیفۆرم (جلکی سەربازی) لەبەرە؟

مامە **فرانتس** ئەفسەرێکی ئاسایی بوو و وێنەکەی لە تەنیشت وێنەی ئەفسەرەکانی ناو تەلار (هۆڵ) نەدرابوو. بەم حاڵەوە من بە تەواوی حەزەوە خۆشم دەویست.

ماریا بە شێوەیەکی جددیانە وتی:

- بەڵێ، بەڵام تۆ نابێ قسەی لەگەڵ بکەی.

- بۆچی؟

_ **"هێر لانگ"** (Herr Lang) (ئاغای لانگ) قەدەغەی کردووە؟

بلوزەکەم دەرهێنا و هەڵمواسی و بینیم باڵاپۆشەکەی (کۆتەکەی) باوکم لە شوێنی خۆی نەماوە.

- باوکم لە کوێیە؟

- چووەتە دەرەوە.

- ئاخر بۆچی من نابێ لەگەڵ مامە **فرانتس** قسە بکەم؟

- کفری کردووە.

- چی وتووە؟

**ماریا** زۆر بە جددی وتی:

- ئیتر ئەوە هیچ پەیوەندی بە تۆوە نییە!

- دوایی بە شێوەیەکی ترسەوە وتی:

- وتوویەتی کە : کەنیسە تەنیا کەڵەك و کوڵەکە و هیچیتر نییە"!

لە چێشتخانە دەنگە دەنگێ هات. گوێم تیژ کرد و دەنگی مامە **فرانتس**م ناسییەوە.

ماریا وتی: – هەر بۆیەش هێر لانگ قەدەغەی کردووە کە تۆ قسەی لەگەڵ بکەی.

– دەتوانم بچم سڵاوی لێبکەم؟

– ماریا بە دوودڵییەوە وتی: – بێشك، بەحەیابوون هیچ کێشەیەکی نییە.

چوومە چێشتخانە. دەرگایەکەی کرابۆوە، وەستام و ڕێك ڕاوەستام.

مامە فرانتس دانیشتبوو. پێکێکی لەناو دەست دابوو، قۆبچەی جلە سەربازییەکەی کرابۆوە و قاچەکانی درێژ کردبووە سەر کورسی و دایکم بە بارودۆخێکی شاد و خەتاکار لەپەنای وەستابوو.

مامە فرانتس کە منی بینی، بە دەنگێکی بەرز وتی:

– دەی. ئەوەش جوجەقەشە! سڵاو جوجەقەشە!

دایکم بەشێوەیەکی ناڕەحەت وتی: – فرانتس؟

– ئەی دەبێ چی بڵێم؟ ئاها: دەبێ بڵێم "گەورەمیی بچکۆڵە؟ دەی باشە: سڵاو گەورەمیی بچکۆڵە!

دایکم وتی: – فرانتس!

گەڕایەوە لای من و نیگەرانی ئەوە بوو کە باوکم لەناکاو بێتە ژوور.

مامە فرانتس وتی: _ "واس دان" (Was denn) (ئەی چی)؟ ڕاستییەکەم وت ئیتر، "نیشت وار" (Nicht wahr) (مەگەر نا)؟

من هەر بەشێوەی ڕێك وەستابووم و سەیری مامە فرانتسم دەکرد.

دایکم زۆر بە وشکی وتی: – خێرا بچوو بۆ ژوورەکەت!

مامە فرانتس چاوێکی تروکاندم : – بابە دەقەیەك لێیگەڕێ!

پێکەکەی بۆلای من بەرز کرد و دووبارە چاوێکی لێتروکاندم و بە شێوازێکی سەیر کە من حەزم لێی بوو وتی:

– لێیبگەڕێن جاروبارە پیاوێکی دروست و حسێبی ببینێت!

دایکم وتی: – رۆدۆلف، برۆ بۆ ژوورەکەت!

بۆ دوایە گەڕامەوە لە مەمەڕەکەدا بەڕێکەوتم. لە پشتەوە گوێم لە دەنگی مامە فرانتس بوو کە دەیوت:

– "ئارمێس کیند" (Armes Kind) (منداڵە فەقیرە) قبوولْ ناکەی کە زۆر ناخۆشە ئەم منداڵە فەقیرە بە زۆرەملی بکریْ بە قەشە، ئەویش تەنیا سەبارەت بە مێردەکەت، لە فەڕەنسا.....

دەرگای چێشتخانە دەنگێکی لێوەهات و ئیتر هیچم گویْ لیْ نەبوو. دوایی گوێم لە دەنگی دایکم بوو کە پرتەپرتێکی کرد، کەچی نەمزانی چی وت و دووبارە گوێم لە دەنگی مامم بوو کە وتی: "کەڵەك و کووڵەکێکی بیْ مانایە و تەواو."

چونکە باوکم بڕیار بوو لە کۆبوونەوەی باوکانی قوتابیانی قوتابخانە بەشداری بکا، ئەو شەوە زووتر لە شەوانی دیکە خواردنمان خوارد. دوای خواردنی خۆراك لە ژووری خۆراکخۆری چۆکمان دادا و ڕێوڕەسمی دوعای شەوانەمان بەڕێوەبرد، باوکم کە دوعای تەواو کرد، رووی لە بێرتا کرد و وتی:

– بێرتا، ئەتۆ گوناهێکی گەورەت کردووە؟

– نەخێر، باوکە.

دوایی رووی کردە گێردا:

– گێردا، تۆ ئەمڕۆ هیچ گوناهێکت کردووە؟

– نەخێر، باوکە.

– من منداڵی گەورەی ماڵەوە بووم، هەر بۆیەش منی دەهێشتەوە بۆ ئاخر کەس.

– **رۆدۆلف، تۆ ئەمڕۆ هیچ تاوانێکت نەکردووە؟**

– **نەخێر، باوکە.**

**هەستایەسەرپێ و هەمووومان بێدەنگ بووین. کاتژمێرەکەی دەرهێنا، چاوی لە دایکم کرد و وتی:**

– **هەشتە، سەری کاتژمێر نۆ دەخەون!**

**دایکم بە سەر ئیشارەیەکی پێکرد کە بەچاوان. باوکم رووی لە ماریا خێگە کرد و وتی:**

_ **هەروەها ئەتۆ، "مادینە دامە"** (Madne Dame) **(خاتوونی من)**

**ماریا وتی: – بەڵێ ئاغا.**

**باوکم بە سەر مالاوایی لە هەمووومان کرد، رۆیشتە ناو مەمەڕەکە و بالاپۆشەکەی لەبەر کرد و کلاوەکەی لەسەری نا. ئێمە لە جێمان نەجوولاینەوە، ئاخر پێی نەوتبووین بجووڵێین. پێلاو و پەنجەوانەی رەشی لەبەر کرد و بۆ بەر دەرگای چێشتخانەکە گەڕایەوە و پێی وتین:**

_ **"گوتە ناخت"** (Gute Nacht) **(شەو خۆش).**

**سێ گوتە ناخت بە یەکەوە وترا و بە نەختێك درەنگەوە، "گوتە ناخت هێر لانگ" ماریا.**

**دایکم هەتا بەر دەرگا لەگەڵ باوکم رۆیشت، دەرگای بۆ کردەوە و خۆی کێشایە قەراغ کە تێپەڕێت. هەرچی نەبێ خۆ دایکم شایستەی گوتە ناختێکی ئاسایی بوو.**

**دە خولەکێك لە رۆیشتنم بۆ ناو جێگەوبان تێپەڕیبوو کە دایکم هاتە ژوورەکەم. وەستابوو و سەیری دەکردم، کە چاوەکانم کردەوە و جمگەیم گرت. کارێك کە بە خێرایی کارەبا بەڕێوەچوو، چونکە خێرا رووی لێوەرگێڕام و چرایەکەی کووژاندەوە. ئەوکات بێ وتنی تاکە وشەیەك**

دەرگای بەست و دەنگی هەنگاوەکانیم لە ناو مەمەڕەکە بیست کە دوور دەکەوتەوە.

لەدەنگی وێککەوتنی دەرگای ماڵەوە و دەنگی قوورسی هەنگاوی ناو مەمەڕ بەخەبەر هاتم. تیشکێکی توند بەچاوم کەوت. وام هەست کرد کە باوکم لەتەنیشت تەختەکەم وەستاوە، بەلاپۆش لەبەر و کڵاو لەسەر. بە دەستی جووڵاندمیەوە و بە تەواوی لەخەو هەڵیستاندم: لە راستیدا باوکم لەوێ بوو. وەستاو، سەرتاپێ رەش و بێ جووڵە و چاوەکانی ئاگری لێدەباری.

بە دەنگێکی ساردوسڕ وتی:

– هەستە!

چاوم لێکرد. لە ترسان هۆشم نەما.

– هەستە.

بە دەستی داپۆشراو لە پەنجەوانەی رەش، بە توورەییەوە بەتانییەکەی لەسەر لابردم؟

هەر جۆرێك بوو لە تەختەکە خزامە خوارێ و داهاتمەوە کە سەرپایەکانم بدۆزمەوە، بە پێ بۆ ژێر تەخت بەرپێیکردن و قیژاندی:

– هەر ئەمجۆرە وەرە!

چووە ناو مەمەڕ و منی خستە پێش خۆی و دەرگای ژوورەکەمی داخست و دوایی بە هەنگاوی قوورس بۆلای ژووری ماریا بەرێکەوت، بە توندی لە دەرگای دا و قیژاندی:

– ئاوف ئەشتەهەن! (هەستە سەرپێ).

دوایی لە دەرگای خووشکەکانمی دا:

– ئاوف ئەشتەهەن!

سەرەتا **ماریا** بەدیار کەوت. بەسەر و گوێلاکی پێچراو بە لەف (بیگودی) و کراسی سەوزی گوڵدار. سەیرێکی باوکمی کرد کە تەواو رەشپۆش بە کڵاوێك لەسەر و من کە بە پێپەتی دەلەرزیم؟

دایکم و خوشکەکانم لە ژوورەکانیان هاتنەدەر. هەموویان بە خەواڵوویی تووشی سەرسوورمان ببوون.

باوکم گەڕایەوە بۆ لایان و وتی:

- کۆتەکانتان لەبەر بکەن و وەرن!

چاوەڕوانیان بوو، بێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێت، بێ ئەوەی جووڵەیەك بکات.

ژنەکان لە ژوورەکانیان هاتنەدەر. باوکم بۆلای ژووری خواردن رۆیشت و ئێمەش بەدوای کەوتین. چرایەکەی پێکرد و کڵاوەکەی لەسەر هەڵگرت و وتی:

- دوعایەك دەخوێنین!

هەموومان چووینە سەر چۆك و باوکم دەستی بە دوعا خوێندن کرد. کوورە کووژابۆوە، بەڵام ئەمن لەگەڵ ئەوەیکە کراس لەبەر لەسەر کاشی سارد و سڕ چۆکم دادابوو، بە زەحمەت هەستم بە سەرما دەکرد.

باوکم وتی "ئامین" و هەستایە سەرپێ. شەق و رەق، پەنجەوانە لە دەست و بێ جووڵە و دێوئاسا.

بێ ئەوەی دەنگی بەرز بکات وتی:

- ئێرە "یەهوودا"[14]یەکی لێیە.

[14] - یەکێ لە لایەنگرانی مەسیح کە بە خیانەت جێگەی ئاشکرا کرد و ئێستا لە فەرهەنگی مەسیحدا بەمانای "خائین" دێت.

هیـچکەس جووڵـەی نـەکرد. هیـچکەس سـەری بـەرز نـەکرد و سـەیری باوکمیان نەکرد: – گوێت لێبوو مارتا؟

دایکم بە دەنگێکی نزم هەروەکوو لە قووڵایی چاڵێکەوە بێتەدەر وتی:

– بەڵێ، هاینریخ (Heinrich).

باوکم دووبارە وتی:

– ئەمـشەو، لـە کـاتی دوعـاکردن، هـەمووتان، گوێتـان لێبـوو، کـە لـە ڕۆدۆلفـم پرسی، تاوانێکی جێگەی، باست کردووە، ؟[15]

سەیری دایکمی کرد و دایکم بە جووڵەی سەر وتی بەڵێ.

– هەمووشتان، گوێتـان، لێبـوو. هـەمووتان، ڕێك گوێتـان لێبـوو، مەگـەر نا؟، کە ڕۆدۆلف وتی، "نا"؟

دایکم وتی: – بەڵی هاینریخ.

باوکم وتی: – ڕۆدۆلف، هەستە سەرپێ!

هەستام. لە تۆقی سەرم هەتا بەری پێم دەلەرزی!

– سەیری بکەن!

دایکم، خوشکەکانم، ماریا، هەموویان سەیری منیان دەکرد.

باوکم بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە وتی:

– کەواتە، وتی "نا"! بەڵام، ئەوە بزانن، کە تـەنیا چەند کاتژمێر، بـەر لەوەیکە، لە وەڵامی منـدا، بڵێ "نا"، کردارێکـی کـردووە، وەحـشیانە، کە مرۆڤ واق، دەمێنێ.

بە دەنگی سارد و سڕ بەردەوام بوو:

– لە هاوپۆلێکی لاوازی، خۆی داوە. قەڵەمی پێی، شکاندووە!

---

[15] - باوکم هەمیشە پچڕ پچڕ قسەی دەکرد و فاریزە زیادەکات بە مانای ئەم وەستانە دێت.

ئیتر پێویست بەوە نەبوو کە باوکم دووبارە بکاتەوە "سەیری بکەن" چونکە هەموویان چاویان لەمن هەڵنەدەگرت.

باوکم دەنگی بەرز کرد و وتی:

- دواتر، ئەم ئاژەڵە وەحشییە، هاتووە، لەنێوانمان دانیشتووە، نانەکەمانی خواردووە، و بێ ئەوەی، وشەیەك بڵێت، لەگەڵ ئێمە، دوعای کردووە.... دوعای کردووە!

رووی لە دایکم کرد و بە دەنگێکی بەکەمزانی پێی وت:

- ئەوەش، ئەو کوورەی، کە تۆ بە منت، داوە!

دایکم رووی وەرگێرا.

باوکم بە بێ رەحمی وتی:

- سەیری بکەن!

دایکم سەرلەنوێ سەیری کردم و لێوەکانی وەلەرزین کەوتن.

باوکم بە دەنگێکی رێك وتی:

- ئەوەش، کوورێك، کە لێرە، جگە لە چاکە، هیچیتری، فێر نەکراوە!

ئەوکات رووداوێکی سەیر رووی دا و ماریا زلە لەژێر لێوەکانی شتێکی وت.

باوکم خۆی راست کردەوە، چاوێکی پڕ لە تووڕەیی لێکردین و زۆر ئارام، ئارام و قوورس و بە زەردەخەنەوە وتی:

- دەی.. ئەگەر کەسێك، قسەی هەیە، بە دەنگی بەرز، بیڵێت!

ئەمن سەیری ماریام کرد، سەری دانەواندبوو، بەڵام لێوە ئەستوورەکانی بە ئارامی دەکرانەوە و بە پەنجە قەڵەوەکانی کۆتەکەی لوول دەدا. دوای کاتێکی کەم بە سەیرەوە گوێم لە دەنگی خۆم بوو کە وتم:

- دانم بە تاوانەکانم دانابوو.

باوکم بە دەنگێکی سەرکەوتووانە قیژاندی:

– هەواڵەکەیم هەیە!

سەیریم کرد و ئەویش بە تووڕەیی لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

– کەواتە ئێوەش بزانن، کە ئەم عیفریتە، دوای تاوانەکەی، دەچێت و یەکێ لە، قەشەکان، دەدۆزێتەوە، بە دەغەڵی، و نیشاندانی، پەشیمانی، داوای بەخشینی، لێدەکات، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەرچی وشەی، بەخشین، هێشتا لە گوێیدا، دەنگ دەداتەوە، بەڵام جەنایەتەکەی، لە باوکی، دەشارێتەوە و بەم، شێوەیە، ئەو رێزەی کە دەبێ، بۆ باوکی، دابنێت، دایناندێت و، ئەگەر من، من کە باوکی ئەوم، ئاگاداری، تاوانەکەی نەبام.....

بۆ کاتێکی کەم بێدەنگ بوو و بە دەنگی گریاناوی وتی:

– من کە، باوکی ئەوم، لەو کاتەی کە، لە دایك بووە، لە رووی خۆشەویستییەوە، بە جۆرێك، گوناهەکانیم، بە ئەستۆوە گرتووە، هەروەکوو ئەوەی، لە راستیدا، گوناهی خۆم بووە. بێ ئەوەی رووحم، ئاگادار بێت، مشکولۆزمی ئەو، دەبووم.....

لەناکاو دەستی بە قیژاندن کرد:

– بێ ئەوەی رووحم، ئاگادار بێت، مشکولۆزمە، دەبووم!

گەڕایەوە و بێ رەحمانە سەیری دایکمی کرد:

– گوێت لێمە، مارتا؟.... حاڵی بووی، تێگەیشتی، ئەگەر لەناکاو، ئاگادار نەدەبووم، کە کووڕت، چ گوناهێکی، کردووە، منی بەدەبەخت، دەبوایە، لە بارەگای خوای گەورە....

بە توندی لە سینگی خۆی دا:

- بێ ئەوەی رووحم، خەبەردار بێت، هەتا مردن، باری بێ رەحمی، و درۆزنایەتی، قورسایی دەکردە، سەر شانم!

- ئەوکات لەناکاو کەوتە سەرچۆك:

- خوایە، ئەوکات، چۆن ئەگەری ئەوە، هەبوو، عەفوم بکەی، لێم بووری، بمبەخشی؟

بێدەنگ بوو و دڵۆپ دڵۆپ فرمێسك بەسەر رووخساریدا دەباری. سەری لەنێوان هەر دوو دەستی گرت و خوار بۆوە و خولایەوە هەر دەتوت مەستە و بە دەنگێکی جەرگبڕ و پڕ لە ناڵە:

- خودایە، عەفوم بکە! خودایە بمبوورە! خودایە ببوورە!....

دوایی هەر وەکوو ئەوەی لەناو دڵیدا خەریکی دوعا کردن بێت. کەم کەم ئارامی گرت، سەری بەرز کردەوە و وتی:

- چۆك دابدە، و دان بە، تاوانەکەت بنێ، رۆدۆلف!

چۆکم دادا، دەستەکانم پێکەوە جووت کرد، دەمم کردەوە، بەڵام کەمترین دەنگم لێ نەهاتەدەر.

- گوناهەکەت، تاوانەکەت، دانی پێدابنێ!

- هەموویان سەیری منیان دەکرد. نائومێدانە فشارم بە خۆم هێنا. سەرلەنوێ دەمم کردەوە، بەڵام دیسانیش نەمتوانی کەمترین قسە بکەم. باوکم بە توندی هاواری کرد:

- ئەوە شەیتانە، شەیتانە کە ناهێڵێت، قسە بکات!

چاوم لە دایکم کرد و لە بێدەنگی، بە هەموو هێزێکەوە داوای یارمەتیم لە دایکم کرد.

ویستی رووم لێوەرگێڕێت، بەڵام نەیتوانی. ماوەیەکی زۆر ئاوا بە چاوزەقی سەیری کردم. دوایی نیگایەکەی پڕ لە سەیروسەمەرەیی بوو، رەنگ لە رووخساریدا نەما. بێ وتنی تەنیا وشەیەك بەربۆوە خوارێ.

زۆر بەخێرایی ئاگاداری ئەوە بووم کە روویدەدا: دیسانیش دەیویست لای باوکم بە تەنیا بمهێڵێتەوە!

ماریا جووڵەیەکی هاتی، کەقیژەی توندی باوکم بەرز بۆوە:

- مەجووڵێن!

ماریا بێ جووڵە مایەوە و دوایی بە لەسەرەخۆیی بە چۆکدا هاتەوە.

باوکم سەیری دایکمی کرد کە لەبەردەم ئەو کەوتبوو و بە جۆرێك پاڕانەوە وتی:

- سزا دەست پێدەکات.

سەیری منی کرد و بە دەنگێکی خەفە وتی:

- دان بە تاوانەکەت دابنێ!

بەڵام وەکوو ئەوە بوو کە شەیتان هەموو جەستەی منی داگرتبێ، چونکە هەرچی دەمکرد نەمدەتوانی لام تا کام هیچ شتێ بڵێم.

باوکم وتی: ئەوە ئیبلیسە، شەیتانە!

بێرتا رووخساری لەناو دوو دەستیدا شاردەوە و دەستی بە گریان کرد.

باوکم وتی: - خودایە! ئەگەر سزای خوداییە، ئێمەی گرتووەتەوە، کە کوورِی من، دوور بخەیتەوە، بە دەریای رەحمەتت، رێگەم پێبدە، جارێکی دیکە، گوناهەکەی، بە ئەستۆوە بگرم!

رووخساری پڕ لە ژان بوو، دەستەکانی تێکهاڵان و دواتر، ئەم وشانە زۆر لە ناڕێکی لە قوورگی هاتنەدەر:

– خودایە، سەبارەت، بە شکانی، قاچی هانس وێرنێر، داوای بەخشین، دەکەم.

ئیتر هیچکام لە قسەکانی کە تا ئەوکات وتبووی نەیتوانی کاریگەری لەسەر من دابنێت.

باوکم سەری بەرز کردەوە، نیگای پڕ لە ئاگرینی بەمندا گێڕا و وتی:

– دەعا بکەین!

خەریکی خوێندنی دوعای پاتر بوو. ماریا و خوشکەکانم بێ چرکەیەك درەنگ دەنگی خۆیان خستە پاڵ دەنگی باوکم. باوکم، سەیری منی کرد، دەمم کردەوە، بەڵام کەمترین دەنگ لە دەمم نەهاتەدەر. ئیبلیس هەموو جەستەی منی داگیر کردبوو. دەستم کرد بە جووڵاندنی لێوەکانم، کە یانی بە دەنگی لەسەرەخۆ دوعا دەکەم، لە هەمانکاتدا فشارم بە خۆم دەهێنا کە بیر لە وشەکانی دوعا بکەمەوە، بەڵام هەمووی بێ سوود بوو. نەمدەتوانی.

باوکم سەلیبێکی کێشایەوە، هەستا و چووە چێشتخانە، پەرداخێك ئاوی هێنا و رژاندیە سەر رووخساری دایکم. دایکم بە هێواشی جووڵەیەکی هاتی، چاوەکانی کردەوە و هەستایەسەرپێ.

باوکم وتی: – بڕۆن بخەون.

بەڵام کە من ویستم بڕۆم، بە دەنگێکی سارد وتی: – ئەتۆ نا، "ماین هێر" (Mein Herr) (گەورەم)!

دایکم بێ ئەوەی سەیرم بکات ئەوا چووە دەرەوە. خوشکەکانیش بەدوایدا. لەناو دەرگا ماریا گەڕایەوە، سەیری باوکمی کرد و ئارام و لەسەرەخۆ وتی:

– قەباعەتە، عەیبە!

ویستم هاوار بکەم: "ماریا" بەڵام دەنگم نەهاتەدەر. گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی بوو کە لەناو مەمەڕەکە لێم دوور دەکەوتەوە، گوێم لە دەنگی دەرگا بوو و من لە گەڵ باوکم بە تەنیا مامەوە.

گەڕایەوە و بەجۆرێك بە رقەوە سەیری کردم کە وامزانی لێم دەدات.

بە دەنگێکی نزم وتی:

– وەرە!

باوکم ژووری کاریی خۆی کردەوە. منی پێش خست و دەرگای داخست. چرای پێنەکرد. پەردەی پەنجەری کێشا. شەوێکی روون بوو و بانەکانی وێستگەی شەمەندەفەر بە بەفر داپۆشرابوو.

– دوعا بکەین.

لەژێر سەلیب چۆکی دادا. منیش لە پشت سەری ئەو چۆکم دادا. دوای کاتێکی کەم رووی تێکردم:

– دوعا ناکەی؟

چاوم لێکرد و بە سەر وتم "بەڵێ".

– بە دەنگی بەرز دوعا بکە!

ویستم بڵێم "ناتوانم"، بەڵام لێوەکانم وەکوو غونچەی نەپشکووتوو بوو. دەستەکانم بۆ قوڕگم برد، بەڵام کەمترین دەنگم لێ نەهاتەدەر.

باوکم، وەکوو ئەوەی بیهەوێ راموەشێنێ شانەکانی گرتم، بەڵام وەکوو ئەوە دەچوو ترسی لەوە هەبوو دەستم لێ بدات و خێرا بەریدام و بە نفرەتەوە وتی:

– دوعا بکە! دوعا بکە! دوعا بکە!

لێوەکانم جووڵاند، بەڵام دیسانیش بێ سوود بوو.

باوکم چۆکی دادا. نیونیگایەك لای من و چاوە روونەکانی لەمن بڕیبوو. بەم پێیەوە دەنگیٚ ئەویش دەرنەدەهات.

دوای کاتێکی کەم رووی وەرگەڕاندەوە و وتی:

– زۆر باشە، کەواتە لەناو دڵتدا دوعا بکە!

دوایی گەڕایەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی دوعای "**ئاڤە**"[١٦] ئەمجارە تەنانەت بۆ جووڵاندنەوەی لێوەکانیشم هیچ هەوڵێکم نەدا.

سەرم بەتاڵ بوو و داغ. ئیتر هەوڵی ئەوەم نەدا پێش لە لەرزینم بگرم. جار و بارە داوێنی کراسەکەم بە کەلەکەمەوە رێکدەکووشی.

باوکم سەلیبێکی بەخۆیەوە کێشا، گەڕایەوە سەیری منی کرد و بە دەنگێکی سەرکەوتووانە وتی:

– دوای ئەم رووداوە، رۆدۆلف، دەبیٚ ئەمەت، زانیبیٚ، یانی بێشك، زانیوتە، کە، ئەگەر ئێستاش، ئەگەری قەشە، بوونت هەبێت، ئیتر، ناتوانی ببی، بە میسیونر.... بەیانی ئەم شەوە نەخۆش کەوتم، بیٚ گویٚ و بیٚ هۆش کەوتمە ناو جێگەوبان. نە دەمتوانی قسە بکەم، لەسەر ئەم تەنیشتە دەیانهێنامە ئەم تەنیشتە، (رفادە)[١٧]یان پێدادەدام، ئاویان بە زارمەوە دەکرد، سەهۆڵیان لەسەر سەرم دادەنا و تەڕ و وشکیان دەکردمەوە. پەیوەندی من و بنەماڵەکەم بەس ئەوەندە بوو. ئەوەی کە منی خۆشحاڵ دەکرد ئەوە بوو کە کەسم نەدەناسییەوە. هەموویانم وەکوو بازنەیەکی سپی ناوپڕ دەدیت، بیٚ لووت و بیٚ چاو، بیٚ دەم و بیٚ موو. ئەم بازنانە

[16] دوعایەك کە بە وشەی ئاڤە Ave Maria دەست پێدەکات.

[17] - پارچەیەك قووماش تەڕ دەکەن و لەسەر سەری نەخۆشی دادەنێن بۆنەوەی گەرمای تا مێشك تووشی کێشە نەکات

دەهاتنە ناو ژوورەکەم و دەڕۆیشتن. لە هەمانکاتدا وزەوزێکیشم گوێ لێدەبوو کە یەکجۆر و بێ مانا بوون و زیاتر بە وزەوزی مێش و مەگەس دەچوون. بازنەکان دیار نەبوون، تەنها هێڵی دەوری بازنەکەم دەبینی و دەلەرزین. ئیتر لە هیچیان نەدەترسام، نە لە بازنەکان و نە لە دەنگەکان.

ڕۆژێکیان بە یارمەتی باڵنجەکان کە لە پشتیان دانابووم، دانیشتبووم و سەیری بازنەیەکم دەکرد کە لەسەر لێفەکەم دەجوولایەوە کە لەناکاو ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا، بازنەکە ڕەنگی گرت، سەرەتا ئەملا و ئەولا پەڵەیەکی زەردڕەنگ کە حاڵەتی سەرەکیتری هەبوو و واپێچوو کە تۆزقاڵێ دەلەرزێ دوو لەکەی سوور بەچاوەمەوە نووسا. دوایی، وێنە ئاشکراتر بوو و دووبارە تێکەڵ بۆوە. بۆ کاتێکی کەم ئومێدەوار بووم. ویستم سەر وەرگێڕم، کەچی بێ ئیختیار چاوم لە وێنەکە بڕیبوو. وێنەکە بە خێراییەکی ترسناک ئاشکراتر دەبوو. سەرێکی گەورە پەیدا بوو، بە دوو نەواری سوور لە دوولای و ڕووخسارێك بە خێرایی دروست بوو: چاوەکان و لووت و دەمێك پەیدا بوو و من لەناکاو خووشکم بێرتام ناسییەوە کە لە تەنیشت تەختەکەم لەسەر کوورسی دانیشتبوو و کتێبی دەخوێندەوە. دڵم بە جۆرێك لێیدا کە وتم هەر ئێستا دێتەدەر. چاوەکانم بەست. کاتێك کردمەوە، بەڵێ بێرتای خووشکم بوو.

ترسێك دایگرتم. لەسەر باڵنجەکان هەستام و بەر لەوەی بزانم چیم بەسەر هاتووە، لەسەرەخۆ، بە زەحمەت وتم: - ماری یا، لە، کوێیە؟

بێرتا بە سەیرەوە چاوی تێبڕیم، خێرا هەستایە سەرپێ، کتێبەکەی هاویشتە سەر عەرد و بە هەراوهووریا و قیژاندن لە ژوورەکەم چووە دەرەوە:

- ڕۆدۆلف قسەی کرد! ڕۆدۆلف قسەی کرد!

ئەوەنـدەی پێنەچـوو کـە دایکـم و بێرتـا و ئـەو خوشـکەکەی دیکـەم بـە هـەنگاوی بـڕۆم یـان نـەڕۆم هاتنـە ژوور و هـەر ئـەوجۆرەی کـە بـە ترسـەوە سەیریان دەکردم، لە خواروی تەختەکەم وشک بوون.

- رۆدۆلف؟
- بەڵی.
- دەتوانی قسە بکەی؟
- بەڵی.
- ئەمن، دایکتم.
- بەڵی.
- منت ناسییەوە؟
- بەڵی، بەڵێ.

بە ناڕەحەتی و بێ خووڵقی رووم وەرگێڕایەوە و وتم:

- ماریا لە کوێیە؟

دایکم بە پەشێوی وتی: — رۆیشتووە.

دڵم گیرا و دەستەکانم وەلەرزین کەوتن. گیانم دەرهات هەتا پرسیم:

- کەی؟
- هەر ئەو رۆژەی کە تۆ نەخۆش کەوتی.
- بۆچی؟

دایکم وەڵامی نەدایەوە. دووبارە دەستم بە قسە کردەوە:

- باوکم دەری کرد؟
- نا.
- بۆخۆی ویستی بڕوات؟
- ئەرێ.

- هەر ئەم رۆژەی کە من نەخۆش کەوتم؟
- ئەری.

کەواتە مارياش منی بە ئەمانی خوا بەجێهێشتبوو. چاوەکانم بەست؟

- حەز دەکەی من لە لات بمێنمەوە، رۆدۆلف؟

بێ ئەوەی چاو بکەمەوە وتم:

- نەخێر؟

دەنگــێ بەرپێدارۆیــشتنیم لــەناو ژوورەکــەدا بیــست. دەرمانــەکان لــەژێر تەختەکەم بوون. دایکم ئاخێکی هەڵکێشا و دوایی بە لەسەرەخۆیی لێم دوور کەوتەوە. دەنگی دەرگام بیست و من توانیم چاوەکانم بکەمەوە.

لەماوەی هەفتەکانی داهاتوودا، هەمووی لەفکری خیانتکاریی بابە تالر بووم، ئاخر بە تەواوی ئیمانم لەدەست دابوو.

دایکم رۆژانە چەند جارێك دەهاتە ژوورەکەم:

- ئەحواڵت باشترە؟
- بەڵێ.
- کتێبێ، شتێکت دەوێ؟
- نا نەخێر.
- حەز دەکەی خوشکەکانت بێنە لات؟
- نا نەخێر.

بێدەنگییەك ژوورەکەی دادەگرت و دایکم دەیوت:

- دەتهەوێ بۆخۆم لەلات بمێنمەوە؟
- نەخێر؟

دەرمانــەکانی لــە خــوارەوەی تەختەکــەم رێــك دەخــستەوە، باڵنجــەکانمی ساف دەکرد و بێ ئامانج لە ژوورەکەمدا بۆ ئەولا و ئەملا دەرۆیشت. لە

نێو پێڵوە نیوە بەستراوەکانم سەیرم دەکرد. کاتێك ئاوڕی دەدایەوە چاوم لە پشتی دەکرد و بە دڵەوە داوام لێیدەکرد کە: "بڕۆ دەی، بڕۆ دەی". ڕێگەی کە دەگرتەبەر و دەڕۆیشت هەستم بە خۆشبەختی دەکرد، هەر دەتوت پاڵەپەستۆی حەزی من پاڵی دەنا و ئەویش دەڕۆیشت.

شەوێکیان بەر لە خواردنی شەو هاتە ژوورەکەم. ناڕەحەت بوو و حاڵەتێکی گوناهکارانەی هەبوو. وەکوو جاران واینواند کە دەیهەوێ ژوورەکەم هەڵوەژێرێت، دوایی بێ ئەوی سەیرم بکات وتی:

- ئەمشەو حەز دەکەی چی بخۆی، ڕۆدۆلف؟
- هەر شتێ هەموو خواردیان.

چووە لای پەنجەرە و بێ ئەوەی ڕوو وەرگێڕێت وتی:

- باوکت وتی ئەمشەو خواردنی شەو لەگەڵ ئێمە بخۆی.

کەواتە مەسەلەکە ئەوە بوو!

زۆر وشك و بێحاڵ وتم: - باشە.

- دەڵێی بتوانی؟
- بەڵێ.

هەستام. ویستی یارمەتیم بدات، نەمهێشت. دوایی، بۆخۆم بە تەنیایی ڕۆیشتمە ژووری خواردن. لەناو دەرگا وەستام. باوکم و دوو خوشکەکانم لەسەر مێزی خواردن دانیشتبوون.

- سڵاو باوکە.
- سەری بەرز کرد، نەخۆش و تێکچوو دەهاتەبەرچاو:
- سڵاو، ڕۆدۆلف.

بەردەوام بوو و وتی:

- ئەحواڵت باشە؟

- بەڵێ باوکە.
- دانیشە.

دانیشتم و ئیتر هیچم نەوت.

خواردن کە تەواو بوو، باوکم کاتژمێرەکەی دەرهێنا و سەیری کرد و وتی:

- دەی، ئێستا دەعا دەکەین.

هاتینە سەر چۆك. کلفەت (کرێکاری ئافرەت)ی تازە لە چێشتخانە هاتەدەر و لەگەڵ ئێمە چۆکی دادا. ساردیی خشتی ژوورەکە خۆی هاویشتە ناو چۆك و جەستەم.

باوکم دەستی بە خوێندنی دوعای پاتر کرد. ئەمن بێ ئەوەی بچووکترین دەنگم لێوەبێ جووڵەم خستە لێوەکانم. سەیری کردم.

چاوەکانی قووڵ و پڕ لە غەم و ماندوو بوون. دوعاکەی بڕی و بە دەنگێکی خەفە وتی:

- بە دەنگی، بەرز دوعاکەت، بخوێنە، رۆدۆلف.

هەموو نیگایەکان بۆ لای من سووڕان. نیگایەکی دووروودرێژم لە باوکم کرد و بە هەوڵێکی زۆرەوە وتم:

- ناتوانم.

باوکم بە سەرسووڕمانەوە سەیری کردم:

- ناتوانی؟
- نەخێر، باوکە.

چەند ساتێکی کەم سەیری کردم و دوایی وتی:

- ئەگەر، ناتوانی، بە هێواشی، بیخوێنە.
- بەچاوان، باوکە.

دوعـا خوێندنـەوەی دەسـت پێکـردەوە و منـیش دووبـارە دەسـتم بـە جووڵاندنەوەی لێوەکانم کرد. فشارم بە خۆم دەهێنا کە بیر لە هیچ شتێکی دیکە نەکەمەوە.

دوای دوو رۆژ بـۆ قوتابخانـە گەڕامـەوە. هیـچکەس لـەبارەی رووداوەکـە هیچی پێ نەوتم.

لە کاتی پشووی بەیانیان دووبارە چوومە سەر هەنگاو ژماردنی خۆم. شەش جارێك مەودایەکەم پێوابوو کە کەسێك لەنێوان من و خۆر وەستا و سەرم کە بەرز کردەوە، بینیم **هانس وێرنێرە**.

– سلاو رۆدۆلف.

ئیهمـالم کـرد و بـەدوای کـاری خـۆم کـەوتم. ئـەویش شـان بـە شـانی مـن بەڕێکەوت. هەر ئەمجۆرەی کە هەنگاوەکانم دەژمارد، سەیرێکی قاچەکانیم کرد، بڵێی نەڵێی نەختێك دەشەلی.

– ئەمن دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم رۆدۆلف.

وەستام و وتم:

– هیچ قسەیەکەم لەگەڵ تۆ نییە.

نەختێك گوورزەرا تا وتی: – "زو" (So) (ئاوا) وەکوو ئەوەبوو کە لەوێ بە بزمار بیچەقێنن.

من دووبارە بەڕێ کەوتم و گەیشتمە دیواری نوێژخانە. **وێرنێر** ئێستاش هەر لەو شوێنە کە جێمهێشتووە وەستاوە. بۆ لای بەڕێ کەوتم. نەختێك دڵ بەشك مایەوە، دوایی لەسەر پاژنەی پێـی سووڕایەوە و دەورێکی لێدا و رێگەی گرت و رۆیشت.

هەمان رۆژ لە رێڕەوی قوتابخانە بابە **تالرم** بینی. بانگی کردم. وەستام و رێك بۆی وەستام.

- ئەوە تۆی!
- بەڵی بابە؟
- پێیان وتم زۆر نەخۆش بووی.
- بەڵی بابە.
- بەڵام ئێستا باشتری؟
- بەڵی بابە.

لە بێدەنگیدا، باش سەیری کردم. واپێدەچوو ناسینی من بەلایەوە سەخت و دژوار بوو.

- زۆر گۆڕاوی.

لە قسەکانی بەردەوام بوو:

- ئێستا تۆ چەندساڵتە، رۆدۆلف؟
- سێزدە ساڵ، بابە.

سەری راوەشاند.

- سێزدە ساڵ! تەنیا سێزدە ساڵ!

ریشی خوراند، زللەیەکی سەبری لێدام و رۆیشت. لە پشت سەریەوە چاوم لێیکرد. پت و پان و بەهێز بوو. وام بیر کردەوە "ئەمە خیانەتکارە" و رقێکی شێتانە هەموو ناخمی داگرت.

بەیانی ئەو رۆژە، دوای ئەوەی لە باوکم جیا بوومەوە و لە کۆتایی شەقامی "ئشلوس" سووڕامەوە، دەنگی پێیەکم لە پشت خۆم بیست.

- رۆدۆلف!

گەڕامەوە. هانس وێرنێر بوو. پشتم تێیکرد و بەڕێ کەوتم. بە هەناسەبڕکێوە وتی:

- رۆدۆلف، قسەم پێتە.

تەنانەت سەریشم نەسووڕاند.

– ئاخر بۆچی ئاوا ناحاڵی رۆدۆلف. دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.

هەنگاوەکانم خێراتر کرد.

– ئەتۆ تۆخوا ئاوا خێرا مەڕۆ رۆدۆلف، ناتوانم بەپێی تۆ بڕۆم.

خێراتـرم کـرد و ئـەو، بـە شەلەشـەل و بـە خێرایـی بەدوامـدا رایکـرد. لەگۆشەی چاوم سەیرم کرد و بینیم کە لەماندوویی سوور هەڵگەڕاوە و گلۆڵە بووە. بە هەناسەبڕکێ وتی:

– دەزانم.... دوای ئەو کارەی کە.... من لەگەڵتم کرد... سرووشتییە کە نەتهەوێ.... قسەم لەگەڵ بکەی.....

لەناکاو وەستام:

– ئەوکارەی کە تۆ لەگەڵت کردم؟

بە زەحمەت وتی: – من نا... کار، کاری "پیرەی" بوو..... "پیرە" بوو کە تۆی ئاشکرا کرد.

بە سەرلێشێواوی سەیرم کرد:

– کەواتە ئەو رۆیشتووە رووداوەکەی بە هەموو کەس وتووە؟

ویرنێر وتی:

– هەر ئەم شەوە! هەر ئەم شەوە چووە هەموویانی شڕی جنێو کردووە. لەنێوان ئەنجوومەنی باوکانی قوتابیان هێرشی کردووەتە باوکت و بابە تالر و لەپێش چاوی هەمووان پڕی جنێوی کردوون.

– ناوی منیشی هێناوە؟

– ئـەی چـی؟ تەنانـەت وتوویـەتی "ئەگـەر هەنـدێ وەحشی لـەنێوان قوتابییەکانن، دەبێ خێرا لە قوتابخانە دەر بکرێن!"

– قسەیەکی ئاوای کردووە؟

ڤێرنێر نەختێك بە خۆشحاڵی وتی:

– ئەریٚ. بەڵام ناڕەحەت مەبە، چونکە بەیانییەکەی بۆ بەڕێوەبەری نووسی کە خەتای بەفر بووە نە خەتای تۆ و حەز ناکات تۆ سزا بدرێی.

بە ئارامی وتم: – کەواتە ئەمجۆرە بووە!

بە نووکی پێڵاوەکانم خۆم خەریکی تاشینی سەهۆڵەکان کرد.

ڤێرنێر وتی: – تۆیان تەمبیٚ کرد؟

– نا.

بە دوودڵی و بڵێم و نەڵێم وتی:

– دەی، پی.... (دەیویست بڵێت پیرەی تۆ، بەڵام لەجێگەی خۆی پێش دەمی گرت) باوکت چی؟

بە توندی وتم:

– هیچی پیٚ نەوتم.

دوای ماوەیەکی کوورت سەرم هەڵێنا و یەك هەناسە وتم:

– هانس، سەبارەت بە قاچت داوای لێبوردن دەکەم.

ناڕەحەت بوو و بە پەلە وتی:

– هیچ نییە، هیچ نییە، خەتای بەفر بوو.

دیسان وتم:

– ئیتر بۆ هەمیشە دەلەنگی؟

بە پێکەنینەوە وتی: – ئەی وای، نا! ئەمە ..... (بەدوای وشە گەڕا) کاتییە. دەزانی؟ کاتی.

بە حاڵەتی شادی ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە و وتی:

– مانای ئەوەیە کە بۆ هەمیشە ئاوا نامێنمەوە.

بەرلەوی لەبەر هەیوانی قوتابخانە تێپەڕین بۆ لای من سووڕایەوە، پێکەنی و دەستی بۆ لای من درێژ کرد. سەیری دەستیم کرد و هەستم کرد دەبێتم بەستوویەتی. بە زەحمەتێکی زۆر وتم.

– تۆقەت لەگەڵ دەکەم، بەڵام دواتر قسەت لەگەڵ ناکەم.

بەسەیرەوە قیژاندی و وتی: – "**ئابێر مێنش**" (Aber mencsch) (بابە ئەی وەڵڵا) ئێستاش کە لێم دڵگیری.

– نا. لەتۆ دڵگیر نیم. هەر نامهەوێ لەگەڵ هیچ کەس قسە بکەم.

دەستم بە سەبری و بێ ئیرادە بردە سەرەوە، دەستم رێککوشی و بەخێرایی کێشامەوە. **وێرنێر**، بە سەیرەوە، لە بێدەنگیدا سەیری دەکردم.

– کوڕێکی سەیری، رۆدۆلف.

هەر ئەمجۆرە بۆ ماوەیەکی کەم سەیری کردم، دوایی پشتی تێکردم و رێگەی خۆی گرت و منیش وەستام هەتا لێم دوور کەووتەوە، ئەوکات خۆشم بەڕێکەوتم و چوومە ناو قوتابخانە.

تەواوی ئەم رۆژە و سەرتاسەری هەفتەی دواتر لە بیرکردنەوەی ئەم گفتوگۆیەدا بووم و لە کۆتاییدا ئاگاداری ئەوە بوومەوە کە جگە لە هەستی خۆم بەرامبەر بە بابە **تالر** هیچ شتێکی دیکە نەگۆڕاوە. ئیمانم لەدەست دابوو و زۆر بە باشیش لەدەستم دابوو.

باوکم یازدەهەمی مەی ١٩١٤ مرد، بەڵام هیچ لە رێورەسم و داب و نەریتی ماڵەکەمان نەگۆڕا. من هەموو رۆژ بۆ نوێژی بەیانی دەچووم. دایکم دووکانەکەی ئیدارە دەکرد و بارودۆخی ئابووریمان باشتر بوو. دایکیشم وەکوو باوکم نفرەتی لە بەرگدرووەکانی کلیمی بوو و دووریی لێدەکردن، بەڵام ئەوەی زانیبوو کە خۆپارێزی لە فرۆشتنی قووماش هیچ هۆکارێکی مەنتیقی نەبوو. لەوە بگووزەرێ کە دایکم هەندێ نرخەکانیشی

زیاتر کرد. ئەم نرخانە بەڕادەیەکی سەیر لە خوارێ بوون، یان بە رادەیەك کە بە قەولی مامە فرانتس، مرۆڤ بەم فکرە داوێ کە نەکا باوکم هەولی داوە بە دەستی خۆی مالی خۆی بفەوتێنێ.

هەشت رۆژ دوای مردنی باوکم، رۆژێك کە چوومە ناو کەنیسە، هەستم بە دلگرانییەکی زۆر کرد: جێگەی هەمیشەیی ئێمەیان گرتبۆوە. دوو ریز دواتر دانیشتم. نوێژ دەستی پێکرد. وشە بە وشە نوێژەکەم دەخوێند کە لەناکاو جۆرێك پەرت بوون رووی تێکردم. سەرم هەلێنا و تاقی بانەکەم سەیر کرد.

وام هەست کرد کە کەنیسە بەشێوەیەکی زۆر سەیر گەورە دەبێ و کوورسییەکان، پەیکەرەکان، ستوونەکان، بە خێرایی گەورە دەبن. لەناکاو وەکوو قوودییەك کە دیوارەکانی خواربێت، دیوارەکانی کەوتن. ئیتر جگە لە سەحرا هیچم نەدەدیت: بیابانێکی وەکوو بیابانەکانی ماە، چۆلٚ و هۆلٚ و بێدەنگ. دلەڕاوکی قوورگی گرتم. دەستم بە لەرزین کرد. هەڕەشەیەکی ترسناك بەناو هەوادا هەبوو. هەموو شتێك لە چاوەڕوانییەکی ترسناك و شووم سەهۆلی بەستبوو. وەکوو ئەوەیکە دونیا خراپ دەبوو هەتا تەنیا من تێدا بمێنمەوە.

زەنگێك دەنگی هات. چۆکم دادا و سەرم خوار کردەوە. هەستێك لە گەرما و توانایی لە بەری دەستم خۆی خزاندە جەستەم و هەموو شتێك وەکوو پێشووی لێهاتەوە.

گووزەرا؟

ئەم قەیرانە هەفتەکانی دیکەش دووبارە بۆوە. بەم ئەنجامە گەیشتم کە هەرکات لە کاروباری هەمیشییەم دوور دەکەومەوە ئەوا تووشی ئەم حالەتە دەبم. ئیتر غیرەتی ئەوەم نەدەکرد کە کەمترین جوولەش بکەم.

مەگـەر ئەوەیکـە بـە یەقینـەوە بمزانیبـا کـە جووڵـەکانم شـێوەی نۆرماڵیـان هەیە. کاتێك حەرەکەیـەکم دەکرد کـە حاڵـەتی نۆرمـاڵی نـەدەبوو، شـتێ لـە نـاو قـورگم دەگـیرا. چـاوەکانم دەبەسـت و ئـیتر غیرەتـی ئـەوەم نـەدەکرد سـەیری هـیچ شـتێ بکـەم. خـۆف و ترسـم لـەوە بـوو کـە لەبەرچـاوم هـەموو شتێك خراپ بێت و لەناو بچێت.

لە کاتێکی ئاوادا ئەگـەر لـە ژوورکـەی خـۆم بـام، خێـرا خـۆم بـە کارێکـەوە خەریك دەکرد. بۆنموونە خۆم خەریکی واکس کردنـی پێڵاوەکـانم دەکـرد. کـۆن کـۆن، دوایـی وەکـوو پێـشووی خۆیـانی لێدەهاتـەوە. بـۆنی واکـسم دەکرد و دوای ماوەیەکی کەم هەستی حەسانەوە رووی تێدەکردم. خۆم لە ئاسایش و حەسانەوەدا دەدیت.

شەوێك، پێش خواردنی نانی شەو، دایکم هاتـە ژوورەکـەم، منـیش خێـرا لەبەری هەستام.

- دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.
- بەڵی دایە.

ئـاخێکی هەڵکێـشا، دانیـشت. دانیـشتن هـەمان و مانـدوویی و شـەکەتی رووخساری هەمان.

- رۆدۆلف....
- بەڵی دایە.؟

رووی وەرگێرا و بە دوو دڵییەوە وتی:

- ئـەتۆ دەتهـەوێ هـەر ئـەمجۆرە هـەموو رۆژێ کاتـژمێر پێـنج بەخەبـەر بێیت و بچیتە نوێژکردن؟

دڵەڕاوكی بەرۆكی گرتم. ویستم وەڵام بدەمەوە، بەڵام دەنگم لێنەهات. دایكم بە خەیاڵی خۆی، پێشبەندی خۆی ڕاست كردەوە و وتی:

– وابزانم دەكرێ ڕۆژێك تا ڕۆژێكیش بۆ نوێژخانە بچی.

حەزم دەكرد بڵێم "نا"

دایكم لە گۆشەی چاوی بە سەیرەوە چاوی لێكردم و دیسانیش بە دەنگی بەشكەوە وتی:

– ماندوو دێیتە بەرچاو، ڕۆدۆلف.

– ماندوو نیم.

دوایی، دیسانیش لەژێر چاوی سەیری كردم و ئاخێكی هەڵكێشا و بێ ئەوەی سەیرم بكات وتی:

– دوعای شەویش.... فكرم كردەوە.... هەر كەس دەتوانێ بە حەزی خۆی لەژووری خۆی دوعا بكات.

– نا.

دایكم، نەختێك لەناو كورسی خۆی هێناوبرد و چاوەكانی درەوشانەوە. بێدەنگی ژوورەكەی داگرت و دواتر، بە دەنگی خۆشی وتی:

– ئاخر، بۆخۆشت كە.....

وام بیر كردەوە كە دەیهەوێ بڵێت: "خۆشت كە حەزت لە دوعا و موعا نییە"، بەڵام تەنیا وتی:

– ئاخر خۆشت دوعاكەت لەناو دڵت دا دەخوێنی.

– بەڵێ دایكە.

سەیری منی كرد. من بێ ئەوەی قسەیێ بكەم، ڕێك وەكوو ئەوكاتانەی باوكم ئەمری دەكرد وتم:

– بەهیچ شێوەیەك بڕیار نییە هیچ شتێ بگۆڕێت.

دوای ماوەیەکی کوورت ئاخێکی هەڵکێشا و بێ وتنی تاکە وشەیەك لە ژوورەوە چووە دەرەوە.

شەوێکی مانگی ئوت، لە ناوەڕاستی خواردنی شەو، لەناکاو مامە فرانتس هاتە ماڵمان. بە رووخسارێکی سادەوە و لەناو دەرگاوە بەشێوازێکی سەرکەوتووانە هاواری کرد:

- شەڕ دەستی پێکرد!

دایکم رەنگ و رووی لەبەردا نەما و لە شوێنی خۆی هەستایە سەرپێ و مامە فرانتس وتی:

- پێویست بەوە ناکات ئاوا رەنگ و روو بە رووخسارتەوە نەمێنێ. بەس سێ مانگ کۆتایی پێدێت، شاد و خۆشحاڵ دەستەکانی رێکخشاند و وتی:

ژنەکەم لە تووڕەییان خەریکە خوودی خۆی بخووات!

دایکم هەستایە سەرپێ و چوو عارەقی ئاڵباڵووی لە کەوەنتەر دەرهێنا. مامە فرانتس دانیشت، خۆی خستە ناو کوورسییەکە، قاچەکانی بە چەکمەوە بەرامبەر بەخۆی درێژ کرد. قوپچەی بلوزەکەی کردەوە و سەیری منی کرد و سەرخۆش و بەزمخۆش وتی:

- "**نا، یونگە**"! (Na Junge!) (دەی لاوە) تۆ چی دەڵێی؟

سەیرم کرد و وتم:

- خۆبەخشانە بەشداری دەکەم.

دایکم قیژاندی: - **رۆدۆلف**!

شەق و رەق، بە ردنگ و رووخسارێکی زەرد، شووشەی عارەقی ئاڵباڵوو بەدەست، لەپێش کەوەنتەرەکە وەستابوو.

مامە فرانتس سەیرێکی منی کرد و قیافەیەکی جددی بە خۆوە گرت:

- زۆر باشە، رۆدۆلف. خێرا بیرت لە ئەرکەکەت کردەوە.

رووی لە دایکم کرد و بەشێوەیەکی گاڵتەجاریەوە وتی:

- ئەم شووشەیە دابنێ ئیتر، دەیشکێنی.

دایکم شووشەکەی دانا: مامە فرانتس سەیری کرد و بە سادەییەوە وتی:

- خەیاڵت راحەت بێت و پشوویەك بدە، تەمەنی کەمە.

بەردەوام بوو کە:

- هێشتا کەمێکی ماوە. بەڵام تا بەو تەمەنە بگات ئەوا شەڕ کۆتایی پێهاتووە.

بێ ئەوەی شتێ بڵێم هەستام و چوومە ژوورەکەم و دەرگام لەسەر خۆم داخست و ئێستا مەگری کەی بگری.

چەند رۆژ دواتر توانیم بۆ ئەو کاتژمێرانەی کە وانەم نییە، وەکوو یارمەتیدەری برانکاردکێش لە رێکخراوی مانگی سوور، لەو گرووپەی کە ئەرکیان بەتاڵ کردنی بریندار لە شەمەندەفەر بوو، ناوم تۆمار بکەم.

ئەو حاڵەتە قەیراناوییەم بە تەواوی لەناو چوو. بە حەزەوە هەواڵی شەڕم لە رۆژنامەکاندا دەخوێندەوە. ئەو وێنانەی کە کووژراوی بە کۆمەڵی دووژمنی لە گۆڕەپانی شەڕدا نیشان دەدا، لە گۆڤارەکانم دەردەهێنا و لە دەوروبەری خۆم لە دیواری ژوورەکەم هەڵدەواسین.

دایکم، گلۆپێکی لە ئاودەست دابوو و ئەمنیش هەموو رۆژێ بەیانیان، پێش رۆیشتنم بۆ نوێژ، ئەو رۆژنامەیەی کە دوێنێ خوێندبوومەوە، سەر لەنوێ لەوێشدا دەمخوێندەوە. هەموو هەواڵی کردەوە خراپەکان و درۆی ناوشەڕی فەرەنسییەکان بوو بۆ ئەوەی شکست خواردنیان دەرنەخەن. لە نفرەتەوە سەرتاپێ وەلەرزە دەکەوتم. کاتێك سەرم بەرز دەکردەوە شەیتانم بەرامبەر بە خۆم دەدیت کە سەیری من دەکات. ئیتر لێی نەدەترسام و

**نیگای ئەوم بە نیگا وەڵام دەدایەوە. مووی خورمایی و چاوی رەش بوو. ناحەزی لە قەڵافەتی دەباری، موو بە موو بە فەرەنسییەکان دەچوو. قەڵەمێکم لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دەرهێنا و بە فشە و گاڵتەجاری لە ژێر وێنەکەم نووسی "دێر تویفل" (Der Teufel) (شەیتان) و لە سەرووی وێنەکەشم نووسی: "دێر فرانتزوزە" (Der Franzose) (فەرەنسایی).**

**دە خوولەك زووتر لە کاتی دیاریکراو دەگەیشتمە کەنیسە و جێگەم بۆ باوکم دەگرتەوە زادالمعادم لەژێر ئانشك دادەنا و دادەنیشتم و دەستەکانم لەسەر سینگم دادەنا. بە هەزاران شەیتان لەبەرچاوم خۆیان نیشان دەدا و دۆڕاو و سەرشۆڕ و بێ چەك بە کڵاوی فەرەنسەوییەکان کە دەستیان وەکوو تەسلیم بەرز کردبۆوە لە پێش چاوم ریزە دەرۆیشتن. بە زۆرەملێ ناچارم دەکردن جلکەکانیان دەربێنن و خوولێکی دیکە بسوورێن. ئەوکات بۆلای من دەنێردران.... ئەمنیش دانیشتبووم، بە کڵاو و چەکمەوە جگەرەیەکم دەکێشا. رشاشێکی بریقەدار لەناو قاچەکانمدا بوو و هەر ئەوەیکە لێم نزیك دەبوونەوە سەلیبێکم دەکێشا و تەقەم لێدەکردن. خوێن فڕقەی دەکرد و دەپڕژا. ئەوان بە ناڵەوە دەکەوتنە خوارێ. لەسەر سك بۆ لام دەخـــزان و داوای لێبوردنیـــان دەکـــرد. بـــە زەربـــی چـــەکمەکانم رووخساریانم ورد دەکرد و زیاتر تەقەم لێدەکردن. بەڵام شەیتانێکی زۆری دیکە دەردەکەوتن. هەر شەیتان بوو کە دەهاتنە دەرەوە. شەیتانەکان بە قیژە و ناڵەناڵەوە دەکەوتنە خوارێ. هەزاران هەزار شەیتان و منیش بە رشاشەکەم دەمدوورینەوە. دوایی لەناکاو هەموو شتێك کۆتایی پێدەهات. تەنانەت یەکێکیشیان زیندوو نەدەمایەوە. هەڵدەستام و لە دوو وشەدا ئەمرم بە سەربازەکانم دەکرد هەموویان بڕۆن. دوایی، پەنجەوانە بەدەست و چەکمە بەپێ و خاوێن و پاك بۆ سەر مێزی نانخواردنی ئەفسەرەکان**

دەچووم بۆ ئەوەی جامێك کۆنیاك بخۆمەوە. تەنیا بووم، خۆم بە دروست و توندرەو هەست پێدەکرد و زنجیرێکی بچووکی زێڕینم بە جمگەی دەستی راستەوە بوو.

ئێستا ئیتر بەهۆی ئەرکی "یارمەتیدەری برانکاردکێشی" و قۆڵبەستێك کە هەمبوو، لە وێستگەی شەمەندەفەر زۆر ناسراو بووم.

لە بەهاری ساڵی ١٩١٥ ئیتر لەوێ نەمام: هەر کە شەمەندەفەرێکی نیزامی (سەربازی) بەرێکەوت خۆم هاویشتە سەرێ و دەستێك منی بۆ لای خۆی راکێشا و تەنیا کاتێك بە فکری سەربازەکان گەیشت کە حاڵ و رۆژی من بپرسن کە لەنێوان ئەوانەدا بووم. مەبەستی منیان کە پرسی پێیانم وت دەمهەوێ لەگەڵ ئەوان بۆ بەرەی شەڕ بچم و کاتێك لە تەمەنی منیان پرسی و وتم "پازدە ساڵمە"، لە قاقای پێکەنینیان دا و فشەیان پێکردم و بە زلە و مشت بە سۆحبەت لە پشتیان دام. لە کۆتاییدا، یەکێکیان کە هەموویان "پیرە" بانگیان دەکرد وتی بەهەرحاڵ هەر لەگەڵ گەیشتنمان دەتگرن و بۆ ماڵێ دەتگەڕێننەوە. بەڵام رەنگە بۆم خراپ نەبێ کە لەم ماوەیەدا بزانم ژیانی سەربازی چۆنە و بەچاوی خۆم ببینم و تامەکەی بچێژم. ئاوا بوو کە لە نێوان خۆیان جێگەیەکیان بۆ من کردەوە و یەکێکیشیان لەتە نانێکی پێدام کە رەش و بۆن ناخۆش بوو و پیرە بە پێکەنینەوە وتی:

- بێسر "کا"بروت، ئەل سکاین بروت.[18]

[18] Besser k. – Brot al skein Brot -، نان "کا" باشتر لە بێ نانییە. پەندێکی پێشینیانی ئەڵمانییەکانە. کا بە مانای کەمپ و ئۆردوگا دێت.

بە چێژێکی زۆرەوە نانەکەم خوارد، دوایی سەربازەکان دەستیان کرد بە گۆرانی و سرود گوتن. سرروودەکانیان کاریگەرییەکی بەهێزیان لەمندا هەبوو.

بوو بە شەو. قولابی ناوقەدەکانیان کردەوە، یەقەکانیان کردەوە و قاچەکانیان درێژ کرد؟ لە تاریکایی ژووری شەمەندەفەر، بۆنی چەرم و عارەقە مێشکی سەری گرتبووم کە لەوانەوە بەرز دەبۆوە و بە ناچاری هەڵمدەمژی.

سەرەتای مانگی مارسی ١٩١٦ش بۆ جارێکی دیکە هەوڵم دا، کەچی سەرکەوتنێکی زیاتر لە جاری یەکەمی بۆ من نەبوو و هەر لەگەڵ گەیشتنم بۆ بەرەی شەڕ، گرتیانم و بۆماڵەوە بەڕێیان کردمەوە؟

ئیتر لەوکاتە بە دواوە هەر لەبەر دەرگای وێستگەی شەمەندەفەر پێشیان لێدەگرتم. لە نەخۆشخانەشەوە ئیتر منیان بۆ بەتاڵکردنی بریندارەکان نەنارد، بەڵکوو کاری خزمەتگووزاری ناو نەخۆشخانەیان پێسپاردم.



# ١٩١٦

لــە تــەلاری ژمــارە شــەش تێپــەڕیم و بــۆ لای راســت ســووڕامەوە، لــە دەرمانخانــە کــە تێپــەڕیم دووبــارە بــۆلای راســت ســووڕامەوە. ژوورەکــانی رائیــدەکان لــەم بەشــەدا بــوو. خێــراییم کــەم کــردەوە. "**ریتمایــستر**"[١٩] "**گــونتر**" (Gunther) وەکــوو هەمیــشە دەرگــای ژوورەکــەی کــراوە بــوو و دەمزانی کە ئێستا بە قەڵافەتێك کە هەر لــە تــەپڵی ســەریەوە هــەتا نــووکی پــێ بــرینپێچ کــراو لەســەر باڵنجــەکانی دانیــشتووە و چــاووی بڕیوەتــە مەمەڕەکە.

لەبــەر دەرگــا تێپــەڕیم و بــە گۆشــەی چــاو ســەیرم کــرد. بــە دەنگێکــی بروسکئاسا قیژاندی:

- "**یونگە**" (Junge) (جەوان – لاوە – دۆلاب)!

دڵم رووخا.

- وەرە!

ستڵ و تەلیس و دەسماڵەکانم لە مەمەڕەکە دانا و چوومە ژوورەوە.

- جگەرەیەکم بۆ داگیرسێنە.

ئەمن، "**هێر ریتمایستر**"؟(ئاغای ریتمایستر)

---

١٩ - ریتمایستر نەقیب لە بەشی سوارکاران.

– بەڵی، ئەتۆ، "**دۆمکوپف**" (Dummkopf) (گێلە – ئەحمەق)! مەگەر کەسی دیکە لەم ژوورەدا هەیە؟

لەم حاڵەدا هەر دوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی برینپێچەکانی ببینم.

وتم: – "**یاوول**" (Jawohl) (بەچاوان)، **هێر ریتمایستر**!

جگەرەم خستە ناو لێوەکانی و هەڵمکرد. بەدوای یەکدا سێ چوار جار قمی لێدا و وتی:

– "**راوس**" (Raus) (بیهێنەدەر)!

زۆر بە جوانی جگەرەکەم لەدەمی هێنایەدەر و چاوەڕوان مامەوە. **ریتمایستر** چاوی گەشایەوە و زەردەخەنەیەکی هاتێ. دەمویست بیروڕای خۆم دەربڕم سەبارەت بەم هەموو برینپێچەی کە لە تۆقی سەریەوە هەتا نووکی پێی کرابوو، پیاوێکی زۆر جوان بوو و غیرەت و ورەبەرزی لەناو پێکەنینەکەیدا بەدی دەکرا کە مامە **فرانتس**ی بەبیر دەهێنامەوە.

ئەمری کرد: – "**راین**"! (Rein) (داینێوە – ئێرە).

جگەرەکەم خستە ناو دەمی و چەند جار هەڵیمژی.

– **راوس**!

جگەرەکەم لە دەمی دەرهێنایەوە. لە بێدەنگیدا بەباشی سەیری کردم و دوایی وتی:

– ناوت چییە؟

– **رۆدۆلف**، **هێر ریتمایستر**.

بە خۆشرووییەوە وتی:

_ ئێ، **رۆدۆلف**، ئەمجۆرەی پێدەچی تۆ بە چڵمنیی "**پاول**" (Paul) نی، ئەم گوێلکە، هەرکات جگەرەم بۆ پێدەکا، لانی کەم نیوەی جگەرەکە دەسووتێنێ. هەروەها جارێك نەبووە بانگی بکەم و لێرە بێت.

ئیشارەی کرد کە جگەرەکە دانێمە ناو لێوەکانی. قمێکی لێدا و وتی:

– راوس!

سەیری کردم.

– لەکام کوونەوە دەریانهێناوی بچکۆڵە؟

– لە قوتابخانە، **هێر ریتمایستر!**

– کەواتە، دەتوانی بنووسی؟

– بەڵی، **هێر ریتمایستر.**

– دانیشە نامەیەك بۆ ئەسوارانی (سوارکاران) من بنووسە.

بەردەوام بوو و وتی:

– دەزانی ئەسوارانی من لەکوێن.

– تەلاری ژمارە هەشت، **هێر ریتمایستر.**

رەزامەندانە وتی:

– زۆر باشە، دایشە.

لە پشت مێز دانیشتم. دەستی بە وتن کرد و نووسیم. کە تەواو بوو، نامەکەم بردە لای. هەر ئەمجۆرەی کە دەیخوێندەوە سەری رادەوەشاند. دوایی وتی دانیشم و شتێکی دیکەی پێوە زیاد بکەم، کە دەنگی سەرپەرستار (نێرس) لە پشت سەرمەوە بەرز بۆوە:

– تۆ لێرە چی دەکەی **رۆدۆلف؟**

هەستامە سەرپێ. نێرس، بالابەرز و زەلام، بە مووی ساف و زەرد، دەستەکانی لەسەر سینگی دانابوو و بە حاڵەتێکی جددی لەناو دەرگا وەستابوو.

**ریتمایستر گونتر** بە تووڕەیی سەیری نێرسی کرد و وتی:

– **رۆدۆلف** بۆ من کار دەکات.

نێرس بێ ئەوەی سەیری بکات وتی:

– **رۆدۆلف**! من ئەمرم پێکردی کە تەلاری ژمارە دوازدەهەم خاوێن بکەیەوە. لێرە ئەمر ئەمری منە و بەس!

**ریتمایستر گونتر** کە پێدەکەنی بە ئەدەب و حەیا و رێزەوە هاتەدەر و وتی:

– **ماین گندیگە** (خاتون)! **رۆدۆلف** تەلاری دوازدە خاوێن ناکاتەوە. نە ئەمرۆ، نە بەیانی!

سەرپەرستار تەواوبالا بۆ لای ئەو سووڕایەوە و وتی:

– **"زو"** (نا بابە) ... ئێ، دەتوانم هۆکارەکەی بپرسم **هێر ریتمایستر؟**

– **هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو لەمڕۆوە لە خزمەت من و ئەسواران دایە...، بەڵام پاول** .... ئەگەر حەزتان لێبێت، ئەو دەتوانێ تەلاری ژمارە دوازدە خاوێن بکاتەوە **"ماینەگنەدیکە"**.

سەرپەرستار باڵای راست وەستا و زۆر بە وشکی وتی:

– هیچ سکاڵایەکت لە **پاول** هەیە؟

– دیارە، **"ماین گندیگە"** لە **پاول** ناڕازیم. دەستەکانی زۆر پیسە، بەڵام دەستەکانی **رۆدۆلف** خاوێنن. **پاول** وەکوو دێو جگەرە دادەگیرسێنێ، بەپێچەوانە **رۆدۆلف** بە جۆرێک جگەرە پێدەکات کە پیاو چێژی لێوەردەگرێت. دەستخەتی **پاول** وەکوو هی جنۆکەکانە، بەڵام **رۆدۆلف** وەکوو مانگ دەنووسێت. بەم هەموو هۆکارە **ماین گندیگە** و بەم هۆیە کە ئەو هیچکات لێرە نییە و دیار نییە لەکام جەهەنەمە، **پاول** دەتوانێ بڕوات و خۆی لەدار بدات. **رۆدۆلف** هەر لەمڕۆوە لە خزمەت من دایە.

ئاگر لە چاوەکانی سەرپەرستار دەباری.

– دەکرێ لە **هێر ریتمایستر** بپرسم کێ ئەم بڕیارەی داوە؟

- ئەمن، بۆخۆم.

سەرپەرستار کە سینگی بە توندی دەهاتەسەر و دەچووەخوار، قیژاندی:

- هێر ریتمایستر! دەمهەوێ یەکجار بۆ هەمیشە ئەوە بزانی کە لێرە تەنیا من لەسەر ئەرکی ئەمانە بڕیار دەدەم.

- نا بابە!

بە پێکەنینەوە و بە توورپییەوە بەجۆرێك سەیری سەرپەرستاری کرد هەر وەکوو ئەوە دەچوو رووتی دەکاتەوە.

سەرپەرستار بە دەنگێك کە غەزەبی لێدەباری و دەلەرزی، وتی:

- یاڵڵا رۆدۆلف، بەدوام کەوە، خێرا بەدوام کەوە!

ریتمایستر گونتر بە دەنگێکی ئارام وتی:

- دانیشە رۆدۆلف.

من سەیریانم دەکرد. جارێك ئەو و جارێك ئەمیان و بە دوودڵی مابوومەوە.

سەرپەرستار قیژاندی:

- رۆدۆلف!

ریتمایستر هیچی نەگووت. هەر پێدەکەنی، وەکوو ئەوە دەچوو کە لەگەڵ مامە فرانتس سێوێك بێت کە لەناوەڕاستەوە دوولەت کراوە.

سەرپەرستار بە دەنگێکی پڕ لە کینە قیژاندی:

- رۆدۆلف!

دانیشتم. ژنەتیوە لەسەر پاژنەکانی سووڕایەوە و لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

ریتمایستر بە دەنگێکی بروسکئاسا قیژاندی:

- دیار نییە ژەنەتیوێکی لەندەهۆری موو زەرد بەم شەق و رەقییە لەناو جێگە و بان چەند ئازایە! نابێ زۆر ئازا بێ ها؟ تۆ چۆن بیر دەکەیەوە رۆدۆلف؟....

روژێك دواتر سەرپەرستار گۆڕدرا و من بە تەواوی لە خزمەت ریتمایستر گونتر و سوارکارانی دابووم.

رۆژێك کە سەر لەبەیانی ژوورەکەیم رێکدەخست، لە پشت سەرمەوە وتی:

- هەندێ شتم لەبارەی تۆ بیستووە!

گەڕامەوە. زۆر بە جددی سەیری دەکردم. شتێك لەناو قورگمدا کۆ بۆوە.

- وەرە ئێرە.

لە تەختەکەی نزیك بوومەوە. لەسەر باڵنجەکانی سووڕایەوە بۆ ئەوەی تەواو رووبەڕووی من بێت.

- وابزانم لە کار لە وێستەگە کەڵکی بێجێت وەرگرتووە و دووجار خۆت خستووەتە ناو شەمەندەفەرێك کە چووەتە بەرەی شەڕ. راستە؟

- یا، هێر ریتمایستر.

بۆ کاتێکی کەم لە بێدەنگیدا سەیری کردم:

- دانیشە!

جگە لەو کاتەی کە نامە بۆ ئەسوارەکان بنووسم، هیچکات لە پێشی دانەنیشتبووم، دڵ بەشك مامەوە.

- دانیشە، دۆمکوپف!

کورسییەکەم کێشایە نزیك تەخت، دانیشتم، ترپەی دڵم زیاتر ببوو.

- جگەرەیەك هەڵگرە.

جگەرەیەکم دەست دایە و بۆ لای ئەوم درێژ کرد، دەستی گێڕامەوە و وتی:

– بۆ خۆت.

شەپۆلێك غرور و خۆ بەزلزانی دایگرتم. جگەرکەم نایە ناو دەمم و دامگیرساند، چەند قمم لێدا و کەوتمە کۆخەکردنەوە. ریت مایستر کە سەیری دەکردم، دەستی بە پێکەنین کرد. لەناکاو بەخۆی هاتەوە و وتی:

– رۆدۆلف! من بە تەواوی ئاگادارت بوومە. تۆ ئێستا زۆر لاوی. ئەوەندە توانات نییە. قسەش ناکەی، بەڵام بەهۆشی. وانەت خوێندووە و هەر کارێکی بەرێوەی دەبەی، بەجۆرێك بەرێوەی دەبەی کە پیاو چاوەڕوانە لە "ئەڵمانییەکی باش" بەرێوەی ببات، یانی بە "کامڵی"!

ئەم رستەیەی رێك وەکوو باوکم وت و تەنانەت وام هەست کرد بە دەنگی باوکم گوێم لێیبوو.

– کەواتە تۆ کوڕێکی بە غیرەت و بە هیمەتی کە ئاگاداری ئەرکێتی بەرامبەر بە ئەڵمانیا.

– یا، هێر ریتمایستر.

دەستم بە کۆخینێکی زۆر کرد.

سەیری کردم و پێکەنی و وتی:

– ئەگەر ناتەوێ جگەرە بکێشی، مەکێشە رۆدۆلف.

– سوپاس هێر ریتمایستر.

جگەرەکەم خستە ناو ژێرجگەرەکە و بە هێوری و لەسەرەخۆیی کوژاندمەوە. "عەقید" لە بێدەنگیدا سەیری منی دەکرد. دوایی دەستی کە بە تەواوی برینپێچ کرابوو، بەرزی کردەوە و وتی:

– رۆدۆلف.

- **یا، هێر ریتمایستر؟**
- ئەوەیكە ویستووتە لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بچی بۆ بەرەی شەڕ، زۆر باشە.
- **یا، هێر ریتمایستر.**
- ئەوەیكە جارێك شكستت خواردووە، بەڵام سەرلەنوێ دەست بەكار بوویتەوە زۆر باشە.
- **یا، هێر ریتمایستر.**
- كاركردن لێرە زۆر باشە.
- **یا، هێر ریتمایستر.**
- بەڵام لە هەمووی باشتر رۆیشتنە ناو سەوارەنیزامە! (سەربازی ئەسب سوار)

شڵەژام و دەست و پێی خۆم وون كرد، هەستامە سەرپێ:

- ئەمن، **یا، هێر ریتمایستر؟**

بە توندی قیژاندی:

- دانیشە! كێ ئەمری پێكردی هەستیتە سەرپێ.

بە رێكی بەرامبەری وەستام و وتم:

- **یاوول، هێر ریتمایسترا**

دانیشتم.

دوای ماوەیەكی كوورت وتی:

- ئێ، لەمبارەوە چۆن بیر دەكەیتەوە؟

بە دەنگێكی لەرزۆك وەڵامم دایەوە:

- تكایە، هێر ریتمایستر هەر ئەوەندە دەزانم كە زۆر سادە و موعجیزەیە!

بە چاوێکی پڕ لە غرورەوە سەیری کردم، سەرێکی جوولاند و دوو سێ جار دووبارەی کردەوە:

– کە زۆر سادە و موعجیزەیە!

دوایی بەشێوەی جددی، بەڵام بە موحەبەتەوە و بە هێواشی وتی:

– زۆر باشە **رۆدۆلف**، زۆر باشە.

ترپەی دڵم گوێ لێدەبوو. بێدەنگییەك روویدا و **ریتمایستر** وتی:

– **رۆدۆلف**، من بڕیارم داوە هەر کە برینەکانم ساڕێژ بوونەوە، فەوجەکەم پێکبێنم....

بەردەوام بوو و وتی:

– بۆ یەکێ لە جیبهەکانمان.... پێش رۆیشتنم نیشانەی سەربازخانەت دەدەمێ، خۆت لەوێ بە من بناسێنە، باقییەکەی خۆم چارەی دکەم.

لە تۆقی سەرم هەتا نووکی پێم وەلەرزە کەوت و وتم:

– یا، هێر ریتمایستر دوایی، خێرا فکرێکی ترسناك هاتە ناو مێشکم. بە تەتەپەتە وتم:

– بەڵام، **هێر ریتمایستر**، ئەوان وەرم ناگرن، ئاخر من شازدە ساڵم تەواو نەکردووە.

**ریتمایستر** بە پێکەنینەوە وتی:

– "**ئاخ واس**" (Ach Was) (عەجەبا)! وا نییە لە شازدە ساڵی تەمەنی مرۆڤ ئامادەیە بۆ شەڕ. ئەمەش لە یاسای گێلانەیان! بەڵام تۆ نیگەرانی هیچ شتێکی مەبە **رۆدۆلف**، بۆخۆم جێبەجێی دەکەم!

لەسەر باڵنجەکان هەستایە سەرپێ. چاوەکانی دەدرەوشانەوە، روو بە دەرگا هوتافێکی کێشا:

– سلاو، جوانکەڵەی من!

ئـاوڕم دایـەوە، پەرسـتارە (نێـرس) جـوان و مـوو زەردەکـەی هـاتبوو. دەستەکانم لە رووشۆری ژوورەکەدا شووشت و لە کردنەوەی برینـەکانی **ریتمایستر** هاوکاریم کرد. کارەکە ماوەیـەکی تـەواوی گرت. لـەم ماوەیـەدا **ریتمایستر** کە هەروەکوو ئەوە لە راستیدا حەساسییەتی بەرامبەر بە ژانـی برینـەکان لەدەسـت دابـوو، بـۆ چـرکەیەکیش وازی لـە سـۆحبەت و گاڵتەجاری نەهێنا. نێرسەکە سەر لـەنوێ وەکوو مەیتێکی مومیـایی کـراو برینپێـچی کـرد. عەقیـد بـە دەسـتی برینپێـچکراو روومـەتی نێرسـی بـەرز کردەوە و بە شێوەیەکی نیوەجددی و نیـوە سۆحبەت لێـی پرسـی کـەی دەیهەوێ "بڕیار بدات، "**هێرگوت**" (خوایە)، کە لەگەڵی بخەوێ؟"

نێرسەکە وتی:

– ئاخ! بەڵام ئاخر، **هێر ریتمایستر**، ئەمن کە بڕیارێکی ئاوام نەداوە.

"عەقید" کە بەشێوەیەکی پێکەنیناوی سەیری دەکرد وتی:

– چۆن مەگەر؟ حەز بە من ناکەی؟

کچەکە بە پێکەنینەوە وتی:

– "**دوخ دوخ**" (Doch Doch) (بۆچی بۆچی)! **هێر ریتمایستر!** ئەتۆ پیاوێکی زۆر جوانی!

دوایی بە دەنگێیکی تەواو جددی لە قسەکانی بەردەوام بوو:

– بەڵام ئەمکارە گوناهە.

عەقید بە بێ خووڵقی وتی:

– ئاخ واس! گوناه! چ قسەیەکی گێلانەیە!

ئیتر تا کۆتـایی کـار ددانـەکانی لێکنـەکردەوە. کاتێـك کچەکە لـە ژوورەکە چووەدەرێ، بە تووڕەییەوە رووی لە من کرد و وتی:

- گوێت لێبوو ڕۆدۆلف؟ چ كچێكی گێلە! كچ ئەوەندە جوان بێت وباسی گوناه و تاوانم بۆ بكات! "**هێرگوت**" گوناه! چ گێلانه! ئەوه لەو قسە سەیروسەمەرانەیه كە "**فافێن**" (Pfaffen) (قەشە)ەكان خستوویانەته ناو مێشكیان! ئەڵمانییه جوانەكانی ئێمه ئاوا دەخەڵەتێنن! بەرازه بێ شەرەفەكان، پارەیان لێ دەستێنن، كەچی باس لە گوناهباری و تاوانباری دەكەن. تازه هەرچەند ئەم ئەسپێیانه خوێنی ئەمانه زیاتر بمژن، دۆمكوپفەكانی ئێمه رازیتر دەبن. ئەسپێن، **ڕۆدۆلف**، ئەسپێ! ئەوانه لە جندۆكەكانیش خراپترن! ئەگەر دەكەوتنه ناو چنگی من، **هێرگوت**، ڕۆژگاریانم ڕەش دەكرد! گوناه!...."**هەر كه به دونیا هاتن، هەر هەمان كات گوناهێك به حسێبی ئێوه دەنووسرێت!؟** بەم قسه قێزەونانه ئەڵمانییه باشەكانی ئێمه كەر دەكەن. ئەویش به ترسەوه، ئەوكات ئەم گێلانه بەجۆرێك دەخەرفێن كه ئیتر ناوێرن بەیەكەوەش بخەون. لەجیاتی ماچ و مووچ و بەیەكەوه خەوتن چۆك دادەن و — خوایه چەندە گوێلكن! — دوعا و نوێژ دەكەن و لە سینگیان دەدەن: "خوایه بمانبووره، ئەی كەریم! بمانبووره، ئەی ڕەحیم!"....

بەجۆرێك لاسایی تۆبەكارێكی دەكردەوه كه وامزانی بۆ كاتێكی كەم باوكم دەبینم!

- "**دونێر وێتر**"[20]! عەجیب گێلایەتییەكه! یەك گوناه، یەك گوناەمان زیاتر نییه ڕۆدۆلف. باش گوێ بگره چی دەڵێم. ئەو گوناهه، ئەو تاوانه ئەوەیه كه **مرۆڤ ئەڵمانییەكی باش نەبێت**. ئەگەر گوناهێك هەبێت ئەمەیه و بەس! من كه "**ڕیتمایستر گونتر**"م ئەڵمانییەكی باشم. كارێك كه **ئەڵمانیا** پێم دەڵێت، دەیكەم! كارێك كه سەركردەكانی ئەڵمانی پێم دەسپێرن،

[20] - (Donner wetter) بروسك! (لێرەدا بەمانای ئەوەی دێت كه بروسكه لێتان دات).

دەیکەم! وەسەلام و تەواو! ئیتر دواتر نامهەوێ ئەم ئەسپێیانە خوێنم بمژن!

لەسەر باڵنجەکان خۆی رێکخست، بە قەڵافەتێکی بەهێز بۆلای من سووڕایەوە و بە چاوی درەوشاوە کە هیچکات ئاوا بە جوانیم نەدیتبوو. دوای ماوەیەك حەزی کرد هەستێت و بە کەڵك وەرگرتن لە شانەکانی من لە ژوورەکەدا چەند هەنگاوێك بەرێدا رۆیشت. دووبارە گاڵتەجاری و سۆحبەتی پەیدا کردبۆوە و لەسەر هیچ و پوچ قاقای لێدەدا.

– بڵێ بزانم رۆدۆلف، لێرە لەبارەی من چی دەڵێن؟

– لێرە، لە نەخۆشخانە؟

– یا، دۆمکوپف! لە نەخۆشخانە. ئەی وادەزانی لە کوێین؟ نەختێك پاڵەپەستۆم خستە سەر هزرم؟

– دەڵێن ئەتۆ یەك قارەمانی راستەقینەی ئەڵمانی، **هێر ریتمایستر**.

– ئاه، ئاه! ئاوا دەڵێن؟ دەی، چیتر؟

– زۆرش بەتام و شیرینی، **هێر ریتمایستر**.

– چیتر؟

– ژنەکانیش دەڵێن کە ئەتۆ....

– چی؟

– هەر دەبێ بیڵێم **هێر ریت مایستر**؟

– بێشك **دۆمکوپف**؟

– لەو زمان لووسانەی کە بە ئاسانی دەتوانی سەرنجیان راکێشی.

– ئاها ئاها! راستە ئەوەیان راستە. نیشانیان دەدەم!

– هەروەها.... دەڵێن تۆ پیاوێکی بە هەیبەتی.

– چیتر؟

- هەروەها دەڵێن تۆ سەربازەکانی خۆت زۆر خۆش دەوێت.

ئەمەشیان راست وتوە، وامزانی لە گوێبیس بوونی ئەم مەسەلەیە زۆر خۆشحاڵ دەبێ، بەڵام بەپێچەوانە، تێکچوو.

- زۆر جوانە! چەندە گێلن! "**سەربازەکانم خۆش دەوێ!**" ئەوەش لەو ئیحساساتە گێلانەیە. دەبێ لە هەموو شوێنێك عەشق لەناو بچێت! گوێ بگرە **رۆدۆلف**: ئەمن سەربازەکانم خۆش ناوێ، بەڵکوو ئاگام لێیانە. ئەم دووە جیاوازن. ئاگام لێیانە، چونکە سوارچاکی ئەڵمانین و منیش زاتێکی سوارەم و ئەڵمانیا پێویستی بە سوارەکان هەیە. ئەمە و بەس!

- ئاخر دەڵێن کاتێك "**ئریکە چکۆڵە**" مرد، ئەتۆ نیوەی مووچەکەت بۆ خێزانی نارد.

**ریتمایستر** چاوێکی داگرت و وتی:

- "**یا، یا**" (بەڵێ، بەڵێ) لەگەڵ نامەیەکی جوان کە بەهەزاران زمانی جیاواز باسی چاکەکانی ئەم **ئریکە** پیسەم کردبوو کە تەنانەت نەیدەتوانی خۆی لەسەر ئەسب رابگرێت... ئێ **رۆدۆلف**، بۆچی ئەمکارەم کرد؟ سەبارەت بەوەی **ئریکم** خۆش دەویست؟ - ئاخ! نەختێك بیر بکەوە **رۆدۆلف**! ئەو بەستەزمانە مردبوو: کەواتە ئەو لەناو سوارەکانی ئێمەدا نەمابوو. نا، ئەگەر من ئەمکارەم کرد بۆ ئەوە بوو کە لەناو گوند، هەموو کەس نامەی من بخوێننەوە و بڵێن: "**ئریك** ئەڵمانییەکی بەغیرەت بوو وفەرماندەکەشی رائیدێکی ئەڵمانییە".

وەستا و چاوی لەناو چاوی من بڕی.

- ئەوە دەرسێکە، وانەیە، تێدەگەی؟ ئەگەر رۆژێ بوویتە فەرماندە، ئەمە وەبیر خۆت بێنەوە: پارە، نامە، هەموو ئەم شتانە، کارێك کە دەبێ

بیکەی ئەوەیە. ڕێك ئەوەیە. وەکوو دەرسێك، وانەیەك، ڕۆدۆلف، بۆ ئەڵمانیا.

بەرامبەرم وەستا، دەستە برینپێچکراوەکانی خستە سەر شانەکانم و منی بۆلای خۆی ڕاکێشا:

- ڕۆدۆلف!
- یاوول ، هێر ڕیتمایستر!

چاوەکانی لەناو چاوی من بڕی:

- جوان گوێ بگرە!
- یا، هێر ڕیتمایستر!

منی بە خۆیەوە ڕێککووشی و ئەم ڕستەیەی بە هەموو هێزەوە، وشە بە وشە وت:

- فور میش گیبتس نور ئاینە کیرشە، ئاوند دی هایست دویچلاند[٢١]!
- لەرزێك لە تۆقی سەرم هەتا نووکی پێمی داگرت. بە دەنگێکی بەرز وتم:
- یاوول، هێر ڕیتمایستر!
- بەسەرما خوار بۆوە و بەجۆرێك بێ ڕەحمانە بە خۆیەوە ڕێککوشیم کە وەختبوو بمتوڵێنێتەوە:
- "ماینە کیرش هایست دویچلاند"![٢٢] دووبارەی بکەوە!
- "ماینە کیرش هایست دویچلاند"!
- توندتر!

---

[21] Fur mich gibt,s nur eine kirche, und die heist Deutschland!-
بۆ من تەنیا کەنیسەیەك هەیە و ئەویش ئەڵمانیایە!

[22] Menie Kirsche heist Deutschland- کەنیسەی من ئەڵمانە!

بە دەنگێکی بەرزتر دووبارەم کردەوە:

– "**ماینە کیرش هایست دویچلاند**"!

– **ماینە کیرش هایست دویچلاند**!

– زۆر باشە **رۆدۆلف**

بەریدام و بێ یارمەتی من گەڕایەوە بۆ سەر تەختەکەی. دوای ماوەیەکی کوورت چاوەکانی بەست و ئیشارەیەکی پێکردم کە بڕۆم. بەر لەوەی کە بڕۆم ئەو جگەرەیەی کە پێی دابووم خێرا لەناو ژێرجگەرەکە دەستم دایە و کە گەیشتمە مەمەڕەکە خستمە ناو جانتاکەم.

ئەو شەوە کە گەیشتمەوە ماڵەوە، کاتژمێر حەوت و نیو تێپەڕیبوو. دایکم و دوو خوشکەکانم دانیشتبوون لە پشت مێزی خواردن چاوەڕێم بوون. لەناو دەرگا وەستام و سەیرێکی ئەوانم کرد:

– "**گوتن ئابند**" (Guten Abend) (سڵاوی شەو).

سەرەتا دایکم وتی: "**گوتن ئابند، رۆدۆلف**" و دوایی خوشکەکانم بەدوای دایکمدا.

دانیشتم، دایکم سووپی بۆ کێشام. کەوچکم بۆ لای دەمم برد و هەموویان سەیری منیان کرد.

سوپ کە تەواو بوو دایکم قابلەمەیەك پەتاتەی هێنا و لەسەر مێزەکە داینا. **بێرتا** بە مۆنەوە قاپەکەی کێشایەوە و وتی:

– ئاه، دیسانیش پەتاتە؟

سەیرم کرد و وتم:

– **بێرتا**، لەناو سەنگەرەکان تەنانەت هەموو رۆژێ پەتاتەشیان بەگیر ناکەوێ.

**بێرتا** سوور هەڵگەڕا و وتی:

- ئەتۆ لە کوێوە دەزانی؟ ئەتۆ کە بۆ ئەوێ نەرۆیشتووی؟

کەوچکەکەم دانایە سەر مێز و سەیرم کرد و وتم:

- **بێرتا**، من دووجار هەوڵم داوە بۆ بەرەی شەڕ بچم. قبووڵیان نەکرد و ئێستاش هەر چاوەڕوانم و ڕۆژانە دوو کاتژمێر لە نەخۆشخانەیەك کار دەکەم....

نەختێك وەستام و زۆر بە توندی وتم:

- ئەو کارەی کە من بۆ ئەڵمانیا بەڕێوەی دەبەم ئەمەیە... بەڵام تۆ بۆ ئەڵمانیا چی دەکەی **بێرتا**؟

دایکم وتی: - **بێرتا**، تۆ دەبێ شەرم بکەی کە...

قسەکەیم بڕی و وتم: تکا دەکەم دایە.

بێدەنگ بوو، رووم کردە **بێرتا** و چاوم لە چاوی بڕی و بێ ئەوەی دەنگم بەرز بکەمەوە، دووبارەم کردەوە:

- تۆ بۆ ئەڵمانیا چی دەکەی **بێرتا**؟

**بێرتا** وەگریان کەوت و ئیتر تا خواردن کۆتایی پێهات هیچکەس هیچی نەوت.

کاتێك دایکم دەیویست سفرەکە کۆ بکاتەوە، وتم:

- دایە....

دووبارە دانیشت. سەیری کردم و وتم:

- بە باشی بیرم کردووەتەوە. ڕەنگە ئەگەر دوعای بەکۆمەڵی شەوانە تەرك بکەین زۆر باشتر بێت. هەرکەس لە ژووری خۆی دوعا بکات.

سەیری کردم و وتی: - ئەتۆ بۆخۆت بووی کە ئەمکارەت قبووڵ نەکرد، ڕۆدۆلف.

- بەڵام دواتر بیرم لێیکردەوە.

بێدەنگییەك ژوورەکەمانی کپ کرد.

دایکم وتی:

- باشە رۆدۆلف، هەر جۆرێك تۆ دەتهەوێ.

دەیویست شتێك بڵێت، بەڵام وازی هێنا و یارمەتی خوشکەکانمی دا کە خەریك بوون مێزەکەیان کۆ دەکردەوە. ئەمن هەر بەوشێوەیە دانیشتم و لە جێگەی خۆم جووڵەم نەکرد. کاتێك هەر سێکیان لە چێشتخانە گەڕانەوە وتم:

- دایە....
- بەڵێ رۆدۆلف؟
- شتێکی دیکە.
- چی رۆدۆلف؟
- لەمەوبەدوا منیش نانی بەیانی لەگەڵ ئێوە دەخۆم.

وام هەست کرد کە خوشکەکانم سەیری من دەکەن. کاتێك بۆ لایان سووڕامەوە، خێرا نیگایان دزیەوە و سەیری عەردیان کرد. دایکم لەناکاو پەرداخێك کە لەناو دەستی دابوو، لەسەر مێزەکەی دانا. ئەویش چاوی لە خوارەوە دەکرد.

دوای ماوەیەکی کوورت وتی:

- ئەتۆ تا ئێستا هەموو رۆژێ کاتژمێر پێنج لەخەو هەڵدەستای رۆدۆلف.
- بەڵی دایە.
- ئیتر ناتهەوێ بەردەوام بی؟
- نەخێر دایکە.

بەردەوام بووم کە:

- لەمەوبەدوا كاتژمێر حەوت لە خەو هەڵدەستم.

دایكم هیچ جووڵەیەكی نەكرد، تەنیا نەختێك رەنگی گۆڕابوو و دەستەكانی بەردەوام پەرداخی لەسەر مێز هەڵدەگرت و دایدەنایەوە، بە دەنگێكی دوودڵی وتی:

- كاتژمێر حەوت نەختێك درەنگ نییە رۆدۆلف؟

سەیرم كرد و وتم:

- نەخێر دایكە. یەك راست لەماڵەوە دەچمە قوتابخانە.

لەسەر "یەك راست" پێداگر بووم. دایكم یەك وشەش نەدوا. منیش دوایی قسەكەم گرت و وتم:

- نەختێك هەست بە ماندوویی دەكەم؟

دایكم رەنگی وەكوو خۆی لێهاتەوە. واپێدەچوو ئەم رستەیی دوایی من ئەوی لە دوودڵییەك هێناوەتەدەر و لەژێر بارێكی قوورس ئازادی كردووە و وتی:

- سروشتییە. بەم هەموو كارەی كە بۆخۆت جێبەجێت كردووە شتێكی سرووشتییە كە...

قسەكەیم بڕی و وتم:

- كەواتە روون بۆوە؟

سەری جووڵاند كە بەڵێ.

وتم: - **گوتە ناخت** (Gute Nacht) (شەو خۆش).

سەبرم كرد هەتا وەڵام لە هەموویان وەربگرم و ئەوكات چوومە ناو ژوورەكەم.

كتێبی هەندەسەم كردەوە و خەریكی خوێندنەوە وانەی بەیانیم بووم. زۆر بەسەختی دەمتوانی هۆشم بێنمە سەر خوێندن. كتێبم دانا سەر مێز،

پێڵاوەکانم هەڵگرت و خەریکی واکسیان بووم. بە چەند خوولەك تەواو بووم. ڕەزامەندیم لە خۆم بوو و پێڵاوەکانم دانا، ئاگام لێبوو پاژنەکانی لەسەر هێڵێك بێت. دوایی لەپێش ئاوێنەی دۆلاب وەستام و وەکوو فەرماندەیەکم بینیبێت، خێرا ڕێك وەستام. کەم و زۆر، خوولەکێك، ئاوا بە ڕێکی وەستام. وەستانەکەم بەرامبەر بە ئاوێنە ڕێك کرد تا ئەوەی وەکوو سەربازێك ڕێکوپێك وەستام. لەناو ئاوێنە، چاوم لە چاوی خۆم بڕی و ئارام و لەسەرەخۆ، بە ڕێکوپێکی بەجۆرێك کە باوکم دوعایەکانی دەخوێند وتم:

– ماینە کیرش، هایست دویچلاند!

دوایی جلەکانم دەرهێنا، ڕاکشام، ڕۆژنامەم لەسەر کوورسی دەست دایە و خەریکی خوێندنەوەی هەواڵەکانی شەڕ بووم. هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی. کاتژمێری وێستگەی شەمەندەفەر زەنگی نۆیی لێدا. ڕۆژنامەم قەد کرد و لەسەر کورسی دامنا و خۆم خستە ناو تەختەکەم. چاوەکانم کرابۆوە، بەڵام حازر و ئامادە کە ئەگەر دایکم بۆ کوژاندنەوەی چرا بێتە ژوورەوە خێرا لەسەر یەکیان دابنێم. دەنگی دەرگای ژووری خوشکەکانم گوێ لێبوو کە جیرەیەکی بچووکیان لێدەهات. دواتر هەنگاوی سووك کە پێی نایە پێش ژوورەکەم. دەنگی ژووری دایکیشم بە نۆرەی خۆی بەرز بۆوە. زمانەی قفڵەکە دەنگی لێهات. دایکم دەستی کرد بە کۆخە کۆخ و دواتر بێدەنگی دەسەڵاتی شەوی بەدەستەوە گرت.

بێ هیچ جووڵەیەك خوولەکێکی دیکە سەیرم کرد. دواتر دووبارە ڕۆژنامەم دەست دایە و خەریکی خوێندنەوە بووم. کاتێك سەیری کاتژمێرم کرد، کاتژمێر نۆ و نیو بوو.

ڕۆژنامەکەم دانا و هەستام چرایەکەم کووژاندەوە.

# یەکەمی ئوتی ۱۹۱٦

لە سێیەمین هەوڵ کە بۆ راکردن لەماڵەوە بەڕیوەم برد، بە لوتفی **ریتمایستر گونتر** توانیم لە هەنگی ب. د۲۳، لەشاری ب. بچمە خزمەتی سەربازی، ئەوکات رێك تەمەنم پازدە ساڵ و هەشت مانگ بوو.
وانەکان خێرا بەڕێوەدەچوون. ئەمن بچووك بووم، بەڵام قەڵافەتێکی بەتوانام هەبوو و بەرامبەر بە ماندوویی فێرگە ئابڕومەندانە بەرگریم دەکرد. خاڵێکیشم لە جووجە سەربازەکانی دیکە زیاتر بوو کە چونکە چەند ساڵێکی پیشوو لە کێڵگەی "**مێکلێمبورگ**" (Mecklembourg) گوزەراندبوو. تا رادەیەك ئەسب سواریم دەزانی. بە تایبەت حەزێکی زۆرم لە ئەسب بوو. نەتەنیا بە سواربوون، بەڵکوو حەزم دەکرد سەیریان بکەم، پێیان رابگەم، بۆنیان بکەم و لێیان نزیك ببمەوە. لە سەربازخانە زۆر بە زوویی بە حازرخزمەتی ناوم درکرد، چونکە هەمیشە ئامادە بووم لەجیاتی هاوڕێیانم نۆبەتچی تەویلە بم. هەڵبەت لەم کارە هیچ جۆرە شایستەییەك بەدی نەدەکرا: هەر ئەوەندە حەزم دەکرد لەگەڵ ئەسبەکان بەتەنیا بم.

شێوەی ژیانی سەربازخانەش بۆ من سەرچاوەی کەیف و دڵخۆشی قووڵ بوو. وام بیر دەکردەوە مانای دسیپلین دەزانم، چونکە لە ماڵ، هەموو کاتمان بە دسیپلینەوە ژیابووین. بەڵام ئێستاش زۆر لەپاش بووم. لەماڵ جاروبارە وا دەهاتەپێش کە پێشتر هیچ پلانێکت بۆی دانەنابێت، بەڵام لە سەربازخانە، دسیپلین بە تەواوی کامڵ بوو. کەیفم بە دەست لە تفەنگ وەردان دەکرد. حەزم دەکرد ژیانی ئاسایی ئێمەش ئاوا چێژی بەردەوامی هەبوایە.

بەیانیان کە بیدارباش (مارشێك تایبەت بە هەستان لە خەو)یان لێدەدا، یارییەکی بچووکم بۆخۆم دروست کردبوو کە بەئەنقەست نەمهێشتبوو هیچکام لە هاوڕێیانی دەوروبەرم لێی تێبگەن. بۆ هەستان و دەست و ڕووشوشتن و جلك لەبەرکردن، جووڵەکانم لێك جیا کردبۆوە، بۆ نموونە بۆ هەستان لە خەو:

١. لادانی پەتوو لەسەر خۆم،
٢. بەرز کردنی پێیەکانم لە تەخت،
٣. دانانی پێیەکانم لەسەر ئەرد،
٤. هەستان و ڕاوەستان.

ئەم یارییە بچووکە هەستی ڕەوزامەندی و چێژی لەمندا پێکدەهێنا. لە هەموو دەورەی فێربوون تەنانەت جارێکیش خۆم نەدزییەوە. تەنانەت ئەگەر ترسم نەبوایە، هەموو کارە ئاساییەکانی ڕۆژانەشم وەکوو فێرگەیەك بەڕێوەدەبرد و ژیانی خۆم بەشێوەیەکی سەربازیانە لێدەکرد.

ریتمایستر گونتر بەردەوام بە شادوومانی پێمانی دەوت کە لەجیاتی "شوێنێکی دیکە، هێرگوت، بۆ شوێنێکی دیکە" دەچین و هەندێ

سەرباز دەیانوت دڵخۆشی ئەو لە راستیدا تەنیا "جۆرێك درۆ و گاڵتەجارییە" و بێ یەك و دوو دەمانئێرنە مەیدانی شەڕ لە رووسیا.

بەلام رۆژێك سەر لەبەیانی ئەمریان پێکردین کە بۆ وەرگرتنی جلکی تازە بۆ ئەمبار بچین. لەبەر دەرگا ریز بووین و کاتێك یەکەم کەسەکان ئەشیا و جلکەکانیان وەرگرت و گەڕانەوە، بینیمان جلکی بە رەنگی خاکی و کلاوی لۆکەیی لەگەڵە. هەر ئەو کات وشەیەك هەموو ریزی وەرگرانی جلکی گرتەوە و دوایی لە خۆشحاڵی و هوتاف لێدان وەکوو بۆمبێك تەقییەوە.

– "**تورکای**" (Turkei) (تورکیا)!

**ریتمایستر گونتر** بە پێکەنینەوە گەیشتێ. ملوانکەیەکی شانازی و لیاقە کە هەر ئەوکات وەریگرتبوو لە دەوری ملی دەدرەوشایەوە. سەربازێکی راگرت و ئەشیاکانی ورگیراوی یەك بەدوای یەك نیشان داین و دڵنیای کردینەوە کە:

– بۆ هەموویان مارك خەرج کراوە!

کە گەیشتە پانتۆڵی کوورت، کردیەوە و بەجۆرێکی گاڵتەجاری خستیە سەر پەنجەکانی و سووڕاندی و پێمانی وت:

– سوپا ئێمە بەشێوەی منداڵ دەردێنێت کە ئینگلیزییەکان نەتۆقێنین.

سورارکاران دایان لە قاقای پێکەنین و یەکێکیان وتی:

– منداڵە بچووکەکان دەزانن چۆن راویان بنێن!

**ریتمایستر گونتر** وتی:

– **یاوول، ماین هێر** (وایە ئاغا گیان)

لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- جاریَ ئەو ئینگلزییە خوێریانە، کاتەکەیان لە دوورگەی نیل بە خواردنەوەی چا و یاری تۆپی پیَ دەگوزەرێنن، بەڵام ئێمە، "**بای گوت**" (بە قودرەتی خوا) نیشانیان دەدەین کە میسر نە چایخانەیە و نە یاریگای تۆپی پیَ.

کە گەیشتینە قوستەنتەنیە، ئەوجۆرەی کە وتبوویان ئێمەیان بۆ لای فەلەستین نەبرد، بەڵکوو رەوانەی عێراقیان کردین. لە بەغدا لە شەمەندەفەر دابەزین. گروپەکەمان سواری ئەسب بوو و لە چەند قۆناغی کورت کورت بە کوێرەدێیەك گەیشت بە ناوی "**فیلالیە**" (Fellalieh) کە بینای دوور و درێژی بە قوور دروستکراوی هەبوو. ئەویَ سەربازخانەیەکی لێبوو کە ئێمەش نزیك بە دووسەد مەتری سەربازخانەی توورکەکان ئۆردومان لێدا.

رێك هەفتەیەك دوای گەیشتنمان بۆ ئەویَ، لە کەش و هەوایەك کە بەشێوەی سەرسوورهێنەر رووناك بوو، ئینگلیزییەکان دوای بۆمبارانێکی زۆر توند لەگەڵ دارودەستە هندییەکانیان هێرشیان کرد.

نزیکییەکانی نیوەڕۆ، "**ئۆنتەرۆفیزێر**" (Unteroffizier)(عەریف یەکەم) سیَ کەس "**شمیتز** Schmiz، **بێکر** Becker و **من**"ی لەگەڵ موسلسەلێك (رشاش – تفەنگێك کە بە رێژەی زۆر گوولە دەهاویَ) هەڵگرت و مەودایەکی زۆر لەپێشەوە، لە لای راستی گروپەکەمان، ئێمەی بردە ناو قووڵکەیەکی حەشاردراو کە لەویَ هەڵکەنرابوو. رووبەڕوومان سەحرایەکی دووورودرێژ بوو لەگەڵ چەند دارستانی بچووك. هێڵی هێزی هیندووەکان کە بۆ پێشەوە دەهاتن، رێك بەرامبەر بە ئێمە بوون و بە تەواوی دەبینران.

موسەلسەلەکەمان سوار کرد و "**ئۆنتەرۆفیزێر**" بە دەنگێکی وشك وتی:

– هەر کەس زیندوو مایەوە موسەلسەلەکە لەگەڵ خۆی بباتەوە ئۆردوگا.

"**شمیتز**" رووی لە من کرد. کۆڵمە گۆشتنکەی وەکوو ماست سپی بوو. بە هێواشی وتی:

– گوێت لێیە چی دەڵێت؟

– "**ئۆنتەرۆفیزێر**" وتی: – **بێکر!**

**بێکر** لە پشت موسەلسەلەکە دانیشت و لێوەکانی بە ددان گەست. "**ئۆنتەرۆفیزێر**" وتی:

– تەقەی بکە بە حەزی خۆت؟

دوای ماوەیەکی کوورت هەر هاوانە بوو لەملا و لەولا بە عەرد دەکەوت و دەتەقییەوە. **بێکر** کوژرا و هەر رووخساری پێوە نەما.

"**ئۆنتەرۆفیزێر**" بە دەستی جووڵەیەکی کرد و وتی: – **شمیتز!**

**شمیتز** مەیتی **بێکری** بۆ دواوە برد. کۆڵمەکانی دەلەرزی. **ئۆنتەرۆفیزێر** قیژاندی:

– **لوس، مێنش** (خێرا بکە بابە)

**شمیتز** خۆی لە پشت موسەلسەلەکە قایمتر کرد و دەستی بە تەقە کرد. کەف و عارەقە لە هەردوو لای دەمی دەرژا.

**ئۆنتەرۆفیزێر** لەلای راستەوە دوو سێ مەترێك لە ئێمە جیا بۆوە. تەنانەت ئەم زەحمەتەشی بە خۆی نەدەدا کە سەری دابنوێنێت. **شمیتز** هەر ئەمجۆرە بە بەردەوامی جنێوی دەدا. دەنگێکی بەرز لە نزیك ئێمە هات و بارانێك لە زیخ و خۆڵ رژایە سەرمان. کاتێك سەرمان بەرز کردەوە، **ئۆنتەرۆفیزێر** بزر ببوو.

**شمیتز** وتی: – بڕۆم ببینم.

لەسەر سینگ خزایە پێشەوە. چەند دنك بزماری پاژنەی چەکمەکەی لێببونەوە. کاتێکی کەم تێپەڕی، **شمیتز** گەڕایەوە. گۆنای ڕەش ببوو. بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە وتی: — دوولەت بووە.

دوایی دەنگی هێور کردەوە. وایدەزانی **ئۆنتەرۆفیزێر** گوێی لێدەبێ و وتی:

– شێتەپیاو! ڕێك لەژێر هاوانەکان وەستاوە، چۆنی بیر لێ کردووەتەوە. وایزانیوە دەورەمان دەدەن؟

دووبارە لەپشت موسەلسەل دانیشتەوە. بێ ئەوەی تەقەی بکات یان لە شوێنی خۆی بجووڵێت. دەنگی تۆپبارانمان لە لای ڕاستی خۆمان گوێ لێدەبوو. بەڵام لەو کاتەوە موسەلسەلەکەمان لەکار کەوتبوو، دوژمن کاری بە ئێمە نەبوو. سەیر بوو کە ئەم گۆشەیە ئاوا ئارام بوو لەکاتێکدا لە بەرەکانی دیکە تەنیا ئاگر دەباری.

**شمیتز** مشتێك خۆڵی دەست دایە و هێشتی لەنێوان پەنجەکانی بڕژێت و بە نفرەتەوە وتی:

– سەبارەت بەوە یەکتر دەکووژن!

بە ئارامی ڕوومەتی بە موسەلسەلەکەوە نا، بەڵام لە جیاتی تەقەکردن سەیرێکی منی کرد و وتی:

– ئێ. ئێستا ئەگەر ئێمە....

من سەیرم دەکرد، خوار ببۆوە بەرەو پێشەوە، کوڵمەی گۆشتنی بە موسەلسەلەکەوە نووساندبوو و ڕووخساری بۆلای من سووڕاندبوو، وتی:

– بەهەرحاڵ ئێمە ئەرکی خۆمان بە تەواوی بەڕێوەبردووە.

دووبارە وتی: — هیچ ئەمرێکمان پێنەدراوە.

دوایی، چونکە من هەر ئاوا بێدەنگ بووم، بەردەوام بوو:

- **ئۆنتەرۆفیزێر** وتی: ئەوانەی زیندوو مانەوە موسەلسەلەکە بگەڕێننەوە.

زۆر بە وشکی وتم:

- **ئۆنتەرۆفیزێر** وتی: "هەر کەس زیندوو مایەوە...."

**شمیتز** بە سەیرەوە چاوێکی لێکردو چاوەکانی گرد بوونەوە و وتی:

- "**یونگە**" (Junge) (لاوە) شێتی مەگەر؟ هیچ هۆیەك نییە لێرە بمێنینەوە هەتا یەکێکمان سەقەت بین.

بێ ئەوەی وەلامێکی بدەمەوە، سەیرم کرد.

دووبارە وتی:

- ئاخر ئەوە شێتانەیە! دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئۆردوگا. هیچکەس پێمان نالێ سەرووی چاوتان برۆیە! کێ چی دەزانێ **ئۆنتەرۆفیزێر** چی بە ئێمە وتووە.

کەللە خڕەکەی هێنایە پێش و دەستی لەسەر قۆلی من دانا. دەستم کێشایە دواوە.

وتی: - "**هێرگوت**"! (Herrgott) ئاخر من ژنم هەیە، سێ منداڵم هەیە....

بێدەنگییەك لەنێوانمان رووی دا، دوایی بە حاڵەتێکی بوێرانە وتی:

- دەی بەڕێ کەوە! من حەز ناکەم لە ناوقەدەوە دوولەت بم! ئەمجۆرە غیرەتانە پێشکەش بە "**ئۆنتەرۆفیزێر**"ەکان، لە ئێمە نایات!

ئەوەی وت و وەکوو ئەوە دەچوو کە دەیهەوێ موسەلسەلەکە هەڵبگرێت و دەستی خستە ژێری. بە خێرایی دەستم لە لای دەستی ئەو دانا و وتم:

- ئەگەر تۆ حەز دەکەی دەتوانی بڕۆی. بەلام من دەمێنمەوە. موسەلسەلەکەش دەمێنێتەوە.

دەستی کێشایەوە و بە شڵەژاوی سەیری کردم. زۆر بە وردی وتی:

- "ئابێر مێنش" (Aber Mensch) (ئاخر بابە) راستی راستی ئەتۆ بە تەواوی شێتی! ئەگەر من بێ موسەلسەل بگەڕێمەوە تیرەبارانم دەکەم! وەکوو رۆژ روونە!

لەناکاو چاووی سوور و زەق بوو، جنێوێکی دا و مستێکی حەواڵەی سینگم کرد. خۆم لە مستەکەی دزییەوە و ئەو بە هەر دوو دەستی موسەلسەلەکەی گرت و بەرزی کردەوە. من بە خێرایی تفەنگی لوولە کوورتەکەی خۆمم گرت، فیشەکم وەبەرنا و نیشانەم لێیگرت. بێ جووڵە و بە سەرسووڕمانەوە بە تەتەپەتە کەوت و وتی:

- کەواتە بڵێ، کەواتە بڵێ.... کەواتە بڵێ!...

هەر ئەمجۆرە بێدەنگ و بێ جووڵە مامەوە و لوولەی تفەنگەکەم روو بە ئەو راگرت. بە نەرمی موسەلسەلەکەی دانا و لە تەنیشتی دانیشت و رووی وەرگێڕا.

تفەنگەکەم کە هەر ئەمجۆرە روو بە ئەو بوو، لەسەر کۆشم دانا و قەتاری فیشەکی موسەلسەلەکەم گووڕی. **شمیتز** سەیری کردم، دەمی کردەوە، چەند جارێك چاوی لێکدا، دوایی بێ ئەوەی هیچ بڵێت، کۆڵمە گۆشتنەکەی بە موسەلسەلەکەوە نا و دەستی بە تەقەکردن کرد. دوای چەند چرکە، هاوانەکان لە هەموو لایەکەوە وەکوو باران رژانە سەرمان و هەموو جار خۆڵباران دەکراین.

موسەلسەلەکە دووکەڵی لێ بڵند بوو وتم: - دەست رابگرە!

**شمیتز** تەقەی راگرت و سەیری منی کرد. هەر ئەمجۆرەی کە بە دەستی راست تفەنگەکەم راگرتبوو بە دەستی چەپ قومقومەکەم هەڵگرت و دەرگاکەم بە ددان کردەوە و لەسەر موسەلسەلەکە بەتاڵم کرد. ئاوەکە

وەکوو گلێرەی لێدەهات و جزە جزی لێدەهات. دوژمن ئیتر تەقەی لە لای ئێمە نەدەکرد.

شمیتز بێ ئەوەی هیچ بڵێت، سەیری منی دەکرد. ئاو و ئارەقە لە هەموو لایەکی دەمی دەهاتەدەر. بە دەنگێك کە شەرمەزاری پێوەدیار بوو، وتی:

– لێمگەڕی با من بڕۆم.

بەسەر وتم: "نا"! لێوەکانی بە زمان تەڕ کرد، چاوەکانی وەرگێڕا و بە دەنگێکی نزم وتی: – موسەلسەلەکە هی تۆ، لێمگەڕێ بڕۆم.

– ئەگەر دەتهەوێ دەتوانی بڕۆی، بەڵام بێ تفەنگ.

دەمی کردەوە و چاوی لە من کرد: – عەقڵ لە مێشکتدا نەماوە؟ دەی ئەوکات سەبارەت بە تفەنگ تیرباران دەکرێم!

چونکە بێدەنگ بووم وتی:

– بێ تفەنگی خۆم بۆچی؟

– حەز ناکەم بۆ هەڵگرتنی موسەلسەلەکە لە پشتەوە گوللەیەکم لێبدەی.

سەیری کردم و وتی:

– سوێند دەخۆم کە فکرێکی ئەوتۆم نەکردبۆوە.

چاوەکانی وەرگێڕا و وەکوو منداڵ بە دەنگێکی نادیار و پڕ لە پاڕانەوە وتی:

– لێمگەڕێ با بڕۆم.

قەتارێکی دیکەم لە فیشك هاویشتە سەر موسەلسەلەکە. زامنەکەی کەوت. سەری بەرز کرد و چاوێکی لێکردم و دوایی بێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێ، دەستی بە تەقە کرد و دووبارە هاوانەکان وەکوو باران دەبارین. بە

دەنگێکی وشك لە پشت سەرمان دەکەوتن و هەموو جارێ زیخ و خۆلێکی زۆریان بەسەردا دەباراندین.

شمیتز بە دەنگێکی زۆر ئاسایی وتی:

– زۆر خراپ دانیشتووم.

سەری بەرز کرد و خۆی بە هێوری لەسەر سمتی بەرزکرد و دوایی هەر دوو دەستی دێوئاسا بۆ ئاسمان بەرز کرد و خۆی هاویشتە سەر من. کاتێك وەرمگێڕا کوونێکی گەورەی رەش لەناو سینگی بوو و منیش سەرتاپێ لە خوێنی ئەودا شەڵاڵ ببوم.

شمیتز زەبەلاح و قوورس بوو. گیانم دەرهات هەتا کێشامە دوایە. کارم کە تەواو کرد، قومقمەکەم دەست دایە. قومقمەکەی بێکریش. موسەلسەلەکەم ئاوپاشی کرد و چاوەڕێ مامەوە. داغتر لەوە بوو کە بکرێ تەقەی پێبکرێ. سەیری شمیتزم کرد. درێژ درێژ کەوتبوو. چاوەکانی نیوە بەستراو پاڕانەوەی پێوە دیاربوو.

موسەلسەلەکەم دەست دایە و دووسەد مەتر سەرووتر خۆم هاویشتە ناو قووڵکەیەکی تەسکتر و قووڵتر، سواری بووم و گۆنام پێوەنووساند، خۆم بە تەنها هەست دەکرد. موسەلسەل لەناو قاچەکانمدا دەبریقایەوە.

هەستی رەزامەندی هەموو جەستەمی پڕ کردبوو.

نزیك بە هەشت سەد مەتری خۆم لەناکاو بینیم هیندییەکان بە هێواشی و ترسەوە بەشێوەیەکی زۆر سەیر لەسەر عەرد بەرز بوونەوە و بە هێواشی لە ریزێکی بەرامبەر بە من رایاندەکرد. قاچە باریك و درێژەکانیانم دەدیت. لە پشت ئەوان ریزیکی دیکە بەدیار کەوت و لە پشت سەری ئەوانیش ریزێکی دیکە. ئەمن لە تەنیشتەوە سەیرەم بەسەر هەموویان هەبوو. موسەلسەلەکەم رووبەڕووی ئەوان گرت و ماشەکەم کێشا. تەقەم دەست

پێکرد و لە سەرەتای ریز هەتا کۆتایی ریز لوولەی موسەلسەلەکەم دەسووڕاند و دیسانیش دەمسووڕاندەوە و دوایی تەقەم راگرت.

رێك ئەوکاتە بوو کە هەستم کرد قوورساییەك بە شانی چەپم کەوت. کەوتمەخوار، بەڵام خێرا هەستامەوە و دانیشتم. کە سەیری شانم کرد، شەلاڵی خوێن ببوو. هەستم بە تۆزقاڵە ژانێك نەدەکرد، بەڵام نەمدەتوانی قۆڵم بجووڵێنم. بەستەیەکی برینپێچیم بە دەستی راست گرت، بە ددان دڕاندم و تەنزیپم خستە نێوان برین و کراسەکەم. تەنانەت ئەو کاتەی دەستم بە برینەکە دەکەوت، دیسانیش هەستم بە ژان نەدەکرد. ئیتر بە باشترم زانی کاتی گەڕانەوەیە و دەبێ موسەلسەلەکەش لەگەڵ خۆم ببەم.

لە گەڕانەوەمدا چوار پێنج سوارەی هندیم بینی کە لەسەر تەپۆڵکەیەك لەناو دارستانەکە بێ جووڵە وەستابوون. نێزەکانیان باریك و بڵند روو بە ئاسمان بوو.

بە ویقارەوە موسەلسەلەکەم ئامادە کرد و درووەمنەوە.

دوایی، چەند سەد مەترێکی دیکە بەرەو بەرەی هاوڕێیانم گەڕامەوە، بەڵام وابزانم بەر لە گەیشتنم بێهۆش ببوم، چونکە ئیتر لەوێ بەدواوە هیچم بەبیر نایەت.

دوای چاك بوونەوەم، نیشانی سەلیبی ئاسنینیان بەبەر کردم و ناردیانمە بەرەی شەڕ لە فەلەستین لە "برسابە" (Birseba)، بەڵام لەوێ زۆر دەوامم نەهێنا، چونکە تووشی نەخۆشی مالاریا بووم و خێرا بۆ دەمەشق ناردیانم.

لە نەخۆشخانەی دەمەشق بۆ ماوەیەکی باش هۆشم لە خۆم نەبوو. یەکەم بیرەوەری کە بەبیرم دێت، قەڵافەتی ئافرەتێکی موو رەش بوو کە بەڕومدا خوار ببۆوە.

دەنگی پێکەنینێك هات کە: – باشی، یونگە؟

– "یا، فراولین" (ئافرەتی بێ شوو).

وتی: – "فراولین" نا، بڵێ "ڤێرا" (ژنی بە مێرد). من بۆ سەربازانی ئەڵمانی ڤێرام.... باشە، ئێستا ئاگات لە خۆت بێت!

دوو دەستی ناسك و زەریف و جوان، بەڵام بەهێز خزانە ژێر ناوقەدم و بڵندیان کردم.

هەموو شت تێکەڵ و پێکەڵ بوو. ژنێك لەسەر دەستان منی دێنا و دەبرد. دەنگی هەناسەیم گوێ لێ دەبوو و رێك لە پێش چاوەکانم دڵۆپە عارەقەکانیم دەبینی کە گەردنی گرتبوو.

هەستم کرد کە منیان لەسەر تەختێك دانا.

دەنگێکی پێکەنیناوی وتی:

– ئێستا جێبەجێ بوو! هاتنەخواری تای نی نی بچکۆڵە بە باش دەزانین و سەر و جەستەی دەشۆین!

هەستم کرد رووت دەبمەوە. دەستێك لەسەر جەستەم وەجووڵە کەوت و بە قوماشێکی گەرم مەساجی دام.

تەڕ و تازە، بە چاوی نیوەکراوە خرامە سەر باڵنجەکان. سەرم کە سووڕاند ملم زۆر هێشا و ئەو کاتە بوو کە زانیم لە ژوورێکی زۆر بچووك دام.

– نا، یونگە بارودۆخت باشترە؟

– یا، فراولین؟

– ڤێرا.... بۆ سەربازەکانی ئەڵمانی ڤێرا.

دەستێکی سوور گەردنی بەرز کردم، باڵنجەکانمی رێکخست و بە ئارامی سەرمی خستە سەر باڵنجەکان.

- لە تەنیایی لەناو ژوورێکدا دڵگران نابی؟ دەزانی بۆچی تۆیان هێناوەتە ئێرە.

- نا، ڤێرا.

- چونکە شەوانە کاتێك کامووس دەبینی، بە جۆرێك دەست دەکەی بە هەرا و هووریا کە ناهێڵی کەس لە ژوورەکەت بحەسێتەوە.

دەستی کرد بە پێکەنین و خوار بۆوە کە لێوی مەلافە بخاتە ژێر دۆشەگ. پێستی ملی بە جۆرێك سوور ببۆوە هەر دەتوت ئێستا لە حەمام هاتووەتەدەر، مووە قژەکانی ساف کردبوو و گرێیدابوو و بۆنی سابوونی خۆش عەتری لێدەهات.

- ناوت چییە؟

- رۆدۆلف لانگ.

- زۆر باشە. بەس بە رۆدۆلف بانگت دەکەم. ئاغای "دارگون" (سوارە) رێگەم پێدەدەن؟

- تکایە، ڤێرا؟

- تۆ زۆر لەوە بە حەیاتری کە سەربازێکی سوارە بی رۆدۆلف، چەند ساڵتە؟

- شازدە ساڵ و نیو.

- "گوت هیم ئیمل" (ئەی خوای گەورە)! شازدە ساڵ؟

- لەگەڵ شەش مانگ.

بە قاقاوە پێکەنی.

- نابێ ئەو شەش مانگە وەبەرچاو نەگرن رۆدۆلف. ئەسڵی کار ئەو شەش مانگەیە، "نیشت وار" (مەگەر نا)؟

بە پێکەنینەوە سەیری کردم؟

- منداڵی کوێی؟
- "باویر"
- منداڵی باویری؟ ئاخ! باویرییەکان زۆر کەللەڕەقن! تۆش کەللەڕەقی ڕۆدۆلف؟
- نازانم؟

دووبارە پێکەنییەوە، پشتی دەستی بە رووخسارم داهێنا و دوایی بە حاڵەتی جددی و ئاخ کێشان:

- شازدە ساڵ تەمەن، سێ برین و مالاریا!

بەردەوام بوو:

- متمانەت بەخۆتە کە کەللەڕەق نی، ڕۆدۆلف؟
- نازانم ڤێرا.

پێکەنی.

- باشە، زۆر باشە کە وەڵام بدەیتەوە: "نازانم ڤێرا"... رەنگە نزانی کە وەڵامم دەدەیتەوە "نازانم، ڤێرا"... ئەگەر دەتزانی وەڵامم دەدەیەوە "ئەرێ ڤێرا" یان "نا ڤێرا". ئاوا نییە.
- بەڵی ڤێرا.

دای لە قاقای پێکەنین.

- "بەڵی ڤێرا".... دەی باشە زۆر بڵێی بەسە! هەر دەڵێی تای زیاد دەبێ. دووبارە رەنگ و رووت سوور هەڵگەڕا ڕۆدۆلف. خواحافیز تا ئەمشەو، نی نی بچکۆڵە!

چەند هەنگاوێکی بەرەو دەرگا نایەوە و دوایی بەدەم پێکەنینیەوە گەڕایەوە ووتی:

- پێم بڵێ ڕۆدۆلف، کێ بووە کە لێتداوە جمگەی پێت شکاندووە؟

هەستام. دڵم دەیویست لە سینگم بێتەدەر. پەرێشانحاڵ سەیرم کرد. بە خێرایی خۆی گەیاندە تەختەکەم و وتی:

- سەیرە! چیت لێهات؟ ئەی وای! بگرە راکشێ! چ مانایەکی هەیە. تۆ ئەو قسەیە بە بەردەوامی لە کاموسەکەتدا دووبارە دەکەیتەوە... باشە ئیتر، بگرە راکشێ بخەوە رۆدۆلف!

شانەکانی گرتم و سەرلەنوێ ناچاری کردم رابکشێم. دوایی یەکێک دانیشتە سەر لێوی تەختەکەم و دەستی لەسەر ناوچاوانم دانا و دەنگێک وتی:

- "نا" (دەی) باشتر بوو... بە من چی تۆ قاچی دە هەزار کەسیش بشکێنی؟

ژوورەکە وازی لە سووڕان بەسەرسەرمدا هەڵنەدەگرت و بینیم ئەوەی لەسەر لێوی تەختەکەم دانیشتوە، خوودی ڤیرایە. ڤیرا بە پێستی سوور و مووی بڵند و بۆنی سابوونی عەتری؟ سەرم سووڕاند کە باشتر بیبینم، بەڵام لەناکاو کەوتە ناو مژێکی سوور و وون بوو.

- ڤێرا؟

- بەڵی؟

- ئێوەن؟

- منم. بۆ خۆمم، منداڵی خراپ! منم، ڤێرا.... باشە، دەی بگرە بخەوە.

- ئەو پێیەی شکا خەتای من نەبوو، ڤێرا، خەتای من نەبوو. خەتای بەفر بوو.

- دەزانم، دەزانم، هەزار جار وتوتەوە. ئیتر ئارام بگرە و بخەوە.

هەستم کرد دوو دەستی گەورە جمگەکانی بە توندی گرتووم؟

- ئەم مەسەلەیە ئیتر بەسە، وا تان دەچێتەوە سەر.

- خەتای من نەبوو ڤێرا.
- دەزانم، دەزانم.

هەستم بە دوو لێوی فێنك كرد كەلەبن گوێم دەڵێن:

- خەتای تۆ نەبوو، گوێت لێیە؟
- بەڵێ.
- یـەكێك دەسـتی خـستە سـەر ناوچـاوانم و بـۆ ماوەیـەكی زۆر لـەوێ مایەوە.
- ئێستا ئیتر بخەوە رۆدۆلف.

وام هەسـت كـرد كـە كەسـێك لێـوی تـەختمی گرتـووە و دەیجووڵێنێتـەوە. دەنگێك وتی:

- "نا"! و من چاوەكانم كردەوە.
- ئێوەن ڤێرا؟
- ئەرێ، ئەرێ. باشە ئێستا بێدەنگ بە.
- یەكێك تەختەكەم دەجووڵێنێ.
- هیچ نییە.
- بۆچی تەختەكەم دەجووڵێنێ؟

بەسـەرمدا خـوار بـۆوە و بـۆنی سـابوونە عەترییەكـەی لـەناو لووتمـدا مایەوە.

- ئێوەن ڤێرا؟
- منم، نی نی بچكۆڵە.
- تۆخوا نەختێك لەلام بمێنەوە.

دەنگێكی پێكەنیناوی ئاشكرام بیست. دوایی رەشایی لاچوو، سۆزێكی سارد منی بە خۆیەو گرت و گێل و گێژ مامەوە.

- ڤێرا، ڤێرا، ڤێرا!

دەنگێکم لە دوورەوە بیست:

- یا، یونگە؟

- گوناەی من نەبوو.

- نا نا، "ماین شفچێن" (Mein Schafchen) (بەرخە بچکۆڵەکەی من)! گوناەی تۆ نەبوو. ئیتر وازی لێبێنە!

دەنگێکی قوورس و توند گوێی داگرتم:

- ئیتر وازی لێبینە!

منیش بە رەزامەندییەیکی تەواو لەناو دڵی خۆمدا وتم:

- ئەوە ئەمر و فەرمانە!

پێش چاوم رەش بوو، دوایی چرپەچرپێکی تێکەڵاوم بیست و کاتێك کە چاوم کردەوە بینیم ژوورەکەم تاریکە تاریکی و یەکێ کە نەمدەتوانی بیبینم لەژێر پایەی تەختەکەم دەجوولایەوە. بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد:

- ئەوەندە ئەم تەختە مەجووڵێنەوە!

بێدەنگییەکی قوورس هاتەپێش و دوایی، باوکم سەرتاپا رەشپۆش لە نزیك تەختەکەم خۆی دەرخست، چاوی قووڵ و درەوشاوەکانی لەچاوی من بڕی و پچڕ پچڕ وتی:

- رۆ، دۆلف! هەر ئەمجۆرە، کە هەی، هەستە، و وەرە!

بەخێرایی و بێ ئەوەی کەمترین جووڵە بکات، لەبەرچاوموون بوو تەنیا رەشاییەکم لە ئەو بینی. قاچەکانی درێژ و باریك بوو. بینیم هیندوویەکە و لەگەڵ ئەوان دەستی بە راکردن کرد. من لە قەراغ تەختەکەم دانیشتبووم و موسەلسەلێك لەناو قاچەکانمدا بوو و تەقەم لە ریزی هیندووەکان

دەکرد کە رایاندەکرد. موسەلسەلەکە لەسەر دۆشەگەکە هەڵدەبەزییەوە و لەناو دڵمدا دەموت: "کەواتە هیچ سەیر نییە کە تەختەکە دەجووڵێ"

چاوەکانم کردەوە. ڤیرا لەپێشم وەستابوو. رووناکایی خۆر ژوورەکەی پڕ کردبوو.

وتم:

- دەبێ نەختێك خەوتبم.
- نەختێك!

دوایی پرسی:

- برسیتە؟
- بەڵێ ڤیرا.
- باشە، باشە، تایەکەت کەم بووەتەوە. دوێنێ شەویش تا بەیانی کە بەرنامەت هەبوو؟
- دوێنێ شەو، مەگەر بەیانی داهاتووە؟

پێکەنی:

- نا، بەیانی دانەهاتووە.... چۆن بیر دەکەیەوە؟ خۆر هەڵەی لە کاتدا کردووە.

بۆ سەیر کردنی خواردنی من وەستا و کە تەواو بووم سینییەکەی هەڵگرت و بەسەرمدا خوار بۆوە کە تەختەکەم رێکبخاتەوە. مووەکانی ساف کردبوو و بۆنی خۆشی عەتر و گەردنی سووریم کە بینی، دەستم خستە ناو گەردەنی.

هیچ هەوڵێکی نەدا کە خۆی رزگار بکات. هەر ئەوەندە رووخساری بۆ لای من وەرگێڕا وسەیری کردم:

- ئێ. ئەوەش لە هەڵسووکەوتی سوارچاکێکی ئەڵمانی!

كـەمترین جووڵـەم نـەكرد. هـەر ئـەمجۆرە سـەیری دەكـردم. دوایـی پێكەنینەكەی خواردەوە و بە دەنگی نزم و سەرزنشتەوە وتی:

- نی نی گیان، ئەتۆش ئاوا؟

لەناكاو حاڵـەتێكی غـەماوی و حـەزینی پـەیدا كـرد. هەسـتم كـرد ئێسـتا شـتێك دەڵێـت كـە دەبـێ وەڵامـی بدەمـەوە و خێـرا دەسـتم لـە گـەردەنی كردەوە. بە پـشتی دەسـت رووەمـەتی نـەوازش كـردم، سـەرێكی جووڵانـد و وتی:

- سروشتییە.

بە دەنگێكی نزم وتی:

- دواتر.

بە حاڵەتێكی حەزینەوە زەردەخەندەیەكی هاتێ و رۆیشت.

سەیری رۆیشتنەكەیم كرد. هەڵسووكەوتی خۆمم بەلاوە سەیر بوو. تازە كار لە كار ترازاوە و رێگەی گەڕانەوەم نییە. هەرچی دەمكرد و دەمكراند نەمدەتوانی ئەوە بزانم كە هیچ حەزم لەمكارە هەیە یان نا.

نیوەڕۆ ڤێرا رۆژنامـە و نامـەكانی ئـەڵمانیای بۆ هێنـام. یـەكێان لـە لایـەن دكتـۆر "ڤۆگێـل"ەوە بـوو كـە دەیـوت سـێ مـانگی تـەواو بەدوامـەوە بـوو. هەواڵی مردنـی دایكمـی پێدام و نامەیەكی دیكە سەبارەت بەم مەسەلەیە لەلایـەن خوشـكەكانم بێرتـا و گێـردام بەدەسـت گەیـشت. نامەیـەك بـە دەستخەتی قرژاڵ و بۆق، تەواو غەڵەت ویەڵەت.

دكتـۆر ڤۆگێـل لـە نامەكەیـدا ئاگـاداری كردمـەوە كـە قەیـەمی ئێمـەی بەئەسـتۆوەیە و خوشـكەكانمی بـە ژنـی مامـە فـرانتس سـپاردووە و بـۆ دووكانەكەش كەفیلێكی دۆزیوەتەوە. بەڵام لەبارەی خۆم، لە راستیدا درك بـە نەتەوەپەرسـتی مـن دەكـات، بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەش نووسـیبووی كـە

راكردنی من لە ماڵەوە دایكمی تووشی غەم و پەژارەیەكی زۆر كرد كە بێشك بووەتە هۆی خراپتر بوونی بارودۆخی دایكم و هەر بۆیەش كۆچی دوایی كردووە و ئومێدەوارە كە ئەركەكانی بەرەی شەڕ بە باشترین شێوە بەڕێوە ببەم و لە كاتی تەواو بوونی شەڕ ئەركی دیكەم پێسپێردراوە كە دەبێ بەڕێوەیان ببەم.

نامەكانم بە جوانی قەد كرد و خستنمە ناو جانتاكەم. دوایی رۆژنامەكانم كردەوە و هەموو ئەو بابەتانەم بە وردی خوێندەوە كە باسی بەرەی شەڕ لەگەڵ فەرەنسای كردبوو. تەواویانم كرد و دووبارە خستمنە نێوان نەوارێك كە بەدەوریانەوە پێچرابوو و لەسەر كوورسی تەنیشت خۆم دامنان. ئەوكات دەستەكانم لەسەر سینگم خستە سەریەك و لە پەنجەرەوە تەماشای خۆرم كرد كە لەسەربانی تەختەكان رادەكشا.

شەو داهات.

لەگەڵ **ڤێرا** خەوتم.

بۆ بەرەی شەڕ لە فەلەستین گەڕامەوە، دووبارە بریندار بووم و بووم بە شارنشین و نیشانی شانازیم پێبەخشرا و لە گەڕانەوەم لەگەڵ ئەوەیكە تەمەنم كەم بوو، بەڵام پلەیان پێبەخشیم و پێیان دەوتم "پلەدار".

دواتر دەستەی "**گونتۆ**" خرایە پاڵ هەنگی سێیەمی سوارەنیزام كە فەرماندەكەی عەمیدی تورك "**ئەسعەد بێگ**" بوو، لە هێرشێكی پێچەوانە بۆسەر قەڵای "**السط**" كە عەرەبەكان بە فێڵ و فەرتەنە و دەغەڵبازی تەسلیمی ئینگلیزییەكانیان كردبوو بەشداری كرد.

شەڕێكی كوشندە بوو. هاتینەخوارێ و بە عەردەوە نووساین و دوای چل و هەشت كاتژمێر شەڕی تاك بە تاك لە كۆتاییدا توانیمان قەڵایەكە وەربگرینەوە.

بەیانی رۆژی دواتر و بەدەنگە دەنگێکی بەهێز لەخەو راپەریم. لە خێوەتەکەم هاتمەدەر، خۆر کوێری کردم. پاڵم بە دیوارێکەوەدا و نەختێك مژۆڵکەکانم کردەوە. کۆمەڵێکی سپی و سەیرم بینی، جەماعەتێکی بەیەکەوەنووساو لە عەرەبەکان کە بێ جووڵە و خامۆش سەریان بەرز کردبۆوە. ئەمنیش سەرم بەرز کردەوە و چل کەسێك لە عەرەبەکانم بینی بە شاڵەوە کە لەسەر شانەکانیان لوولی خواردبوو لە خۆرەتاوێك کە لە پشتەوە پێیان کەوتبوو بە شێوەیەکی سەیر خۆیان هەڵداویشت و گیانیان دەدا. هەروەکوو ئەوە دەچوو کە بە پێپەتی بۆ ئەو کەسانە سەما دەکەن کە بۆ تەماشا کردنیان کۆ بوونەتەوە. دواتر کەم کەم جووڵەکانیان هێواشتر بوو، بێ ئەوەی بە تەواوی نەمێنێ. هەر ئەمجۆرە بە دەوری خۆیاندا دەسووڕانەوە و دەخوولانەوە، بەجۆرێك کە جاریوابوو هەموو رووخساریان بەدیار دەکەوت و جاریوابوو نیوەی رووخساریان.

چەند هەنگاوێکم نایەوە. سێبەری خانوویەك لەسەر عەرد چوارگۆشەیەکی درووست کردبوو. کە چوومە ناو چوارگۆشەکە، هەستم بە فێنکاییەکی دڵنشین کرد. چاوەکانم بە تەواوی کردەوە و تەنیا ئەوکاتە بوو کە توانیم تەنافەکان (پەتەکان) ببینم.

سلێمان، دیلمانجی تورك، نەختێك لەدواتر وەستابوو و دەستەکانی لەسەر سینگی دانابوو. قەڵافەتی بێزاری و نارەزایەتی لێدەباری.

چوومە لای و لەسێدارەدراوەکانی نیشان دام. برۆکانی لەسەر لووتە دنووك هەڵۆییەکەی تێکنا و وتی:

- ها، ئەوانە؟ شۆڕشییەکانی "ئەمیر فەیسەڵ"ن.

من هەر ئەمجۆرە سەیرم دەکرد.

- سەردەستەکانی کە قەڵای "**السط**"یان تەسلیمی ئینگلیزییەکان کرد. تۆڵەیەکی زۆر بچووکە "**ماین فرۆیند**" (دۆستی بەڕێز). گەورەم "**جەمالْ پاشا**" لە راستیدا زۆر بەخشەندەیە! کاری دروستتر ئەوەبوو کە هەموویان لەدار بدرێن!

- هەموویان؟

سەیرێکی کردم و هەموو ددانە سپییەکانی دەرخست:

- هەموو عەرەبەکان، هەموویان!

لەوکاتەوە هاتبوومە تورکیا، مردوویەکی زۆرم بینیبوو. بەڵام ئەم لەدار دراوانە هەستێکی نفرەتاوی لەمندا پێکهێنابوو. پشتم تێکردن و رۆیشتم.

شەو، "**ریتمایستر گونتر**" منی بانگ کرد. لەناو خێمەکەی لەسەر کوورسییەکی بچووك دانیشتبوو. رێك وەستام وسڵاوم کرد. ئیشارەی کرد ئازاد بوەستم و بێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێ بەردەوام بوو لە یاری کردن بەخەنجەرێکی عەرەبی کە دەستەکەی زیو بوو و لەناو دەستیدا دەیهێناو دەیبرد.

دوای کاتێکی کەم رائیدی سێیەم "**فون ریترباخ**"یش گەیشتێ. پیاوێکی باڵابەرز و زۆر لاواز بە برۆی رەشی درێژەوە. **ریتمایستر** دەستی لەگەڵ لێدایەوە و بێ ئەوەی سەیری بکات وتی:

- ئەمشەو مەعموریەتێکی مەترسیدارم بۆ ئێوە هەیە رائید. تورکەکان دەیانەوێ بە مەبەستی تۆڵە هێرش بکەنە گووندێکی ئەم نزیکیانە. گوندێکە کە خەڵکەکەی لەکاتی چوونەدەری تووركەکان لەناوچە رووی خۆشیان بە ئینگلیزییەکان نیشان داوە.

لەسیلەی چاوی سەیرێکی "**فون ریتر باخ**"ی کرد و بەبێ خولقی وتی:

– بەبڕوای من ئەم مەسەلەیە پەیوەندی تەنیا بە خوودی تورکەکانەوە هەیە، هەرچەند ئەوان حەز دەکەن لەم تۆڵە سەندنەوەیەدا بەشدار بین.

**فون ریترباخ** برۆکانی هەڵاویشت. **ریتمایستر** بەوپەڕی بێ حەوسەلەیی هەستایە سەرپێ و دوو هەنگاوێك لەناو خێوەتەکەدا رۆیشت و گەڕایەوە و وتی:

- **هێرگوت**، ئەمن بۆ ئێرە نەهاتووم کە شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان بکەم!

**فون ریتر باخ** هیچی نەوت. **ریتمایستر** لە هەنگاونانەوە بەردەوام بوو و دوایی بۆلای ئێمە سووڕایەوە و بە خۆشڕوویییەوە وتی؟

- گوێ بگرن رائید. ئێوە سی کەس لەگەڵ خۆتان هەڵدەگرن. لەگەڵ ئەو رۆدۆلفە بچکۆڵەی خۆمان کە لێرە ئامادەیە و تەنیا کارێك کە دەیکەن دەورەدانی گووندەکەیە.

**فون ریترباخ** وتی:

- لە خزمەت دام، **هێر ریتمایستر**!

**ریتمایستر** خەنجەری عەرەبی دەستدایە نەختێك بەخواری سەیری **فون ریترباخ**ی کرد.

– ئەو فەرمان و ئەمرانەی بە ئێوەم کردووە ئەمانەن: دەورەگرتنی گووندەکە و بەرگری کردن لە تێپەڕبوونی یاغییەکان. ئەمە و بەس.

**فون ریتر باخ** برۆکانی هەڵێنا و وتی:

- **هێر ریتمایستر**....

- یا؟

- ئەگەر ژنەکان ویستیان لەنێوان ئێمە تێپەڕن؟

**ریتمایستر** بەشێوەیەکی ناڕەزامەندانە سەیرێکی کرد، بۆ کاتێکی کەم بێدەنگ بوو، دوایی بە دەنگێکی وشك وتی:

- لە فەرمان و ئەمردا نەهاتووە چییان لێبکەن.

**فون ریتر باخ** چەنەگەی هەڵویشت و قورقوڕۆچکەیم بینی کە لەناو ملیدا سەروخواری دەکرد.

- ئایا ژن و منداڵەکانیش یاغین **هێر ریتمایستر**؟

عەمید هەستا و بە دەنگێکی بروسکئاسا وتی:

- **هێرگوت، لویتنانت!** (رائید) جارێك پێم وتن کە ئەم مەسەلەیە لەناو ئەم ئەمرەدا نەهاتووە!

- پرسیارێکی دیکە **هێر ریتمایستر**: ئەگەر یاغییەکان بۆخۆیان ویستیان تێپەڕن، چی؟

- ئەمریان پێبکەن بگەڕێنەوە.

- ئەگەر نەگەڕانەوە؟

**ریتمایستر** قیژاندی:

- **لویتنانت!** ئێوە سەربازن یان نا؟

**فون ریتر باخ** لەناکاو کارێکی کرد کە چاوەڕوانی لێی نەدەکرا: یانی پێکەنی. دوایی بە دەنگێکی زۆر تاڵ وتی:

- بێشك سەربازین.

**ریتمایستر** دەستی جووڵاند. **فون ریترباخ** بە سەلابەتەوە سڵاوی دایەوە و ڕۆیشتە دەرەوە. لە تەواوی ماوەی گفتوگۆکە، تەنانەت ئەو کاتەی کە **ریتمایستر** وتی: "**ڤون زرن کلای نم رۆدۆلف**" (ڕۆدۆلفە بچکۆلانەکەی ئێمە)، رائید **فون ریترباخ** منی شایستەی ئەوە نزانی کە تاکە جارێکیش سەیری من بکات.

**ریتمایستر** کە بە چاوەکانی ڕۆیشتنی سەیر دەکرد بە پرتەبۆڵەوە وتی:

- ئاخ، رۆدۆلف! هاوار لەدەست ئەو نەجیبزادە دێهاتیانە! ئەو بەرو ژیانە، ئەو فیس و ئیفادانە و ئەو ویژدانە نەعلەتییە مەسیحیانەیان! هەربینە لەم رۆژانەدا کلکی ئەو بەناو نەجیبزادانمان گرتن و بەدرەمان نان.

ئەمن پلانەکەم بۆ سەربازەکانم شی کردەوە و نزیك کاتژمێر یازدەی شەو رائید **فون ریتریاخ** ئیشارەی دا کە بەڕێکەوین. هەوا زۆر بەسەیری روون بوو.

چارەگە کاتژمێرێك بە غارەغاری ئەسپ دوور کەوتینەوە، **سلێمان** کە پەیوەندی ئێمەی لەگەڵ گرووپی تورك ریکدەخست خۆی گەیاندە ئێمە و ئاگاداری کردینەوە کە نزیك دەبینەوە و ئەو لە بەشەکەی خۆی جیا بۆوە کە ئێمە رێنوێنی بکات و راستی دوای چەند خوولەکێك چەند پەڵەی سپی لەمانگەشەودا بەرچاومان کەوت و یەکەمین خانووەکانی گووندمان بینی.

**فون ریتریاخ** ئەمری پێکردم کە لەگەڵ سەربازەکانم رێگەی رۆژهەڵات بگرمەبەر و خۆیشی لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لە سەربازەکان رێگەی رۆژئاوای گرتەبەر و لەماوەی چەند خوولەك، دوای دابەش کردنی سەربازەکانم، لەملایەی گوندەکە خۆم گەیاندە دەستەی دووهەم.

تەنانەت چوارپێیەکیش پێمان نەوەڕی.

چەند خوولەکێك چاوەڕێ ماینەوە. دەنگی هێرشی تورکەکان کە لەلای باکوورەوە دەهات زەوی دەلەرزاند. بێدەنگییەکی قووڕس پەیدا بوو. فەرمانێکی ئاشکرا ئاسمانی دڕی و دەنگەدەنگی ناڵی ئەسپەکان هەڵسایەوە. هورا و هوتاف وەحشیانە بەرز بۆوە، دەنگی دوو گوللەی تفەنگ هات و یەکێ لە سوارکاران لە لای چەپی من بە دەنگێکی نزم وتی:

- دەستیان پێکرد.

هەرا و هوریایەکان بڕان. گوللەیەکی دیکە لە شوێنێکی پەرت دەنگی هات و هەموو شتێ خۆی هاویشتە پاڵ بێدەنگییەوە.

دراگونێک خۆی گەیاندە من و هاواری کرد:

- هێر، ئۆنتەرۆفیزێر (Her Unteroffizer) (مفەوەن) بە ئەمری رائید: هەموومان لە بەشی باکوور!

بەردەوام بوو کە:

- تورکەکان گوندەکەیان بە هەڵە گرتووە.

بە پێچەوانەی ئەم شوێنەی پێداهاتبووین، گەڕاینەوە و سەربازەکانم کۆ کردەوە. **فون ریتریاخ** لە رێگای سەرەکی گوندەکە لەگەڵ **سلێمان** خەریکی گفتوگۆیەکی توند بوو. لە چەند مەتری ئەوان وەستام. **فون ریتریاخ** شەق و رەق لەسەر ئەسپەکەی دانیشتبوو، رووخساری بێ رەنگی لەژێر مانگەشەو دیار بوو و بە مۆڕەمۆڕ سەرتاپێی **سلێمان**ی سەیر دەکرد. لەناکاو دەنگی بەرز بۆوە، من گوێم لێی بوو کە دەڵێت:

- ناین! ناین! ناین! (نەخێر)

**سلێمان** بە خێرایی کارەبا رۆیشت و دوای ماوەیەکی کوورت لەگەڵ رائیدێکی تورک گەڕایەوە کە باڵا و قەڵافەتێکی گەورە و قەڵەوی ئەسپەکەی هەبوو و بە تەواوی دیار بوو کە ئاژەڵی بەستەزمان لەژێر لاشەی قوورسی گیانی دەردەچێت.

رائیدی تورک شمشێرەکەی دەرهێنا و لەکاتێکدا لەپێش خۆی دەیجوولاند خیتابەیەکی تەواوی بە زمانی تورکی وت. **فون ریتریاخ** بە جۆرێک بێ جووڵە لەسەر جێگەی خۆی وەستابوو هەر دەتوت پەیکەرە.

کاتێك رائیـدی تـورك قسەکانی تـەواو کـرد، دەنگـی سلێمان تونـد و خێـرا بەزمانی ئەڵمانی بەرز بۆوە.

ئەمن گوێم لەمانە بوو:

- رائیـد... قـەولی شـەرەف... بـە شمـشێرەکەی.... نـە یـەك گونـدی باش.....

ئەوکات فون ریترباخ سلاوێکی وشکی دا و بۆلای ئێمە هات. نزیکی من بۆوە و زۆر بەساردی وتی:

- هەڵە روویداوە، بەرێکەوین.

ئەسبەکەی تەواو نزیك بە ئەسبی من بوو و بینیم دەستە بڵند و رەشە سووتاوەکانی دەلەرزی. دوای ماوەیەکی کوورت وتی:

- ئێوە بکەونە پێشەوە. ئەم سلێمانە رێگەتان نیشان دەدات.

وتم: – تزوبەفل، هێرلویتنانت؟

راست بەرامبەر بەخۆی سەیر کرد و لەناکاو بە توورەییەوە قیژاندی:

- جگە لەمە "تزوبەفل، هێرلویتنانت" هیچ شتێکی دیکە نازانن بڵێن؟

نیو کاتژمێرێك کە بە راکەراکەی ئەسب دوور کەوتینەوە، سلێمان دەستی بە بەرزایی سینگی من بڵند کرد، کاتێك وەستاین وتی:

- گوێ بگرن، دەنگی سەگ دێت.

بەردەوام بوو:

- ئەمجارە بێشك گووندی یاغییەکانە.

دراگـونیێکـم نـارد کـە رائیـد ئاگـادار بکاتـەوە و هـەمان پلانـی پێـشوو بەرێوەچوو، بەڵام ئەمجارە لەگەڵ وەڕینی توندی سـەگەکان. سـەربازەکان هەرکامە لە شوێنی خۆیان وەستان. بێ خووڵق و بێدەنگ بوون.

شتێکی سپی زۆر بچووک لەناو ماڵەکان دیاربوو. دراگونەکان جووڵەیەکیان نەکرد، بەلام هەستم کرد دڵەڕاوکێ و ترس سەرتاپێی ریزیانی گرتووە.

سپیایی، بە دەنگێکی سەیرەوە لێمان نزیك بۆوە و وەستا. سەگێك بوو و لەکاتێکدا هەنگاوهەنگاو پاشەکشێی دەکرد. کلکەجووڵەی کرد و بەرامبەر بە ئێمە دانیشت و بە بۆن کردنەوە دەستی بە وەڕین کرد.

لەهەمانکات دەنگی چوارناڵێك، تەقاندنی گوللەیەك لە بێدەنگی و قیژەی ژنێك بەرز بۆوە: دەنگی "ها! ها! ها!"ی تیژی جەرگبڕ کە کۆتایی نەبوو. دوای ماوەیەکی کورت لەهەرلاوە دەنگی تەقەی تفەنگ بوو کە بەرز دەبۆوە. ئەوکات رووناکییەکی توند ئاسمانی روون کرد و دەنگە دەنگ و گریان و ناڵە ناڵە بە ئاسمان گەیشت و ئەسبەکان دەستیان بە بێ قەراری کرد.

سێ سەگ بە راکردن لە گوند درکەوتن، بە خێرایی بۆلای ئێمە هاتن و رێك کە گەیشتنە بەردەم ئەسبەکانی ئێمە، وەستان. یەکیان کوونێکی پانی خوێناوی لەسەر شانی بوو. دەستیان بە وەڕین کرد و وەکوو منداڵان ناڵە ناڵیان بوو. دوایی، لەناکاو غیرەتێکی بەخۆی دا و وەکوو تیرێك خۆی هاویشتە نێوان ئەسبی من و "بۆرکێل" (Burkel) و ئەم دوو سەگەکەی دیکەش رێگەی ئەویان گرتەبەر. لەسەر زینی ئەسب سووڕام بۆئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچن: چەند جارێك خۆیان هەڵاویشت و دوایی وەستان، لەسەر کلکیان دانیشتن و حەپەحەپی مەرگیان گوێی فەلەکی کەڕ کرد.

"ها! ها! ها!"یەکی ناخۆش بەرز بۆوە. دووبارە بۆ ئەولا گەڕامەوە. لەلای گوند دەنگی گریان و رۆرۆ بەرز دەبۆوە و گوللەیەکی زۆر بەسەرماندا تێپەڕی.

سەگەکان لە پشت سەرمان دەوەڕین و ئەسپەکان لەژێر ئێمە بێقەراری خۆیان نیشان دەدا.

سەرم بۆلای راست وەرگێڕا و وتم:

- بۆرکێل، گوللەیەك بهاوێ و ئەم سەگانە دوور بخەوە.

- لە خۆیان بدەم، "هێر ئۆنتەرۆفیزێر؟

بە تووڕەییەوە وتم:

- هەڵبەت کە نا. سەگی زمان بەستراو.... گوللەی هەوایی درکەن.

بۆرکێل گوللەیەکی هاویشت.

گروپێك تارمایی سپی، بەڕاکردن لە گوند بەدەر کەوتن و سەراوژێر بۆلای ئێمە رایانکرد. دەنگێکی زۆر تیژی ژنێك بەرز بۆوە. لەسەر زینی ئەسپ خۆم راست کردەوە و بە عەرەبی هاوارم کرد:

- بڕۆ!

تارماییەکان وەستان، گەڕانەوە، چونکە دوودڵ بوون کە هێرشیان کرایەسەر. تیغەی شمشێرەکان درەوشانەوە.و ......والسلام.

ئێستا لە سی مەتری ئێمە بێ جووڵە دیار بوون، جێگەیەکی زۆر کەمیان گرتبوو.

لای راستی من گرێکی شینی بچووك دەست و رووخساری دراگونێکی روون کرد. کاتژمێرەکەی سەیر دەکرد و کە بینیم هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە، هاوارم کرد:

- دەتوانن جگەرە بکێشن.

دەنگێك بە خۆشحاڵییەوە وەڵامی دایەوە:

- "**شونێن دانك**" (Schonen Dank) (زۆر سوپاس).

خاڵی سووری بچووك هەموو ریزی سەربازانی داگرت و مێشکەکان حەسانەوە.

قیژە و گریانەکان بە جۆرێکی جەرگبڕ دووبارە بۆوە کە وەڕینی سەگەکانی داپۆشی. کەس نەیدەتوانی دەنگی ژن و پیاو لەناو ئەم هەموو گریان و رۆرۆیەدا جیا بکاتەوە. دەنگێك کە دەهات یەك "ها! ها! ها!ی تیژ و لەهەمانکاتدا ئاشکرا بوو کە بە رۆرۆ دەچوو.

هێورییەك پەیدا بوو و بۆرکێل وتی:

- **هێر ئۆنتەرۆفیزێر**، سەیر کەن!

قەڵافەتێکی بچووکی سپی لە سەراوژێرەوە بۆلای ئێمە دەهات. بەڵام دوودڵ بوو.

دەنگێك بێمنەتانە وتی: - سەگە.

سپیایی بەهێواشی دەجووڵایەوە. وەکوو منداڵێك کە بگریت. لەسەر وردکە بەردەکان بەلادادەهات و بە هێوری و بە ترسەوە بۆ پێشەوە دەهات. جارێك بەربۆوە و چەند مەترێك خلۆر بۆوە، بەڵام دووبارە هەستایەوە. سێبەری ماڵێك کەوتەسەری و بەتەواوی ونی کرد، بەڵام لە ناکاو لەمانگەشەو هاتەدەر.

گەیشتە ئێمە، کوڕە منداڵێك بوو پێنج شەش ساڵە، کراسێکی لەبەر بوو و پێپەتی، بە برینێکی خوێناوی ملیەوە. وەستابوو و پێشی لە بەربوونەوەی دەگرت. بە ترسەوە سەیری ئێمەی دەکرد و بە دەنگێکی بەرز دەستی بە هاوار کرد:

- بابە! بابە!....

دوای وتنی چەند جار "بابە" بە روو کەوتە خوار.

**بۆرکێل** لە ئەسبەکەی هاتەخوار و لە تەنیشت ئەو چۆکی دادا. ئەسبەکەی چەند هەنگاوێك کشایەوە، بەڵام من توانیم لغاوەکەی بگرم.

بانگم کرد: – **بۆرکێل!**

وەڵامێکم نەبیست. بێ ئەوەی دەنگم بەرزتر بکەم دووبارە بانگم کرد: – **بۆرکێل!**

هەستا و بۆلای من هات و لە تەنیشت ئەسبکەم وەستا. کەللەی چوارگۆشەی لە مانگەشەودا بریقەی دەدا. سەیرم کرد و وتم:

- کێ ڕێگەی پێدای دابەزی؟
- هیچکەس، "**هێر ئۆنتەرۆفیزێر** ".
- ئەمن فەرمانم پێدای دابەزی؟
- "**ناین، هێر ئۆنتەرۆفیزێر** ".
- ئەی بۆچی ئەمکارەت کرد؟

نەختێك بێدەنگ بوو و وتی:

- وامزانی کارێکی باش دەکەم، "**هێر ئۆنتەرۆفیزێر** ".
- نابێ وابزانی، دەبێ گوێڕایەڵ بی **بۆرکێل**.

لێوەکانی بە ددان گەست و بینیم کە عارەقە لە چەنەگەی دێتەخورا. بە زەحمەت وتی:

- "**یا، هێر ئۆنتەرۆفیزێر**."
- سزا دەدرێی، **بۆرکێل**.

بێدەنگییەك پێکهات. هەستم کرد سەربازەکان هەموویان گوێیان بۆ ئەم بێدەنگییە تیژ کردەوە و وتم:

- سوار بن.

بۆرکێل بۆ کاتێکی زۆر سەیری کردم. عارەقە سەروچاوی داپۆشیبوو. وتی:

- "هێر ئۆنتەرۆفیزێر"، منیش منداڵێکی ئەو تەمەنەم هەیە.
- سوار بن بۆرکێل!

جڵەوی ئەسبەکەی لەمن وەرگرت و سوار بوو. کاتێك کە تێپەڕی، بینیم رووناکی جگەرەیەك هێڵێکی روونی لەناو شەودا پێکهێنا و بە بریقەیەکی بچووك وەئەردی کەوت. دووهەم جگەرە و دیسان جگەرەیەك و دیسانیش جگەرەیەکی دیکە. لە سەرووی ریزەوە هەتا کۆتایی. هەستم بەوە کرد کە سەربازەکان نەفرینم دەکەن.

لە کاتژمێری راحەتباش دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ سلێمان وتی:

- دوای شەڕ، ئێمە بە تەواوی عەرەبەکان دەسڕینەوە. هەر بەم شێوەیە کە ئەرمەنییەکانمان سڕییەوە و رێك بەو هۆیەشەوە.

تەنانەت لەژێر خێوەتیش گەرمای خۆر تەحەموول نەدەکرا. لەسەر ئانیشکم خوار بوومەوە و هەر ئەوکات بەری دەستەکانم عارەقەی کرد. پرسیم:

- سەبارەت بە کام هۆکار؟

سلێمان خێرا بە شێوەیەکی خۆ بەزلزانیەوە وتی:

- لە تورکیا، جێگەی عەرەبەکان و تورکەکان جیاوازە.

راست دانیشتن و لەناکاو لە قاقای پێکەنینی دا و وتی:

- ئەوە رێك ئەو مەسەلەیە کە فەرماندەی ئێمە دەیویست رائید فون ریتر باخ تێبگەیەنێت. بە خۆشییەوە رائیدی ئێوە تورکی نازانێ....

نەختێك بێدەنگ بوو.

- چونکە نابێ لەوە تێگەیشتبێ کە کاتێك گووندی یاغییەکانمان لەناو برد، گووندی عەرەبەکانیشمان وەکوو ئاوخواردن لەناو برد.

من بە دەمی کراوە سەیریم کرد و ئەویش لە قاقای پێکەنینی دا. پێکەنینێکی تیژ و ژنانە. شانەکانی هەڵداویشت و وەکوو جۆڵلانە دەجووڵایەوە و هەرکات بۆ پێشەوە دەگەڕایەوە هەر دوو دەستی بە توندی لە زەوی دەدا.

کەم کەم هێور بۆوە. جگەرەیەکی پێکرد، دووکەڵێکی دوورودرێژ لە لووتی هاتەدەر و وتی:

- بوونی دیلمانجێکی باش، لەمجۆرە جێگایانەیە کە بەکەڵك دێت.

دوای نەختێك بێدەنگی و بیرکردنەوە وتم:

- خۆ ئاخر ئەم گوندە گوناەیان نەبوو؟

هەواڵی ئەوەم نییە کە دوایی فەرماندەی تورکەکان چۆن باسی ئەم مەسەلەیەی بۆ فەرماندەی ئێمە کردووە. زانینیشی گرنگ نەبوو، چونکە فەرماندەکەمان دوای دوو رۆژ بەشێوەیەکی زۆر گێلانە و لەبەرچاوی من خۆی بە کوشتن دا. واپێدەچوو هەر بە ئەنقەست وایکردبێ، ئاخر ئەم رۆژە جوانترین ئۆنیفۆرمی خۆی لەبەر کردبوو و هەموو نیشانەکانیشی بە سینگییەوە هەڵواسیبوو.

بردیانەوە ناو خێوەتەکەی، بەدوای ڕیتمایستر گونترم نارد و خۆشم لەگەڵ عەریف "شرادر" لای مەیتەکەی مامەوە. دوای چەند کاتژمێرێك ڕیتمایستر هات. لەژێر تەختی سەفەری ڕێك وەستا، سڵاوی کرد، **شرادری** بۆ دەرەوە نارد و ڕووداوەکەی لە من پرسی و داوای لێکردم بە وردی ڕووداوەکەی بۆ بگێڕمەوە. برۆکانی تێکنا و کاتێك قسەکانی من تەواو بوو لەناو خێوەت بەردەوام هاتووچۆی دەکرد و بەردەوام لە پشتەوە

دەستەکانی پێکەوەدەنا و دەیکردەوە. دوایی وەستا و بە قەڵافەتێکی ناڕازی سەیری مەیتەکەی کرد و لەژێرلێو وتی:

- کێ وایدەزانی ئەم گێلە....؟

بەیانی ئەمڕۆژە سەربازەکان سیلاح و فیشەکی تەواویان هەڵگرت و ریتمایستر نوتقێکی کورتی کرد کە بەبڕوای من نوتقێکی باش بوو و بە تایبەت بۆ ورەی سەربازان بەسوودم زانی. هەرچەند نەختێك زیاتر لەوەیکە فون ریتر باخ شیاوی بوو، باسی کرد و بە شایستەیی یادی کرد.



## نۆزدەی سێپتەمبەری ١٩١٨

ئینگلیزییەکانی دەستیان بە هێرشێکی زۆر توند کرد بەرەی شەڕ تێکشکا. تورکەکان بۆلای باکوور رایانکرد.

ئێمە لە دیمەشق ماینەوە، بەڵام حەسانەوەمان سەخت و کوورت بوو و دووبارە ناچار بووین هەتا حەلەب پاشەکشە بکەین.

سەرەتای ئۆکتوبەر گروپەکەمان بۆ "ئادانا" (Adana) گوازرایەوە، نزیک خەلیجی ئەسکەندەرون و چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە بێ ئەوەی هیچ کارێکی بکەین. تەنیا سلێمان سەبارەت بە نیشاندانی ئەم هەموو فیداکارییەی کە لەکاتی پاشەکشە لەخۆی نیشان دابوو نیشانێکی سەلیبی ئاسنینی پێ بەخشرابوو.

نزیك کۆتایی ئۆکتوبەر، لە گوندەکانی دەوروبەری ئادانا نەخۆشی وەبا پەیدا بوو و کەم کەم تەواوی ناوچەی ادگرت و رۆژی بیست و هەشتەمی ئۆکتوبەر ریتمایستر گونتری لەماوەی چەند کاتژمێر لەپێ دەرهێنا.

ئەم مردنە بۆ قارەمانێك کۆتاییەکی حەزین و پڕ لە غەم و پەژارە بوو.

من "**ریتمایستر گونتر**"م دەپەرست. لە سایەی ئەو بوو کە توانیم بێمە ناو سوپا. ئەمرۆژە و رۆژەکانی دواتر زۆر تووشی سەرسووڕمان بووم کە مردنی ئەو هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەمندا نەکرد. کاتێك بیرم لەم مەسەلەیە دەکردەوە بەم ئەنجامە دەگەیشتم کە مەسەلەی زانینی ئەوەیکە ئەوم خۆش دەویٚ یان نا، ئەوەندە جێگەی باس و بەلامەوە گرنگ نەبوو هەتا ئەوەیکە بۆ نموونە ڤێرام خۆش دەویٚ.

شەوی سی و یەکەمی ئۆکتوبەر هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە تورکیا لەگەڵ "**ئانتێنت**[٢٣]" (Antente) بۆندی دوورکەوتنەوە لە شەڕی واژوو کردەوە.

**سلێمان** بە سەرشۆڕی بە منی وت:

- تورکیا تەسلیم بووە و بەمحاڵەشەوە ئەڵمانیا ئێستاش شەڕ دەکات.

فەرماندەیی گرووپی **گونتریان** بە نەقیب **ڤون رێکۆف** دابوو و رۆیشتن بۆ وەتەن دەستپێکرد. بە تێپەڕبوون لە وڵاتەکانی بالکان، ئارم ئارام رێگەی ئەڵمانیامان گرتەبەر. سەفەرێکی زۆر سەخت و دژوار بوو، چونکە هیچ جلێکمان جگە لە جلێکی تەنك نەبوو و سەرماش زۆر لەوە زیاتر بوو کە دەبوایە لەم وەرزەدا هەبیٚ. هەربۆیەش تەلەفاتێکی (کوشتە و بریندار) زۆرمان دا.

رۆژی دوازدەهەمی نوامبەر، لە مەقدونیە، بەیانییەکی باراناوی، کاتێك لە گوندێکی وێران کە شەوی پێشوو لەوی پشوومان دابوو دەچووینەدەر، نەقیب **ڤون رێکۆف** فەرمانی دا بوەستین و سەربازەکان روو بە چەپی

[23] - ناوی یەکێتییەکە کە لەنێوان یۆگسلاڤیا و چکسلۆڤاکیا و رۆمانی پێکهات هەتا متمانەی عەهدنامەکان کە دوای شەڕی گەورە ئیمزا دەکرێن، رابگرن.

جاددە ریز بن و بۆخۆشی لەلایەکی دیکەوە ئەوەندە بۆ دوایە رۆیشت هەتا سەر و بنی ریزەکە ببینێت. ماوەیەکی زۆر بێ ئەوەی هیچ شتێکی بڵێت هەر بەم شێوەیە مایەوە و هەر لەوێ وەستا. کز ببۆوە و لەسەر ئەسبی سپی بە ئۆنیفۆرمی دڕاوی پەڵەیەکی روونی پێکهێنابوو. دوایی سەری بەرز کردەوە و جووڵەیەکی بچووکی بە دەستی چەپی دا و بە دەنگێکی زۆر نزم وتی:

- ئەڵمانیا تەسلیم بوو.

بەشێکی زۆری سەربازەکان گوێیان لێ نەبوو. دوودڵییەك پێکهات و پسکەپسك لەملا و لەولای ریزی سەربازان دەستی پێکرد و **ڤون رێکۆف** بە دەنگی هەمیشەیی هاواری کرد:

- "**روهە**" (Ruhe) (بێدەنگ.)

بێدەنگی جاددەی داگرت و ئەو قسەکەی دووبارە کردەوە، زۆر بە زەحمەت و بەرزتر لە جاری پێشوو دووبارەی کردەوە:

- ئەڵمانیا تەسلیم بوو.

ئەوکات لە رکێفی دا و خۆی گەیاندە سەرەتای ریز و ئیتر جگە لە تەقە تەقی سمی ئەسبەکان هیچیتر بەگوێ نەدەگەیشت.

من راست رووبەڕووی خۆم سەیر کرد. وەکوو ئەوە بوو چاڵێکی رەشی گەورە لەبەر پێم دەمی کردووەتەوە. دوای چەند خوولەکێك دەنگێك بەرز بۆوە:

**ئێمە دەجنگێن**

ئێمە فەڕەنسا داگیر دەکەین.

بەشێك لە دارگوڵەکان وەحشیانە دەستیان بە خوێندنەوەی سروود کرد.

باران توندتر بوو.

سمی ئەسبەکانیش ئاهەنگێکی ناڕێکی پێکهێنابوو و لەناکاو بەجۆرێك بایەکە ساردی کرد و بارانێك باری کە سروودەکە لاواز بۆوە، تێکەلاو بوو، بلاو بۆوە و لەناو خۆیدا مرد.

دوای ئەوە بە جۆرێکی لێهات کە بریا هەر لە سەرەتاوە ئەم سروودە نەعلەتییەمان نەخوێندبۆوە!



## ١٩١٨

له ئەڵمانیا بەشەکەی ئێمە لەم ناوەندە بۆ ئەم ناوەندە بەڕێدەکرا بێ ئەوەی کە کەس بزانێ کێ بەرپرس و فەرمانده‌ی ئێمەیە و مفەوەز "شرادر" بەمنی وت:

- ئیتر کەس پێویستی بە ئێمە نییە. گروپەکەی ئێمە کۆتایی پێهاتووە؟

لەکۆتاییدا گەیشتینە شاری دەسپێك، یانی بە شاری ب. گەیشتین، لەوێ خێرا سیلاحەکانیان لێستاندین بۆ ئەوەی نان و خۆراکمان نەکەوێتە ئەستۆیان. جلکە مەدەنییەکانیان پێدایینەوە. پارەیەکی کەمیان پێدایین و وەرەقەی هاتووچۆیان لەدەستی ناین کە بتوانین بۆ سەر ماڵ و ژیانمان بگەڕێینەوە.

بەرەو شاری "هـ"سواری شەمەندەفەر بووم. لەناو ژوورەکەی شەمەندەفەر، لە تیشەرت و پانتۆڵێك کە ئێستا زۆریش بۆم کوورت ببۆوە، خۆم زۆر پێ سەیر بوو. هاتمە ناو ڕێرەوەکەی ناو شەمەندەفەر وەستام. چاوم بە پیاوێکی ڕەشی زەبەلاحی باڵابەرز کەوت کە سەری تراشیبوو و شانە گەورەکانی نەختێکی مابوو دروومانی جلکەکانی لەبەریەك

هەڵوەشێنێ. کاتێك ئاوڕی دایەوە، بینیم شرادرە. سەیرێکی منی کرد، لووتە شکاوەکەی بە پشتی دەستی سڕییەوە و لە قاقای پێکەنینی دا.

- ئاها، ئەتۆی؟ ئەوە چییە لەبەرت کردووە! خۆت وەکوو کووڕان لێکردووە.

- ئەتۆش وەکوو من.

سەیرێکی بەژن و باڵای خۆی کرد و وتی:

- ئەمنیش وەکوو تۆ.

برۆ رەشەکانی لە هێڵێکی راست و ئەستوور لەسەر چاوەکانی کەوتبوون. بۆ ماوەیەکی کوورت سەیری کردم و رووخساری تێکچوو:

- حاڵ و رۆژی جووتێك تەلخەکی (کەسێك کە خەڵك وەپێکەنین دەخات) سەیروسەمەرەمان هەیە.

مستێکی رەوانەی شووشەی شەمەندەفەرەکە کرد و وتی:

- ئەتۆ بۆ کوێ دەچی؟

- شاری هـ.

فیتوویەکی لێدا و وتی:

- وەکوو من، باوك و دایکت لەوێن؟

- ئەوان مردوون، بەڵام قەییم و خوشکەکانم لەوێن.

- ئێ، دەتهەوێ چی بکەی؟

- نازانم.

تەپڵی بە شووشەی شەمەندەفەر لێدەدا و هیچی نەوت. دوایی جگەرەیەکی لەناو بەرکی دەرهێنا و دوولەتی کرد و لەتێکی بە من دا.

بە دەنگێکی حەزین وتی:

- دەبینی؟ ئێمە لێرە زیادەین، نەدەبوایە بگەڕێینەوە.

بێدەنگییەك رووی دا. دوایی وتی:

- فەرموو، با نموونەیەکت بۆ بڵێم، موو زەردێکی بچکۆڵانە لەم ژوورەیە. (بە دەست ژوورەکەی خۆی نیشان دام) ناسك و جوانە. رێك بەرامبەر بە من..... باشە: بەجۆرێك سەیری دەکردم هەر دەتوت سندەم (دەستی بە توندی بۆلای ئەرد برد).

- وەکوو لەتێك پیسایی! سەلیبی ئاسن و هەموو شتەکان! وەکوو لەتە پیساییەك!

بەردەوام بوو و وتی:

- هەر بۆیە لەوێ هاتمە دەرەوە.

دووکەڵی جگەرەی دایە دەرەوە، سەری بۆلای من خوار کردەوە و وتی:

- دەزانی لە بەرلین خەڵك چی بەو رائیدانە دەڵێن کە بە ئۆنیفۆرمەوە لە کۆڵان و شەقامەکان دەیانبینن؟ (سەیری کردم و بە دەنگێکی پڕ لە رق و کینە وتی:)

- سەرشانەکانیان لێدەکەنەوە. (مەبەست نیشانەی پلەی سەربازییە)

شتێك قورگی گرتم. وتم: – بەڕاستیتە؟

سەرێکی راوەشاند. بۆ کاتێکی کەم بێدەنگ بووین و ئەو دووبارە سەرلەنوێ پرسی:

- باشە، ئێستا دەتەوێ چی بکەی؟

- نازانم.

- باشە بزانم چ کارێك دەزانی؟ (بێ ئەوەی رێگەم بدات وەڵامی بدەمەوە بەپێکەنینەوە وتی:

- هیچ نازانم! باشە بۆخۆم مەگەر چ کارێك دەزانم و چیم لەدەست دێت. هیچی! ئێمە تەنیا دەتوانین شەڕ بکەین و کەسیش ئێستا پێویستی

بە شەڕ نییە. باشە..... ئەگەر حەز دەکەی با پێت بڵێم: ئێمە بێکارین. (جنێوێکی دا) — بەڵام چ باشتر! هێرگوت، ئەمن حەز دەکەم هەموو تەمەنم بێکارە بمێنمەوە هەتا بۆ کۆماریی لەعنەتی ئەوان کار بکەم!

دەستە پان و بەرینەکانی لە پشت سەری دانا و سەیری رووبەڕووی خۆی کرد. دوایی لاپەڕە کاغەزێك و قەڵەمێکی لەناو بەرکی دەرهێنا و پاڵی بە شووشە دا و هەندێ شتی لێ نووسی و درێژی کردە لای من:

- هانێ، ئەوە ئادرەسی منە. ئەگەر نازانی بۆ کوێ بچی، ئەوا یەك راست وەرە لای من. زیاتر لە ژوورێکم نییە، بەڵام هەمیشە بۆ هاوڕێیەکی کۆنی گرووپی گونتر جێگەم هەیە.

- بڕوات ئەوەندە هەیە کە ژوورەکەت لە شوێنی خۆیەتی؟

وەپێکەنین کەوت و وتی:

- ئۆە! ئەوەکە بە- لێ! و بەردەوام بوو:

- خاوەنماڵەکەم بێوەژنە.

لە شار یەك راست بۆ ماڵی مامە فرانتس رۆیشتم. هەوا تاریك ببوو و نم نم باران دەباری. کۆتم نەبوو و سەرتاپێ تەڕ بووم.

ژنی مامە فرانتس دەرگای بەڕوومدا کردەوە؟

- ئۆە، ئەوە ئەتۆی، وەرە ژوورێ.

ئەم رستەیەی بەجۆرێك وت کە هەر وەکوو دوێنێکەیش منی بینیوە.

ژنێ بوو درێژ و خوێنتاڵ بە نەختێك سمێڵەوە و پەشمێکی رەش لەسەر گۆناکانی. لەژێر چرای مەمەڕی ماڵیان زۆر پیرتر لەجاران هاتە بەرچاوم.

- خوشکەکانت لێرەن.

- مامە فرانتس لە کوێیە؟

زۆر بە سەیری چاوی تێبڕیم و بە دەنگێکی ناخۆش وتی:

- لە فەڕەنسا کوژرا.

بەپەلە پێیەوە زیاد کرد کە:

- پێلاوەکانت لە پێ دەربێنە. هەموو شوێنێکت پیس کرد.

وەپێش کەوت و دەرگای چێشتخانەی کردەوە. هەر دوو خوشکەکانم لەوێ خەریکی جلك دوورین بوون. دەمزانی ئەم دووە خوشکەکانی منن، بەڵام بە زەحمەت توانیم بیانناسمەوە.

ئامۆژنم وتی: – وەرە ژوورێ.

کچەکان هەستان و هەر ئەمجۆرە بێ جووڵە، سەیری منیان دەکرد.

ئامۆژنم وتی:

- براتانە رۆدۆلف.

هاتنە پێش و بێ ئەوەی تاکە وشەیەك بڵێن یەك یەك دەستیان لەگەڵ لێدامەوە و رۆیشتنەوە سەر شوێنی خۆیان دانیشتن.

ئامۆژنم وتی:

- دەی، بگرە دانیشە، خەرج هەڵناگرێ!

دانیشتم و خوشکەکانم چاویان تێبڕیبوم. ئەوان هەمیشە نەختێك بەیەك چوونە و ئێستا ناسینەوەیان بۆ من زۆر سەختە. دووبارە دەستیان بە دوورین کردەوە و جاروبارە بەدزی سەیری منیان دەکرد.

ئامۆژنم پرسی: – برسیتە؟

دەنگی وا پێنەدەچوو بەدڵەوە بڵێ.

- نەخێر ئامۆژن.

- ئێمە نانمان خواردووە، بەڵام ئەگەر تۆ برسیت بێت...

- سوپاس ئامۆژن.

دووبارە بێدەنگی ژوورەکەی داگرت و ئامۆژنم وتی:

- بەڵام سەر و بەرێکی سەیروسەمەرەت هەیە رۆدۆلف!

خوشکەکانم سەریان هەڵێنا و بە وردی سەیریان کردم؟

- ئەوە هەمان ئەو جلکانەن کە لەکاتی رۆیشتنم لەبەرم بوون.

ئامۆژنم ئەمەی بیست و سەرێکی لیّ راوەشاندم و خەریکی کارەکانی بوو.

وتم: – نەیانویست ئۆنیفۆرمەکەمان لەبەر بێت، و هەربۆیەش لێیانستاندینەوە.

دوای بێدەنگییەکی کەم، ئامۆژنم وتی:

- ئیّ، کەواتە تۆش هاتییەوە!

- بەڵیّ ئامۆژن.

- خوشکەکانت گەورە بوونە.

- بەڵیّ ئامۆژن.

- رەنگە لێرە هەندیّ شت بە جۆرێکی دیکە ببینی، ئاوایە، ژیان لە راستیدا دژوارە، ئیتر هیچمان نییە بیخۆین.

- دەزانم.

ئاخێکی هەڵکێشا و سەرگەرمی کارەکەی بوو. خوشکەکانم سەریان داخستبوو و بیّ ئەوەی هیچ بڵێن دەرزیان لێدەدا. ماوەیەکی زۆری کێشا، لەناکاو هەستم بەوە کرد کە ئامۆژنم نەختێك تێکچوو، ئاخر دەبوایە لەبارەی دایکم شتێك بڵێم و هۆکاری نەخۆشییەکەیم دەپرسی و سەبارەت بە مردنی پرسیارم دەکرد. ئەوکاتە خوشکەکانم دەگریان و ئامۆژنیشم چیرۆکێکی غەمین بۆ دەگێرامەوە و بێشك منی بە تاوانباری سەرەکی دەزانی، یانی لە چیرۆکەکەی ئاوا دەردەکەوت کە من هۆکاری مردنی دایکمم.

ئاخرییەکەی وەزمان هات و وتی:

- ئێ، پیاوێکی چەنەباز و زۆربڵێ نی رۆدۆلف.

- نا، ئامۆژن.

- هەروەکوو ئەوە ناچێ کە دوو ساڵێك لە ماڵ و کەس و کارت دوور بوویە.

- بۆچی ئامۆژن وانیم، رێك دوو ساڵی تەواو.

- واپێناچێت ئێمەت ئەوەندە خۆش بوێت.

- وا نییە ئامۆژن.

شتێك لە قورگمدا خر بۆوە. وام هەست کرد "ئیتر کاتێتی" و لەژێر مێز مستەکانم رێکدەکووشی و وتم:

- دەمویست رێك لێتان بپرسم کە.....

ژنەکان هەر سێکیان سەریان لەسەر کار هەڵبڕی و چاویان لە من کرد. قسەکەم بڕی. لە چاوەڕوانیاندا شتێکی ترسناك و لە هەمانحاڵدا شاد هەبوو کە منی راگرت. نازانم چۆن لەجیاتی "چۆن دایکم مرد" رێك وتم:

- مامە فرانتس چۆن مرد.

بێدەنگییەکی قورس پێکهات و خوشکەکانم ئامۆژنمیان سەیر کرد.

ئامۆژنم بە دەنگێکی سارد وتی:

- باس لەو پیاوە پیس و خراپە مەکە، وەکوو هەموو پیاوەکان تەنیا فکر و بیری شەڕ، بەردەوام

شەڕ و بەدوای شەڕ کەوتن بوو.

دوای ئەو قسەیە لەسەر جێگەم هەستام.

ئامۆژن سەیری کردم و وتی:

- ئاوا بە زوویی دەڕۆی.

- بەڵێ.
- بۆ مانەوە هیچ شوێنێکت پەیدا کردووە؟

بە درۆ وتم: بەڵێ.

ئەویش هەستایە سەرپێ:

- چ باشتر، ئێرە زۆر بچووکە. لەوە بگوزەرێین، خوشکەکانتیشت لێرەن. بەڵام بۆ یەك دوو شەوان دەمانتوانی بسازێین.
- سوپاس ئامۆژن.

بە چاوێکی تاوانبارانە سەیری سەر و بارودۆخی کردم و وتی:

- بالاپۆشت نییە (کۆت)
- نا ئامۆژن.

بیری کردەوە و وتی:

- راوەستە، وابزانم کۆتێکی کۆنی مامت ماوە.

رۆیشت و من و خوشکەکانم بە تەنیا ماینەوە. بێ ئەوەی سەریان بەرز بکەن، خەریکی دوورین بوون، یەك بە یەك سەیریانم کرد و وتم:

- کامەتان بێرتایە؟
- منم.

ئەوەیکە وەڵامی دامەوە چەنەگەی بەرز کردەوە. چاوەکانمان پێك کەوت و ئەو بێدرەنگ رووی وەرگێرا. واپێدەچوو لەناو بنەماڵەدا بە جۆرێکی باش باسی منیان نەکردووە.

ئامۆژنم گەڕایەوە:

- ها ئەوەیان تاقی بکەوە.

کـۆتێکی سـەوز، کـۆن، پـیس و بـۆ مـن زۆر فـش و گـەورە بـوو. وەبـیرم نەدەهاتـەوە کـە مـامم هیـچکات ئـەو کۆتـەی لەبـەر کردبێـت. مامـە فرانتس هەمیشە جوان پۆش بوو.

- سوپاس ئامۆژن.

کۆتەکەم بە شانم دادا.

- دەبێ بۆخۆت بچووکی بکەیتەوە.

- بەڵێ ئامۆژن.

- ئێـستاش باشـە، دەزانـی؟ ئەگـەر ئاگـات لێـی بێـت ماوەیـەکی بـاش دەتوانی لەبەری بکەی.

- بەڵێ ئامۆژن.

پێدەکـەنی. رووخـسارێکی خـۆ بـەزلزان و دڵـسۆزی بەخۆیـەوە گرتبـوو. هەرچی نەبێ کۆتێکی پێدابووم. لەبارەی دایکمدا هیچم نەوتبوو و لەگەڵ ئەوەی ئەو کۆتێکی پێدابووم. هەموو تاوانەکان بەئەستۆی خۆم بوون.

- رازی؟

- بەڵی ئامۆژن.

- ئەی حەزت لە کوپێك قاوە نییە؟

- نەخێر ئامۆژن.

- دیسانیش دەتوانی کەمێك بمێنیتەوە ئەگەر حەز دکەی رۆدۆلف.

- سوپاس ئامۆژن، حەتمەن دەبێ بڕۆم.

- بێرتـــا و گێـــردا هەســـتان و هـــاتن دەســـتیان لەگـــەڵ لێدامـــەوە. هەردووکیان نەختێك لەمن بەرزتر بوون.

ئامۆژنم وتی: هەرکات ویستت دەتوانی سەردانمان بکەی و بمانبینی.

لەناو دەرگای چێشتخانە لەنێوان هەرسێ ژن وەستابووم. سەرشانەی کۆتەکە لەسەر شانەکانم هەڵواسرابوو و دەستەکانم لە قۆڵیدا ون ببوو. لەناکاو هەرسێ ژنم بە بالابەرز بینی. یەکیان سەری وەرگێڕا و هەستم بەوە کرد کە لەسەر عەردی نین، بەڵکوو وەکوو عەرەبەکانی بەدار هەڵواسراوی "السط" لەنێوان زەوی و ئاسمان دەجووڵێنەوە. دوایی رووخسارییان ون بوو، دیوارەکانی چێشتخانە لەناو چوون. چۆلگەیەکی سارد و دووروودرێژ هاتە بەرچاوم کە لە رووبەردا بێ وێنە بوو، تا چاو توانای هەبوو جگە لە هەڵواسراوەکان هیچم نەدەبینی و بێ وەستان بە دەوری خۆیاندا دەسووڕان و دوایی نەدەبینران.

دەنگێك وتی:

- گوێت لێ نەبوو؟ دەڵێم هەرکات ویستت دەتوانی سەردانمان بکەی.

وتم "سوپاس" و خێرا بەرەو دەرگا بەڕێ کەوتم. کۆتەکە ئەوەندە درێژ بوو کە نەختێکی مابوو بەر پێم بکەوێت.

خوشکەکانم لەوێ مانەوە و بەڵام ئامۆژنم بەڕێی کردم و وتی:

- بەیانی دەبێ بچی دکتۆر ڤۆگێل ببینی. هەر بەیانی زوو. نەکا نەچی رۆدۆلف!

- نا ئامۆژن.

- ئێ، بەهیوای دیدار رۆدۆلف.

- دەرگای کردەوە. دەستی لەناو دەستەکانی مندا وشك و سارد بوو.

- وتت سەبارەت بە کۆتەکە خۆشحاڵی ها.

- زۆر.... ئامۆژن.... سوپاس.

خۆم لە کۆڵاندا بینییەوە. دەرگای بە خێرایی بەست و دەنگیم بیست کە لە ژوورەوە دایخست. لە پشت دەرگا مامەوە و گوێم لە دەنگی پێی گرت

کە بەرەو تاریکی دەچوو. ڕێك وەکوو ئەوە بوو کە لەماڵەوەم. ئامۆژنم دەدیت کە دەرگای چیشتخانە دەکاتەوە، دادەنیشێت، کراسەکە هەڵدەگرێت و تەنیا تکەتکی کاتژمێر دەبیسرێت. دوای کەمێك ئامۆژن چاوێك لە خوشکەکانم دەکات و بە جووڵاندنی سەری دەڵێت "تەنانەت وشەیەکیش لەبارەی دایکی نەدوا"! ئەوکات خوشکەکانم دەست بە گریان دەکەن. ئامۆژنم دڵنەواییان دەداتەوە و هەر سێکیان بەیەکەوە هەست بە ناخۆشی دەکەن.

شەوێکی سارد بوو. باران بە نەرمی دەباری. ڕێگەم بە باشی پێنەدەزانی و بۆ دۆزینەوەی ئەو ئادرەسەی کە شرادر پێیدابووم ناچار بووم نیو کاتژمێرێك لە شەقام بسوڕێمەوە.

لە دەرگام دا و دوای ماوەیەکی کورت ژنێك هاتە بەر دەرگا. بەخۆوە و زەلام بوو و مەمکی پڕ و گەورەی هەبوو.

- "**فراون لیپمان**"؟
- منم، دەمویست " **ئۆنتەرۆفیزێر شردار**" ببینم.

کۆتەکەی سەیر کردم و زۆر بە وشکی پرسی:

- بۆچی.
- هاوڕێیەکی ئەوم.
- هاوڕێیەکی ئەوی؟

بە باشی سەیری کردم و وتی: – وەرە ژوورێ.

چوومە ژوور. دووبارە سەیرێکی کۆتەکەی کردم – بەدوام بکەوە.

مەمەڕێکی دوورودرێژمان پێوا. لە دەرگای ژوورێکی دا و بێ ئەوەی چاوەڕوان بێت دەرگای کردەوە و وتی:

- یەکێ لە هاوڕێکانتە. "**هێر شرادر**".

شرادر کە تاکە کراسێکی لەبەر بوو، بە شڵەژاوی ئاوڕی دایەوە:

- کەواتە تۆی! چ زوو! وەرە ژووری! مێشکت چاک کار دەکات ها!... ئەو کۆتەی! ئەو جلەت لە کوێ دزیوە. دەی وەرە ژووری دەی! "فراو لیپمان" پێکەوە ئاشنا بن: " ئۆنتەرۆفیزێر لانگ" لە گروپی "گونتر" ئەڵمانییەکی قارەمان، "فراو لیپمان"!

فراو لیپمان سەرێکی جووڵاند، بەڵام دەستی لەگەڵ لێنەدامەوە.

شرادر بە شادییەکی بێ سەرەتا وتی:

- دەی وەرە ژووری! دە وەرە دەی، "فراو لیپمان"!.... بەڵام سەرەتا ئەم جلە دەربێنە! هەر ئەمجۆرە باشتری! ... "فراو لیپمان"؟! "فراو لیپمان"!

فراو لیپمان بە پرتەپرت وتی:

- یا، "هێر شرادر"؟

- "فراو لیپمان"، منت خۆش دەوێ یان نا؟

- ئاخ! ئەوە چ قسەیەکە، "هێر شردار"! ئەویش لەبەردەم هاوڕێکەت!

- چونکە ئەگەر منت خۆش دەوێ، سەبارەت بە من وەکوو کارەبا دەچی بیرە و نانە مرەبایەکم بۆ دێنی، .... هەرچی دەست کەوت. بۆ ئەم پیاوە قارەمانە بێنە. بۆ من و بۆ خۆتان "فراو لیپ مان"! هەڵبەت ئەگەر من بە شایستە بزانی و خواردنی ئەمشەوت لەگەڵ من بخۆی.

برۆکانی نەختێك تێکنا و چاوێکی لێ داگرت و دەستی خستە ناوقەدی و بە فیتو لێدان سەمایەکی لەگەڵ کرد.

"فراو لیپمان" بە قاقا و پێکەنینەوە عیشوەیەك هات و وتی:

- ئاخ! "هێر شرادر"! من ئیتر پیرتر لەوەم کە سەمای والس بکەم! ئوتۆمبێلی کۆن ئیتر کێشی نەماوە. لێم تێگەیشتی؟

شرادر وتی:

- چی، پیر؟ کەواتە ئەو پەندی پێشینیانی فەڕەنسەوییەکانت نەبیستووە....

شتێکی لە گوێی سریواند کە ژنەکە لە قاقای پێکەنینی دا و بە خۆشییەکی لەرادەبەدەر گەیشت.

شرادر بەریدا و وتی:

- دوایی، گوێ بگرە "فراو لیپمان"، بۆ ئەم قارەمانە دۆشەگێکیش بێنە. ئەمشەو لێرە دەخەوێ.

- "فراو لیپمان" پێکەنینی بڕی و لێوەکانی رێککوشی:

- لێرە؟

- دەی بابە، ئەم منداڵە یەتیمە، خۆ ناتوانێ لە قەراغ شەقام بخەوێ، "فراو لیپ مان"! خۆ دەبێ پیاو خزمەتێکی بەرامبەر بە قارەمانێکی ئەڵمانی لەدەست بێت!

ژنە نێوچاوانی تێکنا و شرادر قیژاندی:

- "فراو لیپمان"! "فراو لیپمان"! نازانم ئەگەر بڵێ "نا" چ بەڵایەکت بەسەر دێنم!

باوەشی پێداکرد و وەکوو پەڕ بەرزی کردەوە و لەناو ژوور دەستی کرد بە گاڵتەجاری و هوتاف کێشان:

- ئێستا گورگە دەیخوا! ئێستا گورگە دەیخوا!

ژنەش کە لە خۆشیان پێدەکەنی وەکوو کچان نازی بۆ دەکرد و وتی:

- وای! وای! مەگەر شێت بووی "هێر شرادر"؟ مەگەر شێت بووی؟

شرادر لەسەرەخۆ داینا (نەختێك تووڕە دیار بوو) وتی:

- **لوس، ماین شاتز! لوس ماینە لیبە! لوس!** (خێرابە گەنجینەی من، خێرا کە عەشقی من! خێراکە).

ئاخ، تەنیا سەبارەت بە رووی گووڵی تۆ **"هێر شرادر"**!

کاتێك لە دەرگا دەچووە دەرێ، **شرادر** گۆنای گرت و وتی:

- ئامان! **"هێر شرادر"**!

پێکەنینی بە بەغبەغو دەچوو و لە مەمەڕە دووروودرێژەکەدا دوور کەوتەوە.

دوای ماوەیەك گەڕایەوە. بیرەمان خواردەوە لەگەڵ نانی چەوریی بەراز. **شرادر** وای لە **"فراو لیپمان"** وایکرد **"شناپس"**(جۆرێك عارەق) پشمان بۆ بێنێت و دووبارە خواردمانەوە و دووبارە خۆش بووین و **شرادر** بەردەوام قسەی دەکرد و بێدەنگ نەبوو. بێوەژنە رووخساری زیاتر کرایەوە و زیاتر وەکوو بەغبەغوو دەیخوێند. نزیك کاتژمێر یازدە **شرادر** هەڵیگرت و وون بوون و دوای نیو کاتژمێرێك بە تەنیا گەڕایەوە بە مشتێك جگەرەوە.

بە قەڵافەتێکی ناتەواو نیوەی جگەرەکانی هاویشتە سەر دۆشەگی من و وتی:

- دەستایان دەیە. بەهەرحاڵ پیاو دەبێ لەحەق ئەڵمانییەکی قارەمان خزمەتێ بکات کە لە دەستی دێت!

ئێوارەی رۆژی دواتر سەردانی دکتۆر **"فۆگێل"**م کرد. ناوەکەم بە خزمەتکارەکەی وت. رۆیشت و گەڕایەوە کە: "دکتۆر تا چەند خوولەکی دیکە دەتانبینێ."

سێ چارەگە کاتژمێر چاوەڕوانی بووم. واپێدەچوو دوای شەڕ کاروباری دکتۆر گرتوویەتی، ژوورەکەی بەجۆرێك رازابۆوە کە سەرەتا نەمناسییەوە.

بەهەرحاڵ خزمەتکار گەڕایەوە و منی بۆ ژووری کاری دکتۆر برد. دکتۆر **فۆگێل** لەپشت مێزێکی گەورەی رووت دانیشتبوو. مووەکانی سپی کردبوو. بەڵام هەر بە جوانی و رێکوپێکی جارانی بوو.

سەیرێکی کۆتەکەی کردم، ئیشارەی پێدام بچمەپێش، دەستی بە ساردی وێدام و داوای لێکردم دانیشم. بەری هەر دوو دەستی خستە سەر مێزەکە و وتی:

- ئێ، رۆدۆلف، تۆش هاتییەوە.
- یا، هێر دکتۆر "فۆگێل".

ماوەیەکی زۆر سەیری کردم. دەست و لەناوقەد بۆ سەرێی بێ جووڵە بوو. قەڵافەتێکی سەیر و پڕ هێزی هەبوو، (بەقسەی باوکم قەڵافەتێکی وەکوو "ئیمپراتۆری رۆما")، بەڵام رووخساری جوانی هەبوو کە چاوە بچووکەکانی لەژێر ئەم رووخسارەدا دەدرەوشایەوە و بەردەوام خەریکی سەیرکردن بوون.

بە دەنگێکی وشك وتی: – لێتناگرم و گلێیت لێناکەم، رۆدۆلف.

نەختێك وەستا و سەیری کردم و دووبارە دەستی بە قسە کردەوە:

- نا رۆدۆلف گلێیت لێناکەم، کەس ناتوانێ ئەو کارەی کە تۆ کردت بە تاوان بزانێ. هەست بەو بەرپرسیاریەی کە دەیکەی "زۆر قوورسە". هیچیتر لەبارەیدا ناڵێم. لەوە رابردوو، لەبارەی "راکردنت" و کاردانەوە قەرەبوو نەکراوەکەی، هەر شتێکم کە بە مێشکیدا هات بۆم نووسی؟

بە رووخسارێکی حەزینەوە سەری بەرز کرد و لە قسەکانی بەردەوام بوو.

- هیوادارم ئەو شتەی پێویست بووە وتبم.

بە هێواشی دەستی راستی بەرز کرد:

- رابردوو رابردووە. ئێستا دەبێ بیر لە داهاتووت بکەیتەوە.

بە حاڵەتی جددیـەوە سـەیری کردم، وابـزانم چاوەڕوانی وەڵام بوو. بـەڵام من لام تا کام هیچم نەوت. سەبر سەری بۆ پێشەوە خوار کردەوە، وەکوو ئەوە دەچوو کە هەموو هۆشی وەگەڕ بخات:

- تـۆ بـە تـەواوی ئاگـاداری ویسـت و داخوازییـەکانی بـاوکتی. ئێـستا "ئەمینی" ئەو منم. بۆ ئەوەی باوکت خاترجەم بێت، ئەوا بەڵێنیم پێیـداوە کە لە رووی رەوشتی و ماددی هەموو شتێکت بۆ دابین بکەم.

سەری بەرز کرد و رێك چاوی لە چاوی بڕیم:

- ئێستا دەبێ پرسیارێکت لێ بکەم رۆدۆلف. دەتەوێ رێز لە ویسـت و داخوازییەکانی باوکت بگری؟

لە بێدەنگییـەك کە هاتەپێش بە پەنجەکانی چەند تەقەیەکی لە مێزەکە هێنا و منیش بە سەڕاحەتەوە وتم: - "نا"!

دکتـۆر ڤۆگێـل بـۆ کـاتێکی کـەم چـاوەکانی وێکنـان، بـەڵام تەنانـەت ماسـوولکەیەکیش لـە رووخـساری وەجووڵـە نەکـەوت. بـە دەنگێکـی زۆر جددی وتی:

- بەڵام رۆدۆلف، وەسێتی مردوو پیرۆزە.

هیچ وەڵامێکی ئەم قسەیەم نەدایەوە.

دووبارە وەقسە هات و وتی:

- هـەر ئـەمجۆرەی کـە ئاگـاداریی، باوکـت لـەم بـوارەدا "سـوێند"ی خواردبوو.

چونکە من هیچم نەوت، بەردەوام بوو و وتی:

- سوێندێکی پیرۆز.

هەر بەم شێوەیە بێدەنگ مامەوە. دوای ماوەیـەك دیسان وەقسە کـەوت و وتی:

- تۆ بێ رەحم و دڵ سەخت بوویە رۆدۆلف، شك لەوەدا نییە کە ئەوە ئەنجامی تاوانەکانتە. بەڵام خۆت بەم ئەنجامە دەگەی کە لە راستیدا "خودا" چ شتەهایەك دەکات. چونکە لەهەمانکات کە بە نییەتی سزای تۆ لە دڵتدا چی پێکدەهێنا، لەراستیدا دەرمانێکیش بۆ دەردەکەت دەنێرێ و بۆ تۆبە و پەشیمانی بارودۆخێکی باش پێکدێنێ.

دووبارە دوای بێدەنگییەك وتی:

- کاتێك کە تۆ دایکت بەجێهێشت رۆدۆلف، دوکان بە باشی کاری دەکرد و بارودۆخی ئابووریتان باش بوو... یان دەتوانین بڵێین بۆ ئێوە بەس بوو. لەگەڵ مردنی دایکت کەسێکم بۆ دوکانەکە گرت. پیاوێکی کرێکاری باشە کە کاتۆلیك و بە ئیمانە. هیچ شك و گومانێکیشی پێوەنانووسێ، دوورە لەم قسانە. بەڵام لە راستیدا کار خراپە و دوکانەکە ئێستا تەنیا خەرجی خوشکەکانت دەدات و بەس.

دەستەکانی خستە سەر سنگی و وتی:

- من تا ئێستا دڵم بەو بارودۆخە ناڕێکە سووتاوە، ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینم ئەوەیە کە ئەوەی دڵم بەحاڵی سووتاوە بە خۆڕایی بووە، بەڵێ رۆدۆلف، خواستی خوا چ کارێك کە ناکات و خواستی خوا بەلای من زۆر روون و ئاشکرایە: "رێگەت پێ نیشان دەدات" رۆدۆلف!

نەختێك بێدەنگ بوو و سەیرێکی کردم و بەدەنگێکی بەرزتر وتی:

- تۆ دەبێ بزانی رۆدۆلف کە ئێستا یەك رێگا، تەنیا یەك رێگات لەپێشە. ئەویش خوێندن لە زانکۆیە. یانی ئەوەیکە لە بەشی ئیلاهیات بۆرسەیەکی قەشایەتی وەربگری و مەسەلەی خورد و خۆراکیشت چارەی دێت. هەرچی لەوە زیاتر پێویستیت هەبوو، پێشاوپێش من بە ئەستووی دەگرم.

چاوە شینەکانی لەناکاو درەوشانەوە و چاوەکانی لەسەریەك دانا. دوایی هەر دوو دەستی بەجوانی خستە سەر مێزەکە و چاوەڕەڕێ مایەوە. سەیری قەڵافەتە بێ کاریگەییەکەم کرد و لەناکاو پڕ بە دڵەوە نفرەتم لێ پەیدا کرد.

ئاوی ناو دەمم قووت دا و وتم:

- ناتوانی بڕەپاریەکم پێشاوپێش بدەیتێ کە لە بەشێکی دیکە جگە لە ئیلاهیات بخوێنم.

لەهەمانحاڵدا کە ڕێگەی بەخۆی دەدا نیوچە پێکەنینێك بکات وتی:

- ڕۆدۆلف! ڕۆدۆلف! چۆن دەتوانی پرسیارێکی ئاوا بکەی؟ چۆن دەتوانی داوام لێ بکەی یارمەتیت بدەم کە سەرپێچی لە وەسێتی باوکت بکەی، لە کاتێك کە من ئەمینی دوایین وەسێتی ئەوم؟

- کەواتە هیچ شتێك نەماوە لەبارەیدا قسە بکەین.

هەستام، بە رووخۆشی وتی:

- دانیشە، ڕۆدۆلف، قسەکانم تەواو نەبووە.

دانیشتم، بە ئاهەنگێکی پڕ لە پەژارەو غەمەوە وتی:

_ تۆ لەوپەڕی لاوێتی و سەرکەشی دای ڕۆدۆلف، ناتهەوێ ئیشاراتی خوا کە بۆتۆ نازڵ دەکرێ ببینی. هەرچەند ئەو ئیشاراتانە زۆر روون و ئاشکران: بە خراپ کردنی ماڵ و بە بەهەژار گەیاندنی تۆ دەیەوێ تاکە ڕێگا، ئەو ڕێگایەی کە حەزی لێیەتی، بپێوی، ڕێگەیەك کە باوکت بۆتی هەڵبژاردووە نیشانت دەدات....

هیچ وەڵامێکم بەو قسانەی نەدایەوە. دەستەکانی لەسەر سینگی هاویشتە سەریەك و بۆ پێشێ خوار بۆوە و چاوەکانی بە قووڵی لەمن بڕی و وتی:

- تۆ باش دەزانی کە ئەوە ڕێگەی تۆ نییە؟

دوایی دەنگی هێنایە خوار و بە نەرمی و بە سۆزەوە وتی:

- ئەوەندە متمانەت هەیە کە بۆ قەشایەتی دروست نەکراوی؟ خۆت تاقی بکەوە ڕۆدۆلف. هیچ شتێ لەناختدا نییە کە تۆ بۆ ژیانی قەشایەتی ببات؟

سەری سپی و جوانی بەرز کردەوە و وتی:

- هیچ بۆ قەشایەتی وەسوەسە نەبووی؟

دوای ماوەیەك وتی:

- باشە کە وەڵام نادەیەوە، ڕۆدۆلف! ئەوکات هەموو بیر و هۆشت ئەفسەری بوو، بەڵام خۆت کە دەزانی ئیتر سوپای ئەڵمانیا نەماوە. کەواتە جوان بیر بکەوە بزانە ئێستا دەتوانی چی بکەی. من کە سەر لە بارودۆخی تۆ دەرناهێنم و لێت تێناگەم.

بێدەنگ بوو و چونکە بینی هیچ وەڵامێك نادەمەوە بە بێ حەوسەلەیی دووبارەی کردەوە:

- هیچ لێت تێناگەم. چی پێش لە قەشەبوونی تۆ دەگری؟

وتم: — باوکم.

دکتۆر ڤۆگێل هەتا بن گوێی سوور هەڵگەڕا و چاوەکانی بریقەیان دا و هەستایە سەرپێ و هاواری کرد: — ڕۆدۆلف!

ئەمنیش هەستامە سەرپێ، بەدەنگێکی خەفە وتی:

- بڕۆ لەبەرچاوم ون بە!

تەواوی مەودای ژوورەکەم لەناو کۆتەکەمدا پێوا. گەیشتبوومە بەر دەرگا کە گوێم لە دەنگی بوو:

- ڕۆدۆلف!

گەڕامەوە. لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو و بەری هەر دوو دەستی لەسەر دانابوو. توانیبووی دووبارە رووخساری رێکبخاتەوە:

- بەجوانی بیر بکەوە. هەرکات ویستت دەتوانی بگەڕێیتەوە. پێشنیارەکانی من وەکوو خۆیان دەمێننەوە.

هاتمە دەرێ، لە کۆڵاندا بارانێکی تەزوو ساردی سەهۆڵاوی دەباری. یەقەی کۆتەکەم هێنایەسەر و بیرم کردەوە: "باشە، والسلام، ئەمەش بە تەواوی کۆتایی پێهات."

بێ ئامانج بەڕێکەوتم. ئوتۆمبێلێک رێمخشا و شوفێرەکە جنێوێکی بەناوکی وەنوساندم. کە بەخۆم هاتمەوە بینیم وەکوو سەربازێک رێژەی بەیانی باش دەڕۆم، ئەویش لەناوەڕاستی جاددەکە. چومەوە پیادەرۆ و بەردەوام بووم لە رێکردن.

گەیشتمە گەڕەکێکی قەرەباڵغ. پۆلێک کچ بەدەم پێکەنینەوە لەبەردەمم تێپەڕین و بۆ بینینی کۆتکەم ئاوڕیان دایەوە. لۆرییەکی سەرئاوەڵە تێپەڕی. پڕ لە سەرباز و کرێکار بوو کە جلی شینیان لەبەر بوو. هەموویان تفەنگیان بەدەستەوە بوو و قۆڵبەندی سووریان بەستبوو. سروودی نەتەوەییان دەخوێندەوە. لەنێو خەڵکیشەوە چەند کەسێک لەگەڵیان خوێندەوە. پیاوێکی لاواز بە سەری رووت و رووخساری ئەستووربوو لە تەنیشتم تێپەڕی. جلکی یەکرەنگی **"فێلدگراو"** (جلکی سەربازی) لەبەر بوو کە سەرشانەکانی دڕابوو، واپێدەچوو پلەی سەربازییەکەیان لێکردبێتەوە.

لۆرییەکی دیکە تێپەڕی، پڕ لە کرێکار کە تفەنگەکانیان بەرز کردبۆوە و دەیانجووڵاندەوە و هوتاف و هورایان دەکێشا.

- هەر بژی **لیبکنێخت**.! (Liebknecht) ("کارل" **لیبکنێخت** ڕێبەری شۆڕشگێرانی ئەڵمانیا (١٩١٩-١٩١٢).

جەماوەر بەیەکەوە دەیانقیژاند:

- **لیبکنێخت، لیبکنێخت!**

ئێستا ئیتر جەماوەر بەشێوەیەك زۆر ببوو کە نەمدەتوانی هەنگاو بنێمەوە. شتێك وەکوو گێژەلووکە، منی بردایەوە کە قۆڵی ئەمەی تەنیشتم گرت و وتم: - ببورن؟

پیاوەکە سەری بەرز کردەوە، پیری پیر بوو، بەڵام جلی جوان و ڕێکی لەبەر بوو و لە ڕووخساری غەم و خەفەت دەباری.

وتی: - **"کاینە ئورزاخە"** (گرنگ نییە).

جەماوەرەکە بەرەو پێش ڕۆیشتن. سەرلەنوێ کەوتمەوە سەر پیرەپیاوەکە و پرسیم:

- **لیبکنێخت** کێیە؟

بەدوودڵی سەیری کردم، دەوروبەری سەیر کرد و بێ ئەوەی هیچ بڵێت سەری نایە خوارەوە. دوایی دەنگی تەقە هات. پەنجەرەکان هەموویان بەستران و خەڵك دەستیان بە ڕاکردن کرد.

جەماوەر منیشیان بەرەوپێش برد. لای ڕاستم چاوم بە کۆڵانێك کەوت. خۆم کێشایە قەراغ و چوومە ناو کۆڵانەکە و تێمتەقاند، ئەویش بە ڕاکردن. پێنج خوولەکێك کە تێپەڕی خۆم لە کەلێن و کونی کوچەکانی گەڕەکێکی نەناسراو بە تەنیایی بینییەوە. سەرەتای کۆڵانێکم گرت و بەڕیکەوتم. باران وەستابوو. یەکێك هاواری کرد:

- هۆی! لەگەڵ تۆمە فەرخە جوولەکە!

سەرم وەرگێڕا. دە مەتر ئەولاتر، لەناو كۆلانێكی باریك كە لەم كۆلانە جیا دەبۆوە، پۆلێك سەربازم لەگەڵ سەردەستەیەك بینی.

- هۆی لەگەڵ تۆمە.

- من؟

- ئەریّ، تۆ!

بەدەنگێكی پڕ لە رق و كینە هاوارم كرد:

- من جوولەكە نیم!

" ئۆنتەرۆفیزێر" وتی:

- "ئاخ واس"! تەنیا جوولەكە دەتوانیّ كۆتێكی ئاوا لەبەر بكات!

سەربازەكان كە سەیری منیان دەكرد، دایانە بەر قاقای پێكەنین. لە تووڕەییان دەلەرزیم.

- پێتان دەڵێم حەقتان نییە پێم بڵێن جوولەكە!

ئۆنتەرۆفیزێر وتی: – هۆی، یواشتر، "كێرل" (Kerl) (كوڕە)! وادەزانی بەرامبەر كیّ وەستاوی؟ وەرە پێشیّ هەویەكەتم نیشان بدە.

رۆیشتمە پێش، لە دوو هەنگاوی ئەو وەستام، سەربازانە بەرامبەری رێك بووم و وتم:

- ئۆنتەرۆفیزێر لانگ، د. ب. لەشكری ۲۳، بەشی ئاسیا.

ئۆنتەرۆفیزێر برۆیەكانی تێكنا و وشەیەكی وت: = ناسنامە و هەویەت.

هەویەم بۆ راداشت. ماوەیەكی زۆر بە دوودڵی سەیری كردن.

- دەبیّ ببوری دراگون! گوناهەكە وەبالی كۆتەكەتە، خۆت دەزانی كە قەلافەتێكی گاڵتەجارانەت بەخۆوە گرتووە. بیّ بگرە و بەردە "ئسپارتاكیستی" (Spartakiste) (حزبی شۆڕشی ئەڵمانیا.)

- ئیّ، كێشە نییە.

- لێرە چی دەکەی؟
- دەگەڕێم.

سەربازەکان پێکەنین و یەکیان وتی: – ئێستا کە کاتی پیاسە کردن نییە!

" **ئۆنتەرۆفیزێر**"یش وتی: – ڕاست دەکات، بگەڕێوە بۆ ماڵێ. هەر ئێستا ڕەنگە بگرە و بگوژە پەیدا بێت.

سەیریم کرد. هەر دوو ڕۆژ لەمەپێش بوو منیش ئۆنیفۆرمم لەبەر بوو، بە کەسانێکەوە کە ئەمرم پێدەکردن و فەرماندەیەك کە ئەمری پێدەکردم.

هاواری جەماوەرەکەم وەبیر هاتەوە و پرسیم:

- دەتوانی پێم بڵێی "**لیبکنێخت**" کێیە؟

سەربازەکان لە قاقای پێکەنیان دا و " **ئۆنتەرۆفیزێر**" بە دەم پێکەنینەوە وتی:

- عەجیبە! سەیرە! نازانی؟ لەکام کونەوە هاتوویەتە دەرێ؟
- لە تورکیا.

" **ئۆنتەرۆفیزێر**" وتی: – ئەها، ڕاستە!

سەربازێکی قولەڕەشی وردیلە وتی: – "**لیبکنێخت**" ئیمپراتۆری نوێیە!

هەموویان پێکەنین و قاقایان لەسەرم لێدا. دوایی موو زەردێکی بە قەڵافەت سەیری کردم و بە سەبری و بە زاراوەی "**باویر**"ی (بەشێك لە ئەڵمانیا) وتی:

- "**لیبکنێخت**" پیسکەیەکە کە بووەتە هۆی ئەوەی ئێمە لێرە بین.

" **ئۆنتەرۆفیزێر**" بە پێکەنینەوە سەیری کردم و وتی:

– یاڵڵا، بگەڕێوە بۆ ماڵتان.

سەربازە قولە ڕەشە کورتەباڵاکە وتی:

- ئەگەر "لیبکنێخت"ت بینی، پێی بڵێ ئێمە چاوەڕوانی ئەوین!

تفەنگەکەی لەهەوادا سووڕاند. هاوڕێکانی لە گرمەی پێکەنینان دا، پێکەنینی سەربازی، توند و شاد.

لێیان دوور کەوتمەوە، ئیتر دەنگی پێکەنینیان نەما و دڵم گیرا. ئێستا من غەیری سوپایی بووم. تەختێکی تێکشکاوم لە ژووری "شرادر" هەبوو. بێکار بووم و هەموو پارەکەم ئەوەندە بوو کە بتوانم هەشت رۆژێك زگم بە تێری رابگرم.

گەیشتمە ناوەندی شار و لە جمووجۆڵی سەیر تووشی سەرسووڕمان هاتم. دوکانەکان بەسترابوون، بەڵام کۆڵانەکان پڕ بوون. هاتووچوو بە سەختی رووی دەدا. هەر دەتگوت کەس باکی لەوە نییە کە دە خوولەك پێشتر تەقە کراوە. بێ ئیختیار بۆ پێشوە بردرام کە لەناکاو ئاپۆرەکە تێکچوو. ژنێك رێك لە تەنیشت من تێپەڕی. پێکەنی. دەمی کراوەی کراوە بوو، بە جۆرێك کە دەمتوانی پوك و ددانەکانی ببینم. ددانەکانی زۆر گەورە بوون. ترس سەرتاپێی گرتم. قەڵافەتی ئەوانەی تێدەپەڕین بەردەوام دەگۆڕا و جێیان دەگۆڕا و دەهات و گەورە و گەورەتر دەبوون و دوایی لەپێش چاوم نەدەمان و لەناکاو، وەکوو مشتێك بازنە گرد دەبوون: چاوەکان، لووت، دەم، رەنگ و روو، هەموویان لەناو دەچوون و جگە لە بازنە هیچیان لێ نەدەما، ئەم بازنانە گەورە وگەورەتر دەبوون، وەکوو لەرزانە دەلەرزین و بۆ لای من دەهاتن. دیسانیش گەورەتر دەبوون، وەرووخسارم دەکەوتن و لە ترسان و نفرەتەوە وەلەرزینیان دەخستم. دەنگێکی وشك بەرز دەبۆوە و هەموویان دیار نەدەمان. دواتر بازنەیەکی دیکە، شل و بەرەنگی شیری، لە دە هەنگاوی من پەیدای دەبوو، رێك بۆ لام دەهات و پان و گەورە دەبوو. چاوەکانم بەست. وەستا. لە ترسان

وشـك ببـووم. دەسـتێك ئـەوكمی رێكدەكووشـی واپێدەچـوو دەیهـەوێ بمخنكێنێ. تەڕی عارەقە ببوم و بە توندی هەناسەم هەڵدەكێشا.

كـەم كـەم ئـارام بوومـەوە، رووبـەرووی خـۆم هەڵبـژارد و بـێ ئـەنجام بەڕێكەوتم. هەموو شت بێ رەنگ و وون بوو.

لـەناكاو بـێ ئـەوەی بۆخـۆم بمهـەوێ و راسـت وەكـوو ئـەوەی یـەكێك قیژانـدبی "بوەسـتە"! وەسـتام. بەرامبـەرم دەرگایـەكی بـەردین بـوو. قەڵافەتێكی ناشیرین و ناحەز پەیدابوو و پرسی: – چیت دەوێ؟

دەوروبـەری خـۆم سـەیر كـرد. هـەموو شـت وەكـوو خـەونێكی نـاخۆش دەچوو. بە دەنگێكی بێگانە لەخۆم وتم: – دەمویست بابە تالر ببینم.

- ئەو ئیتر لێرە نییە.

دووبارەم كردەوە: – ئیتر لێرە نییە؟

- نا!

- من شاگردێكی پێشووی ئەوم.

دەنگەكـە وتـی: – مـنیش هـەر وام بـیر دەكـردەوە. راوەسـتە بـزانم، ئـەتۆ هەمان كوورە بچكۆڵانە نی كە لە تەمەنی شازدە ساڵی خۆبەخشانە چووە سەربازی؟

- بەڵی هەوم.

دەنگەكە وتی: – لە شازدە ساڵی!

بێدەنگییەك هاتەپێش. هـەموو شـت بـێ قـەبارە و بە رەنگـی خـاك و خـۆڵ بـوو. وەكـوو ئـەوە دەچـوو سـەری پیاوەكـە وەكـوو دەبدەبـە لەسـەر مـن هاتووچـۆی دەكـرد. دووبـارە تـرس هـەموو لەشـی داگـرتم. چـاوەكانم سووڕاندەوە و وتم: – دەكرێ بێم نەختێك بسووڕێمەوە.

- بەڵی دەكرێ. منداڵەكان لەسەر پۆلن.

وتم: "سوپاس" و چـوومە ژووریّ. لـە حەوشـەی منـدالآن و دوایـی گەورەسـالآن تێپـەڕیم و لـە کۆتاییـدا گەیـشتمە "حەوشـەی خـۆم". بـە هێواشـی نـەختێك هـەنگاوم نایـەوە و کورسـییەکی بـەردینم بینی. هـەمان کورسـیەی کـە "وێرنێـر"یـان لەسـەر خەواند. بۆئـەوەی پێـی نەکـەوم، بـە دەووریـدا سـووڕامەوە و لـە ڕۆیـشتن بـەردەوام بـووم. دوایـی سـووڕامەوە و پاژنەکانم بە دیوارەوەنا. هەنگاوم نایەوە و دەستم کرد بە ژماردن.

ماوەیـەکی زۆر تێپـەڕی. وەکـوو ئـەوە بـوو کـە گیانلەبـەرێکی دڵـسۆز و بەتوانا ژێر هەنگڵمی گرتووە و بە لایی لایی دەمجووڵێنێ.

ڕێك کاتێك کە چەند "**فینگ**" (Pfennig) "سکەی ئەڵمانی" زیاتر لەناو بەرکمدا نەمابوو، "**شرادر**" لە کارگەیـەکی بچووك کە کەوەنتـەر و دۆڵابی فـافۆنی دروسـت دەکـرد، بـۆ هـەردووکمان ئیـشی دۆزیـەوە. "**شـرادر**" بـۆ بەشـی ڕەنگکـاری نـاردرا کـە لـە ئەنجامـدا ڕۆژانـە نیـو لـیتر شـیری بـێ چەوریشی دەدرایە.

ئـەو ئیـشەی مـن ئیـشێکی ئاسـان بـوو. دەرگـای قەفەسـەکانم یـەك بەیـەك هەڵـدەگرت و سـومبەیەکی پـۆڵایینم بـە چەکووچـك دەخـستە نـاو کوونەکەیان. چکووچێکم لەسەری سوومبەکە دەدا کە بچێتەخوار و دوو چکووچی دیکەم لە تەنیشتی دەدا بۆئەوەی نەختێك شل بێت. لینگەی دەرگاکانم چوارچوار لەسەر مێزی کارگە دەچنی و ئیشی هەرکامە تەواو دەبوو پاڵمدەدان بۆ خواریّ و قیتم دەکردنەوە. ئیشی هـەر چوار لینگەی دەرگا کە تەواو دەبوو دەمبردن و بە پایەیەکی دیکەمەوە دەنان.

چـونکە دەرگاکـان نـەختێك قـوورس بـوون، سـەرەتای ئـیش دانـە دانـە دەمـبردن. بـەڵام کاتـژمێرێك کـە تێپـەڕی "**مایـستر**" (Meister)

(سەرکارگەر) ئەمری پێکردم بۆئەوەی کە کات کەم بگیرێت دەبێ جووت جووت بیانبەم و منیش بە گوێم کرد. کێشەی ئیشەکەش هەر لێرەوە دەستی پێکرد. ئەو کرێکارەی کە دەرگاکانی دەخستە سەر قەفەسەکەوە، پیر و پاتاڵێك بوو بەناوی ""کارل"" (Karl) زۆر بە کاوەخۆتر لەمن بوو، چونکە دوای ئەوەی ئیشی دەرگاکان تەواو دەبوو، دەبوایە قەفەسە قوورسەکانیش بگوازێتەوە. بیانگوازێتەوە سەر عارەبانەیەك کە پێی دەبردرانە بەشی رەنگ کردنیان. کەواتە کاتێك من خێراییم پەیدا کرد، ئەو دەرگایانەی کە لەبەردەستی من تێپەڕیبوون لە پێش ""**کارل**"" مانەوە. **مایستر** کە چاوی پێیان کەوت بە پیرەی وت خێراتر و تیژتر بجوولێت. ئەویش هەوڵی خۆی دا، بەڵام هیچی پێنەکرا. دوای ئەوە هەرکات دەرگای نوێم بۆ دەبرد، مۆڕەیەکی دەکرد و بە پرتەبۆڵە دەیوت: "**لانگسام، مێنش، لانگسام**" (هێواشتر، بابە، هێواشتر)، بەڵام من ناچار بووم هەرجارەو جووتێك دەرگا ببەم و نەمدەزانی چۆن دەکرێ هێواشتر کار بکەم. دوایی ئەو لینگە دەرگایانەی زۆر دەبوون کە لەبەر دەم "**کارل**" دەمایەوە کە دیسان **مایستر** هات و بە دەنگێکی وشك هەڕەشەی خێرایی لە "**کارل**" کرد. "**کارل**" ئاهەنگی ئیشەکەی خێراتر کرد، سوور بۆوە و ئارەقە لە حەوت بەندی جەستەی دەهاتەدەر، بەڵام بێ سوود بوو. کاتێك فیکەی کۆتایی ئیش لێدرا، هێشتاش زۆر لەپاش بوو.

دەست و رووخسارم لە دەستشۆرەکان دەشورد و "**کارل**" ی پیر لە تەنیشتم بوو. "**پرۆسی**"یەکی (بەشێك لە ئەڵمانیا) رەنگ گەنمی بوو و پەنجا ساڵێکی تێپەڕاندبوو، وتی:

- لەبەر دەرگا چاوەڕوانم بە، هەندێ قسەم پێتە.

بەسەر وتم باشە، کۆتەکەم لەبەر کرد و وەرەقەی ئیشم بە چاودێر دا و لە نەردەکان تێپەڕیم. "کارل"ی پیر چاوەڕێم بوو. ئیشارەیەکی پێدام بۆ ئەوەی بەدوای کەوم. دوو سێ خوولەك لە بێدەنگیدا ڕۆیشتین تا ئەوەیکە وەستا و رووی تێکردم.

- گوێ بگرە "یونگە"، من هیچ دوژمنایەتیم لەگەڵ تۆ نییە، بەڵام ئاوا نابێ، تۆ دەبیتە هۆی ئەوەی ئیشەکەی من عەیب و کەموکوڕی پێوەدیاری بێ.

چاوی لە من بڕی و دووبارەی کردەوە.

- دەبیتە هۆی کەموکۆڕی و عەیب و عاری ئیشەکەم. ئیتر سەندیکا ناتوانێ بەرگریم لێبکات.

من بێدەنگ مامەوە و ئەویش لە قسەکانی بەردەوام بوو.

- وابزانم تێناگەی چیت پێ دەڵێم. دەزانی ئەگەر عەیب و کەموکوڕی لە ئیشەکەمدا پێکبێت، چیم بەسەر دێت.

- نا.

- سەرەتا چەند جار هۆشدار، غەرامە و لە کۆتاییدا دەردەکرێم!

- من لەوێ نە سەری سیرم و نە بنی پیواز. تەنیا ئەوکارەی کە مایستر پێیسپاردم، ئەوا ئەنجامم دا.

سەرتاپێ سەیری کردمەوە و وتی:

- یەکم جارتە لە کارگەیەك ئیش دەکەی؟

- بەڵێ.

- پێشتر چی؟ لە کوێ بووی؟

- لەناو سوپا.

- وەکوو خۆبەخش.

- بەڵێ.

سەرێکی راوەشاند و وتی:

- کەواتە گوێ بگرە. دەبێ زۆر بە هێواشی ئیش بکەی.

- ئاخر لەوە سەبرتر ناتوانم. بۆخۆتان کە بینیت....

قسەی برِیم کە: – جارێ بە من مەڵێ "بۆخۆتان" ئەوە ئیتر چ جۆرە قسە کردنێکە. دواتر، بارودۆخم زۆر باش بوو لەگەڵ ئەو هاورِێیەی پێش تۆ ئیشی دەکرد. ئەویش ئەمری پێکرابوو جووت جووت دەرگاکان بێنێ.

پیپێکی رەشی پێکرد کە لە کۆنیان وەکوو ددانە مشکی لێهاتبوو.

- لەو چکوشانەی کە دەیانوەشێنی، چەند لە ئاسنەکان بە ناڕێکی دەچنەژوور و دەبێ دەریانبێنیتەوە؟

ژماردم و وتم: – لە هەر پازدە بیستیان، یەك دانە.

- کاتت دەگرێت مەگەر نا؟

- بەڵێ.

- ئێ، ئێستا گوێ بگرە. تۆ بۆ دەرهێنانەوەیان کاتت بەسەر دەچێ وایە؟

- بەڵێ

- بەیانی لە هەر دە دانەیان یەکیان بەخراپی بخە ناو کوونکەی و دەریانبێنەوە.

تووشی سەرلێشێواوی ببوم.

وتی: – ئێستا لێم تێگەیشتی؟

بە شك و گومانەوە وتم: – دەتهەوێ وا بنوێنم کە لە دە دەرگا یەکێان خراپ بووە و دەبێ سەرلەنوێ چاکی بکەمەوە.

بە دەنگێکی ڕەزامەندانە وتی: – کەواتە تێگەیشتی! بەڵام ئەمە هەمووی نییە. نەختێك دەبێ خۆت زیاتر بخافڵێنی. تێگەیشتی؟ ئەوکات دەبینی کە منیش وەپاش ناکەوم. ئەگەر هەر لە بەیانییەوە ئاوا نەکەی، ئەوا وەکوو ئەمڕۆ کە پێنج قەفەسەمان زیاتر بردە ڕەنگکاری، ئەوا دەبێ هەموو ڕۆژێ دووبارەی بکەینەوە، یانی کارێکی زیاتریان لێمان دەوێ.

سەرتاپێ گوێم گرتبوو و وتم: – کارێکی ئاوا لەدەست من نایەت.

شانەکانی هەڵاویشت و وتی: – بیر لە مایستر مەکەوە، یونگە. ئەو هاوڕێیەی پێش تۆ کاری دەکرد، پێنجساڵ بەم شێوە مایەوە و هیچکەس تێنەگەیشت.

- من هیچ کێشەیەکم لەگەڵ مایستر نییە و ئەوەندەش حسێبی لێناکێشم.

"کارل"ی پیر بە سەیرەوە چاوێکی لێکردم و وتی: – کەواتە بۆچی ئاوا ناکەی.

ڕاست سەیری چاوەکانیم کرد و وتم: – ئەمە "خەرابکارییە".

"کارل"ی پیر سوور هەڵگەڕا و چاوەکانی لە تووڕەیی درەوشایەوە.

- کەواتە باش گوێ بگرە یونگە، ئیتر ئێرە لەناو سوپا نیت! خەرابکاری، خوشکی خەرابکاری ....! من کرێکارم و لە هەموو تەمەنمدا هیچ کارێکی خراپم نەکردووە.

مایەوە و ئیتر نەیتوانی هیچ بڵێت. پیپیەکەی بەجۆرێك لەناو دەستی ڕاستیدا ڕێککووشی کە پەنجەکانی سپی هەڵگەڕا. دوای ماوەیەك سەیر کردنی من بە هێوری وتی:

- ئەوە "خەرابکاری" نییە یونگە، "هاوکاری"یە.

وەڵامم نەدایەوە. لە قسەکانی بەردەوام بوو کە:

- بیری لێبکەوە، لە سوپادا فەرمانـدە هەیـە و هیـچیتر. بەڵام لێـرە کرێکارێکی زۆری لێیە و ئەگەر ئاگامان لە یەکتر نەبێت ئەوا هیچکات کرێکار ناحەسێتەوە و ناکرێ ناوی کرێکاریش لە یەکتر بنێین.

دیسان ماوەیەك سەیری کردم و دوایی سەرێکی جووڵاند و وتی:

- باش بیری لێ بکەوە یونگە. بەیانی بەدیار دەکەوێ کە لێم تێگەیشتووی یان نا.

پشتی تێکردم و رۆیشت.

بۆ مـاڵی "فـراو لیپمـان" و شـرادر کـە خـەریکی تاشـینی ردێـنی بـوو چوومەوە. شرادر هەموو ئێواران ردێنی دەتاشی.

کە چوومە ژوور، بوتڵی نیو لیتری شیری بێ چەوریی کە لە کارگەی پێیان دابوو، لەسەر مێز بوو. هێشتا نیوە بوو.

شرادر بە تیغەوە (مووس) ئاوڕی دایەوە و ئیشارەیەکی کرد و وتی:

- هەڵیگرە، هی تۆیە.

بوتڵەکەم سەیر کرد. شیرەکەی بۆر ببوو، بەڵام بەهەرحاڵ شیر بوو. سەرم سووڕاند و وتم:

- نا، گەورەم، شرادر!

- ئیتر من نایخۆمەوە.

نیوە جگەرەیەکم لە بەرکم دەرهێنا و دامگیرساند: – نا شرادر. ئەمە شیری تۆیە. بۆ تۆ لە حوکمی دەرمان دایە.

شرادر تیغەکەی بەرز کردەوە و هاواری کرد:

- ئەتۆ گیانی من گوێ لەم گێلە پیاوە بگرە!.... مەگەر نەموت "ئیتر ناخۆمەوە"؟ .... یاڵڵا! هەڵگرە و بیخۆوە، دۆمکوپف!

- گرنگ نییە.

بە پرتەبۆڵە وتی: – کەللەکەری خراپ، باواریای لەعنەتی!

دوایی لەناوقەدەوە بۆ سەرێی رووت کرد، خوار بۆوە و هەر ئەمجۆرەی لەناو تەشت خەریکی شۆردنی دەست و دەم و چاوی بوو، دەستی بە فیکەلێدان کرد.

دانیشتم و جگەرەکەم کێشا. بوتڵی شیر لەبەرچاوم سەمای دەکرد. بەجۆرێکدانیشتم کە ئیتر چاوم پێی نەکەوێت.

شرادر بە خاولی سینگ و پشتی وشك دەکردەوە، پرسی:

- "کارل"ی پیر چ ئیشێکی پێ بووی.

لە سەرتاوە بۆم گێڕایەوە. کە تەواو بووم سەرێکی هەڵاویشت و دەستی بە پێکەنین کرد.

هاواری کرد: – ئاخ، کەواتە ئاوا، کەوەنتەرە زیادەکانی ناو کارگەی رەنگکاری ئیشی "کارل"ی پیر نییە، ئیشی رۆدۆلفی بچکۆلانە بوو!

کراسەکەی لەبەر کرد و بێ ئەوەی بیخاتە ناو پانتۆڵەکەی دانیشت.

- تۆش رێك ئەو کارە دەکەی کە "کارل"ی پیر پێی وتوویە.

- نەخێر بەهیچ شێوە ئەم بڕیارەم نەداوە.

سەیری کردم و هێڵێکی رەش لە برۆکانی کەوتە سەر چاوەکانی:

- بۆچی ئەم بڕیارەت نەداوە؟

- چونکە بۆ ئەو ئیشەی کە دیکەم، مووچە وەردەگرم، منیش ئەرکم ئەوەیە کە ئیشەکەم بە رێکوپێك و بە درووستی ئەنجام بدەم.

شرادر وتی:

- بە.....ڵێ! تۆ ئیشەکەت باش بەڕێوەدەبەی، ئەوانیش مووچەت پێدەدەن! هیچ ئەوەت لێکداوەتەوە رەنگە ئیشی تۆ ببێتە هۆی ئەوەی "کارل"ی پیر ئیشەکەی لە دەست بدات و لە کارگە بیخەنە دەرەوە؟

بە نووكی پەنجەكانی چەند زەربێكی لە مێزەكە دا و دووبارە وتی:

- ئەوەی روون و ئاشكرایە ئەوەیە كە "كارل"ی بەستەزمان ناتوانێ بچێتە لای مایستر و بڵێت "لەگەڵ ئەو هاورێیەی پێش رۆدۆلف پێنج ساڵی تەواو فێڵمان كردووە و كڵاومان لەسەر تۆ و كارگە ناوە بۆیە ئیشەكە ئاوا بوو!"

چاوی لە من بڕی و چونكە بینی هیچ ناڵێم دووبارە وەقسە هاتەوە و وتی:

- "كارل"ی پیر بە فێڵ كردن توانیویەتی ئەمكارە بەدەست بێنێ، ئەگەر ئاگات لێی نەبێت دەفەوتێ، دەفەوتێ و دەردەكرێ رۆدۆلف.

- هیچ كارێكم لەدەست نایەت.

لووتە شكاوەكەی بە پشتی دەستی خوراند:

- ئەگەر وەدەری نێن، ئەوكات كوڕەكانی كارگە بە چاوێكی باش سەیری تۆ ناكەن.

- هیچ كارێكم لەدەست نایەت.

- بۆچی، لەدەستت دێت.

بێدەنگییەك هاتە ئاراوە و دوایی وتم:

- من ئەركی خۆم بەرێوەدەبەم.

شرادر بەجۆرێك دەرپەڕی كە بەلامەوە سەیر بوو و بۆ یەكەمجار بەم شێوەیە بینیم. قیژاندی:

- ئەركت....! دەتهەوێ بزانی ئەركی تۆ چییە؟ بە رۆژانە پێنج كەوەنتەر زیاتر دروست بكرێ، تا بابە زاكە (خاوەنی كارگە) پارەیەكی زیاتری بەدەست كەوێ و بیانخاتە ناو بەركی و هەر ئێستاكەش ئەوەندەی تێدایە كە وەختە لە پڕیان بتەقێ. هەر ئەمڕۆ بابە زاكەت بینی سواری

مارسدێسەکەی دەبوو! بەو لووتە سووورە نەعلەتییەی کەوەکوو لووتی بەراز دەچوو! بەو زگە زلەیەی! ئەوە باش بزانە کە ئەو هیچکات لەسەر تەختی خراپ ناخەوێ! ئەو شیرەی کە دەیخاتە ناو قاوەکەی، شیری بێ چەوریی نییە. ئەوە باش بزانە و گوێتی لێ باخنە. ئەو ئەرکە نەعلەتییەی تۆ، لێمگەڕی با پێت بڵێم ماناکەی چییە ڕۆدۆلف: برسێتی و تینویەتی هەرچی زیاتری "**کارل**"ی پیر و بەستە پارەی زیاتر بۆ بابە زاکە.

نەختێك سەبرم کرد بۆئەوەی کەمێك لە تووڕەیی کەم بێتەوە و ئەوکات وتم:

- ئەوە بە من چی کە خۆم بخەمە ناو ئەم مەسەلەیە؟ بۆ من ڕوونە. متمانەیان پێکردووم و ئیشێکیان پێ سپاردووم. ئەرکەکەشم ئەوەیە کە بە باشترین شێوە ئیشەکەم ڕاپەڕێنم. هەر ئەمە و بەس.

شرادر بە سەرلێشێواوی چەند هەنگاوێکی نایەوە و دوایی گەڕایەوە لای مێزەکە.

- "**کارل**"ی پیرەپیاو، پێنج منداڵی هەیە

دوای بێدەنگییەك، خێرا و بە وشکی و بێ ئەوەی سەیری بکەم، وتم:

- ئەوەیان هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە.

شرادر مستێکی لە مێزەکە دا و هاواری کرد:

- "**دونێروێتر**" (هەی سەرلێشێواو) ئیتر بە دیتنت دەڕشێمەوە.

هەستامە سەرپێ و دەستەکانم خستە ناو بەرکی کۆتەکەم و وتم:

- ئێستا کە بە دیتنم دەڕشێیەوە، خۆ دەتوانم بڕۆم.

شرادر سەیرێکی کردم و خێرا بەسەر تووڕەییدا زاڵ بوو و بەشێوەی جارانی وتی:

- بەگیانی خۆم ڕۆدۆلف، جاروبارە دەڵێم نەکا لەسەرت دا.

لێوەکانی کراسەکەی خستە ناو پانتۆڵەکەی، ڕۆیشت و نان و چەوریی بەراز و بیرەی هێنا و هەموویانی دانایە سەر مێز و بە سەرخۆشییەکی گاڵتەجارانە وتی:

- **"زو تیش! زو تیش"** (بەرەو مێز).

دانیشتم. پارووییەکی دروست کرد و دای بە من و پارویەکیشی بۆخۆی دروست کرد و خەریکی خواردنی بوو. تەواوی کرد و پەرداخێك بیرەی بۆخۆی تێکرد و نیوە جگەرەیەکی داگیرساند و تیغەی چەقوویەکەی نوشتاندەوە و خستیە ناو بەرکی. حاڵەتێکی پەژارە و ماندووی هەبوو.

کەمێك کە تێپەڕی وتی:

- فەرموو! ئەوەش ژیانی غەیری سەربازی! ئەوەیە ئیتر... پیاو تا تەپڵی سەری دەچێتە ناو پیسایی و یەکێ نییە ڕێگەیەکی نیشان بدات. بە پیاوی بڵێ دەبێ چی بکات! هەمووی خۆتی کە دەبێ بڕیار بدەی!

کە بیرم لە قسەکانی کردەوە، بینیم ڕاست دەکات.

ڕۆژی دواتر کە چوومە سەر ئیش، کاتێك لەبەردەم **"کارل"**ی پیر تێپەڕیم، بە دەممەوە پێکەنی و بە دەنگێکی برایانە وتی: - **نا، یونگە!** (یاڵڵا لاوە).

سڵاوم لێیکرد و چوومە پشت مێزی کار، چۆکەکانم هێزی ئیشیان نەبوو و ئارەقە لە شانم ڕێگەی پشتمی بڕی. چوار لینگە دەرگام هەڵگرت، بەڵام دڵم بۆ کار نەدەچوو. چکوچ و ئامرازەکانی دیکەم دەست دایە و دستم بە ئیش کرد.

خۆم دەخافڵاند و کاتێك یەکەم چوار لینگە دەرگام بردە لای **"کارل"**، دووبارە پێکەنی و لەبن گوێم وتی:

- ئەمجۆرە زۆر باشە، **یونگە**.

سوور هەڵگەڕام و وەڵامێکم نەدایەوە.

بەهەرحاڵ دیسانیش نەختێك بە هێوری ئیشم دەکرد و کەم کەم ئومێدەوار دەبوو کە ئیتر لەمەو بەدوا ئاوا ئیشەکە راپەڕێنم. کاتژمێرێکی پێ نەچوو کە ئاسنە بچووکەکان کە دەبوایە بیانخەمە ناو لوولای دەرگا، بە جۆرێك رێك بڕدران کە بێ کەڵك وەرگرتن لە چکوچیش دەچوونە ناو کوونەکە. دەمویست بیر لە قسەکانی "کارل" و منداڵەکانی بکەمەوە، بەڵام نازانم لەناکاو بە خێرایی ئیشەکانم راپەڕاند، زۆر خێرا و خێراتر لە رۆژی رابردوو، وەکوو مەکینەیەك.

کاتژمێرێکی پێنەچوو کە یەکێك هاتە لای مێزەکەم. سەرم بەرز نەکرد. تەنیا دەستێکم بینی کە بە درەگاکان کەوت و لەناو دەستەکەدا پیپێکی بچووکی ددان رەشم بینی. پیپ دوو تەقەی لە دەرگا هێنا و دەنگی "کارل"م گوێ لێبوو کە وتی: "چیتە؟" لەبەرچاوی ئەو سومبەکەم خستە ناو کوونەکە و بەدەستم پاڵمدا. بێ هیچ کێشەیەك رۆچوو. دەرم هێنایەوە و خستمە ناو کوونی دەرگایەکی دیکە، دیسان بێ هیچ زەحمەت و گرفت رۆچوو. بێ ئەوەی سەرم بەرز بکەمەوە، پاڵمدان و بردمنە لای دەرگاکانی دیکە. ئەو دەستەی کە پیپەکەی گرتبوو، هەر لەوێ بوو. لەرزینێکی سووکی هەبوو و دوایی، لەناکاو هیچ شتێ لەوێ نەما. گوێم لە دەنگی پێ بوو کە دوور دەکەوتەوە.

مەکینەکان کارگە گەورەکەیان دەلەرزاند. بێ ماندوو بوون ئیشم دەکرد. چالاك بووم و بەتاڵ. بە زەحمەت هەستم بەوە دەکرد لەوێم. عارەبانەی بەشی رەنگکاری بە چغەچغ هات. تایەکانی دەیانچریکاند. ئەوکات بینیم کرێکاری سەر عارەبانەکە بە دەنگی بەرز بەسەر "کارل"ی پیری قیژاند:

- تۆ چیتە؟ زاکە پوڵی خێرات بە تۆ نادات؟

بێدەنگییەك رووی دا. من هەروا سەرم داخستبوو. تەنیا ئەوەندەم بینی کە پیپی "کارل" بەرز بۆوە و منی نیشان دا.
دوای ماوەیەك دیسان تایەکانی عارەبانە سەرلەنوێ بەچیفەچیغ کەوت. سێبەرێك لەسەر مێزی من تێپەڕی و دەنگی مایستر، بەتووڕەیی لەناو مەکینەکان بیسرا کە:

- هیچ نازانم ئێوە چیتانە.... خەوتوون؟

"کارل" بە دەنگێکی بەرز وتی کە:

- تەنیا دە خولەك لای من راوەستە، خۆتان دەبینن کە من خەوتووم یان نا!

سێبەر لەسەر مێزی کاری من تێپەڕی و دەنگی "کارل"ی پیرم بیست کە لەژێر لێوەکانی جنێو دەدات. دوای نیو کاتژمێر مایستر گەڕایەوە، بەڵام ئەمجارە توانیم گوێ لە قسەکان بگرم.
دوایی، ماوەیەکی زۆر هەستم کرد کە "کارل"ی پیر چاوی لەمن هەڵناگرێت. خێرا چاوێکم لێکرد: ئیتر سەیری منی نەدەکرد و پشتی لەمن کردبوو. پشت سەری سوور بوو، مووەکانی بە ئارەقە تەڕ ببوون و شێتانە ئیشی دەکرد. ئێستا بە رێژەیەك دەرگای لەلایە کە هەر ناتوانێ بجوولێ.
فیکەی نیوەڕۆ لێدرا. مەکینەکان وەستان و دەنگەدەنگ کارگەی پڕ کرد. چووم دەست و باڵم بشۆم. وەستام هەتا شرادر هات و پێکەوە بەرەو چێشتخانە رێکەوتین، زۆر غەمین و تووڕە دیار بوو بێ ئەوەی سەیرم بکات وتی:

- کوورەکانی بەشی رەنگکاری چەقویان لێبدەی دڵۆپە خوێنێکیان لێ نایەت.

دەرگای ژووری خواردنم كردەوە، بڵغە بڵغ و دەنگە دەنگ لەناكاو بڕا. هەستم كرد هەموویان سەیری من دەكەن. چاوم لە هیچكەس نەكرد و راست بۆ لای مێزێكی بەتاڵ رۆیشتم. شرادریش بەدوام كەوت و دەنگە دەنگ و قیژە و هەرا دەستی پێكردەوە.

هۆڵی نان خواردن رووناك و خاوێن بوو و كۆمەڵێك مێزی بچووكی لێ دانرابوو بە رەنگی سوور كە لەسەر هەر كامەیان دەستەیەك مێخەكی دەستكرد دانرابوو.

شرادر لە تەنیشتم دانیشت و دوای نەختێك، كرێكارێكی لاوازی درێژ كە بیستبووم ناویان ناوە "كاغەزە جگەرە" لەسەر مێزی رووبەڕوو هەستا و هات رووبەڕووی ئێمە دانیشت. شردار سەری بەرز كرد و سەیرێكی كرد. "كاغەزە جگەرە" بە دەست سڵاوێكی لێكرد و بێ ئەوەی شتێك بلێت یان تەنانەت سەیری لای ئێمە بكات خەریكی خواردنی نانەكەی بوو. ژنێكی كرێكار بە كوپ و ئیستكانەوە هات و ئاوی گەرمی بۆ تێكردین. پیاوەكە سەرێكی بۆ سووڕاند، تازە زانیم بۆ ناویان ناوە كاغەزە جگەرە. كابرا زۆر پان و بەرین بوو، بەڵام كە لە تەنیشتەوە سەیرت دەكرد، وەكوو ئەوە دەچوو هیچ بەریناییەكی نییە. من هەر سەیری سەرووی ئەوم دەكرد و خواردنەكەم دەخوارد: لەسەر دەرگای رووبەڕووی من، لەناوەڕاستی دیوارەكە، پەڵەیەكی گەورەی چوارگۆشە بوو كە رەنگێكی توندتری هەبوو. سەیری ئەم پەڵەیەم دەكرد و جاروبارەش چاوم لە شرادر دەكرد. سەری داخستبوو و خواردنەكەی دەخوارد. هێڵی رەشی برۆكانی پێش چاوەكانی گرتبوو.

"كاغەزە جگەرە" وتی: - یونگە!

سەیرم كرد. چاوەكانی بێ رەنگ بوو. بزەی دەهاتێ.

وتی: – یەکەم جارە لە کارگە ئیش دەکەی؟

- بەڵێ.

- پێشتر چیت دەکرد؟

لەجۆری قسەکردنی دیار بوو کە خۆی دەزانێت.

- مفەوەزی سوارکارانی سوپا بووم.

- وتی: "مفەوەز" و فیتوویەکی راداشت.

شرادر سەری بەرز کردەوە و زۆر بە وشکی وتی: – وەکوو من.

کاغەز جگەرە پێکەنینێکی ئاراستە کرد و بەهەر دوو دەست کوپەکەی گرت. سەرم بەرز کردەوە و سەیرێکی پەڵەی گەورە و چوارگۆشەی سەر دیوارم کرد. تەقەی کرانەوەی چەقووی شرادرم گوێ لێبوو و لە جووڵەی دەستی زانیم خستییە ناو بەرکی.

کاغەزە جگەرە وتی: – یونگە! ئەم "کارل" پیرە هاوڕێیەکی باشە، هیچکەس حەز ناکات لێرە دەربکرێ.

سەیرم کرد و دووبارە بە پێکەنینێك کە تووڕەیی لێدەباری سەیری کردم و لەناکاو حەزێکی زۆر هاتە ناخمەوە کە کوپە پڕ لە چایەکەی هەڵگرم و لە رووخساری بدەم.

کاغەزە دیوار بێ ئەوەی واز لە پێکەنینی بێنێ وتی:

- ئەگەر لێرە دەربکرێ، گوناهەکەی وەباڵی تۆیە.

پەڵەی چوارگۆشەی سەر دیوارم سەیر کرد و بەم بڕوایە گەیشتم کە پێشتر وێنەیەکی لێبووە و لەخۆم پرسی بۆچی هەڵیانگرتووە. شرادر ئەنشکێکی تێکووتام و دەنگی خۆمم گوێ لێبوو کە: – مەبەست؟

کاغەزە دیوار وتی:

- زۆر سادەیە... ئەو کارەی کە "کارل"ی پیر پێیوتوی بەڕێوەی دەبەی.

شرادر بە نوکی پەنجەکانی لە مێزەکەی دا و منیش وتم:

- نا!

شرادر وازی لە تەپڵ لێدان هێنا و بەری هەر دوو دەستی لەسەر مێزەکە دانا. من سەیری کاغەزە جگەرەم نەدەکرد بەڵام هەستم دەکرد وەکوو پێشووتر هەر پێدەکەنیّ.

بە هێواشی وتی: - پیساییەکی غەریب و نامۆی!

لەناکاو لە هەموو شت گەیشتم. ئەو شتەی کە لەویّ هەڵیان گرتووە، پەردەی وێنەی کێشراو نەبوو، بەڵکوو وێنەی "**قەیسەر**" بوو. (نازناوی پاشاکانی ئەڵمانیا)

گرمەیەك بەرز بۆوە و بێدەنگییەکی مەرگئاسا تەلارەکەی داگرت. **شرادر** لە جێگەی خۆی دەرپەڕی و قۆڵی منی گرت. هاواری کرد: - شێت بوویە!

کاغەزە جگەرە وەستابوو و رووخساری بە قۆڵی خاوێن دەکردەوە: بەڵیّ کوپە چایەکەم بە سەرو چاوی دادابوو..

کاغەزە جگەرە سەیری منی کرد، چاوەکانی دڕ ببوون. کورسییەکەی وەلانا و بۆ لای من هات. لە جێگەی خۆم نەجوولام. قۆڵی شرادر دووجار بەخێرایی لەپێش من هاتوو چوو. دوو دەنگی وشك هات. کاغەزە جگەرە کەوتە خواریّ. هەموویان لە جێگەی خۆیان هەستان. هاوارێکی خەفە بەرز بۆوە. وام هەست کرد کە دەرگای هۆڵەکە بەرووی ئێمەدا داخرا. جووت دەستی شرادرم بینی کە دەستەی کوورسییەکیان گرت. دەنگی "کارل"ی پیرم گویّ لێبوو:

- لێیان گەڕێن با بڕۆنە دەرەوە.

لەناکاو هەتا بەردەرگا کۆڵانێك کرایەوە و شرادر قۆڵی گرتم و منی بەدوای خۆیدا کێشا.

لەناو ئاودەست شرادر دەست و باڵی خۆی شورد. بەندی پەنجەکانی غەرقی خوێن بوون. قوونە جگەرەیەکم داگیرساند و شرادر کە ئیشەکەی تەواو بوو بۆم راداشت.چەند قمی لێدا و پێیدامەوە. فیکەی کارگە بەرز بۆوە، بەڵام بەر لەوەی لە ئاودەست بچینە دەرەوە، نەختێك لەوێ ماینەوە.

شرادر رێگەی خۆی خوار کردەوە، بۆ ئەوەی هەتا کارگە لەگەڵم بێت. دەرگام کردەوە و بە سەرسووڕمانەوە لە جێگەی خۆم وشك هەڵاتم. لەناو کارگە تەنانەت باڵندەش باڵی لێنەدەدا!

شرادر سەیری منی کرد و سەرێکی راوەشاند. چوومە شوێنی خۆم و دوایی شرادریش رۆیشت.

چوار لینگەی دەرگام هەڵگرت و لەسەر مێزەکە دامنا و خەریکی ئیشی خۆم بووم. دوایی دوو دوو بردمنە نزیك شوێنی "کارل"ی پیر و لەوێم دانان. کاتژمێرم سەیر کرد، دە خوولەکێك لە کاتی ئیش لایدابوو. تەلاری کارگە بێدەنگ و کوێر بوو، کەسی تێدا نەبوو.

دەرگای تەلارەکە کرایەوە. مایستر سەری هێنایە ژوور و هاواری کرد: – ئیدارە.

چکوچ و کەرەستەکانی دیکەم دانایە سەر مێز و بۆ دەرێ رۆیشتم.

لەبەر دەرگای ئیدارە شرادرم بینی. بە هێواشی منی وەپێش خۆی دا. دەرگام کردەوە. یەکێك کە لووتی زیاتر وەکوو لووتی مەیمون دەچوو، لەوێ وەستابوو و هەر ئەمجۆرەی کە دەستەکانی رێکدەخشاند، سەیری دەکردین.

چووینە پێش، بە پێکەنینێکی بچووك وتی: – ئێوە درکران!

**شرادر** وتی: — بۆچی؟

- "کردەوەی زۆرەملانە دژ بە هاوکار".

برۆکانی **شرادر** هاتنە سەر چاوەکانی: — بەو خێراییە؟

لووت مەیموون بە تووڕەییەوە وتی: — شۆڕای کرێکاران: درکرانی خێرا، یان وازهێنان لە ئیش و کار.

- زاکەش ترساوە لەوەیکە کارگە دابخرێ.

- یا، یا، "**هێر زاکە**"ش تەسلیم بووە.

دوو پاکەتی لەسەر مێز بەرەو ئێمە خلیسکاند: — ئەمەش حسێبتان. رۆژێك و نیو. (دووبارەی کردەوە) — یا، یا، "**هێر زاکە**"ش تەسلیم بوو.

سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و دەنگی هێنایە خوار و وتی:

- تۆ وابیر دەکەیەوە هەمان رۆژگاری باشی پێوویە؟

دوایی هەر بەم دەنگەوە وتی: — بەهەرحاڵ، لە دەم و فلْچی کاغەزە جگەرەت داوە خۆ؟

**شرادر** وتی: دانەیەك نا، بەڵکوو دوو دانە!

لووت مەیمونە جارێکی دیکە دەوروبەری خۆی سەیر کرد و بە هێواشی وتی:

- هەی نەوشی گیانی بێت و چاوێکی لە **شرادر** داگرت.

- تا قورگ چووینەتە ناو پیسایی! ئەوەش حاڵ و رۆژمانە: هەتا قورگ چووینەتە ناو گوو!

**شرادر**: — ئای چیت وت.

لووت مەیموونی دووبارە چاوێکی داگرت و وتی:

- کەواتە ئێستا نەختێك بوەستە هەتا ببینی. ئەوانە بۆ هەمیشە لە سەروو نامێننەوە دەبینی!

**شرادر: – هەر بژی!**

**لەناو کۆلان هەمان بارانی سەهۆڵاوی هەشت ڕۆژ پێش دەباری و وەستانی نەبوو و پێشوازی لێدەکردین. چەند هەنگاوێك لە بێدەنگیدا ڕۆیشتین و من وتم:**

- **تۆ ناچار نەبووی خۆت تێکەڵاو بکەی.**

**شرادر وتی: – وازبێنە ئیتر.**

**بە پشتی دەستی لووتە شکاوەکەی خوراند.**

- **ئەگەر لە من دەپرسی، ئاوا زۆر باشتر بوو.**

**بۆ ژووری ئەو ڕۆیشتین. دوای ماوەیەکی کوورت گوێمان لە هەنگاوەکانی "فراو لیپمان" بوو کە لە مەمەڕەکەوە دەهات. شرادر چووە دەرەوە و دەرگای لە پشت خۆی پێوەدا.**

**سەرەتا دەنگی قاقا و پێکەنین، دەنگی ملچە ملچ و بەغبەغو. دوایی لەناکاو دەنگی "فراو لیپمان" بەرز بۆوە.**

- **ناین! ناین! ناین! ئیتر وە ئامان هاتووم. ئەگەر هەر لە ئێستاوە تا هەفتەیەك ئیشتان پەیدا نەکرد، ئەوا دەبێ هاوڕێیەکەت بڕوات.**

**گوێم لێبوو، شرادر سوێندی دەخوارد و لە کۆتایی گوێم لە دەنگی ئەو بوو کە :**

- **کەواتە منیش دەڕۆم.**

**بێدەنگییەك رووی دا و "فراو لیپمان" ماوەیەکی زۆر بە هێواشی سرتەسەرتی بوو. دوایی لەناکاو بە تووڕەیی هاوارێکی کرد و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد.**

- **زۆر باشە، زانیم "هێر شرادر" ئێوەش دەڕۆن!**

شرادر هاتەوە ژوور و دەرگای بە توندی لەپشت سەری خۆی پێوەدا. وەکوو چەوەندەر سوور ببۆوە و چاوەکانی تووڕەییان لێدەباری. لەسەر لێوی تەختی خەوتن دانیشت و منی سەیر کرد.

- دەزانی ئەم سێحربازە نەعلەتییە چی پێ وتم؟

- گوێم لێبوو.

هەستایە سەرپێ و دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە:

- ژنەتیوی شێت! ژنەتیوی شێت! تەنانەت ماڤ داوێنی پیاویش راناگرێت!

ئەم سۆحبەتەم بەدڵ نەبوو، وام هەست کرد ڕەنگم گۆڕا. شرادر لەژێر چاویەوە سەیری کردن و قاقایەکی لێدا و کراسەکەی دەرهێنا و فڵچەکەی دەست دایە و بە فیتوو لێدان خەریکی سابوون لێدان لە رووخساری بوو. دوایی تیغی دەست دایە و وازی لە فیتوو لێدان هێنا و دەستی بە تراشینی ردێنی کرد.

دووای خوولەکێك، تیغ بەدەست ئاوڕی دایەوە. رووخساری بە کەف سابوون داپۆشرابوو. وتی:

- راستی، وابزانم سەبارەت بە ژنان، هەر هیچ هەستێکت نییە؟

چاوەڕوانی ئەم پرسیارە نەبووم. هەر ئاوا سەرسەری وتم: -"نا". بەڵام دوایی بە دڵەڕاوکێیەوە بیرم کردەوە کە ئێستا دەست دەکات بە گاڵتەجاری و پرسیاری دیکە!

شرادر وتی: - بۆچی؟

- نازانم.

سەرلە نوێ دەستی بە تێهەڵسوونی کەف کردەوە.

وتی: - یا، یا، بەڵام بەهەرحاڵ تاقیت کردووەتەوە. نیشت وار؟

- بەڵی، جارێك لە دەمشق.

شرادر وتی: – ئێ، ئەنجام؟

شرادر کە بینی من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی کە:

- یاڵڵا بابە، ئەمجۆرە وەکوو شاماسی مردوو لەسەر کوورسی وشك مەبە! وەڵام بدەوە دەی! ئاخر جارێك بە باشی وەڵام بدەوە و دوو وشە قسە بکە!.... ئەمکارە چێژی پێبەخشی؟ ئا یان نا؟

- ئەرێ.

- دەی، دوایی؟

جووڵەیەکی توندم کرد و وتم: – ئەوەندە پێم خۆش نەبوو کە دووبارەی بکەمەوە.

تیغەکە بە رووخساریەوە وشك بوو: – ئاخر بۆ؟ ژنەتیوە ناشیرین بوو؟

- ئۆە، نا!

- بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات.

- نا.

- دەی بابە قسە بکە! رەنگە جوان نەبووە؟

- بەڵێ .... جوان بوو.

شرادر بە پێکەنینەوە: – جوانیش بوو، ئەی کێشە لە چیدا بوو؟

بێدەنگییەك رووی دا.

وتی: – دەی، یاڵڵا، قسە بکە، بێڵێ بۆچی؟

بە ئیفادەوە وتم: – ئێ، دەبوایە بەردەوام قسەی لەگەڵ بکەم. ئەوە ماندووی دەکردم.

**شرادر سەیری کردم. چاو و دەمی گرد بۆوە و لەناکاو لە قاقای پێکەنینی دا و وتی: - هێرگوت! راستی راستی کە شاماسییەکی سەیر و سەمەرەی، رۆدۆلف.**

**لەناکاو گرێکی سووتێنەر هەموو جەستەی داگرتم، وتم: - خەفە بە، بێدەنگ شرادر.**

**شرادر کە پێشتر وەپێکەنین کەوتبوو هاواری کرد:**

**- ئاخر، فشە و گاڵتە و سەیری رۆدۆلف! دەتەوێ راستیت پێبڵێم؟ زۆرجار لای خۆم بیر دەکەمەوە کە باشتر نەبوو بە قسەی باوکت کردبا و ببای بە قەشە؟**

**مستێکم لە مێزەکە دا و نەڕاندم: - بێدەنگ بە شرادر!**

**دوای ماوەیەك شرادر گەڕایەوە شوێنی خۆی و ئانشکی بەرز بۆوە و دیسانیش خش و خشی تیغ بەرز بۆوە.**

**"فراو لیپمان" ناچار بوو ئەو هەفتەیە لەسەرمان بەوەستێ کە خۆی مۆڵەتی پێدابووین. دوو رۆژ دوای درکرانی ئێمە لە کارگە، شرادر وەکوو گێژەڵووکە خۆی هاویشتە ناو ژوور و شێتانە هاواری کرد: "لوس، مێنش، لوس! بۆ سوپاکانی ئازاد[٢٤] خەڵك وەردەگرن!".**

**سێ رۆژ دواتر، بە چەك و سیلاحەوە شاری هـ.مان بەجێهێشت.**

**"فراو لیپمان" بۆمان گریا. ئێمەی هەتا وێستگەی شەمەندەفەر بەڕێکرد و لەسەر سەکۆ دەسرەی مالاوایی بۆ راوەشاندین و شرادر لە پشت**

---

[24] - لەم کاتەدا ئەڵمانیای شکست خواردوو لە چەك و سیلاح داماڵدرابوو، بەڵام چونکە لەناکاو ئینگلیزییەکان بۆ رووخاندنی حکوومەتی نوێی یەکێتی سۆڤیەت پێویستیان بە هێزی ئەڵمانیا پەیدا کردبوو و بەناوی "فەوجەکانی ئازاد" (سوپاکانی ئازاد) بە چەك و سیلاحی خۆیان ئامادەی شەڕ لەگەڵ بلشویکەکان کرد. لەم سەردەمەدا هێشتا سوپای سوور پێکنەهاتبوو.

شووشـــەی پەنجـــەری شـــەمەندەفەر وەســـتابوو و وتـــی: – بـــە هـــەموو شێتایەتییەکەی کچێکی خراپ نەبوو.

من لەسەر کوورسی دانیشتبووم. شەمەنەدەفەر بەڕێکەوت. سەیرێکی ئۆنیفۆرمەکەمم کرد و ئەو هەستەم هەبوو کە بۆ جارێکی دیکە بۆ ژیان گەڕاومەتەوە.

ئێمەیان ناردە "**گرنتس شوتز**" (پاسەوانانی سشۆقەکانی رۆژئاوای ئەڵمانیا) کە لە "**و**" بوون و تەحویلی "**روسباخ**"یان داین. خۆشمان لە "**ئۆبێرلویتنانت**"[25] روسباخ هات.

بالآبەرز و باریك بوو بە مووی بۆز کە بەشی پێشەوەی رووتتر بوو. وەکوو ملازمێك خۆی وشك نیشان دەدا، بەلآم لە هەمانحاڵدا بە پیاوێکی باش دەچوو.

لە بێ سەبریان خوێنی خۆیان دەخواردەوە و تەنانەت هی ئێمەش.

لە "و" هیچ ئیشێکمان نەبوو: چاوەڕوانی ئەمر و فەرمان بووین و هیچ هەواڵێکیش لە ئەمر و فەرمان نەبوو.

جاروبـــارە ئـــەوەی لـــە "**لیتـــوانی**" دەگـــوزەرا ئاگـــادار دەبـــووین و حەسوودیمان بە سوپای ئازادی ئەڵمانیا دەهات کە لەگەڵ بلشویکەکان شەڕیان دەکرد.

کۆتایی مانگی مەی ئاگادار کراین کە "**ریگا**"یان داگیر کردووە و بۆ یەکەم جار ناوی ملازم "**لئو ئالبرت شلاگێتر**"مان بیست کە پێشاوپێشی هەندێ سەرباز یەکەم کەس بووە کە چووەتە ناو شار.

---

[25] - ملازم یەکەم لە پەلەی سوپای ئەڵمانیا.

داگیرکردنی **ریگا** دوایین کاری بەرچاوی "**بالتیکومر**" (سوپای ئازادی ناوچەی بالتیك" بوو. یەکەم شکستەکان دەستیان پێکرد و **روسباخ فێلْ** و پلانی ئینگلتەرای بۆ ئێمە شی کردەوە:

- تائەو کاتە بلشویکەکان دوورگەکانی **بالتیك**یان هەبوو، ئینگلتەرا لەگەڵ چەك کردنی ئەڵمانیا چاوەکانی لەسەر یەك دانابوو و بوونی سوپاکانی ئازادی ئەڵمانیای لە **لیتوانی** بەلاوە گرنگ نەبوو و حکوومەتی بێ چەکی ئەڵمانیاش بە نۆرەی خۆیان چاویان بەست. بەڵام لەگەڵ جوولە و بزواتی بلشویکەکان، ئینگلیزیەکان بینیان کە **بالتیکومر** پێشێل کردنێکی ئاشکرایە بە پەیمانی چەك کردنی ئەڵمانیا و "سەرکردەکانی فیدراڵی ئەڵمانیا" لەژێر گووشاری ئینگلتەرا ناچار بوون **بالتیکومر**ەکانیان بوێتەوە. وا دابنێین کە ئەوان نەگەڕانەوە. مەسەلەی خۆش و سەیر ئەوەیە کە **بالتیکومر**ەکان بوون بە گروپەکانی خۆبەخشی روسیای سپی و تەنانەت لەناکاو دەستیان کرد بە خوێندنەوەی گۆرانی بە زمانی رووسی.....

قاقای پێکەنین بەرز بۆوە و **شرادر** لە پێکەنینی زۆر دەستەکانی لە رانی دەدا.

دوای ماوەیەك بە سەرسوورمانەوە هەواڵی ئەوەمان بۆ هات کە سەرکردەکانی فیدراڵی ئەڵمانیا "**دیکتاتی ورسای**"یان (پەیماننامەی زۆرەملی ورسای) ئیمزا کردووە. بەڵام **روسباخ** لەمبارەیەوە لام تا کام هیچی بە ئێمە نەوت. واپێدەچوو ئەم هەواڵە هەر هیچ پەیوەندییەکی بە بارودۆخی ئەو نەبوو. هەر ئەوەندەی وت کە ئەڵمانیای راستەقینە لە "**وایمار**" (ناوەندی ویلایەتی تورینگ لە ئەڵمانیا) نییە. هەر شوێنێك ئەڵمانیی بەغیرەت لە شەڕکردن بەردەوام بێت، ئەوا ئەوێ ئەڵمانیایە.

بەداخەوە هەواڵی یەك لە یەك ناخۆشترمان لە بالتیکومرەکان پێگەیشت. ئینگلتەرا "لتونیایی" و "لیتوانییەکان"ی دژ بە ئەوان پڕ چەك کردبوو. زێرەکەی وەکوو شەپۆل داگیرکەر و زۆر بوو و هێزی دەریاییەکەشی لە بەردەم ریگا ئامادەی شەڕ کرابوو و بۆ هێرش کردنە سەر هێزەکانی ئێمە ئاڵای لتوانیان بەرز دەکردەوە.

ناوەڕاستی مانگی نەڤامبەر روسباخ وتی بالتیکومرەکان ئەم شانازیەیان پێداوین کە بۆ هاوکاریان بچین. دوایی نەختێك وەستا و پرسیاری لێکردین: – ئایا بەلامانەوە گرنگە کە سەرکردە بێ چەکەکانی فیدراڵی ئەڵمانیا بە چاوی "شۆڕشی – یاغی" سەیرمان بکەن ین نا؟

هەندێکیان پێکەنین و روسباخ وتی کە هیچکەس ناچار ناکات و هەر کەس حەزی لێبێت، ئەوا دەتوانێ بمێنێتەوە.

هیچکەس ناهاوڕێیەتی نەکرد و هەموویان مانەوە.

روسباخ سەیری کردین و چاوە شینەکانی لە خۆشیان بریقەیان هات.

بەڕێکەوتین و حکوومەتی ئەڵمانیا هێزێکی نارد بۆئەوەی پێشمان لێبگرێت. وابزانین بۆ ئەم پلانە کەسانێکی خراپی هەڵبژاردبێت: ئەوانیش هاتنە ریزی ئێمە و دوای ماوەیەك یەکەم رووبەڕووبوونەوە رووی دا. دەستەکانی لیتوانی کەوتنە شەڕ لەگەڵ ئێمە کە لەماوەی تاکە کاتژمێرێکدا گیسکمان لێدان. شەو لە خاکی لیتوانی ئۆردومان لێدا و بەمشێوەیە سروودمان خوێند:

ئێمە دوایین ئەڵمانین
کەبەرامبەر بە دوژمن
ماوینەتەوە!

ئەمە، سروودی **بالتیکومرەکان** بوو. چەند مانگێك بوو لەبەرمان کردبوو، بەڵام ئەوشەوە بۆ یەکەمجار هەستم کرد کەماڤ چڕینی ئەم سروودەمان هەیە.

دوای چەند رۆژ دەستەی روسباخ بە کردنەوەی رێگەیەك لە نێوان لیتوانییەکان گەیشتە "**تورنسبێرگ**" (Thorensberg) و پادگانێکی ئەڵمانی رزگار کرد کە دەورە درابوو، بەڵام رێك دوای ئەم شەڕە پاشەکشە دەستیٚ پێکرد.

لە ناو قووڕ و چڵپاوەکانی **کورلاند** (Courlande) بەفرێکی قوورس دەستی بە بارین کرد و سۆزی بەستەڵەك مێرشی هێنا. شەو و رۆژ شەڕمان دەکرد. نازانم ئەگەر ملازم "**فون ریتر باخ**" ئێمەی ئاوا دەدیت چۆنی بیر دەکردەوە کە رێك هەمان پلانمان دژ بە لیتوانیەکان هەیە کە تورکەکان دژ بە عەرەبەکان بەڕێوەیان دەبرد.

گوندەکانمان دەسووتاند، مەزرا و ماڵەکانمان تالان دەکرد، دارەکانمان دەبڕی، لەنێوان چەکدار و غەیری چەکدار، ژن و پیاو، سەغیر و کەبیر هیچ جیاوازییەکمان دانەدەنا: هەر کەس لیتوانایی بوایە، ئەوا سزای مردن بوو. کاتێك دەگەیشتینە گوندێك و خەڵکەکەیمان دەکوشت، مەیتەکانمان دەخستە ناو چاڵێك و چەند قومبەلەمان تێدا دەتەقاندنەوە. دوایی شەو هەموو ئەشیا و کەرەسەی ماڵەکانمان دەهێنایە ناوەڕاستی حەوشە و ئاگری شادیمان پێدەکرد و گڕی ئاگر و رووناکی لەسەر بەفر خۆی دەگەیاندە ئاسمان.

**شرادر** بە هێواشی پێی دەوتم:

- هیچ حەزم لەم بارودۆخە نییە!

وەڵامیم نەدەدایەوە. ئەشیا و کەرستەی ماڵەکانم سەیر دەکرد کە چۆن لەناو ئاگردا دەسووتان و هەستم دەکرد ئەمانە هەموویان راستییەکن و تەنیا سەبارەت بەوەیکە دەتوانم بسووتێنم و وێران بکەم، بوونیان هەیە.

گرووپی روسباخ کۆمەڵێك سەربازی جەنگاوەری لیَ کوژرابوو و بەردەوام پاشەکشەی دەکرد.

سەرەتای مانگی نەڤامبەر نزیك "**میتاو**" (Mitau)، لە دارستانێك شەڕ و پێکدادان دەستی پێکرد و دوایی لیتوانییەکان وازیان لە هێرش کردن هێنا. گەردەلوولی شەڕ بۆ کاتێکی کەم ئارامی گرت کە زۆر بەکەمی گوێمان لە دەنگی گوللەیەك دەبوو. شرادر هەستا و پاڵی وە دارە سنەوبەرێك دا. پێدەکەنی، بەڵام لە ماندوویيان هێزی لەبەر بڕابوو. کڵاوکەی بۆ پشتەوە برد و وتی:

- **هێرگوت!** ئەم تۆزقاڵە ژیانەم پیَ ناخۆش نییە!

هەر ئەوکات بە هێوری بەرەو پێش خوار بۆوە، بە سەیرەوە چاوێکی لێکردم، بە نەرمی بەچۆك داهات، سەری بۆ خوارەوە داکەوت و تەواو باڵا بەربۆوە.

لە تەنیشتی چۆکم دادا و خستمە سەر پشت، کونێکی بچووك لەژێر سینگی چەپی بوو و چەند دڵۆپ خوێن لەسەر کراسەکەی.

هەر ئەوکات فەرمانی هێرش درا. دەستمان بە هێرش کرد. لێدان و پێکدادان تەواوی ئەم رۆژە بەردەوام بوو. دوایی گەڕاینەوە و شەو لەویَ ماینەوە. هەندیَ لە سەرباز کە بۆ ناشتن و چارەسەری برینددارەکان لەویَ مابوونەوە پێیان وتم کە قەبرێکیان بۆ شرادر هەڵکەندووە، بەڵام سەبارەت بەوەیکە سەهۆڵی بەستووە، هەر بە دانیشتنەوە ژێرخاکیان کردووە.

لۆحەی ئاسنینی ئەویان پێدام. لەناو قووڵایی بەری دەستم بریقەدار و سارد بوو.

رۆژەكانی دوایی و لەهەمانحاڵدا كە پاشەكشەمان دەكرد، بەردەوام بیرم لە شرادر دەكردەوە. جاریوابوو دەهاتە ناو خەوم كە نائومێدانە دەیهەوێ هەستێتە سەرپێ و خۆڵی سەهۆڵاوی سەر قەبرەكەی لادات. بەڵام بەمحاڵەشەوە لەوەیكە لەگەڵ من نەمابوو، هەستم بە ئازار نەدەكرد.

بالتیكومرەكان لە گروپی بچووك بچووكدا گەیشتنە پروسی رۆژهەڵات. كۆماری ئەڵمانیا رازی بوو سەبارەت بەوەیكە بۆ سەروەری ئەڵمانیا شەڕمان كردوە و عەفومان بكات و لێمان ببوورێت و وەكوو كەسی ئاسایی ناردیانینە شاری "س" و بارودۆخ وەكوو شاری "و" لێهاتەوە. هیچ كارێكمان نەبوو و دەست لەسەر دەست چاوەڕوان دەبووین تا ئەوەیكە لەناكاو، رێك وەكوو ئەوەیكە قەرەبووی ئەو بێكارییەكان لەكاردا بێت، رۆژێكیان شەڕ رووی دا: مەعدەنچییەكانی (ئەو پیاوانەی لە ناو دڵی چیا لە زێر و مز و ....دەگەڕێن.) "روهێر" (روبارێك لە ئەڵمانیا) لەسەر پلان و قسەی جوولەكە و سپارتاكەكان وازیان لەكار هێنا، وازهێنانەكە وەكوو شۆڕش بوو و ئێمە راسپێردراین كە شۆڕشەكە سەركووت بكەین.

سپارتاكیستەكان چەكی سووكیان پێبوو، زۆر بوێرانە شەڕیان دەكرد و لە شەڕی كۆڵان بە كۆڵانیش زۆر ئازا بوون. بەڵام شەڕەكەیان شەڕێكی نائومێدانە بوو. ئێمە تۆپ و هاوانەمان هەبوو. سەركووت كردنێك بەشێوەی بێ رەحمانە رووی دا. هەركەس قۆڵبەندێكی سووری لەلای دۆزراباوە، ئەوا بێ یەك و دوو تیربارانمان دەكرد.

لـەنێوان سپارتاکیـستەکانی دەستبەسـەرکراودا، لـە هەمپالکییـەکانی سـوپای ئـازادیش کـەم نـەبوون کـە پروپاگەنـدەی جوولەکـەکان لـەرێگا بەدەری کردبوون.

ئاخرییەکانی مانگی ئاڤریل، لە "**دوسلدرۆف**" (Dusseldorf)، لەنێوان گرووپێکـی دوازدە کەسـیی کرێکارەکـانی سـوور کـە ئاگاداریـان بـە مـن سـپێردرابوو، "**هێنکێـل**" (Henchkel) نـاوێکم پەیـدا کـرد کـە لـە **تورنسبێرگ** (Thorensberg) و "**میتاو**" (Mitau) شـان بە شـانی مـن شـەڕی دەکـرد. لەگـەڵ هاوڕێیـەکانی شـانی بە دیوارەکـەوە وەسـتابوون، برێنپیێـچی سـەری لـە خوێنـدا شـەلاڵ بـوو و رنـگ و رووی نـەبوو. هـیچ قسەیەکەم لەگەڵی نەکرد و نەمدەتوانی ئەوە بزانم کە منی ناسیوە یان نا.

ملازم بە مۆتۆرێکەوە گەیشتی و هاتە خوار و بێ ئەوەی بێتە پێشەوە دەسـتەی ئامـادە کـرد. کرێکارەکـان ئـارام و خـامۆش و دەسـتیان لەسـەر چۆك و بە قەدی دیوارەوە دانیشتبوون. تەنیا چاوەکانیان زینـدوو بـوو کـە سەیری ملازمیان پێدەکرد.

من بۆ لای ملازم رامکـرد و ئەمرەکەیم وەرگـرت. مـلازم لێوەکـانی بـە ددان گرت و وتی: – وەکوو جاران.

پـێم گەیانـد کـە یـەکێ بـە کوورەکـانی بـالتیکیش لەوێیـە. لـەژێر لێـو جنێوێکی دا و پرسی کامەیانە. نەمویست بە دەست نیشانی بدەم، وتم: ئەوەی کە سەری برینپێچ کراوە..

سەیری کرد و بەسەبری وتی: – ئەی هاوار، ئەوە کە "**هێنکێل**"ە!

دوای ماوەیـەکی کـوورت سـەرێکی بادا و بـە خێرایـی وتـی: – حـەیف! سەربازێکی ئاوا باش!

ئەوکات سواری مۆتۆرەکەی بوو، هەڵیکرد و رێگەی گرت و رۆیشت.

کرێکارەکان سەیری ڕۆیشتنەکەیان کرد. لە پێچی کۆڵان کە پێچایەوە و وون بوو، بێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمانی من بن، هەستانە سەرپێ. وابزانە هەموو شتێکیان دەزانی.

دوو لە سەربازەکانم لە پێش دەستە دانا، دوویانم لە تەنیشت و خۆشم لە پشتەوە. هێنکێل لە دوایین کەسەکان بوو، ڕێك لە پێش من.

فەرمانی ڕێکەوتنم دا و دەستە وەڕێ کەوتن.

کرێکارەکان چەند مەترێك بە هەنگاوی ناڕێك ڕێیان کرد. دوایی بینیم دوو سێ لە کرێکارەکان، لە کاتێکدا پێیان دەگۆڕی و ئاهەنگی هەنگاوەکان شکا. هەستم پێکرد کە ئەنقەستێك لەئارا دایە. ئەو سەربازەی تەنیشتی ڕاست، هەر لەحاڵی ڕێ ڕۆیشتندا بۆ لای من سووڕایەوە و بە چاو ڕای منی ویست. شانەکانم هەڵاویشت. پێکەنی و ئەویش بە نۆرەی خۆی شانی هەڵاویشت و گەڕایەوە.

هێنکێل لە دەستە خۆی جیا کردەوە و ئێستا ڕێك لەبەرچاوی من بەڕێدا دەڕۆیشت. ڕەنگی لەبەر نەمابوو و ڕێك بەرامبەر بەخۆی چاو لێدەکرد. دوایی گوێم لێبوو کە یەکێك زۆر بەسەبری قسە دەکات. سەرم سووڕاند، بینیم لێوەکانی هێنکێل دەجووڵێ. نەختێك خۆم لێ نزیك کردەوە، چاوێکی خێرای لێکردم و دووبارە لێوەکانی جووڵاند و لە قسەکانیدا گوێم لێبوو کە:

ئێمە دوایین ئەڵمانین

کەبەرامبەر بە دوژمن

ماوینەتەوە!

هەستم کرد ژێرچاو سەیرم دەکا.

نەختێك لێی دوور کەوتمەوە.

چەند مەترێکی دیکەمان پێوا. لە گۆشەی چاومەوە سەری **هێنکێل**م بینی کە بە حاڵەتی عەسەبییەوە بڵند دەبێ، نەختێك پێش ئێمە و لای ڕاست سەیر دەکات. سەیری ئەو شوێنەم کرد کە چاوی لێدەکرد، بەڵام جگە لە کۆڵانێکی تەسك شتێکی دیکەم نەبینی. **هێنکێل** دیسانیش مەودای خۆی لەگەڵ ئێمە زیاتر کرد. ئێستا دواتر لە من بوو و هەر بەو دەنگە ناخۆشەی دیوت:

ئێمە دوایین ئەڵمانین

کەبەرامبەر بە دوژمن

ماوینەتەوە!

نەمدەتوانی خۆم ڕازی بکەم کە ئەگەر شتێکی پێدەڵێن ئەوەبێت یان توندتر بڕوات یان هەناسەی ببڕێت.

ڕێك لەو کاتەدا ئوتۆمبێلێکی کۆن بە دەنگێکی زۆر و تەقە تەق لەلای چەپی ئێمە تێپەڕی و منیش بێ ئیختیار ڕووم وەرگێڕا. ڕێك ئەوکاتە دەنگی هەنگاو لەلای ڕاستی من پەیدا بوو. **هێنکێل** ڕایدەکرد و ئیتر گەیشتبووە کۆڵانە باریکەکە. تفەنگم بە شانمەوەنا و ئاگرم دا: دووبار سەرمەقولاتی لێدا و بەپشتەوە کەوت.

هاوارم کرد:

- بوەستە!

دەستە وەستا.

بۆلای **هێنکێل** ڕامکرد. هەموو گیانی دەلەرزی و ڕێك سەیری چاوەکانی منی دەکرد.

بێ ئەوەی تفەنگەکە بەشانمەوە نێم لە یەك مەتری نیشانەم گرت و تەقەم کرد. گوللەکە بە عەرد کەوت.

دوو مەتر ئەولاتر ژنێك لە ماڵێکەوە هاتەدەر. شلەژا و واق ما و بە چاوی زەقەوە لەنێوان دەرگا وشك بوو.

دوو گوللەی دیکەم هاویشت. پێی نەکەوت. ئارەقە پشت ملمی داگرتبوو و دەستەکانم بە توندی دەلەرزین. هنکل چاوی لەچاوم هەڵنەدەگرت. ئیتر لولەی تفەنگەکەم لەسەر برینپێچی سەری دانا و لەژێر لێوەمەوە وتم:

-"**فرزای هونگ، کاماراد**" (ببوورە هاوڕێ) و ماشەم کێشا. قیژەیەکی جەرگبڕ گوێمی کەڕ کرد. سەرم وەرگێڕا. ژنەکە، هەردوو دەستەکانی بە پەنجەوانەی رەشەوە لەپێش چاوی گرتبوو و شێتانە دەگریا.

دوای شەڕەکانی " **روهێر** "یش، لە "**سیلزی علیا**"[٢٦] لە شەر لەگەڵ پۆلۆنیایەك بەشداریمان کرد کە دژ بە ئێمە هەستابوونەوە و بە هاوکاری "**ئنتانت**"[٢٧] هەوڵیان دەدا ئەو ملك و زەویانەی کە بەپروای دەنگی گشتی بە ئەڵمانیا درابوو، لێیبستێننەوە. فەوجەکانی ئازاد (سوپای ئازاد)، پاشەکشەیان بە ئەوباشەکان کرد و هێڵێکی نوێی سشۆق دیاری کرا و دانیان بە ئێمە دانا. — کەواتە "دوایین پیاوانی ئەڵمانیا" لەسەر هیچ و پوچ شەڕیان نەکردبوو.

---

[26] - سیلزی (Silesie) (بە پۆلۆنی سلاسك (Slask) و بە ئەڵمانی (Schlesien) ناوچەیەکی ناوەندی ئەوروپا و ئێستا بەشێك لە خاکی پۆلۆنیایە کە رووباری "ئۆدر" (Oder) لەوی تێدەپەڕێ. لە ١٩١٩ کە رووداوی ئەم بەشە لە کتێبەکەدا هاتووە هەندێك لە بەشی باکووری ئەم ناچەیە (کە ناوەندەی برسلاو بوو) درا بە پۆلۆنیا و باقییەکەی وەکووو پارێزگای سیلزی علیا لەژێر دەسەلاتی ئەڵمانیا مایەوە کە شاری ئۆپلن ویلایەت نشینەکەی بوو. لە ١٩٥٤ بەولاوە سەرتاسەری ناوچەی سیلزی جگە لە بەشێك کە هی چکسلڤاکیا بوو، خرایە ژێر سوڵتەی پۆلۆنیا. ئەم ناوچەیە سەرچاوەیەکی باش بۆ بەردی خەڵووز لە جیهان دایە و هەربۆیەش ناوچەیەکی گرنگی ئابوورییە. لە لایەکی دیکە ناوچەیەکی جووتیاری دەوڵەمەندە کە زیاتر گەنم و چەوەندەری لێ دەڕوێت و کانزای وەکوو مز و نیکلی هەیە.

[27] - مەبەست "پەیماننامەی سەغیر"ە کە بریتی بوو بە پەیماننامەی نێوان یوگسلاڤیا، چکسلواکیا و رۆمانیا بۆ بەڕێوەبردنی پەیمانەکانی کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بەسترابوو.

بەمحاڵەشەوە ئەوەندە تێنەپەڕی کە هەواڵمان پێگەیشت "کۆماری ئەڵمانیا" وەکوو ڕێزلێنان و پێزانین لە ئێمە کە لە سشۆقەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵات بەرگریمان کردبوو و شۆڕشی سپارتاکیستەکانمان سەرکووت کردبوو و دوو لە سێی "**سیلزی**"مان بۆ ئەڵمانیا پاراستبوو، هەموومانی وەکوو زبڵ دەخاتە ناو کۆڵان!

فاتیحەی "فەوجەکانی ئازاد" خوێندرابوو. نافەرمانەکان دەستبەسەر و هەڕەشەی زیندانیان لێدەکرا.

بۆ شاری "**ھ**" گەڕامەوە و تفەنگ و ئەجیزەکانیان لێ سەندمەوە و ئەشیاکانی خۆمیان پێدامەوە، تەنانەت کۆتەکەی مامە "**فرانتس**"یش.

چوومە لای "**فراو لیپمان**" و مردنی **شرادرم** پێ ڕاگەیاند. زۆر گریا و بۆ خەوتن هێشتمیەوە. بەڵام ڕۆژەکانی دواتر خووی بەوە گرت کە جار وبارە دەهاتە ژوورەکەم و باسی **شرادری** دەکرد. قسەکانی کە دەکرد فرمێسکەکانی وشك دەکرد، ماوەیەك بێ ئەوەی شتێ بڵێ دەمایەوە و دوایی لەناکاو دەستی بە پێکەنین دەکرد و دەستی بە ناز و عیشوە دەکرد. دوایی گرەوی لەگەڵ من دەکرد کە زۆر لە من بەهێزترە و ئەگەر ملانێ (زۆرانبازی) بگرین بێ یەك و دوو پشتم لە عەرد دەدات و چونکە دەیدیت من نامهەوێ ملانێی لەگەڵ بگرم دەستی دەخستە ناوقەدم.

شەوێکیان شوشێك عارەق و چەند بیرەی هێنا. من تەواوی ئەو ڕۆژە بەدوای ئیشدا گەڕابووم. دڵم گیرابوو و زۆر ماندوو بووم. "**فراو لیپمان**" ڕۆیشت و نەختێك گۆشتی هێنا و لەنێوان هەر دوو پارووە نان، پەرداخەکانی من و خۆی پڕ دەکرد لە عارەق و بیرە. خواردنەکەم کە تەواو کرد، دەستی کرد بە قسە کردن لەبارەی **شرادر** و گریان و عارەق خواردنەوە، و ئەوەندەی پێنەچوو پێشنیاری کرد کە بەیەکەوە ملانێ

بگرین. دەستی خستە ناو ناوقەدم هەردووکمان بە عەرد کەوتین. ئەمرم پێی کرد لە ژوورەکەم بچێتەدەر. شێتانە دەستی بە پێکەنین کرد. دەیویست تێمبگەیێنێ کە ماق ئەوەم نییە ئەمری پێبکەم و بەسەریدا بقیژێنم. دیسانیش ملانێ دەستی پێکردەوە. دیسانیش دەستی بە عارەق خواردنەوە کرد: پەرداخی منی پڕ دەکرد، هۆڕ هۆڕ دەگریا، باسی مێردە کۆچ کردووەکەی کرد، باسی شرادر و کرێچییەك کە پێش شرادر هەیبوو. یەکبین قسەی دەکرد کە ئەڵمانیا "کاپۆت" (لەناوچوو)ە، هەموو شت کاپۆتە، ئایین و ئیمانیش کاپۆتە، ئیتر رەوشتێك نەماوە و مارك، تەنیا پارە. ئەو هەمیشە هەموجۆرە بەکەڵکم هاتووە، بەڵام من کەسێکم کە دڵم نییە. شرادر حەقی بوو کە دەیگوت نە کەسم خۆش دەوێ و نە هیچ شتێ و هەر ئەم دوو سێ رۆژە بیانووم پێدەگرێت و دەمخاتە ناو کۆڵان.

ئەوانەی کە وت، چاوەکانی زەق بوون و لەناکاو دەستی بە قیژاندن کرد کە:

- "راوس، ماین هێر، راوس" (بۆ دەروە ئاغا گیان بۆ دەروە)؟

هەڕای کردمێ بۆ ئەوەی لێمبدات. جنجڕۆکی لێدام و گەستمی. جارێکی دیکە کەوتینە ئەرد و بە جۆرێك منی بەخۆیەوە کووشی کە نزیك بوو بخنکێم.

سەرم سووڕا. وامزانی چەند کاتژمێرە کە لەگەڵ ئەم دێوە خەریکی ملانێم، هەر وەکوو کامووسێك. ئیتر نەمتوانی ئەوە بزانم کە کەیە و لە کوێم. لەناکاو تووڕەییەکی شێتانەم پەیدا کرد. هێرشم کردێ، کەوتمە سەری، دامە بەر مست و پێلاقە.

بەیانی زوو، کاتی بانگدانی کەڵەشێر، وەکوو دزان خێرا لەماڵ چوومە دەر و بەرەو شارەکەم خۆم هاویشتە ناو شەمەندەفەر.

# ١٩٢٢

لەشاری "م" زۆر ئیشی جۆراوجۆرم کرد: کرێکاری، کار لە کارگە، پێشخزمەتی، ڕۆژنامەفرۆشی..... بەڵام هیچیەك لەم کارانە دەوامیان نەبوو و دوای چەند ڕۆژ کارکردن دەچوومەوە ریزی دووروودرێژی بێکارانی ئەڵمانی. لەناو نانەواخانەکاندا خەوتم. کاتژمێرم بە بارمتە دانا و فێری برسێتی بووم.

لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢ بەختێکی گەورە رووی تێکردم. توانیم وەکوو کرێکارێکی سەرەتایی لە کارگەیەکی بیناسازی بۆ پردێك ئیش بدۆزمەوە کە پێشنیار دەکرا سێ مانگ بکێشێ. لەم سێ مانگەدا متمانەم بەوە هەبوو کە ئەگەر نرخی مارك لەوەی کە هەیە زیاتر دانەبەزێ، ئەوا دەتوانم ژەمێك نا ژەمێك سکمی پێ تێر بکەم.

سەرەتا ئیشم بەتاڵ کردنی زیخ لە عارەبانەی شەمەندەفەری بوو. ئیشێکی پڕ لە زەحمەت بوو، بەڵام هەرچییەك بێ دەمانتوانی لەنێوان هەر دوو بەتاڵ کردنی زیخ پشوویەك بدەین. بەداخەوە دوای دوو ڕۆژ منیان بۆ بێتۆنرێژێك گواستەوە و هەر لە یەکەم کاتژمێری ئیشکردن بە

دڵەڕاوکێیەوە لەخۆم پرسی کە ئایا من توانای ئەوەم هەیە کە لەم کارەدا بەردەوام بم یان نا؟

زیخیان بۆ من دێنا و دەیانخستە پشت ئوتۆمبێلێك و ئێمە چوار کەس بێ پسانەوە بە پێمەڕە (بێڵ) زیخەکەمان دەکردە ناو بۆرییەکی مارپێچی گەورە کە زیخ و چیمەنتۆی بەیەکەوە دەگەیاندە ناو تێکەڵکەرێك. مەکینەی بێتۆنرێژ بە بەردەوامی دەسووڕا و دەبوایە بێ پسانەوە خۆراکی بدەینێ. کاتی خواردنی سەرمان نەبوو. هەر کە سەر و گوێلاکی مارپێچە ئاسنەکە پەیدا دەبوو **مایستر** بەسەرماندا دەیقیژاند.

هەستم دەکرد لەنێوان ددانەکانی چەرخەیەکی بێ ڕەحمدا گیرم کردووە. مەکینەیەکی کارەبایی لەسەر سەرمان هارەهاری بوو و هاوڕێیەکە کە ئاگاداری کاری مەکینەکە بوو، ناوی **"زیبێرت"** (Siebert) بوو. جاربەجار کیسەیەك چیمەنتۆی دەست دەدایە، دەیدڕاند و دەیخستە ناو زارکی مەکینەکە و هەر ئەوکات تەپوتۆزی چیمەنتۆ سەر وگوێلاکی ئێمەی دادەپۆشی و دەم و چاومانی پڕ دەکرد. بێ پسانەوە بێڵمان لێدەدا، هەموو جەستەم ژانی دەکرد و چۆکەکانم بەردەوام دەلەرزین. بۆ کاتێکی کەمیش نەماندەتوانی پشوویەك بدەین.

**مایستر** فیکەیەکی لێدا و یەکێك لەژێر لێوەکانی وتی:

- دوازدە و پێنج خولەکە، ناپیاوە دیسانیش پێنج خولەك کڵاوی لەسەر ناین. بێڵەکەم هاویشتە خوارێ و بە لاتەلات چەند هەنگاوێکم نایەوە و خۆم هاویشتە سەر تەپۆڵکەیەك لە زیخ.

**زیبێرت** وتی: – تەواو نی، **کرل**؟

- تەواوی تەواوم.

خواردنەكەم لەناو دەسرۆكەیەك پێچابۆوە: نان و نەختێك پیوی بەراز. دەستم كرد بە جووتن. هەم برسیم بوو و هەمیش دڵم ژانی دەكرد. چۆكەكانم زۆر پیس دەلەرزین.

زیبێرت هات و لە تەنیشتم دانیشت. پیاوێكی درێژ و لاواز بوو. لووتێكی درێژ و نووك تیژ و لێوی قەیتانی و چاو بولبولی بوو.

دەنگێك بەرز بۆوە كە: - زیبێرت! دەبێ بە مایستر بڵێی كە نیوەڕۆ یانی ـیوەڕۆ.

زیبێرت بەپێكەنینەوە وتی: - ئەرێ "پێستە لیمۆ"، یا، یا.

لە دووهەنگاوی مندا قسەیان دەكرد، بەڵام دەنگیان زۆر دوور دەهاتە بەرگوێم.

- ناپیاوە كاتژمێرەكەی دەدرێنێ و دەڵێت: "رێك نیوەڕۆیە، ماین هێر".

سەرم بەرز كردەوە، خۆر لەژێر هەور هاتەدەر و رێك وەبێتۆنرێژ كەوت. بێتۆنرێژەكە لە چەند هەنگاویی من بوو. نوێی نوێ. بە رەنگی سووری روون. لە تەنیشت ئەو ترێڵەیەكی بچووك لەسەر هێڵی ئاسنین وەستابوو و لەسەر ئەردەكە، پێش ترێڵەكە، بێڵەكان لەناو تەپۆڵكەی چیمەنتۆ چەقێنرابوون. ئەملای مەكینەی بێتۆنرێژ، پەتی نەقالە بوو كە چیمەنتۆ ئامادەكراوەكەی بۆ سەر پرد دەبرد.

دڵم ژانی دەكرد، گوێیەكانم دەزرینگانەوە و هەموو ئەوانم بە تارمایی و ناتەواو دەبینی و لە هەمانحاڵیشدا نانم دەجووت.

لەناكاو هەستم كرد ترسێك جەستەم دادەگرێت. چاوەكانم هاویشتە خوارێ، بەڵام ئیتر درەنگ ببوو. ترێلە و بێتۆنرێژ و چیمەنتۆ و بێڵەكان بەرادەیەك بچووك بوونەوە كە وام هەست دەكرد بۆ یاری منالانە دروست

کـراون و بـە خێراییـەکی شـێتانە لـە ئاسمـان وون بـوون. بۆشـاییەکی سەرئێشە پەیدا بوو: پشتی سەر و پێش روو و لە دەورووبەرم جگە لە بۆشایی و لەناو ئەم بۆشاییەدا جگە لە "چاوەڕوانی" هیچ شتێکی دیکەی تێدا نەبوو. واپێدەچوو رووداوێکی بێ ڕەحمانە، شتێکی مەترسیدارتر لە مردن دەبێ روو بدات.

دەنگێك بەگوێم گەیشت. چاوم بە دەستەکانم کەوت: دەستم بەیەکەوە قفڵ ببـوون. هـەر ئـەمجۆەی کـە چـاوم بەدەسـتمەوە بـوو، بـە دەنگێکـی لەسەرەخۆ دەستم بە ژماردن کرد: "١، ٢، ٣، ٤...." شتێکی وەکوو فیێم گرت و هەموو شتێك بەشێوەی گرێیەك لێك کرایەوە. لە تەنیشت خۆم، لای راست، گوێی گەورەی زیبێرتم بینی. یەکێك دەیوت:

- "دون نروت تر" (هەی بمرێت) دەزانـی ئـەو ناپیـاوە چـی دەکـات؟ پێش نیوەڕۆ کاتژمێرەکەی پێنج خولەك وەپاش دەخات. بۆچی ئەمەی بەڕوو ناهێنی؟

دەنگەکە بەگوێم دەگەیشت، بەڵام زۆر بە ناڕێکی دەمتوانی تـەرکیز بکەم و لێی تێبگەم.

- ئـاخ، ئەگـەر ژنم نـەدەبوو و کـچەکەشم بەنەخۆشـی لەسـەر دەسـتم نەدەمایەوە!....

دانیشـتبوون و سـەیرم دەکـردن. گوشـارم بۆخـۆم دەهێنـا بۆئـەوەی ناوەکانیانم بیر بێتەوە. "زیبێرت، "پێستە لیمۆ" و هۆگۆ". ئەو بچۆکۆڵە رەنگ زەردەی موو خورمایەی کە لە تەنیشتیانە ناوی چییە؟

زۆر بـە توندی رشامەوە. بە تـەواوی درێژ کەوتمە خوارێ. گوێم لێبوو یەکیان وتی:

- بێشك دەبێ شتێکی بخۆی، نیشت وار؟

- یا، یا..

گوێم دەگرت. زۆر بە زەحمەت هۆشی خۆم کۆ دەکردەوە. دەترسام نەکا بێدەنگ بن.

- خوای گەورە نەدەبوایە سك و گەدەی دابا بە ئێمە ئەڵمانییەکان!

- یان ئەگەر پێیدەداین، دەبوایە بە زیخ و چیمەنتۆش تێر ببایین، وەکوو ئەم مەکینە نفرتییە.

یەکیان دای لە قاقای پێکەنین. منیش چاوەکانم بەست و لەناو دڵمدا وتم:

- ئەریٚ. بچکۆڵەکە ناوی "ئێدمۆند" (Edmund)ە.

چۆکەکانم دەلەرزین.

- حاڵت خۆش نییە. کرل؟

چاوەکانم کردەوە. لووت درێژێکی نووك تیژ بەسەرمدا خوار بۆوە. زیبێرت. ئەمە زیبێرت بوو. هەوڵم دا پێبکەنم و هەستم کرد ئەو توێکڵەی کە لە ئارەقە و چیمونتۆ لەسەر رووخسارم پێکهاتووە، ورد بوو.

- باشم.

بەردەوام بووم و وتم: – "دانکیٚ شۆن" (Danke Schon) (سوپاس).

زیبێرت وتی: – ئاساییە!

پێستە لیمۆش پێکەنی.

دووبارە چاوەکانم بەست. فیکەیەکی دوورودرێژ هەوای دڕی. نەختێك تێپەڕی. هەموو شتێك پاك بۆوە و هەستم کرد یەکێك شانەکانم دەجوولێنیٚ.

دەنگی زیبێرت بوو کە: – یاڵلاّ وەرە!

لەسەر پیٚ لەرزۆکەکانم وەستام و بێڵەکەم دەست دایە و بە زەحمەت وتم:

- نازانم. خوولەکێك پێشتر زۆر باش بووم ها!

پێستە لیمۆ وتی:

- ئاخ واس! خۆ بۆ زۆرەملی نییە. جەستەی مرۆڤ پێویستی بە خۆراکە! چەند رۆژ بوو بێکار دەگەڕای؟

- مانگێك.

- هەر ئەوەیە کە وتم: لە بێ خۆراکییە. ئەم مەکینە نەعلەتییە ببینە. ئەویش ئەگەر شتێکی نەخیتە ناو سکی، ئەوا کار ناکات، بەڵام، مێنش! پێیرادەگەن! زۆر بەباشی لەخواردی دەدەن! ئاخر کۆڵێك پارەی پێدراوە.

زیبێرت قۆڵی چەپی هێنایەخوار و خوڕخوڕی مەکینە بەرز بۆوە. لولەی مارپێچی گەورە لەژێر پێیەکانمان ئارام ئارام دەستی بە سووڕان کرد. "پێستە لیمۆ" بێڵەکەی لەناویدا بەتاڵ کرد و بە نفرەتەوە وتی: - بگرە، قووتی دە بەڵا!

ئێدمۆند وتی: - بگرە، خوشکی...!

"پێستە لیمۆ" : - قووتی دە، قووتی دە!

ئێدمۆند وتی: - قووتی دە و بتەقە!

بێڵەکان بە تووڕەییەوە، وەکوو باران زیخیان تێدەکرد. بیرم کردەوە: "ئێدمۆند"، ئەرێ، ناوی ئێدمۆندە". بێدەنگییەك رووی دا. سەیرێکی "پێستە لیمۆ"م کرد.

پشتی دەستی بەناوچاوانی داهێنا و دوایی دەستی بە عەرد داهێنا. بە دەنگێکی تاڵ وتی: - ئاخ واس! ئەوەی دەتەقێ ئێمەین. ئەرێ!

قۆڵەکانم هیچ هێزێکیان نەمابوو. هەرجار کە بێڵەکەم هەڵدەگرت هەستم دەکرد بەردەبمەوە. قووڵاییەك پەیدابوو و ئیتر هیچم گوێ لێ نەبوو. بە دڵگیراوی لە خۆم پرسی: "یانی ئێستاش قسە دەکەن؟"

"پێستە لیمۆ" وتی: – هۆگۆ....

گوێم لێدەبوو، بەڵام حەزم نەدەكرد لێیان تێبگەم.

- مەكینەیەكی بێتۆنرێژ چەندی دێنی؟

هۆگۆ تفێكی هاویشت: – من كە نایكڕم.

زیبێرت كە كیسەیەك چیمەنتۆی دەدڕاند، هاواری كرد: – دوو هەزار مارك!

تۆزی چیمەنتۆ باڵی گرت، داییۆشین و من دەستم كرد بە كۆخە كۆخ.

"پێستە لیمۆ" وتی: – ئێ، ئێمە بایی چەندین؟

- یانی بە پارەی كاش و نەقد؟

- ئەری؟

بێدەنگییەك رووی دا (بەڵام ئایا راستی راستی بێدەنگی بوو؟ یانی راستی راستی ئەوان قەسەیان نەدەكرد؟)

- بیست فنیك!

ئێدمۆند وتی: – نرخی ئێمە هەر ئەوەندەیە.

"پێستە لیمۆ" بێڵەكەی بە تووڕەییەوە رۆكرد: – بە زمانەوە.

- بە زمانەوە، چی؟

- نرخی بنیادەم زۆر هەرزانە.

من بە دەنگێكی خنكاو دووبارەم كردەوە: "نرخی بنیادەم زۆر زۆر هەرزانە" و دوایی لەناكاو هیچم گوێ لێ نەبوو.

بێڵەكەم رۆچوواند، بە شتێك كەوت، دەستەكەی لەدەستم دەرچوو. رێك كەوتمە خوارێ، سەرم كەوتە پشتەوە و خۆر كوژایەوە.

یەكێ وتی: – هەستە، "هێرگوت نوخ ماڵ" (وای خوایە دووبارە)

چاوەکانم کردەوە، هەموو شتێ تێکەڵ پێکەڵ بوو. رووخساری زەرد و بێرەنگی "پێستە لیمۆ" لەبەرچاوم سەمای دەکرد.

- ئەوەش مایستر، دە هەستە!

دەنگێك وتی: – دەتهاوێتە دەرەوە، بەدەرت دەنێ!

هەموویان شێتانە بێڵیان لێدەدا. سەیرم دەکردن، بەڵام نەمدەتوانی بجووڵێم.

زیبێرت وتی: "زۆر باشە" و دەستی چەپی بەرز کردەوە. مەکینە لە خورەخوڕ کردن وەستا و "پێستە لیمۆ" بەهێواشی لە تەنیشتم دانیشت.

لەپشت سەری زیخ وەناڵە هات و من، چەکمە رەش و بریقەدارەی مایسترم لەبەرچاوم بینی.

- ئەوە چ باسە؟

دەنگی زیبێرت هات و وتی:– وەستانێکی بەناچاری.

ئێدمۆند دانیشت و بە پچەپچە وتی: – پشتی تێبکە. رەنگت وەکوو کەچ سپییە.

- دووبارە؟

- بەڵێ، دووبارە.

- ئشنل، مێنش، ئشنل!

- هەمووی دوو خوولەك.

بێدەنگییەك رووی دا. دیسان زیخ وەناڵە کەوت و هۆگۆ لەژێر لێو وتی:

– پیسکە، خوێڕی، ترن!

دەنگی زیبێرت وتی: – یاڵلا ئەمەی قووت بدە! و "شناپس"ی کردە قوڕگم.

هۆگـۆ وەدەنـگ هـات کـە: – زیبێـرت گیـان، منـیش هەسـت بـە بێهێـزی دەکەم.

- مشتێك چیمەنتۆ بە قوزەڵقورت بکە.

زۆر بە زەحمەت خۆم بەرز کردەوە.

"پێستە لیمۆ" وتی: – باشی؟

سەرم جووڵاند کە بەڵێ.

وتم: – باشـە کـە وەسـتانێکی بەناچاری هاتـەپێش، دیـسانیش جێگـەی شوکرە.

هـەموویان دایـان لـە قاقـای پێکـەنین. بـە سـەیرەوە یـەك بـە یـەکیانم سـەیر کرد.

"پێستە لیمۆ" هاواری کرد: – یونگە، تۆ کە لە مایستریش گێلتری!

سەیری زیبێرتم کرد و وتم: – تۆ ئەم کارەت کرد؟

"پێـستە لیمـۆ" رووی لـە زیبێـرت کـرد و بـە شـێوازێکی گاڵتـەجاری دووبارەی کردەوە:

- تۆ ئەم کارەت کرد؟

پێکەنینەکان توندتر بوون. زیبێرت بە لێوە قەیتانییەکەیەوە زەردەیەکی هات و سەری جووڵاند.

زۆر بە وشکی وتم: – نەدەبوایە ئاوات کردبا!

پێکەنینەکان بڕان. هۆگۆ و ئیدمۆند و پێستە لیمۆ سەیری منیان کرد.

"پێستە لیمو" کە واپێدەچوو پێش لە تووڕەیی خۆی گرتووە:

- ئەگـەر بـە بێـڵ دەمـدا لـە دەمـوو لووتـت و خوشـکتم دەکـردە بـووك، ئەوکاتە چی؟ دیسانیش هەڵەم کردبوو؟

ئیدمۆند وتی: – گوو لوولە!

دیسان بێدەنگی. **زیبێرت** وتی: – باشە ئیتر. حەقێتی. ئەگەر حکوومەت و یاسایەکی بەکەڵکهاتوومان هەبا، پێویستیمان بەمکارانە نەبوو.

"پیستە لیمۆ" وتی: – حکوومەت و یاسا! دەزانی ئەو حکوومەت و یاسایەی تۆ لە کوێم داخنم؟

**زیبێرت** هەر ئەمجۆرەی کە منی سەیر دەکرد. دای لە قاقای پێکەنین:

- یاڵلا، خێراکە! نابێ تەنانەت یەك خوولەکیش بوەستین. رەنگە خاوەنکار تووشی زەرەر بێت.

**زیبێرت** کە هەر ئەمجۆرە سەیری منی دەکرد وتی: – چاك بوویتەوە، کرال؟

- سەرم جووڵاند. قۆڵی چەپی هێنایە خوار. خورخوری مەکینە بەرز بۆوە و لوولەی مارپێچی گەورە بە هێوری لەژێر پێمان دەستی بە سووڕان کرد.

ڕۆژەکانی دواتر قەیرانی من زیاتر بوون، بەڵام گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ پێکنەهات: شتەکان هەر ئەمجۆرەی بوون مانەوە، ئیتر ئەم بۆشاییە پەیدای نەبوو. بەڵکوو تەنیا چاوەڕوانیی، تەنیا چاوەڕوانییەك رووی تێکردم. کاتێك مرۆڤ گوێ لە ئۆرکێسترایەك دەگرێ و دەنگی تەپڵی گوێ لێدەبێ، لەم دەنگە خفەیەی تەپڵەکەدا شتێکی سێحراوی و هەڕەشەئامێز، شتێکی بەشکۆ هەیە. – باشە، ئەوەی من هەستم پێیدەکرد شتێکی ئاوا بوو: سەرتاسەری رۆژ بۆ من پڕ بوو لەم دەنگانەی تەپڵ. دوایی، شتێکی بێ رەحمانە رادەگەیەندرا، ئەوکەی ئازار دەدا و ئەوکات چاوەڕێ دەمامەوە و بە دڵەڕاوکێیەکی شێتانە چاوەڕوانی شتێکم دەکرد کە نەدەهات. دەنگی تەپڵەکان دەوەستان، هەستم دەکرد لە کامووسێك دەهاتمەدەر و لەناکاو ئیتر واپێدەچوو دونیای راستەقینە نییە.

واپێدەچوو لەپشت سەری من هەموو شتێکیان گۆڕیوە. هەر شتەی رووبەندێکی لەخۆی دابوو. دەورووبەری خۆمم سەیر دەکرد و ترس و دوودڵی ناخی پڕ دەکردم. خۆرێك کە وەبێڵەکەم دەکەوت، فێڵ بوو، زیخ فێڵ بوو، چیمەنتۆ فێڵ بوو. هەمو شتێك درۆ بوو و لەپشت ئەم هەموو درۆیانە مانایەکی بێ رەحم و تووڕە هەبوو. هەموو شتێ دژ بە من دەستیان وەدەستی یەك دابوو. بێدەنگییەکی قوورس دەهاتەپێش. کە سەیری هاورێییەکانم دەکرد دەم و لووتیان دەجوولا، بەڵام تەنانەت وشەیەکیشیانم نەدەبیست. وابزانین کە ئەوان بە ئەنقەست لێوەکانیان دەجوولاند و دەنگیان دەرنەدەهێنا هەتا من بە شك و گومان بکەوم کە شێت بوومە. دڵم دەیویست بەسەریاندا بقیژێنم کە "ویستی ئێوەم خوێندووەتەوە، ناجسنەکان!" — بەڵام هەر کە دەمم دەکردەوە لەناکاو دەنگێك بە گوێمدا دەستی بە قسە کردن دەکرد. دەنگێك کە خەفە بوو و پچڕ پچڕ. دەنگی باوکم.

رۆژانە هەشت کاتژمێر بێڵم لێدەدا. تەنانەت شەوانەش لە خەودا بێڵم لێدەدا و پێمەڕەکاریم دەکرد. زۆربەی شەوان خەوم دەبینی کە خەریکم بە بێڵ لێدانەوە، بەڵام نە بەخێرایی. ئاسنی سپی و بریقەداری مارپێچ دەهات، مایستر بە نەڕەنەڕ دەیقیژاند. منیش هەر ئەمجۆرەی کەدەستم لەسەر بێڵە نادیارەکە بوو لە تەپایی ئارەقە بەخەبەر دەهاتم. — جاریوابوو بە خۆمم دەوت: " بزانە چیت بەسەر هاتووە: بێڵێك! بێڵێکی ئەتۆ!".

جاریوابوو بیرم دەکردەوە ئەگەر لە رۆژانی بێکاری دەمتوانی ئەوەندە خۆراکەی کە ئێستا هەمە، ئەوکاتیش هەمبێت، چەند باش دەبوو و دەمتوانی پێیوە بچارێم. بەڵام بەداخەوە ناچار بووم بۆ پەیداکردنی پارووە نانێك رۆژانە هەشت کاتژمێر ئیشی سەخت و دژوار بکەم. یانی

بونیەم بە درەچوونی گیانم بەهێز بکەم بۆ مانەوەم. بەم شێوەیە بەیانی تا شەو بە ئومێدی چارەسەرکردنی برسێتی دەبوایە بێلێ لێبدەم وجگە لەوەیکە برسیتر بم، شتێکی دیکەم بەگیر نەدەکەوت.

چەند رۆژێك کە بەم بارودۆخەوە تێپەڕی بڕیارم دا کە خۆم بکووژم. بڕیارم دا هەتا رۆژی شەممەش سەبر بکەم، چونکە بۆ خورد و خۆراکم پارەم لە زیبێرت قەرز کردبوو و دەمویست پێش مردنم پارەکەی بدەمەوە.

رۆژی شەممە گەیشت. قەرزەکەم دایەوە و ئەوەندەم پارە بۆ مایەوە کە ئەگەر زۆر بە برسێتی رامبواردبا تەنیا سێ رۆژی پێ دەژیام، بەڵام بڕیارم دا هەر ئەمرۆژە هەمووی خەرج بکەم و بۆ دوایین جار بە حەزی خۆم بخۆم. سواری تراموایەك (شەمەندەفەری ناو شەقام) بووم و بەر لەوەی بۆ ژووری خۆم بچم، چەوریی بەراز و نان و پاکەتێك جگەرەم کڕی.

پێنج نهومی بینایەکەم چوومەسەر، دەرگای ژوورەکەمم کردەوە و وەبیرم هاتەوە کە وەرزی بەهارە. خۆر، ئەویش دوای پێنج مانگ، بۆ یەکەمجار لە پەنجەرەی بچووك کە کرابۆوە، خۆی هاویشتبووە ژوورەکەم. سەیرێکی ژوورەکەمم کرد: دۆشەگێکی دروستکراو لە کا کە لەسەر چوارتەختەیەك کەوتبوو، مێزێکی سپیدار، تەشتێك و کەوەنتەرێك. دیوارەکان لە پیسیان رەش هەڵگەڕابوون. شوردبووم، بەڵام بێ سوود بوو، دەبوایە بیانکرێنم. لەم.روویەشەوە هەوڵم دابوو، بەڵام هێز و توانام ئەوەندەنەبوو کە بتوانم دیوارەکان سپی بکەمەوە.

پاکەتەکەم لەسەر مێز دانا، ژوورەکەم گێسك لێدا و دوایی تەشتەکەم پڕ لە ئاو کرد و سەر و سەفایەکم بە رووخسارم بەخشی. سەرلەنوێ چوومە دەرەوە، ئاوی پیسی تەشتەکەم رشت و گەڕامەوە. دە سانتی مەترێك تەقەڵی دۆشەگەکەم کردەوە و دەستم خستە ناوی و دەمانچەکەم دەرهێنا.

قوماشەکانی دەوری "ماوزر"م (جۆرێك دەمانچەی ئەڵمانی) لێکردەوە، دەراغەکەیم سەیر کرد و بە ئامادەیی لەسەر مێزەکەم دانا، مێزەکەم کێشایە پێش پەنجەرە کە بە تەواوی خۆر لێیبدات و دانیشتم.

نانەکەم کردە هەشت پارچە و لەسەر هەر پارچەیەك نەختێك پیوی بەرازم دانا. بێ هیچ پلەیەك دەستم کرد بە جووتنی پارووەکان، هەر ئەمجۆرە لەحاڵی جووتن سەیری لەتە نانەکانم دەکرد کە چنیبوونم. هەرجار کە یەکێکیانم هەڵدەگرت باقی نانەکانم دەژمارد. خۆر لەسەر دەستەکانم دەدرەوشا و گەرمای لەسەر رووخسارم هەست پێدەکرا. کراس لەبەر دانیشتبووم و بیرم لە هیچ شتێك نەدەکردەوە و لەوەیکە سەرم لەناو ئاخوور دایە، خۆشبەخت بووم.

خواردنەکەم کە تەواو بوو، ورکەکانی سەر مێزم کۆ کردەوە و خستمە ناو زەرفە کۆنەکەی مرەبا کە لەجیاتی زبڵدان کەڵکم لێوەردەگرت. دوایی دەستەکانم شوشت و چونکە سابوونم نەبوو بە ئومێدی ئەوەیکە چەورییان نەمێنێت، ماوەیەکی زۆر لەناو ئاودا شوشتمن. بیرم لەوە کردەوە "زۆرت شۆردووە و تەنك بوونەتەوە، نەختێکی دیکە ئەگەری ئەوە هەیە ئێسکی دەستت بشکێ!". نازانم چی بوو حەزم کرد بەهۆیەوە پێبکەنم.

دەستەکانم بە کراسێکی کۆنی دڕاو وشك کردەوە کە بە بزمارێك داکرابوو. ئەویشم لەجیاتی خاولی بۆ وشك کردنەوەی دەست و دەم و چاوم کەڵك وەردەگرت. دوایی گەڕامەوە پشت مێز، جگەرەیەکم داگیرساند و رۆیشتمە دەم پەنجەرە و وەستام.

خۆر لەسەر بانەکانی رووبەڕووم دەدرەوشایەوە. قمێکم لە جگەرە دا و نەختێك لە دووکەڵەکەم لە دەمم دوور کردەوە و عەترەکەیم بە حەزەوە

هەڵمیسی. هەستامە سەرپێ. بۆ یەکەمجار پێیەکانم بەهێز هاتنە بەرچاو. لەناکاو خۆمم لە ناو فیلمێکدا بینی: لەپێش پەنجەرە وەستابووم و جگەرەم دەکێشا و سەربانەکانم سەیر دەکرد. بڕیار وابوو کە جگەرەکە تەواو بوو دەمانچەکە هەڵبگرم و لەسەر کەللەی سەرمی دابنێم و بە هەموو شتێک بڵێم: "ترحێو"

دوو تەقەیەك وەدەرگا کەوت. سەیرێکی دەمانچەکەم کرد کە لەسەر مێزەکە بوو، بەڵام بەرلەوەی بتوانم بیشارمەوە، دەرگا کرایەوە و زیبێرت هاتە ژوورەوە، لەنێوان دەرگا وەستا و بەدەست سڵاوی کرد. خێرا چوومە پێش و لەنێوان ئەو و مێزەکە وەستام.

وتی: — خۆ موزاحیمت نیم؟

- نا.

- هاتوم سڵاوێکت لێ بکەم.

وەڵامیم نەدایەوە. ماوەیەکی کەم چاوەڕوان مایەوە، دوایی دەرگای بەست و هەنگاوێك هاتەپێش.

- ئەو ژنەتیوەی خاوەنماڵەکەت کاتێك لەتۆم پرسی، زور بەلایەوە سەیر بوو.

- ئاخر هیچکەس نایەتە لای من.

وتی: — "زو" (کەواتە بۆیە).

پێکەنی. لووتی نووك تیژی درێژ بوو و گوێ گەوەرکانی گەورەتر هاتنە بەرچاو. هەنگاوێکی دیکە هاتەپێش و چاوێکی لە ژوورەکە کرد، برۆکانی تێکنا. دوایی سەیرێکی منی کرد و چووە لای پەنجەرەکە.

ئەمنیش دەوری مێزەکەم لێدا و لەنێوان ئەو و دەمانچەکە وەستام. دەستەکانی خستە ناو بەرکی و سەربانەکانی سەیر کرد.

- هەر چییەکت نەبێ، خۆ هەوات هەیە لانیکەم.
- ئەرێ.

لە من بەرزتر بوو. چاوەکانی من رێك ملی سەیر دەکرد.

- زستان نەختێك سارد دەبێت، نیشت وار؟
- نازانم، دوو مانگ زیاتر نییە لێرەم.

لەسەر پانییەکانی سوورِا و رووی لەمن کرد. نیگاکانی لەسەرم تێپەرِین و پێکەنینەکەی برِی.

وتی: - ئەلۆ!

من جووڵەیەکەم کرد. بە ئارامی بە بەری دەستی لایدام و دەمانچەکەی هەڵگرت.

بەپەلە وتم: - ئاگات لێی بێت، پرِە.

بە توورِەیی سەیری کردم: دەمانچەکەی گرت و چاوی لە دەراغەکەی کرد و چاوی لەچاوی من برِی و وتی:

- لەگەڵ ئەمەشدا، زامنەکەشی کراوەیە.

بێدەنگییەك ژوورەکەی داگرت.

وتی: - خووت بەوە گرتووە کە دەمانچەیەکی پرِ لەسەر مێزەکەت دابنێی؟

وەڵامیم نەدایەوە. دەمانچەکەی دانا و چوو لەسەر کورسی دانیشت و منیش دانیشتم.

- بۆچی هەموو پارەکەت دامەوە کە لێت وەرگرتبووم؟
- حەز ناکەم بەکەس قەرزدار بم.
- دەتتوانی نیوەی بگەرِێنیتەوە، نیوەشی هەفتەی داهاتوو. پێم وتبووی کە خێرا پێویستیم پێی نییە.

- حەز ناکەم بە کەس قەرزدار بم.
- چاوی لەچاوم بڕی و بە پێکەنینەوە وتی: – زو! حەز ناکەی قەرزدار بی و ئێستا ئەو پارەیەی کە هەتە تەنیا بەشی نان و خۆراکی سێ ڕۆژت دەکات و هەفتەش حەوت ڕۆژە، ماین هێر!

هیچ وەڵامێکم نەدایەوە. نیگای بەسەر مێزەکەدا تێپەڕی، لەناکاو بڕۆکانی تێکنا و لێوەکانی باریکتر بوون:

- بە جگەرە دەکرێ دوو ڕۆژ.

پاکەتەکەی دەست دایە و بە وردی سەیری کرد و فیتوووییەکی ڕاداشت:

- حەز ناکەی بە سەختی بیگوزەرێنی.

وەڵامیم نەدایەوە و بە تەشەرەوە وتی:

- ناکا کەسێك بەراتێك، میراتێك، شتێکی بۆ بەجێ هێشتووی؟

سەرم وەرگەڕاند، سەیری شوێنە هەڵوەشاوەکەی دۆشەگم کرد و بە دەنگێکی توند وتم:

- هیچ کام لەم قسانە پەیوەندیان بەتۆوە نییە.
- "**گەویس ماین هێر**" (بێشك، ئاغا)، پەیوەندی بە منەوە نییە.

کاتێك سەرم بەرز کردەوە، چاوی لە من بوو.

- ڕێك ئاوایە و درووستە. پەیوەندی بە منەوە نییە. تۆ دەتهەوێ هەرچۆنێك بێ هەموو قەرزەکەت بدەیتەوە: پەیوەندی بە منەوە نییە. پارەکەت بەشی دوو سێ ڕۆژ دەکات و ئەمەشیان پەیوەندی بە منەوە نییە. جگەرەی ملیۆنەرەکان دەکێشی، ئەمەشیان پەیوەندی بە منەوە نییە. دەمانچەیەکی پڕ لەسەر مێزەکەت دادەنێی، ئەوەشیان پەیوەندی بە من نییە!

چاوی لەسەر چاوم هەڵنەدەگرت. سەرم وەرگێڕا، بەڵام دیسانیش قوورسایی سەیرکردنەکەیم هەست پێدەکرد. وەکوو ئەوە دەچوو باوکم سەیرم بکات. هەردوو دەستم بردە ژێر کوورسی و چۆکەکانم رێککووشین و بە نیگەرانییەوە بەخۆم وت، نەکا لەناکاو دەست بە لەرزین بکەم!

بێدەنگییەکی زۆر پەیدا بوو و زیبێرت بە تووڕەییەوە وتی:

- تۆ دەتهەوێ خۆت بکووژی.

پاڵەپەستۆیەکی زۆرم لەسەر بوو و بەهەرحاڵ وتم:

- پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە.

هاتەپێش و بە هەردوودەست یەقەی گرتم و لەسەر کوورسی بڵندی کردم و رایچڵەکانم و نەڕاندی:

- پیسکە، دەتهەوێ خۆت بکووژی!

چاوەکانی ئاگریان تێبەردەدام. رووم وەرگێڕا، دەستم بە لەرزین کرد.

بە دەنگێکی لەسەرەخۆ وتم: – پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە

هەر ئەمجۆرەی کە رایدەچڵەکاندم، هاواری کرد: ناین! پەیوەندی بە تۆوە نییە! ئەی ئەڵمانیا چی لێدێت؟

سەرم داخست و وتم: – ئەڵمانیا کاری تەواوە.

هەستم کرد پەنجەکانی زیبێرت کراسەکەم بەردەدەن. زانیم هەر ئێستا چی روو دەدات: قۆڵی راستم بەرز کردەوە، بەڵام ئیتر درەنگ ببوو: دەستی بە تەواوی هێزەوە لەسەر رووخسارم هاتەخوار. لێدانەکە بەرادیەك توند و قوورس بوو کە هاوسەنگیم لەدەست دا. دەستی چەپی زیبێرت دیسانیش بەرۆکی گرتمەوە و زللەیەکی گیانەنەی دیکەی لێدام. دوایی بەجۆرێك پاڵیدام کە کەوتمە سەر کوورسییەکە.

روومەتم دەسوتایەوە. سەرم دەسووڕا. بیرم لەوە کردەوە کە هەر ئێستاکە هەستم و خۆی بهاوێمەسەری، بەڵام لە شوێنی خۆم نەجووڵام. خوولەکێك تێپەڕی. **زیبێرت** لەپێشم وەستابوو. حەزێکی خۆش سەرتاپێی داگرتم.

هاواری کرد: — پیسکە!

جـووت دەسـتەکانی خـستە نـاو بـەرکی و لـە ژوورەکـەدا دەسـتی بـە هەنگاونانەوە کرد و بە قیژەقیژ وتی: — **ناین! ناین! ناین!**

دوایـی چـاوەکانی کـە ئاگریـان لێـدەباری لـەمن کـرد و دیـسانیش بـە هاوارەوە وتی:

- تۆ! تۆ! تۆ کە رۆژێك یەکێ لە شەرکەرەکانی فەوجەکانی ئازاد بوویە!

بەجۆرێك بە تووڕەیی گەڕایەوە کە وتم هەر ئێستاکە خۆم دەهاوێتە سەر:

- گوێیـەکانت بەباشـی بکـەوە! ئـەڵمانیا کـاری تـەواو نـەبووە! تـەنیا جوولەکەکان ئاوا دەڵێن کە ئەڵمانیا ئیتر کاری تەواو بووە! شـەڕ ئێـستاش بەردەوامە، تێدەگەی؟ تەنانەت دوای ئەم هـەموو گەندەڵکاریـەی "**دیکتاتی ورسای**"، شەڕ هەر بەردەوامە!

دووبارە شێتانە لەناو ژوورەکەدا دەستی بە رێپێوان کرد.

قیژاندی: — **هێرگوت**، ئاخر، ئەوە وەکوو رۆژ روونە!

بەدوای وشـەکان دەگـەڕا، ماسـوولکەکانی شـویلاکەی بەردەوام لێـدەدا؟ مـشتەکانی گـرێ کردبـوو. لـەناکاو بـە قیژاندنـەوە: — وەکـوو رۆژ روونـە! وەکوو رۆژ روونە!

رۆژنامەیەکی لە بەرکی دەرهێناو وتی:

- فـەرموو! مـن پیـاوی نوتـق و وتارخوێندنـەوە نـیم، بـەڵام لێـرەدا نووسراوە.

رۆژنامەی نایە ناو چاوەکانی من:

- "ئەڵمانیا تاوانی شەڕ دەداتەوە!".... بەم ئەنجامە گەیشتوون.....
دەیانهەوێ هەموو بەردەخەڵووزەکەمان لێبستێنن! ئێستا بەم ئەنجامە گەیشتوون! بگرە سەیری بکە! لێرە نووسیویانە. بەخەتێکی پان و بەرین و بریقەدار! پلانیان ئەوەیە کە ئەڵمانیا لەناو ببەن!
لەناکاو تا بنانگوێ سوور هەڵگەڕا و دەنگی بەرز کردەوە و وتی:
- ئەوکات تۆی پیسکە. دەتهەوێ خۆت بکووژی!
ڕۆژنامەکەی لەدەستی چەپیدا دەجووڵاند و دای بە دەم و چاوی مندا.
هاواری کرد: - فەرمۆ! بیخوێنەوە! بیخوێنەوە! بە دەنگێکی بەرز بیخوێنەوە!
بە پەنجەی لەرزۆکەوە ناوەندی بابەتێکی نیشان دام و منیش دەستم کرد بە خوێندنەوە:
- " نا، ئەلمانیا شکستی نەخواردووە...."
زیبێرت بە قیژە هەرای کرد: - هەستە سەرپێ! ..... هەی پیسکە! کاتێك باسی ئەڵمانیا دەکەی، هەستە سەرپێ!
هەستامە سەرپێ: - "ئەلمانیا شکستی نەخواردووە، ئەڵمانیا سەردەکەوێ. شەڕ کۆتایی پێنەهاتووە. بەڵام کێشەیەکی دیکە هاتووەتەپێش. سوپا بڵاو و فەوجی ئازاد تێکچووە، بەڵام هەر پیاوێکی ئەڵمانی، دەبێ بێ ئۆنیفۆرم، ئێستاش دەبێ خۆی بە سەربازێکی ئەڵمانی بزانێت. هەر پیاوێکی ئەڵمانی دەبێ زیاتر لە پێشوو بەغیرەت و بە ورە بێت و بیر لە شکست نەکاتەوە. هەرکەس لەم دۆخەدا بیری لە نەتەوە نەکردەوە، ئەوا وەکوو ئەوە دەچێ خیانەتی بە نەتەوەی کردووە. هەرکەسی تەسلیمی نائومێدی بێت، وەکوو ئەوە دەچێ لەدەست دوژمن رادەکات. ئەرکی هەر تاکێکی ئەڵمانی ئەوەیە کە سەبارت بە نەتەوە و

سەبارەت بە خوێنی ئەڵمانیی خۆی لە هەر کوێیەکە، بمێنێتەوە، شەڕ بکات و بمرێت!"

**زیبێرت** هاواری کرد:

- **"دون نروت تر"** (هەی مردەشۆر بتبات) .... هەر دەڵێی ڕێك ئەمەیان بۆتۆ نووسیوە!

شەرمەزار و سەرنەوی، سەیری ڕۆژنامەکەم دەکرد. ڕاستی دەوت: ئەمەیان بۆ من نووسیبوو.

**زیبێرت** وتی: – قسەی تێدا نییە! تۆ سەربازی! ئێستاش سەربازی! واز لە ئۆنیفۆرم بێنە! تۆ بێ ئۆنیفۆرمیش سەربازی!

دڵم وە تەپە تەپ کەوت. هەر ئەمجۆرە بە وەستاوی مامەوە. بێ جووڵە بووم. **زیبێرت** بە وردی سەیری کردم، دوایی پێکەنی و شادی لە ڕووخساری دەباری. دەستی هاویشتە سەر شانەکانم و شەپۆلێکی گەرم هاتە ناو دەمارەکانمەوە. وەکوو شێتەکان قیژاندی: – قسەی تێدا نییە!

به دەنگێکی نزم وتم: – یەك خوولەك لێمگەڕێ.

وتی: – خوایە، لەناکاو بێ هێز نەکەویتە خواری؟

- تەنیا یەك خوولەك.

دانیشتم، سەرم گرتە ناو دەستەکانم و وتم: – شەرمەزارم **زیبێرت**.

پشوویەکی قووڵم دا و حەسانەوەیەکی خۆش هەموو جەستەی داگرتم.

**زیبێرت** بە ناڕەحەتیەوە وتی: – ئاخ واس!

پشتی تێکردم و جگەرەیەکی هەڵگرت و دایگیرساند و چووە بەر پەنجەرە. بێدەنگییەکی زۆر هاتەپێش. من هەستامە سەرپێ و چوومە پشت مێز دانیشتم و بە دەستێکی لەرزۆکەوە هەڵمگرت، بەدوای ناوەکەی

گــەڕام: **"فولکــشیر بئوبــاختر"** (ڕۆژنامــەی ئۆرگــانی حزبــی ناشــنال سۆشیالیست بوو).

لــە یەکــەم لاپەڕەیــدا کاریکاتۆرێـک بەرچـاوم کــەوت. ئــەم کاریکـاتۆرە **"جوولەکەکانی نێونەتەوەیی" لەکاتی "خنکاندنی ئەڵمانیا" نیشان دەدا.** ڕووخساری جوولەکەکانم یەك بەدوای یەك سەیر کرد و لەناکاو، وەکوو ئەوەبوو زەربەیەکیان لێدام. لێدانێك کە توندییەکی سەرسووڕهێنەری هەبوو: ئەم قەڵافەتەم ناسییەوە! ئەو چاوە بەپۆرگانە، ئەم لووتە درێژە، ئەو ڕوومەتە شلانە، ئەم هەموو هێڵانەی پڕ لە نفرەتەوە. تا ئەوکات زۆرجار ئەم تایبەتمەندیانم لەم وێنەیەدا دیبوو کە باوکم لەدەرگای ئاودەستی دابوو. شۆقێکی ڕووناك کەوتە ناو دڵمەوە. هەموو شتێکم تا کۆتایی خوێندەوە. حەقم بوو نفرەتم لێی بێت. تەنیا هەڵەم ئەوە بوو کە بڕوام بە قەشەکان پەیدا کردبوو کە ئەو تارماییەکی نادیارە و جگە لە وێرد و دوعا، جگە لە ناڵە، تەنانەت بە خێراتیش پاك نابێتەوە و ناکرێ بەسەریدا زاڵ بی. بەڵام ئێستا بە تەواوی دەیناسم. شتێك بوو ڕاستەقینە و زیندوو زیندووی کە دەکرا لە هەر کۆڵانێك و شەقامێك بیبینی و لەگەڵی ڕووبەڕوو بیتەوە. **شەیتان**، شەیتان نەبوو، **جوولەکە** بوو.

لەجێگەی خۆم هەستام. لەرزێك لە تۆقی سەرمەوە هەتا نوکێ پێمی داگرت. جگەرە پەنجەکانمی دەسووتاند. هاویشتمە دوورەوە و دەستە لەرزۆکەکانم هاویشتە ناو بەرکم. ڕۆیشتمە پێش پەنجەرە و هەناسەیەکی قووڵم کێشا. قۆڵی زیبێرت بە قۆڵی من وەنووسابوو و هەستم دەکرد کە هێز و تاقەتی ئەو دێتە ناو جەستەی من. ئەو هەر دوودەستی هاویشتبووە سەر نەردەکانی پەنجەرە. نە سەیری دەکردم و نە دەجووڵا. لای چەپی من، خۆر لە دەریایەك خوێن دەنیشت. گەڕامەوە، ماوزرم

دەست دایە، قۆڵم بەقەدەر رووخسارم بەرز کردەوە، زۆر بە هێواشی نیشانەم لە خۆر گرت.

**زیبێرت** وتی: دەمانچەیەکی باشە.

دەنگی نەرم و دۆستانە بوو.

بە هێواشی وتم: - "یا، یا!" و ماوزرەکەم لەسەر مێز دانا. دوای ماوەیەکی کوورت کە هەڵمگرتەوە، قۆنداغەکەی لەناو دەستمدا قوورس و خۆمانە بوو و حاڵەتێکی قوورس و پتەو و راستەقینەی هەبوو و کێشەکەی لەناو قووڵایی دەستمدا دەنیشت.

لەناو دڵمدا وتم: - "من سەربازم. ئۆنیفۆرمم هەر ناوێ. من سەربازێکی ئەڵمانیم".

بەیانی ئەمرۆژە یەکشەممە بوو. بۆ چوونم بۆ ئیدارەی هەویە و جنسیە ناچار بووم تا کۆتایی رۆژی کاریی دوشەممە سەبر بکەم.

فەرمانبەرێك کە ردێنێکی بزنانە و چاویلکەیەکی دەورە ئاسنی لەچاو بوو، لە پشت مێزێکی ئیدارییەوە قسەی لەگەڵ پیاوێکی موو سپی دەکرد. وەستام تا قسەکانیان تەواو بوو.

وتم: - بێ زەحمەت دەمویست دەستکاری ناسنامەکەم بکەم.

فەرمانبەری چاویلکە ئاسنین بێ ئەوەی سەیرم بکات پرسی: - یانی چجۆرە دەستکارییەك؟

- وازهێنان لە کەنیسە.

هەردووکیان بەیەکەوە سەریان بەرز کردەوە. دوای ماوەیەکی کوورت فەرمانبەرە ردێن بزنییە چاو بە عەینەکەکە بۆ لای هاوکارەکەی سووڕا و بەهێواشی سەرێکی جوڵاند و دوایی سەیری منی کردەوە:

- خۆتان وابەستە بە چ فرقەیەك راگەیاندبوو؟

- کاتۆلیك؟
- ئێستا ئیتر کاتۆلیك نی؟
- نەخێر.
- ئێستا دەتانەوێ بچنە سەر چ ئایینێك؟
- هیچ.

فەرمانبەرەکە سەیرێکی پیاو سەر سپییەکەی کرد و سەرێکی بۆ راوەشاند.

- ئەی بۆچی لە سەرژمێری ئەم دواییەدا خۆتان بە ئایینی کاتۆلیکەوە راگەیاندووە؟
- من سەرژمێری نەکراوم.
- بۆچی؟
- چونکە لە **کورلاند** بووم. لەناو فەوجی ئازاد.

پیاوە سەر سپییەکە خەتکێشێکی (راستە – راستە) هەڵگرت و بە سەبری دای لەبەری دەستی.

فەرمانبەر وتی: – ئەمکارە سەداسەد دژی یاسایە. دەبوایە پێشتر راتگەیاندبا، ئێستا کۆلێك هاتووچۆ و کێشەی تایبەت بەخۆی هەیە.

– ئاخر فەوجەکانی ئازادیان سەرژمێری نەکردووە.

فەرمانبەرەکە سەرێکی راوەشاند و وتی:

- من ئەمە بەسەرووتری خۆم رادەگەیەنم. قبووڵ ناکەن. سەرژمێری دەستوورێکی هەمەلایەنەیە. تەنانەت پیاوانی فەوجەکانی ئازادیش دەگرێتەوە و دەبێ سەرژمێری بکرێن.

بێدەنگییەك رووی دا.

وتم: من ساڵی ١٩١٦ سەرژمێری کراوم.

فەرمانبەر سەیرێکی منی کرد و شووشەکانی چاویلکەکەی بریقەیان دا:

- باشە، ئەی ئەوکات بۆچی خۆت بە کاتۆلیك ناساندووە؟
- باوك و دایکم منیان بەم شێوەیە ناساندووە.
- چەند ساڵە بووی؟
- شازدە ساڵ.

دیسان سەیری منی کرد: – کەواتە ئێستا بیست و دوو-ساڵتە؟

ئاخێکی هەڵکێشا و بۆلای هاوکارەکەی چوو و هەردووکیان سەریان راوەشاند.

ئەوکات وتی: – ئێ، کە ئێستا ئیتر کاتۆلیك نی؟

- نەخێر.

چاویلکەکانی بۆ سەر ناوچاوانی برد: – بۆچی؟

وام هەست کرد کە بەم پرسیارە پێی لە گلیمی خۆی زیاتر رادەکێشێ. توند و وشك وتم:

- بیروباوەڕی فەلسەفیم گۆڕاوە.

فەرمانبەرەکە رووی لە هاوکارەکەی کرد و لەژێر لێوەکانی وتی: "بیروباوەڕی فەلسەفی گۆڕاوە؟"

پیاوە سەر سپییەکە برۆکانی بردە سەرەوە، دەمی نیوە کراوە و سەری لە چەپەوە بۆ راستەوە دەستی بە راوەشاندن کرد. فەرمانبەر بۆ لای من سووڕایەوە و وتی:

- زۆر باشە، کەواتە بۆ دەرچوون لە کەنیسە هەتا سەرژمێری داهاتوو چاوەڕێ بە.
- حەز ناکەم دوو ساڵ چاوەڕێ بم.
- بۆچی.

چونکە بینی من وەڵامم نەدایەوە وەکوو کۆتایی گفتوگۆکە وتی: – دیارە ئیتر، هیچ کارێك نییە کە خێرایی هەبێت.

بینیم کە دەبێ بۆ خێراییم شێوەی ئیداری بدەمێ. ئەوە بوو کە وتم:

- ئێستا کە پابەندی ئایین نیم، هیچ هۆیەك نابینم بێهۆ تا دوو ساڵی دیکە خەرجی ئەم ئایینە بدەم.

فەرمانبەر لەسەر کوورسییەکەی هەستا و سەیرێکی هاوکارەکەی کرد و بە سەیری چاوی لەمن بڕی:

- "**زیخر، زیخر، ماین هێر**" (هەڵبەت، هەڵبەت، ئاغا)، تۆ دوو ساڵ مەخارجی ئایین نادەی، بەڵام یاسا وای نووسیوە....

نەختێك وەستا و پەنجەی ئیشارەی رووی لەمن کرد و وتی:

- ئەو غەرامەیەی کە دەکرێی، زۆر لە باج و مەخارجی ئایین زیاترە!

لەسەر کوورسییەکەی دانیشتەوە و بە چاوێکی سەرکەوتووانە سەیری کردم، پیرە سەر سپییەکە زەردەیەکی هاتێ.

بە دەنگێکی وشك وتم: – هەمووی بە تەواوی دەدەم.

فەرمانبەر، چاوێکی لەژێر چاویلکەکانی تێبڕیم. لێوەکانی بەددانی کووشی و هاوکارەکەی سەیر کرد و دوایی خواربۆوە و لەناو کەشەوێکدا سێ نوسخەی چاپی هێنایەدەر و لەپێش منی دانا، یان باشترە بڵێم بۆی هاویشتم.

لاپەڕەکانم هەڵگرت و زۆر بەجوانی پڕم کردەوە. کە تەواو بووم لەپێشیم ڕاگرت. سەیرێکی کردن و نەختێك بێدەنگ بوو و برۆکانی تێکنا و بە دەنگێکی بەرز خوێندیەوە.

- "**کنفسیونس لوس ئابر گونگە لوی بیگ**" (خواپەرست، بەڵام بێ وابەستەبوون بە هەرجۆرە فرقەیەك). ڕێك ئەوەیە کە دەتانهەوێ؟

- بەڵێ.

سەیرێکی هاوکارەکەی کرد:

- بیروباوەڕی فەلسەفیتان ئەمەیە؟

- بەڵێ.

لاپەڕەکانی قەد کرد و وتی: – زۆر باشە.

سەرێکم بە رێزەوە بۆی دانەواند. تەنانەت شایستەی ئەوەی نەزانیم کە سەیریشم بکات. لەسەر پانیەکانم سووڕامەوە و بۆلای دەرگا رۆیشتم. لە پشتەوە گوێم لێبوو کە دەڵێت:

– یەکێکی دیکە هاتە ناو حسێبی ئەم فیرقەبازیە تازەیە!

لەناو کۆڵان "**فولکیشر بئوباخ تر**"م لە بەرك دەرهێنا و نیشانەکەم دۆزیەوە. رێگەکەی نەختێك دوور بووو، بەڵام دەبوایە هەر بچم.

کەم تا زۆر سێ چارەگە کاتژمێرم پێچوو. بەتەواوی وەهەناسەبڕکێ کەوتبووم. رۆژی پێشتر بە ناچاری چاوپۆشیم لە خواردنی نان کردبوو. نیوەڕۆ، زیبێرت خواردنەکەی لەگەڵ نیوە کردبووم و چەند مارکێکیشی بە قەرز دابوومێ. لە کارگە کە هاتمە دەرێ لەتە نانێکم کڕیبوو، بەڵام ئێستا دووبارە برسێتی پێیوەدەدام و پێیەکانم بێ هێز ببوون.

ئیدارەی حزب لە نهۆمی یەکەمی بیناکە بوو. زەنگم لێدا. دەرگا نیوە کرایەوە و لاوێکی جوانکەڵە لەولاوە سەری هێنایە دەرێ. چاوەکانی بریقەیان دەهاتێ.

- فەرموو، چ کارێکتان هەیە؟

- دەمهەوێ لەناو حزب ناونووسی بکەم.

دەرگا، لەوەیکە هەبوو زیاتر کرایەوە. لەپشت سەری ئەم کوورە لاوە، کوڕێکی دیکەم بینی کە لەبەردەم پەنجەرە وەستابوو و تیشکی خۆر سەری سوور کردبوو.

چەند چرکەیەك تێپەڕی هەتا لاوەکە سووڕایەوە و بە پەنجەی ئیشارەیەکی بچووکی دا و وتی: – کێشە نییە.

دەرگا بە تەواوی کرایەوە و چوومە ژوورێ، دە لاوێك کە کراسی قاوەییان لەبەر بوو سەیریان کردم. لاوەکەی یەکەم دەستی گرتم و زۆر بەحەیا و سۆزەوە پێی وتم:

- تکایە، فەرموو لەگەڵ من وەرە.

منی بۆلای مێزێکی بچووك برد و داواکارییەکی چاپی پێدام کە پڕی بکەمەوە. کە تەواو بوو بۆ لای ئەوم درێژ کرد، وەریگرت و لوولی دا و لەنێوان مێزەکان ڕۆیشتە کۆتایی تەلارەکە. ڕۆیشتنی گیاندار و خۆش بوو. گەیشتە دەرگایەکی ڕەش و لەوێ وون بوو.

دەوروبەری خۆم سەیر کرد. تەلارێکی گەورە و روون بوو و بە مێزی گەورە و دوو چاپگەر، کە لەچاولێکردنی یەکەمدا وەکوو ئیدارەیەکی تیجاریی دەهاتەبەرچاو. هەرچەند حاڵ و هەوای ئیدارەی نەبوو.

لاوەکان هەموویان کراسی قاوەیی، ناوقەدبەندی تەسمە شەمشێری بە ناوقەدیان و چەکمەیان لەپێ بوو. جگەرەیان دەکێشا و بەیەکەوە دەدوان. یەکێکیان ڕۆژنامەی دەخوێندەوە. ئەوانیتر کارێکی ئەوتۆیان نەدەکرد، بەڵام پێنەدەچوو بێکاریش بن. وەکوو ئەوە دەچوو چاوەڕوان بن.

هەستام و واپێچوو کە هەستانم جەوەکەی گۆڕی. سەیرێکی لاوە کراس قاوەییەکانم کرد. وام هەست کرد کە هیچیان ئاگایان لە من نییە، لەگەڵ ئەوەش دەمزانی کە بچووکترین جووڵەی من لەچاوی ئەوانەوە وون نابێ.

ڕۆیشتمە لای پەنجەرە و ناوچاوانم بەشووشـە وەنـا و بۆ یـەك چرکە وام هەست کرد کە ریخۆڵە گەورەم لە برسان ریخۆڵە بچووکەکەم دەخوات.

- کەش و هەوایەکی باشە، نیشت وار؟

سەرم سووڕاندەوە: لاوە مـوو سـوورەکە لەبـەردەمم وەسـتابوو، ئەوەنـدە نزیـك کـە ئانـشکی لـەناو سـکمدا بـوو. دەمـی هـەتا بنـاگوێ کرابـۆوە و ڕووخـسارێکی هاوڕێیانـەی هـەبوو، بـەڵام چـاوەکانی جـددی بـوون. وتم: "یـا" و سـەیری شـەقامم کـرد. لـەم خـوارە، لـە پیـادەڕۆ، لاوێکـی کـراس قاوەیی کە جێگەی چەقوو ڕووخساری بە قاش کراوەیـی هێشتبۆوە، لـەم لاوە بۆ ئەملا هەنگاوی دەنایەوە. کاتێك هاتمە بنکەی حزب، نەمدیتبوو. لەمبەری شەقامیش دوو کووڕە لاو لەبەر دەرگای دووکانێك دانیشتبوون و جاروبارە سەیری هاوڕێیەکەیان دەکرد.

ئیتر ئەمجارە گەدەم دەیچریکاند و وام هەست دەکرد مێشکم بەتاڵە. وام بـیر کـردەوە ئەگـەر دانیـشم، ئـەوا حـاڵم باشـتر دەبـێ، بـەم فکـرەوە لەسـەر پانیـەکانم سـووڕامەوە و هـەر ئـەوکات و گـۆڕینی پاڵەپەسـتۆی کـەش و هەوام هەست پێکرد.

یەك بە یەك لاوەکانم سەیر کرد: هیچیان چاویان لەمن نەدەکرد.

هەلی دانیـشتنم بۆ نەڕەخسا، لەناکاو دەرگا ڕەشـەکە لەوبەری تەلارەکە کرایەوە و لاوە قۆزەکە هاتەدەرێ و خۆی بە خێرایـی خستە لایـەك و سەر و گوێلاکی پیاوێکی تەمەن نزیك بە چل ساڵە و پان و بەرین پەیدا بوو. لاوەکـان، تـەق و تـووق پانیـەکانیان لێـك دەدا و قـۆڵی ڕاسـتیان بـەرز دەکردەوە. پیاوە خەپەکەش دەستی بەرز کردەوە و هەر لەوێ لەناو دەرگا وەسـتا و چـاوێکی دووررودرێـژی لـەمن کـرد. واپێدەچـوو بـیر دەکاتـەوە بۆئەوەیکە منی لـە کوێ بینیـوە. سینگی پڕهێزی لەژێر کراسـەکەی دیـار

بوو، پرچی زۆر زۆر کەم کردبۆوە و چاوەکانی لەناو پۆرگی چاویدا وون ببوون.

هاتەپێش. هەنگاوەکانی قوورس بوون. کە گەیشتە دوو هەنگاویم، دوو لە لاوەکان لەوانی دیکە جیا بوونەوە و دەورەیان دام.

- **فرێدی؟**

لاوە قۆزەکە پانییەکانی لێکدا:

**یاوول، هێر "ئۆبێرش تورم فورر"؟** (لە پلەکانی حزبی نازی، بەرامبەر بە ملازم یەکەم)

- داواکاری.

**فرێدی** داواکارییەکەی بۆ درێژ کرد. **ئۆبێرش تورم فورر** داواکارییەکەی لەناو دەستە پان و پۆڕەکەی گرت و پەنجەی ئیشارەی دەستەکەی دیکەی خستە سەر؟

- **لانگ.**

رێك وەستام و وتم:

- **یاوول، هێر ئۆبێرش تورم فورر.**

داواکارییەکەی خوێندەوە، دوایی سەری بەرز کرد و سەیری منی کرد. بە دەنگێکی خەواڵویەوە وتی:

- لە کوێ ئیش دەکەی؟
- کارگەی بیناسازی "**لینگن فرزر**".
- لە هاوڕێیەکانت کەس لەناو حزبدا ناونووسی کردووە؟
- وابزانم، یەکیان؟
- شکت هەیە؟
- نەخێر. بەڵام **فولکیشر بئوباخ** تری دەخوێندەوە.

- ناوی چییە؟
- "زیبێرت"

ئۆبێرش تورم فورر رووی کردە فرێدی ؟ یانی تەواوقەد رووی تێکرد. وەکوو ئەوە دەچوو ملی بە شانەکانیەوە دووراوە.

- لێیبکۆڵەوە!

فرێدی لەپشت مێزێک دانیشت و لەناو فایلێکدا گەڕا و ئۆبێرش تورم فورر چاوەڕوان مایەوە.

- لە تورکیاش بوویە؟
- یا، هێر ئۆبێرش تورم فورر.
- لەگەڵ کێ؟ "
- هێر ریتمایستر "گوتر".

فرەدی هەستایە سەرپێ:

- زیبێرت ناوی نووسیوە.

پەنجەکانی لەسەر داواکارییەکەی من جووڵاند: – ئاها! سوپای ئازاد! (لەناکاو حاڵەتی خەواڵوویی لە رووخساریدا نەما) – لەگەڵ کێ؟

- ئۆبێر لویت نانت "روسباخ".

ئۆبێرش تورم فورر پێکەنی، چاوەکانی لەناو قووڵایی رووخساریدا بریقەی دا و وتی:

- لە بالتیک؟ لە روهێر؟ یان لە سیلزی علیا؟
- هەر سێکیان.
- "گوت" (زۆر باشە).

دەستێکی هاویشتە سەر شانم. دوو لاوەکە کە دەورەیان دابووم، رۆیشتنەوە شوێنی خۆیان دانیشتن. **ئۆبێرش تورم فورر**، سووڕایەوە لای **فریدی**:

- هەویەی کاتیی بدەنێ.

وەکوو پێشوو دووبارە خەواڵوویی هاتەوە رووخساری و وتی:

- سەرەتا بە "**ئێس. ئای**" (گرووپی زەربەت) ناوت دەنووسرێت، دوایی ئەگەر زانیان بەکەڵك دێی و بەنسبەت "**فورر**" (پێشەوا) سوێندی وەفاداریت خوارد پلەی "**ئێس ئا**"ت پێدەدەرێت. بارودۆخی ئابووریت دەگاتە ئەوەندە ئۆنیفۆرمی پێ بکڕی؟

- بەداخەوە نەخێر.

- بۆچی؟

- بە هەموویەوە هەفتەیەك دەبێ ئیشم پەیدا کردووە.

**ئۆبێرش تورم فورر** تەواوقەڵافەت بۆلای پەنجەرە سووڕا:

- "**ئۆتۆ**" (Otto).

لاوە پرچ سوورەکە گەڕایەوە و نەختێکیش دەلەنگی. پاژنەکانی لێکدا. رووخسار و ئێسقانی کە پڕ بوو لە پەڵەی سوور، بە پێکەنینەوە رووی تێکردین.

- ئۆنیفۆرمی "**هاینریخ**"ی بدەیە.

پێکەنینی ئۆتۆ نەما، رووخساری تێکچوو و بە پەژارەوە وتی:

- ئۆنیفۆرمی **هاینریخ** بۆ جەستەی ئەو زۆر فشە.

**ئۆبێرش تورم فورر** شانەکانی هەڵاویشت و وتی: - تەسکی دەکاتەوە.

ژوورەکە لە دەنگ کەوت. **ئۆبێرش تورم فورر** سەیرێکی لاوەکانی کرد و بەدەنگێکی قوورس وتی:

- ئەندامێكی فەوجی ئازاد ئەو مافەی هەیە كە ئۆنیفۆرمی هاینرخ لەبەر بكات.

فرێدی هەویەكی قەدكراوی بۆلای درێژ كرد. ئۆبێرش تورم فورر كردیەوە، سەیری كرد و بەستییەوە و درێژی كردە لای من و وتی:

- جاریێ بۆ تۆ، فەرمان، مانەوە لەو كارگەیە كە ئیشی لیێ دەكەی.

زۆر خۆشحالێ بووم كە بە تۆ بانگی كردم.

- ئادرەس و نیشانەی ماڵت بدە بە ئۆتۆ. ئۆنیفۆری هاینریخت بۆ دێنێت.

ئۆبێرش تورم فورر لەسەر پاژنەكانی سوورا، بەڵام رای گۆڕا و دووبارە رووی تێكردمەوە و وتی:

- ئەندامێكی فەوجی ئازاد، بێشك سیلاحێك، دەمانچەیەكی دەبێ هەبێ؟

- دەمانچەی ماوزر.

- لەكوێت شاردووەتەوە؟

- لەناو دۆشەگەكەم.

شانە پڕهێزەكانی هەڵاویشت:

- منداڵانەیە.

بە تەواوی رووی سووڕاندەوە لای لاوەكان، چاوێكی لێداگرتن و وتی: دۆشەگەكانی لە كا دروست كراو، لای "شوپو" (پۆلیسی نیگابان)، ئەوەندە نهێنی پاریز نیین.

لاوەكان لە قاقای پێكەنینیان دا، بەڵام بۆخۆی هەر رووخساریشی وێك نەهات. پێكەنینەكان كە كۆتاییان پێهات، دیسان وتی:

- ئۆتۆ! فێری بكە چۆن بیشارێتەوە.

**فریدی** لە قۆڵی دام:

- متمانەت بە **ئۆتۆ** هەبێ. دەمانچەکەی خۆی بەجۆرێك دەشارێتەوە کە ئیتر خۆیشی پێینازانێتەوە.

لاوکان دیسان پێکەنینەوە و ئەمجارە، **ئۆبێرش تورم فورریش** هەر پێکەنی. دوایی ملی **فریدی** خستە ناو پەنجەکانی و چەندجار بۆ پێشەوە خواری کردەوە و بە هەر خوارکردنەوەیەك بە زمانی فەرەنسی وتی:

- "**پوتیت کانای! پوتیت کانای!**" (هەی خەپەتۆڵە).

**فریدی** دەستی کرد بە سووڕان بە دەوری خۆی، بەڵام بۆ رزگار بوونی هەوڵێکی نەدەدا.

**ئۆبێرش تورم فورر** بەردەوام دەیوت: - **پوتیت کانای! پوتیت کانای!**. رووخساری حاڵەتی جەڵتەی پەیدا کرد. دوایی **فریدی** بە پاڵەپەستۆیەك هاویشتە باوەشی **ئۆتۆ**. بە جۆرێك کە هاوسەنگی **ئۆتۆ** تێکچوو و نزیك بوو بەربێتەوە.

لاوەکان دەستیان بە پێکەنین کردەوە.

**ئۆبێرش تورم فورر** هاواری کرد: - "**ئاختونگ**" (رێك بوەستن – ئاگادار بن).

ژوورەکە لە دەنگ و جووڵە کەوت. دەستی لەسەر شانی من دانا و قەڵافەتی وەکوو بەرد قوورس بوو. وتی: - **خۆبەخش بۆ ئێس. ئای.**!

نەختێك بێدەنگ بوو. منیش رێك بەرامبەر ئەو راوەستام.

- **فورر**، چاوەڕوانی فیدارکاری لەڕادەبەدەری تۆیە!

وتم: - **یاوول، هێر ئۆبێرش تورم فورر!**

"**ئۆبێرش تورم فورر**" شانی منی بەردا، هەنگاوێك بۆ پشتەوە چوو، بە حاڵەتی ڕێك وەستا، قۆڵی ڕاستی بەرز کرد و بە دەنگی توند و قوورس هاواری کرد:

- "**هایل هیتلێر**"[٢٨]

لاوەکان وەکوو بەرد وەستان، بە قۆڵی بەرز کراوەوە و دوایی هەموویان بە یەکەوە لە یەك کاتدا بە دەنگی بەرز و قووڕس هاواریان کرد: – **هایل هیتلێر!**

هاواریان بە هێزێکی تەواو لە سینگی مندا دەنگی دایەوە. هەستم بە هێورییەکی پڕ لە ئاسوودەیی کرد. ڕێگەی خۆم پەیدا کردبوو و ئێستا ڕاست و روون لەپێش پێم بوو. ئەرك، لەهەر کاتێکی ژیانی مندا دەیتوانی چاوەڕوانیم لێبکات.

هەفتەکان و دوایی مانگەکان تێپەڕین. لەگەڵ ئیش و کاری دژوار و قوورسی بێتۆنرێژی و دابەزینی بەردەوامی نرخی مارك و برسێتی، خۆشبەخت بووم. شەو هەر کە کارگەم جێدەهێشت زۆر بە پەلە ئۆنیفۆرمەکەم لەبەر دەکرد و خۆم دەگەیاندە ناوەندی "**شتورم**" (گرووپی زەربەتی) و ژیانی ڕاستەقینەم دەستی پێدەکرد. دژایەتی و ململانێ لەگەڵ کۆمۆنیستەکان بێ پشوو و بێ پسانەوە بوو: ئێمە کۆبوونەوەکانی ئەوانمان تێك دەدا و ئەوانیش کۆبوونەوەکانی ئێمە. ئێمە ناوەندی زەربەتی ئەوانمان داگیر دەکرد و ئەوانیش هی ئێمە. هەفتەیەك نەبوو کە شەڕ و پێکدادانمان لەنێوان نەبێت. واپێدەچوو کە هیچکام لە دوولا چەکدار نەبووین، زۆر بە کەمی لە شەڕ و کێشەکاندا گوێمان لە گوللە

---

[28] - (Heil Hitler)، بژی هیتلێر – دروشمی نازییەکان و ئەڵمانییەکان لە سەردەمی دەسەڵاتداری هیتلێر، کە لەجیاتی وشەی وەکوو سڵاو و بژی و ماڵاوا بەکار دەهات!

دەبوو. هاینریخ کە من ببوم بە خاوەنی ئۆنیفۆرمەکەی، بە گوللەیەك کوژرابوو ئەویش ریّك بە دلّی کەوتبوو و من ناچار بووم دوو کوونی سەر کراسە قاوەییەکەم کە جیّگەی گوللە بدورمەوە.

یازدەهەمی ژانویە بۆ شۆڕشگیّرانی حزبی بە شیّوەی میّژوویەکی بیّویّنە دەرهات.[٢٩]

حکوومەتی پوانکارە فەرمانی داگیرکردنی روهیّری دا. ئەو گروپیّکی سادەی ئەندازیارانی بۆ ئەویّ نارد. گروپیّك ئەندازیار لەگەلّ شەست هەزار سەربازی چەکدار، بەپیّی دەنگۆ و پروپاگەندەی ئەوکات، ئەم گواستنەوە سەربازییە تەنیا بە مەبەستی ئاشتی و سولّح بوو.

لە ناکاو رق و کینەیەکی پڕ لە نفرەت وەکوو مەشخەلّیّك سەرتاسەری ئەلّمانیای داگرت.

فورر بەردەوام و لەهەر ریّورەسمیّکدا رایدەگەیاند کە داسەپیّوراونامەی ورسای رەزامەندی هاوپەیمانان پیّکناهیّنیّ و درەنگ یان زوو هەتا تیری خەلاس لە میّشکی ئەلّمانیا نەدەن، واز ناهیّنن. رووداوەکە نیشانی دا کە

[29] - بەهۆی دابەزینی خیّرای مارك ، حکوومەتی کۆماری ئەلّمانیا کە نەیدەتوانی قیستە قوورسەکانی غەرامەتی شەڕە دۆڕاوەکەی خۆی بە هاوپەیمانان بدات. لە کۆتایی سالّی ١٩٢٢ داوای لە هاوپەیمانان کرد مۆلّەتیّکی پیّبدریّت، بەلاّم "پوانکارە" سەرۆك کۆماری فەڕەنسا بە سەرسەختییەکی تەواوە ئەم داواکارییەی رەت کردەوە و چونکە دەبوایە ئەلّمانیا بابەتی سزا، دار و سووتەمەنی بە فەڕەنسا بدات، نەیتوانی لەکاتی خۆی قیستەکانی بدات و هیّزەکانی فەڕەنسا ناوچەی "روهیّر"یان داگیر کرد. (١١ ژانویەی ١٩٢٣) ئەلّمانیا کە بە لەدەستدانی روهیّر هەشتا لەسەدی خەلّووزی بەرد و پۆلاێ لەدەست دابوو، بە چۆك داهات و ئابوورییەکەی بە تەواوی خەوت. حزبی نازی گۆڕەپانیّکی بەربلاّو و ئامادەی بۆ خۆنواندن و پروپاگەندە بەدەست هیّنا و زۆربەی کریّکارەکانی بۆلای خۆی راکیّشا کە بەهۆی بیّکاربوونیان مانیان گرتبوو. شەڕی چریکی و پارتیزانی دەستی پیّکرد، هەرچەند فەڕەنسییەکان بە تەواوی هیّزەوە سەرکووتیان دەکردن، بەلاّم کەمترین ئەنجامیان بەدەست نەهیّنا. بەلاّم دیسانیش ئابووریی ئەلّمانیا بە باروەخیّك گەیشت کە نرخی دۆلاری ئەمریکی لە حەوت هەزار مارك لە سەرەتای ١٩٢٣، لەماوەی دە مانگ بە چوار ملیار و تا دوو مانگ دواتر بە چەندین هەزار ملیار مارك گەیشت. لەراستیدا هەرزانتر لە کاغەزی رەش. هیتلیّر خەلّکی ئەلّمانیای هان دا کە حکومەتی کۆماریش لەسەرەتاوە نەدەبوایە بچیّتە ژیّر باری قوورسی ئەم غەرامە و سزایە. خەتاکەی خستە سەر شانی حکوومەتی کۆماری و بە دەسەلاّتیّك گەیشت کە هیچکات بیریشی لیّنەکردبۆوە.

حەق بە ئەوە و خەڵك گروپ بە گروپ روویان لە حزب دەكرد، بەجۆرێك كە لەماوەی مانگێك ئەندامەكانی ژمارێكیان نیشان دەدەا كە هەتا ئەم رۆژە بێ وێنە بوو و فاجیعەی ئابووریی بەشێوەیەك هێرشی كردە ولاتە وێرانبووەكەی ئێمە، هەربۆیەش بەشێوەیەكی "موعجزەئاسا" خەبات خێراتر لەوە رووی دا كە بیرمان لێی دەكردەوە. ئۆبێرش تورم فورر زۆرجار بە پێكەنینەوە دەیوت:

- ئەگەر رێك لە رووبەڕوویەوە سەیری بارودۆخەكە بكەین، بەم ئەنجامە دەگەین كە حزب دەبێ پەیكەرێكی سەرۆك كۆمار پوانكارە دروست بكات.

ماوەیەكی نەكێشا كە هەواڵمان پێگەیشت بەرگرییەك كە فەڕەنسا لە ناوچەی روهێر لەگەڵی رووبەڕوو بۆتەوە ئەوەندەش كە ئیمپراتۆر "كونو" (لەساڵی ١٩٢٢ هەتا ١٩٢٩ بوو بە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا) هەوڵ دەدات بە دەنگۆ و هەراوهوریا خۆی پێ بەزل بزانێ، بێ مایە و بێ بەها نەبوو:

لە شەمەندەفەرەكانی بارهەڵگر كە خەلووزیان لە ئەڵمانیا بۆ فەڕەنسا دەگواستەوە بەرێژەیەكی زۆر خرابكاری رووی دەدا. هەر پرد بوو تێكدەشكا و شەمەندەفەر بوو لە هێڵ دەچووەدەر.

لە هەڵسەنگاندنی ئەم خرابكاریانە لەگەڵ ئەم هەموو مەترسیە، ململانی و پێكدادانی بەردەوام لەگەڵ كۆمۆنیستەكان ئیتر جێگەی باس نەبوو. ئەمەشمان دەزانی كە حزب بەپێی گروپە نەتەوەپرستەكانەوە رۆڵی كاریگەر لە بەرگری و رووبەڕووبوونەوەی "روهێر" دەبینێت و ئێمە سێ كەس بووین — یانی زیبێرت، تۆتۆ و من كە هەر لە یەكەم رۆژی داگیركردن داوامان كرد كە بەنهێنی بۆ ناوچەی داگیركراو لەلایەن فەڕەنساوە بچین. بوونی ئێمە لە شاری "م" پێویست بوو و دەبوایە لەوێ بمێنینەوە و من وەكوو ئەوكاتەی كە لەگەڵ سەربازانی فەوجی ئازاد لەشاری "و" بێ

چالاکی پاڵم دابۆوە، سەرلەنوێ هەستم کرد کە لە قوژبنی سەربازخانەیەك لە شارێکی ئارام خەریکی رزینم و هەرچەند کەسانێك هەبوون سەبارەت بەسەربەرزی ئەڵمانیا و ئێمە لە بەرەکانی شەڕ گیانیان دەدا.

ئەوەی بێسەبری منی دە بەرامبەر کرد ئەوە بوو کە بەدیار کەوت زۆربەی هاورێیان و فەرماندەکانم لە فەوجەکانی ئازاد لە بەرەی شەڕ ناوێکی باشیان درکردبوو. بە تایبەت "**لئۆ ئالبێرت شلاگێتر**".

ناوی **شلاگێتر** بۆ هەر سەبازێکی کۆنی فەوجەکانی ئازاد حوکمی وشەیەکی سێحراوی هەبوو.

ئەو قارەمانی **ریگا** بوو. بێباکی و غیرەت و بەجەرگ بوونی ئەو لەڕادە بەدەر بوو. هەر شوێنێك کە بەرەی شەڕی لێبوو، ئەو شەڕی تێدا کردبوو. لە **سیلزی علیا** سێ جار هێزەکانی پۆلۆنی دەورەیان دابوو و هەر سێ جار بوێرانە رزگاری ببوو. گوێم لێبوو کە لە **روهێر** هێرش کردنەسەر هێڵی ئاسنینی بە کارێکی ئاسان زانیوە و لەبەرچاوی فەڕەنسەوییەکان دەستی لە خرابکاری داوە و پردەکانیشی وێران کردووە. بە سۆحبەت دەیانوت کە بە ئەنجامێکی "**تەواو ئاشتیخوازانە**" دەست لەم خرابکاری و وێرانکارییە دەدات!

بیست و سێیەمی مانگی مەی، هەواڵێکی ترسناك هەموو شاری "م"ی داگیر کرد:

دوا بەدوای تەقاندنەوەی پردێك لە هێڵی ئاسنینی "**دوئیسبۆرگ**" بۆ "**دوسلدۆرف**" فەڕەنسەوییەکان **شلاگێتر** یان گرتووە و تیربارانیان کردووە.

چەند رۆژ دواتر لەلایەن گروپێك وەتەن پەرەست کە لەگەڵ حزب لەپەیوەندیدا بوون و ئەندامەکانی پێکهاتبوون لە سەربازانی "**روسباخ**"،

ئاگادار کراینەوە کە "والتر کادو"ناوێك، جاسوسی لە شلاگێتر کردووە و شوێنەکەی بە فەرەنسییەکان راگەیاندووە ومن و دوو کەسی دیکە هەلبژێردراین کە بچین و وەلامی ئەم تاوانەی بدەینەوە.

بە دارستانێکی نزیك "پ" کادومان گرت و ئەوەندە بە داردەست و گۆپالّ لە سەر و مێشکمان دا هەتا لەویّ گیانی دەرچوو و مەیتەکەمان خستە ناو چالێك. پۆلیس مەیتکەی دۆزیەوە و ئێمەیان دادگایی کرد و دەسالّ زیندانیان بۆ من و هاورێیانم بڕیەوە.

مینیان بۆ زیندانی "د...." بەرێکرد. باری خۆراکییەکەی خراپ بوو، بەلام لە قۆناغی بێکاری رۆژانی لەوە دژوارتریشم بینیبوو، بەلام بەم یارمەتی و ئەشیایانەی کە حزب بۆی دەناردم، کەم یان زۆر بارودۆخی سکم باشتر بوو. ئیشی من لەم زیندانە بە زۆری دورینی جلکی سەربازی بە مەکینەی بەرگدووری بوو. بەرامبەر بەم هەموو کارە سەختانە کە کردبووم، شتێکی ئاسایی بوو. لەلایەکی دیکەوە دەبوایە ئەمکارە لە ژوورە تاکە کەسییەکەی خۆم بەرێوە ببەم و هەر ئەوەیکە دەمتوانی بە تەنیایی خۆم سەرگەرمی کار بکەم، ئەوا زۆر باش بوو.

جاروبارە لە کاتی پشوو گوێم لێدەبوو کە هاورێیانی زیندانی لەدەست نیگابانەکان وەزالّە هاتوون. هەلّبەت حەق نەبوو ئەوانیش بە تەواوی خەتابار بزانین. هەرچەند پەیوەندی من لەگەلّ ئەوان زۆر خۆش بوو. هەلّبەت خۆم کەسێکی بێدەنگ و لەسەرەخۆ بووم. دەنگم بۆ داخوازییەك بەرز نەدەکردەوە و هەر کارێکی پێیان دەسپاردم، ئەوا ئەنجامم دەدا.

لە لاپەڕەیەك کە لە کاتی هاتنم بۆ زیندان پرم کردبۆوە، خۆم بە "کنفسیونس لوس ئابر گوتکە لوی بیگ" ناساندبوو. ئەوەبوو زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە کاتیك بینیم قەشەیەکی پرۆتستانی بۆ دیتنم

هاتووە. ئەو سەرەتا لەوەیکە ئەرکی ئاینیم بە تەواوی پاشگوێ خستووە، لێم تووڕە بوو. دوایی ویستی ئەوە بزانێ کە رووم لە چ ئاینێك کردووە و کاتێك زانی فرقەی کاتۆلیك بوومە، هەستی بە حەسانەوە کرد. ئەوکات لێیپرسیم کە حەز دەکەم "کتێبی پیرۆز" بخوێنمەوە؟ و چونکە وەلامی بەلێم دایەوە نوسخەیەکی پێدام و رۆیشت. دوای مانگێك کلیلی قفلی ژوورەکەم سووڕا و دیسانیش بابە قەشە هاتەوە. لەبەری هەستام. لێیپرسیم کتێبکەم خوێندووەتەوە یان نا؟ وتم: – بەلێ. ئەوکات لێیپرسیم ئایا لەو جەنایەت و تاوانەی کە کردوومە، پەشیمانم؟ پێم وت هیچ پەشیمانییەك لەئارادا نییە، چونکە ئەم "**کادو**"یە خائین بە نیشتمان بوو و ئێمە بە عەشقی نیشتمان لەناومان بردووە. پێی وتم ئێعدامی خائینەکان تەنیا کاری حکوومەتە. بێ دەنگ مامەوە، چونکە نەمدەتوانی لەم بارودۆخەدا پێیبلێم کە چ بڕوایەکم لەبارەی کۆماریی "**وایمار**"ەوە (حکوومەتی ئەلمانی) هەیە. وابزانم ئەو بۆخۆی مانای بێدەنگی منی زانی و چەند ئایەتێکی خوێند و رۆیشت.

ئەوەیکە وتبووم خۆشم لە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز هاتووە، درۆ نەبوو: کتێب پێداگر بوو لەم هەموو ئەو شتانەی کە باوکم، **ریتمایستر گونتر** و حزب لەبارەی جوولەکەکان لە گوێیان خوێندبووم. ئەوانە مرۆڤگەلێك بوون کە هیچ کارێکیان بەدڵ نەبوو مەگەر لە بەرژەوەندی ئەوانەوە بێت. قەومێك بوون کە لەرووی ئاینەکەیانەوە هەوڵی قێزەونترین فێڵیان دەدا، قەومێك کە لە ژیانی سرووشتی خۆیان ناڕێکترین مرۆڤ بوون و تەنیا بیریان لە شەهوەت دەکردەوە. لە راستیدا خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانە بەلامەوە ئەوەندەش بێ ناخۆشی و بێ کێشە نەبوو. ئەو چیرۆکانەی کە

زیاتر باس لە نزیکبوونەوەی بە زۆرەملی لەگەڵ خوشك و دایك و ....
تێدابوو و ئەویش بە ناشیاوترین شێوە و دەربڕینی ناحەزترین وشە.

ساڵی سێیەمی ژیانم لە زینداندا ڕووداوێکی باش و خۆش ڕووی دا: نامەیەکم پێگەیشت.

نامەکەم بە حەز و دەستی لەرزۆکەوە خوێندەوە: ئیمزای دکتۆر "**فۆگێل**"ی لە ژێر بوو.

"**ڕۆدۆلفەی ئازیز**"

ئەگەرچی بەحەقی دەزانم دوای ئەو تاوانەی کە کردووتە، بەهیچ شێوەیەك لێت نەپرسمەوە، بەڵام دیسان کە بیر دەکەمەوە، سەبارەت بە باوکت نەتەنیا لەو بەدبەختییەی کە تێیکەوتووی و حەقتە، بەهیوای خوا بتهێڵمەوە، بەڵکوو دەبێ جنێوەکانت لەبیر بکەم و دەستی رزگاریت بۆ درێژ بکەم.

سێ ساڵە کە خوا قوورسایی دەستی لەسەر تۆ داناوە کە بەخۆت بێیتەوە و ئیتر لەوە زیاتر بۆ تاوان و جنایەت کەڵك لە ئازادی وەنەگری. باش دەزانم ئەم سێ ساڵە بۆ تۆ وانەیەکی باش بوویێت. بە رادەی پێویست هەستت بە پەشیمانی کردبێ و بە سزای تاوانەکانت گەیشتبی.

من نازانم گوناهەکەت چی بووە. تۆ بە پچڕاندنی هەموو پەیوەندییەکانت لەگەڵ من هەوڵت داوە کار و کردەوەکانت لە من بشاریتەوە. بەڵام خوا دەزانێ چ ژیانێکت هەبووە کە لە کۆتاییدا تووشی پیاو کوشتن بوویە. کاتێك بیر دەکەمەوە کە ژیانی تۆ چ عەیش و نۆش و مەترسی و جەنایەتی بە دەوروبەری خۆت بەخشیوە، دڵم پڕ دەبێ لە غەم و خەفەت. بەهەر حاڵ هەمیشە ئەوشتەی کە لاوی سالم لە ڕێگە بەدەر دەکات، ئەوا هەوا و هەوەسە، ئەویش قێزەونترین جۆرەکەی؟

بەلام ئێستا ئیتر رۆدۆلفی ئازیز، تۆ بە سزای سەختی خۆت گەیشتووی. حەقی خۆت و خۆشت باش دەزانی. وای دابنێین کە خوای گەورە هەمیشە تۆ دەخاتە ژێر سایەی رەحمەتی بەخشینی خۆی.

بێشك تازە ئەگەری ئەوە نییە کە نییەتی پاکی ئەو پیاوە بەستەزمانە بێتە ئاراوە و ئەو تاوانانەی کە تۆ کردووتن، پێش بە ویست و حەزە بەجێیەکەی باوکت دەگرن. بەلام رێگەیەکی سادەتر هەیە کە تۆ بتوانی قەرەبووی ئەم هەموو گوناهانەت بکەیتەوە. رێگەیەك کە جگە لە دڵێکی پەشیمان و نییەتێکی پاك بۆ خزمەت بە خوا، هیچ شتێکی دیکەی پێویست نییە.

ئێستا خێری تۆ تەنیا لەوە دایە و باوکیشت لە دنیای دیکە نیگەرانی تۆیە و ئەگەر زیندوو بایە، بێشك جگە لەمە هیچ بڕیارێکی دیکەی نەدەدا.

"ئەگەر پەشیمانی، ئەوجۆرەی کە من هیوادارم، ئیشاڵڵا چاوەکانی کردوویەتەوە و ئەگەر ئامادە بی ئەم خۆ بەزلزانییە وەلا نێی و خۆت لەم هەموو تاوان و گوناهانە دوور بخەیتەوە، شك و گومان مەکە کە دەتوانم زیندانییەکەت بۆ کەم بکەمەوە. هەڵبەت بێ لێکۆڵینەوە لەم بوارە ئەمە باس ناکەم. ئاگادار بوومەتەوە کە ئەو کوورە تاوانبارە کە لەگەڵ تۆ تووشی ئەم تاوانە بوو، چەند مانگێك لەمەوبەر بنەماڵەکەیان توانیویانە زیندانییەکەی بۆ کەم بکەنەوە و ئەمەش دەبێتە پێشەکییەکی زۆر باش و ئەگەر بەم ئەنجامە بگەم کە سزا توانیویەتی دڵی بێ رەحمی تۆ نەرم بکات، بێشك دەتوانم هەوڵێکی باشت بۆ بدەم و ئەتۆ بە رامی و پەشیمانییەوە بۆ باوەشی بنەماڵەکەت بگەڕێنمەوە.

هیچ پەیامێکم لە ئامۆژن و خووشکەکانت پێ نییە. هەڵبەت تێدەگەی کە ئەم ژنە نەجیبانە ئێستا حەز ناکەن بەهیچ شێوەیەك ئیشیان بە

تاوانبارێکی وەکوو تۆ هەبێت. بەڵام ئاگاداری ئەم نامەیە هەن و بێشك دەست بە دوعان و دەپاڕێنەوە کە پەشیمانی لەسەر دڵت کاریگەر بێت و ئەوە رێك ئەو شتەیە کە منیش لەناخی دڵەوە بۆتۆی دەخوازم."

"دکتۆر **ڤۆگێل**"

سێ مانگ دوای بەدەست گەیشتنی نامەکە دەرگای تاکەکەسیم لە زیندان کرایەوە و سەرنیگابان سەربازێکی لەدوا ناردبووم و هاتە ژووری، سەیرێکی کردم و بە دەنگە زەبەلاحەکەی وتی:

- بۆ خزمەت بەڕێوەبەر! "**ئشنل**" (خێرا).

منی وەپێش خۆی دا، نیگابان دەرگای بەست و سەرنیگابان هاواری کرد:

- **ئشنل! مێنش، ئشنل!**

هەنگاوەکانم خێراتر کرد. مەمەڕە تەسك و تاریکەکان کۆتاییان نەدەهات. چۆکەکانم دەلەرزین.

سەرنیگابان یەکێ لە کۆنە پلەدارەکان بوو. بە هەنگاوی کێشراوە دەهات و جەستەی راست رادەگرت. سمێڵە گەورەکانی سپی و شەق و رەق بوون. لە من باڵابەرزتر بوو و هەر هەنگاوێکی بەقەدەر دوو هەنگاوی من بوو. نەختێك هەنگاوەکانی سست کردەوە و لەژێر لێوەکانی وتی:

- دەترسێی، **دراگون**؟

- نەخێر، جەنابی سەرنیگابان.

چەند هەنگاوێکی دیکە رۆیشتین. هەستم کرد سەیرم دەکات. نەختێکی دیکە رۆیشتین و دووبارە وتی:

- نایەوێ بترسێی. خۆ ئیشێکی خراپت نەکردووە. ئەگەر ئیشێکی خراپت کردبا من ئاگادار دەکرام.

وتم: سوپاس، جەنابی سەرنیگابان..

دیسان هەنگاوی سست کردەوە و لەژێر لێو وتی:

- گوێ بگرە من چیت پێ دەڵێم دراگون. لای هێر دیرکتور (جەنابی بەڕێوەبەر) ئاگات لە دەمت بێت. لەو پیاوانەیە کە زۆر کەللە پڕە .....

نەختێك دەنگی نزمتر کرد:

- نەختێك..... بڵێین و نەڵێین.... نەختێك....

نەختێك بۆلای من خوار بۆوە و وتی:

- .... یانی، لەو بگوزەرێین، نەختێك شتە.....

دووبارە هەنگاوی شل کردەوە و دەنگی نەختێك بەرز کردەوە و وتی:

- کەواتە زۆر ئاگات لە خۆت بێت و تەنیا وەڵامی ئەو پرسیارانەی بدەوە کە پێویست بێت.

سەیرم کرد، چاوێکی دیکەی لێ داگرتم و بەردەوام بوو:

- .... ئاخر، لەگەڵ ئەو، باش گوێت بکەوە! پیاو نازانێ ئەو وەڵامەی کە دەیداتەوە دەبێ چی بێت.

هەر ئەمجۆرە چاوم لێدەکرد. وەکوو کەسێکی زانا سەری جووڵاند. دوایی وەستا و دەستی لەسەر قۆڵی من دانا:

- بۆ نموونە، فەرموو، نموونەیەکی ئەوەتا: تۆ وابیر دەکەیەوە قسەیەکی شێتانەت کردووە. ئێ؟ .... بەڵام لەناکاو لایەنی بەرامبەرت زۆریش کەیفی بە قسەکەت دێت و دوایی وتی: – ئێستا پێچەوانەکەی....

دووبارە بەڕێکەوت. ماوەیەکی زۆر سمێڵەکانی کێشا و دوایی وتی:

- کەواتە باشە، بەهەرحاڵ ئاگات لە وەڵامەکان و دەمت بێت، دراگون!

وتم: – سوپاس، جەنابی سەرنیگابان.

مەمەڕێکی دووروودرێژی دیکە. لە دوو دەرگای بەدوای یەکدا تێپەڕین و دەنگی تەقە تەقی چاپگەرم بەگوێ گەیشت. سەرنیگابان وەپێش کەوت، خۆی رێکخست و لە دەرگایەکی دا کە رەنگی سوور بوو و چووە ژوورەوە. رێك وەستا و بە دەنگێکی توند وتی: – زیندانی **لانگ** ئامادەیە، **هێر دیرکتور!**

دەنگێك وتی: – بیهێنە ژووریٚ!

سەرنیگابان منی هاویشتە پێش خۆی. ژوورەکە زۆر رووناك بوو و زۆریی سپیایی دیوارکان لە چاوی دەدا. ماوەیەکی پێچوو هەتا بەڕێوەبەرم بینی. لەپێش پەنجەرەیەکی گەورە وەستابوو و کتێبێکی سەوزرەنگی بەدەستەوە بوو. کوورتەبالاً، تێکسماو و رەنگ زەرد بوو. ناوچاوانی پان و لە پشت چاویلکەی دەورە زێڕینیدا چاوەکانی زەق بوون و دەبریقانەوە. سەرتاپێ سەیرێکی منی کرد و وتی: **"لانگ؟"** و ناڕەحەتییەك هەموو رووخساری گرتەوە.

سەرنیگابان بە بەری دەستی کە لەسەر شانی من بوو، بە هێواشی پاڵێکی دام و دوایی گووشاری دەستی راگیرا. خۆم لە یەك مەتری مێزەکە بینی و سەرنیگابانیش لای راستم. لە پشت مێز، دیوار لە عەردەوە هەتا میچ پڕ لە کتێب بوو.

بەڕێوەبەر بە دەنگە تیژە جیغ جیغۆیەکەی وتی: – ئاخ ئاخ!

دوایی هەر لەو شوێنە کە لێی وەستابوو، کتێبە سەوزەکەی هاویشتە سەر مێز. کتێبەکە لەولای مێزەکەوە کەوتە خواریٚ. سەرنیگابان هات هەڵیبگرێتەوە کە بەڕێوەبەر بە دەنگێکی بەرز وتی: – بەوەستە!

چاوەکانی، لووتی، ناوچاوانی، دەمی، هەموویان وەجووڵە کەوتن. بە چالاکییەکی بێ وێنە پەنجەی بۆلای سەرنیگابان راداشت و وتی:

- من بوومە هۆی ئەوەی بکەوێتە خوارێ. کەواتە، ئەرکی خۆشمە هەڵیگرمەوە.... تێگەیشتی؟

سەرنیگابان وتی: - تێگەیشتم، هێردیرکتور

بەڕێوەبەر بە (شیلانگ) سۆندەیەکەوە خۆی گەیاندە مێز، کتێبێکی هەڵگرت و لە لای ژێرجگەرەیەکی دانا کە پڕ بوو لە قونکەجگەرە. دوایی شانەکانی راست کردەوە، سەیرێکی منی کرد، راستەیەکی (خەتکێش - مەستەرە) دەست دایە کە لەسەر مێزەکە بوو و هەستایەسەرپێ و لە ژوورە ئیدارییەکەی دەستی بە رێکردن کرد:

- کەواتە، ئەم پیاوە لانگە!

بێدەنگییەك رووی دا و لەناکاو سەرنیگبان هەر لەخۆوە رووی لەمن کرد و بەسەریدا قیژاندم:

- یاوول، هێردیرکتور!

بەڕێوەبەر لە پشت سەری من وتی: لانگ، من لێرە هیچ شکایەتێکم لە تۆ هەیە کە هێر دکتۆر ڤۆگێل نووسیویەتی.

لە دەنگێك کە بەگوێم دەگەیشت بەم ئەنجامە گەیشتم کە راستەکەی لە شتێك دەدات.

- شکایەتی کردووە کە تۆ وەڵامی نامەکەت نەداوەتەوە کە روونووسەکەی لای منە.

ئاوی ناو دەمم قووت دا و وتم: - هێردیرکتور! دکتۆر ڤۆگێل ئیتر قەییمی من نییە. ئیتر من گەورە بوومە و کەبیرم.

ئێستا لەپێش من بوو؟ راستەکەی جووڵاندەوە؟ مۆڕەیەکی کرد و وتی:

- ئایا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی وەڵامی نامەکەی نەدەیتەوە؟

- **نایِن، هێر دیرکتور!** هۆیەکەی ئەوەیە کە من حەز ناکەم هەرچی ئەو وتی، منیش پێی بڵێم بەچاوان.

- بەڵام ئەگەر بە باشی لێی تێگەیشتبم ئەو نامەیەی کە دکتۆر **فۆگێل** بۆتۆی نووسیوە، نامەیەکە، ئەگەر بتوانم بڵێم، زۆر باش و سەرنج ڕاکێشە. باوکت حەزی دەکرد تۆ ببی بە قەشە؟

- **یا، هێر دیرکتور.**

- بۆچی؟

- بۆ لەدایك بوونم منی نەزر کردبوو.

- چەند زەربەی یەك بەدوای یەکی ڕاستە و لافاوێك لە "ئاها، ئاها" و دوایی بەردەوام بوو:

- ئەتۆش حەزت لەمە نەبوو؟

- **نایِن، هێر دیرکتور.**

لە پشت سەرمەوە — لای باوکت باس کردبوو؟

- باوکم ڕای منی وەرنەدەگرت؟

- ئاها، ئاها، (لەبەردەمی من) ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ببیتە **کنفسیونس لوس؟**

- **نایِن، هێر دیرکتور.**

- کەواتە هۆیە ڕاستەقینەکەی چییە؟

- وام بیر کردەوە کە ئەو قشەیەی کە لای ئەو دانم بە تاوانم نابوو، خیانەتی پێکردووم.

بە سۆندەکەی چەند لێدانێکی ئاراستەی مێزەکە کرد:

- لەم بیرکردنەوە بەشکەدا، تاوانەکانی تۆی لای کێ ئاشکرا کردبوو؟

- لای باوکم.

لەپشت سەری من:

- بە بڕوای تۆ ئەم مەسەلەی ڕاست بوو؟

- **ناین، هێر دیرکتور**، ڕاست نەبوو، بەڵام زۆر درەنگ ئەمەم زانی.

هەر لە پشت سەری من بوو و وتی:

- بەڵام ئیمان و متمانەتان نەگەڕایەوە؟

- **ناین، هێر دیرکتور.**

تەقە تەقی راستە لەسەر مێز و لەناکاو قیژاندی:

- زۆر باشە!

سۆندەکەی بە توندی لە پشت سەری من لە شتێکی تەختەیی دا:

- سەرنیگابان!

سەرنیگابان بێ ئەوەی بگەڕێتەوە، وتی: - **یاوول، هێر دیرکتور؟**

- زۆر باشە!

- **یاوول، هێر دیرکتور.**

ڕێک ڕووبەڕووی من بوو:

- لە نامەکەی دکتۆ **ڤۆگێل**دا خوێنمەوە کە ....

بە نووکی پەنجەکانی لاپەڕەیەکی هەڵگرت و لە خۆی زۆر دوور ڕاگرت، وەکوو ئەوە دەچوو بێزی لێدەکات

- ئەگەر تۆ بچیتە ژێر باری بیروڕایەکانی، ئەوا دەیهەوێ بەخششت بۆ وەربگرێت و زیندانییەکەت کەم بکرێتەوە، تۆ بڵێی ئەم کارەی پێ بکرێت؟

- بێشك، **هێر دیوکتور**، دکتۆر **ڤۆگێل** پیاوێکی بە مێشکە و هەروەها زۆر شتی.....

پێکەنین و پێکەوتنی راستە لە لاپەڕەکە و هاویشتنی سۆندەکە.

- ئـیٚ، کەواتـە، دکتـۆر ڤۆگێل پیاوێکی بەمێشکە؟ باشە پێم بڵـێ ئـەم دکتۆرە لە چ شتێکدا پیاوێکی بە مێشکە؟

- لە پزیشکیدا، هێر دیرکتور.

- زو!

لە پشت سەری من:

- هیچ بیرت لەوە نەکردەوە وابنوێنی کە خۆت داوەتە دەست دکتۆر و دوای ئەوەی عەفووی بۆ وەرگرتی، ئەوا بیخەیتە ژێر پـێ و لەبیر خۆتی بەریتەوە؟

- ناین، هێر دیرکتور. بیرم لە شتێکی ئاوا نەکردووەتەوە.

- ئیٚ، ئێستا چی؟ ئێستا رات بەرامبەر بەم مەسەلەیە چییە؟

- ئەم کارە ناکەم.

- ئاخ، ئاخ.

رووبەڕووی من سەری راستەکەی دانایە سەر مێز:

- بۆچی؟

ماوەیەکی باش بێدەنگ مامەوە. سەرنیگابان بە دەنگێکی جددی وتی: - "وەڵامی هێر دیرکتوری بدەوە!" بەڕێوەبەر راستەکەی دەست دایە و بە توندی وتی: "کاتی بدەیە!". بێدەنگییەکە هەروا بەردەوام بوو.

- نازانم.

بەڕێوەبەر بڕۆی تێکنا. لێوەکانی رێککوشی. چاوێکی توند و تیژی لە سەرنیگابان کرد؟ راستەکەی لە پەیکەرێکی سەر مێزەکەی کوتا و دوایی بە خێرایی دەستی بە هاویشتنی سۆندە کرد.

- جگە لە دکتۆر ڤۆگێل کەسێکی دیکە شك دەبەی کە داوای بەخشینت بۆ بکات؟

- ناین، هێر دیرکتور.

لە پشت سەرم: – ئاگاداری ئەوە هەی کە لە بارودۆخی تۆدا، عەفوو و بەخشین دەتوانیٚ نیوەی سزاکەت کەم بکاتەوە. ئەوکات لەجیاتی دە ساڵ پێنج ساڵ زیندانی دەکێشی.

- ئەمەم نەدەزانی هێر دیرکتور.

- بەمحاڵەشەوە دەتهەویٚ پێنج ساڵ زیاتر لە زیندان بمێنیتەوە و وا نیشان نەدەی کە خۆت دەخەیتە بەر ویست و داخوازی دکتۆر ڤۆگێلەوە؟

- یا، هێر دیرکتور.

- بۆچی؟

- ئەمکارە، ماناکەی فریودانە.

رووبەڕووی من. بە حاڵەتێکی جددی. ڕاستە روو بە من و چاوەکانی لە چاوی من بڕی: – ئێستا بە چاوی هاوڕێیەك سەیری دکتۆر ڤۆگێل دەکەی؟

- ناین، هێر دیرکتور.

- ڕێز و حورمەتی بۆ دادەنێی؟

- بێشك نەخێر، هێر دیرکتور. بەمحاڵەشەوە پیاوێکی زۆر تێگەیشتوویە.

- ئێستا "پیاوی تێگەیشتوو" بەلاوە نێین. لانگ، کوشتنی دوژمنی نیشتمان، شەرعەن ڕێگەی پێدراوە؟

- بێشك، هێر دیرکتور.

- درۆ کردن کردن چی؟

- بێشك، هێر دیرکتور.

- قێزەونترین فریودان و کلاو لەسەرنان؟

- بێشك، هێر دیرکتور.
- بەمحاڵشەوە حەز ناکەی دکتۆر فۆگێل فریو بدەی؟
- ناین، هێر دیرکتور.
- بۆچی؟
- ئەم دووە بەیەکەوە جیاوازن.
- بۆچی ئەم دووە بەیەکەوە جیاوازن؟

نەختێکم بیر کردەوە و وتم: – چونکە لێرە تەنیا من لە گۆڕێم.

بەدەنگێکی تیژ و سەرکەوتووانە "ئاها، ئاها"ی کرد. راستەکەی هاویشتە سەر مێز، قۆڵەکانی لەپێش سینگی هاویشتە سەریەك و حاڵەتێکی رەزامەندانەی بەخۆیەوە گرت و وتی: – لانگ! تۆ پیاوێکی مەترسیداری.

سەرنیگابان سەری وەرگێڕا و جددیانە سەیری کردم.

- دەزانی بۆ پیاوێکی مەترسیداری؟
- ناین، هێر دیرکتور.
- چونکە شەرافەتمەندی.

چاویلکەی دەورە ئاسنەکەی بریقەیەکی دا و بەدوای قسەکانیدا هاتەوە کە: – پیاوە شەرافەتمەندەکان هەموویان مەترسیدارن. تەنیا مرۆڤە دەغەڵ و نادروستەکان بێ کێشە و بێ زەرەرن. هۆیەکەی دەزانی، سەرنیگابان؟

- هەڵبەت، هێر دیرکتور، حەز دەکەم بزانم.
- چونکە خەڵکی دەغەڵ و نادروست تەنیا سەبارەت بە بەرژەوەندی و قازانج هەوڵ دەدەن. بە واتایەکی دیکە، هەوڵەکانیان "رەزیلانەیە".

دانیشت و هەردوو دەستی خستە سەر دەسکی کوورسی و سەرلەنوێ حاڵەتێکی سەختکۆشانە و خۆشی پەیدا کرد.

وتی: – **لانگ**، زۆر خۆشحاڵم کە ئەمە نامەیەی دکتۆر **ڤۆگێل** (بە نووکی پەنجەکانی نامەکەی بەرز کرد) وایکرد کە تۆ باشتر بناسم. ئێستا ئەگەری ئەوە زۆر کەمە کە ئەم دکتۆرە تێگەیشتووە کارێکت بۆ بکات، بەڵام من، بە پێچەوانە....

هەستایە سەرپێ، بە خێرایی خۆی گەیاندە ریزی کتێبەکان. یەکیانی کێشایەدەر و لە کاتێك پشتی لەملایە کردبوو، وتی:

- بۆ نموونە من دەتوانم سەبارەت بە هەڵسووکەوتی باشت، داوای عەفوو و بەخشینت بۆ بکەم.

بە خێرایی و چالاکی مەیمونێك سووڕایەوە، وەکوو یاریزانانی شەمشێر راستەکەی بەرەوڕووی من راگرت. چاوەکانی بریقەیان دا و لەناکاو بە دەنگی تیژی قیژاندی:

- ئەمکارەش دەکەم.

کتێبەکەی دانا. چووە شوێنی خۆی. چاوەکانی بەرز کرد و لەناکاو بێ وازی لە رووخساری باری و وتی: – زایندانی ببەن! (دەستی کرد بە هاوارکردن) – "**ئشنل! ئشنل! ئشنل!**" (زوو، زوو، زوو).

سەرنیگابانیش بە دەنگێکی بەرز وتی: – "**لوس**" (بجووڵێ).

هەر بە راکردن منی بردە دەرەوەی ژوورەکە.

بەڕێوەبەر بەڵێنییەکەی بردەسەر، دەبوایە دیسانیش دووساڵی دیکە لە زیندان بمێنەوە.

لە ساڵی ۱۹۲۹ بەدیار کەوت نیوەی زیندانییەکەم بەخشراوە و دوای پێنج ساڵ زیندانی تەواو ئازاد کرام.

قەڵـەو ببـووم و ئـەمجارە جلکـەکانم بـە بـەرم تەسـك بـوون. دیـسانیش جێگـەی شـوکر بـوو کـە کاتێـك لـە زینـدان ئـازاد کـرام، تیـشکی هـاوین نەشکابوو و هەوا نیوەگەرم بوو. چونکە بەم بارودۆخەمەوە ناچار نەبووم کۆتەکەی مامم لەبەر بکەم.

جگە لەو پارەیەی کە لە ئیشی زینـدان بەدەسـتم هێنـابوو، ناسـنامەیەکی کاتیان پێدام بۆ ئەوەی بتوانم بۆ شاری "م" بگەڕێمەوە.

لـەناو شـەمەندەفەر، کاتێـك بـەبیر ژوورە تاکەکەسـییەکەم لـە زینـدان کەوتمـەوە، مـچووڕکێك بە هـەموو جەسـتەم داهـات و سـەیر بـوو کـە بیریـم دەکرد. لەناو ڕێڕەوەکە وەستابووم و لە پشت شووشـەوە سـەیرم دەکرد. کێڵگەکان ڕێژە دەڕۆیـشتن و لەژێر خۆر بەهێواشـی شـەپۆلیان دەخـوارد و بیرم لەوە دەکردەوە کە: "ئازادم".

بیرکردنـەوە لـە ئـازادی بەلامـەوە سـەیر بـوو . بەتایبـەت دوای هـەموو لێکدانەوەکان دەمبینی کە ئازادییەکەم لە نامەکەی ئەو دەزانم.

دوای ماوەیـەك گەڕامـەوە دانیـشم. دەسـتەکانم بـە بـەتاڵی لـەدوولای جەستەم هەڵواسـرابوون. خوولەکەکان یـەك بەدوای یـەك تێدەپەڕین. ئیتر هیچکەس نەبوو پێم بڵێت چی بکەم. دڵم گیرابوو. سەرلەنوێ بۆ ڕێڕەوەکە گەڕامەوە. دووبارە لە پشت شووشە سەیری دەرەوەم کرد. مەزرای پڕ لە گـەنم و جـۆ جـوان بـوون. بـا کە بەسـەریاندا تێدەپـەڕی، پێڵـوی بـچووکی دەخستنەسەر. ڕێك وەکوو پێڵووەکانی سەر دەریا.

لە زینـدان پێنج جگـەرەیان پێدابووم، بێ ئەوەی جگـەرە داگیرسێنم، بۆ شـوێنی خـۆم گەڕامـەوە و داوای ئـاگرم لـە گەشـتیارێك کـرد و دووبـارە هاتمەوە بۆ ڕێڕەوەکە.

جگەرە هیچ تامێکی نەبوو. چەند قمم لێدا، شووشەم کێشایە خوارێ و تا ئەو جێگەیە دەستم دەگرت، فڕێم دا. بایەکە گەڕاندیەوە و دای لە دەرگای ژوورەکە و نەختێك لە ئاگرەکەی بڵاو بۆوە. دوایی شووشەکەم کێشایەوە سەرەوە و سەرلەنوێ چاوم لە کێڵگەکان کرد. ئەولای کێڵگەکان شیناوردێکی سەوز بوو، بەڵام هیچ ئەسبێکم تێدا نەدی.

دوای ماوەیەك وەبیر حزب کەوتمەوە و هەستم بە خۆشبەختی کرد.



## ١٩٢٩

حزب بڕیاری دا کە من بۆ ماوەیەك بحەسێمەوە و پشوو بدەم و لە ئیلخی (مووچە، مەزرا، کێڵگە) موقەدەم "بارون ڤون یەزریتس" کارێکی بۆ پەیدا کردم کە نزیك شاری و.... لە ویلایەتی پومرانی مڵکێکی زۆری هەبوو.

کاری نوێ، بە تەواوی سەرزیندووی کردم. ئاژەڵەکان جوان بوون و شوێنی نوێ و کارگەی نوێ، مەقەدەم ڤون یەزریتس ئەگەرچی کاربەدەست نەبوو، بەڵام هەر بە "هێر ئورست" (جەنابی موقەدەم) بانگیان دەکرد.

باڵابەرز و لاواز بوو بە رووخسارێکی پڕ لە چرچولووچی و چەنەگەیەکی درێژ کە راستی سەیر بوو و بەم چەنەگەیەوە زۆر بە ئەسب دەچوو. منداڵە خزمەتکارەکان، ناویان نابوو "دەموولووت پۆڵایین" و من هیچکات نەمزانی کە ئەم نازناوەیان سەبارەت بەچەنگەی یان سەبارەت بە چاوەکانی پێداوە. چاوەکانی لە سەرەتادا هیچ شتێکی نارێکیان نەبوو، بەڵام کاتێك ڤون یەزریتس لەناکاو هەڵیدەگێڕانەوە بۆلات، واپێدەچوو کە لەناکاو کلیلی گڵۆپ پێدەکرێت و زۆر سەیر بوو.

سێ مانگی تەواو بوو کە لەلای ئەو ئیشم دەکرد و تەنانەت بۆ جارێکیش قسەی لەگەڵ من نەکردبوو و وام بیر دەکردەوە کە رەنگە سەبارەت

بەوەیەکە پیاوی جێگەی متمانەی ئەو منی لەوێ دامەزراندووە رەنگە هیچ من ناناسێ. تا رۆژێك دوانیوەڕۆ کە من تەك و تەنیا لەناو چیمەنێکدا مابوومەوە و دەمویست پەرژینەکەی چاك بکەمەوە لە پشتەوە گوێم لە دەنگی غاری ماینەکەی بوو. دەنگێك وەکوو چەقەنە کە بە هەڵمژینی زمان و رەهاکردنی بەرز دەبێتەوە و لەناکاو ماینەکە لەبەردەم من وەستا – باریك و بڵند – ماسوولکەیی، جوان و خۆش خەت وخاڵ.

- لانگ!

راست بوومەوە و بە جووڵەیەك کە رێك بەرامبەری وەستام، ماینەکە گوێی قووت کردن. "**فون پەزریتس**" دەستی بەملی داهێنا و بێ ئەوەی سەیری من بکات، وەکوو ئەوەی کەسێك قسە لەگەڵ من بکات وتی:

- لە **مارینتال** زەوییەکی بچووکم هەیە. پاك بە هیوای خوای فڕیدراوە...

بێدەنگ بوو و من چاوەڕوان مامەوە. بەجۆرێك کە هۆشی لە لایەکی دیکەیە و رێك وەکوو کەسێك کەبەدەنگی بڵند خەریکی بیر کردنەوەیە وەدەنگ هات کە:

- بیرم لەوە کردووەتەوە کە ئەگەر زەوییەکە بتوانێ گیایەکی باشمان بداتێ، رەنگە بکرێ چەند ئەسبێك لەوێ بەرەڵلا بکەین.

نووکی قامچییەکەی هێنایەخوار و لەسەر گوێی ماینەکەی دانا و بەنەرمی دوا:

- سەردەمی باوکم چەند ئەسبێکی لێبوو، بەڵام کەس ئامادە نەبوو لەسەر زەوییەکان بمێنێتەوە... دوورکەوتەیە. هەموو لایەکی ئاوە. غەم و پەژارە لە خانووەکەی دەبارێ. لە زەوییەکەشی هەروا. دەبێ هەموو

شتێکی سەرلەنوێ چاك بکرێتەوە. تەنانەت زەوی و خاکەکەشی دەبێ دووبارە و سەرلەنوێ بەدەست بێتەوە....

نووکی قامچییەکەی بەرز کردەوە و سەیرێکی منی کرد:

- تێدەگەی؟

- یاول، هێرئۆبێرست.

دوای ماوەیەکی کوورت رووی لەمن وەرگێڕا و ئاسوودەی کردم:

- بیرم لە تۆ کردووەتەوە.

بە نووکی قامچییەکەی پشتی گوێی خوراند و زۆر بە وشکی وتی:

- مەرجەکانی ئەوەیە: سەرەتا دوو کەست دەدەمێ و هەوڵ دەدەی هەموو شتێك چاك بکەیتەوە. ئەو مووچەیەی لێرە وەریدەگری، لەوێش دەددرێتێ. ئەگەر کارەکانت بەتەواوی بەڕێوەبرد، لەوێ دەمێنیتەوە و منیش چەند ئەسب دەخەمە ئەوێ. لە هەمانحاڵدا بەرازێکی مێ و چەند مریشك و کەڵەشێر و دانەوێڵەت دەدەمێ. لەخۆیدا دەبێتە مەزرایەکی کشت و کاڵی. هەرچی توانیت لە چاندن و بەراز و مریشك و دوو دارستانەکەی زەوییکە بەدەست بێنی بۆ خۆت بێت. راوەکەشی هی خۆت. بەڵام ئەوە بخە ناو گوێت: لەوکاتەوە کە دەستت بە کار و ئیشی خۆتکرد، یەك فلووسیشت نادەمێ! تێگەیشتی؟ تەنانەت یەك فلووس!

وتم: – یا، هێرئۆبێرست.

بێدەنگییەك روویدا و ئەو بە دەنگێکی ئارام وتی:

- مەڵێ "یا". ئەسبێکی هەڵبگرە و برۆ سەیرێکی ئەوێ بکە، کاتێك بینیت، ئەوکات بڵێ "یا".

- هەر ئێستا هێرئۆبێرست؟

- هەر ئێستا. هەروەها بە "گێئۆرگ" بڵێ جووتێك چەکمەت بداتێ، پێویستیت پێی دەبێت.

دەستی پێشووی خوار کرد و ماینەکە بۆ هەوا بەرز بۆوە.

بۆ ماڵەوە گەڕامەوە و بە گێئۆرگم وت کە فون یەزریتس دەمنێرێت بۆ مارینتال.

گێئۆرگ چاوەکانی کز کردەوە و چەند جار سەیری کردم و سەری لێ ڕاوەشاندم و دوایی بە سەرسوڕمانەوە وتی:

- کەواتە ئەو کەسە ئەتۆی؟

پێکەنی و ددانەکانی بەدیار کەوتن و حاڵەتێکی بەتەمەنتری پێبەخشی:

- ئای پیاوێکی فێڵبازە ئەو پیرە! لەسەر ئەسبێکی باش گرەوی کردووە.

بەدوای چەکمەکان کەوت. کاتێك دەمویست تاقیان بکەمەوە بە دەنگێکی نزم وتی:

- هیچ دڵی خۆت خۆش مەکە. جێگەیەکی پەرتی پیسە. ئەگەریش زانیت ناتوانی ڕێکیبخەی، هەرلەخۆتەوە بەڵێنی مەدە!

لە ئیلخی هەتا مارینتال دە کیلۆمەتر ڕێگە بوو، ئاسمان پەڵە هەورێکی تێدانەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیکە لە مانگی سێپتەمبەردا بووین هەوا سەخت دەیگەستین (سارد بوو) لەناو گوند ڕێگەی زەوییەکەم پرسی و سێ چوار کیلۆمەتری دیکەم بڕی لە جاددەیەکی پڕ لەگوڵ و رووەك کە زیاتر بە خلنگ داپۆشرابوو. نە خانوویەکم بینی و نە کێڵگەیەك. هەموو شت بەیار و وەحشی دەهاتەبەرچاو.

جاددەکە بە پەرژینێکی لەدار دروستکراو گەیشت و کۆتایی پێهات. لە ئەسبەکەم هاتمەخوار و لە سپیدارێکم بەستەوە. ئەگەرچی هەشت رۆژێك بوو کە باران نەباریبوو، بەڵام زەوی تەڕ و نماوی بوو.

چەند هەنگاوێك رۆیشتم هەتا توانیم خانووەکە بدۆزمەوە.

بانەکەی بە تەواوی رووخابوو. نە دەرگا و نەپەنجەرەی نەبوو. لەنێوان بەرد و خشت و دار و تەنانەت لە عەردەکەشی رووەك رووابوو.

بە دەوریدا سووڕامەوە و بەرەو تەویلە رۆیشتم: بانەکەی وەکوو خۆی بوو، بەڵام دیوارێکی رمابوو.

گێئۆرگ نەقشەیەکی لە زەوییەکان پێ دابووم و منیش بێ هیچ پەلەیەك سەردانی هەموویم کرد.

دارستان، هەندێ قەڵەمە و چناری باریك و تەڕ بوو. جگە لە دارستانەکە کە دەکرا بۆ سووتەمەنی و راو کەڵکی لێوەربگیرێت، ئیتر هیچیتری لێنەبوو کە پیاو بتوانێ گلیمی خۆی پێ لە ئاو دربکێشێت. دەکرا بەشێکیشی بکێڵدرێ، هەر ئاوا سەیرێکم کرد: پارچە ئەردێکی زیخاوی بێ کەڵك. دوایی دارستانێکی بچووك کەوەستام تێدا سەد قەڵەمەیەکی جوان و باریك و راستم ژمارد. دوایی مەرتەع (شیناوەرد) دەستیان پێدەکرد: لەسەر یەك پێنج پارچە چیمەن بوو کە بە پەرژین لەیەك جیا کرابوونەوە. سێ دانەیان پڕ بوو لە جەگەن و دوویانیش کە کوێرەڕێیەکی پڕ لە قووڕ و چڵپاو بۆ ئەوێی دەگەیاندی، بێ کەڵك لەوێ کەوتبوو. لەگەڵ ئەوەی چەکمەم لەپێ بوو، بەڵام پێویست بەوە نەدەکرا پێ بنێمە ئەوێ و خۆم قووڕاوی بکەم.

کوێرەریم گرت و گەڕامەوە. دوای چارەگێك رێپێوان بە بەندئاوێك گەیشتم و تازە لەوە حاڵی بووم کە تێیدا رووی داوە: ئاوبەندەکە دەبوایە

پڕ لە ئاو بێت، بەڵام لافاو بەندئاوەکەی لەگەڵ خۆی بردبوو. ئاو دوو چیمەنە خراپبووکەی گرتبۆوە و دوایی ڕێگەی بۆ ئەوانی دیکەش پەیدا کردبوو. هەرچەند لە شوێنێك تەپۆڵکە گڵێك پێشی گرتبوو، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو.

خۆم ڕووت کردەوە و چوومە ناو بەندئاوەکە. ئاوەکەی زۆر سارد بوو و تەزاندمی.! هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و چوومە ژێرەوە. دوای ماوەیەکی کوورت دیواری بەندئاوەکەم دۆزییەوە. چوومە سەری، ئاو هەتا چۆکم هات. بە پێ توانیم ڕووی دیوارەکە بدۆزمەوە و خێراتر هەنگاو بنێمەوە.

ئاو ڕەش بوو و قوڕاوی. ئاگام لەخۆم بوو لە شوێنی ڕووخانی دیوارەکە جێپێم بەتاڵ نەبێ و نەکەومە ناو ئاوەکە. لە ڕاستیدا هێشتا هەتا نیوەی دیوار نەگەیشتبووم کە ناچار بووم مەلە بکەم هەتا سێ چوار مەتر ئەولاتر بگەمە قەڵشی ناو دیوارەکە. دووبارە پێم نایەوە سەر دیوارەکە و گەیشتمە کەناری بەندئاوەکە. جگە لەم ڕووخاوە، ڕووخاو و شکانی دیکەی تێدانەبوو.

لەئاو هاتمەدەر و بۆ گەیشتن بە جلکەکانم کە لەوبەری بەندئاوەکە بوون، بەراکردن بەندئاوەکەم دەور لێدایەوە. ددانەکانم پێك دەکەوتن. چەند جارێك هەتا جمگەی قاچم چووە ناو ئاو. بەڵام بای پێکهاتوو لە ڕاکردنم وشکی کردمەوە و کاتێك جلکەکانم لەبەر کردەوە، ئیتر جەستەم تەڕایی نەما.

بەرامبەر بە ئاوبەندەکە، لەسەر بەردێك دانیشتم. خۆر ئیتر دەیویست بێتەخوار. سەگلەرز دەلەرزیم و هەستم بە ماندوویی و برسێتی دەکرد.

پێخۆرێکم پێبوو و لەبەرکم هینایەدەر و هەر ئەمجۆرەی کە ئاوبەندەکەم سەیر دەکرد، دەستم کرد بە خواردنی پێخۆرەکە.

لەشکەرێك جەگەن دەوری ئاوبەندەکەیان گرتبوو. لەلای رۆژئاوا، هەورێکی رەش بەرز بۆوە، ئەمەش لە خۆرەکە...... لەناکاو تاریکی داهات. بۆنی نم و خراپی زەوییەکە دەهات و هەمو شت دڵگرانی و ترسی بەدواوە بوو، دوایی خۆر هەوری کوون کرد و خۆی بەسەر ئاوە رەشەکە داکێشا و لە قووڵایی چیمەندا تەپ و مژێکی پێکهێنا.

ئەو بەردەی کە لەسەری دانیشتبووم هەتا نیوەی لە ئاودا گیری کردبوو. دەوروبەرم هەموو شت سارد و لیچقاوی بوو. وام هەست کرد لە ئۆقیانووسێکی پڕ لە قووڕ و چڵپاو رۆچوومە.

که گەیشتمەوە ماڵەوە، گێئۆرگ جڵەوی ئەسبەکەی گرت و وتی:

- پیرە لە ژووری کار چاوەڕێتە، خێراکە!

دوایی چاوێکی لێکردم و بەسەبری وتی:

- ئێ. رات چییە؟ زستان، ئەوێ. ها؟

لە ژوورەکەی دارێکی زۆر لەئاگردانـدا دەسووتا و فون یەزریتس کە پیپێکی درێژی بەدەستەوە بوو لەبەردەم ئاگرەکە دانیشتبوو یان درووستتر بڵێم لەناو کوورسییەکەیدا پاڵی دابۆوە: بە دوو لینگی ناو چەکمە خۆی درێژ کردبوو. سەری وەرگێڕا چاوە شینەکانی لەمن بڕی و هاواری کرد: - دەیێ؟

رێك وەستام و وتم: - یا!

هەستا و لەسەر هەردو لینگە درێژەکانی وەستا. زۆرم پێ سەیر بوو: تا ئەوکاتە تەنیا لەسەر ئەسب بینیبووم.

- بە باشی بیرت کردەوە؟

- یاوول، هێرئۆبێرست.

دەستی بە ڕێکردن کرد و بەردەوام پیپەکەشی دەکێشا.

بە دەنگێکی نەرمتر وتی: – پێتوابێ دەتوانی؟

- یاوول، هێرئۆبێرست، بەمەرجێك بتوانم بەندئاوەکە چاك بکەمەوە.

چوارمەتری بەندئاوەکە ئاو بردوویەتی.

لەناکاو وەستا و بەباشی سەیری کردم:

- لە کوێوە زانیت قەڵشەکەی چوار مەترە؟

- روت بوومەوە چوومە ناو ئاوەکە.

- شکانی دیکەی نییە؟

-ناین، هێرئۆبێرست.

دووبارە دەستی بە هەنگاونانەوە کرد.

- کەواتە بەو خراپییە نییە کە من بیرم دەکردەوە.

وەستا و بە دەستەی پیپەکەی بنانگوێی خوراند.

- کە رووت بوویەوە چوویتە ناو ئاو؟

- یا، هێر ئۆبێرست.

بە رەزامەندییەوە سەیری کردم:

زۆر باشە. تۆ یەکەم کەسی کە ئاوا بیرت کردووەتەوە!

دانیشت. پێیەکانی پێکەوە جووت کرد و درێژی کردنە پێش خۆی.

- ئێ، دواتر؟

- دواتر، هێر ئۆبێرست، دەبێ ئاوی چیمەنەکانی خوارووی جاددە بگیرێت و وشك بکرێتەوە. ئەو سێیەی دیکە، هەرئەوەیکە خاوێن بکرێنەوە و چاڵ و قوڵکەکانی بگیرێت بەسە.

- خانوو و تەویلە چی؟ دەتوانی بۆخۆت چاکیان بکەیتەوە؟

- **یاوول، هێرئۆبێرست.**

بێدەنگییەك پێش هات. هەستا و پاڵی وە ئاگردانەکە دا و وتی:

- ئێستا باش گوێ بگرە.

- **یاوول، هێرئۆبێرست.**

- چەند ئەسب لەوێ بوون و نەبوونەکەی بۆ من فشەیە. هەر بە حسێب نایەت. ئەو شتەی بەلامەوە گرنگە (نەختێك وەستا و خۆی هاویشتە سەر هەر دوو پێی) و بەردەوام بوو: – ئەوەیە کە پارچەیەك لە زەوی ئەڵمانیا چاك و پاك بکرێتەوە و ئاوەدان بێت و بنەماڵەیەکی ئەڵمانی لەوێ بژیت. تێدەگەی؟

خێرا وەڵامیم نەدایەوە. لە وشەی "بنەماڵە" سۆزێك هاتە ناو دڵمەوە. مەگەر بڕیار نەبوو زەوییەکە بەمن بسپێرێ؟

بێسەبرانە دووبارەی کردەوە: – تێدەگەی؟

وتم: – **یاوول، هێرئۆبێرست.**

- زۆر باشە. لە بەیانییەوە دەست بەکار دەبی. **گێئۆرگ**، پیاو و پێداویستییەکانت بۆ دابین دەکات. کەواتە کار تەواوە؟

- **یاوول، هێرئۆبێرست.**

- زۆر باشە. بەڵام لەبیرت بێت! لەو کاتەوە کە لەوێ مایەوە ئیتر یەك فلووست نادەمێ! تەنانەت ئەگەر لەبرسان بمری، دیسانیش تاکە فلووسێکت نادەمێ. هەر بەڵایەکی خراپتریشت بەسەر بێت، دیسانیش فلووسێکت نادەمێ!

ساڵێکی تەواوی کێشا هەتا توانیم ئەوکارەی قبووڵم کردووە بە ئەنجام بگەیەنم. تەنانەت لەناو ئەرتەش و سوپاش کارێکی ئاوا زەحمەت و سەختم نەدیتبوو. ژیانم لە بارودخێکدا تێپەڕی کە بڕوام بەم هەموو ئازارە

نەدەکرد. سەد رەحمەت بە حاڵ و بارودۆخی ناو کورلاند: پیاو خوو بە گەرما و سەرماوە دەگریٚ، خوو بە قوورِ وچڵپاو ناگریٚ!

بەندئاوی نفرەتی لەناوی بردین. هێشتا کونێکمان نەدەگرت، قەڵشێکی دیکـەی تێـدەبوو.تـازە لـە سـەرەتای مـانگی ئۆکتەبـەر گـەردەلول دوای گەردەلول هەڵدەستا و کۆتایی پێنەدەهات. بەیانی تا شەو، لە حاڵێکدا کە لە چۆك لەناو بەندئاو و لە چۆك بۆ سەریٚ لەژێر باران بووین، خەریکی کار و ئیشی بەردەوام بووین. تەنیا شەوەکان جەستەمان وشك دەبۆوە لەسەر خشتفەرشی ژوور لەناو کورتانی ئەسبەکان دەحەساینەوە. بانی ژورەکەم چـاك کردبـۆوە، بـەلاّم دووکەڵکێـشی ژوورەکـە ئەوەنـدە بـە خراپـی دووکەڵەکەی دەبردە دەرەوە کە ناچار بووین لەنێوان سەرما و خەفەبوونی نـاو دووکـەڵ یـەکێان هەڵبـژێرین. بەمحاڵەشـەوە بەندئاوەکـەمان چـاك کردەوە، هەرچـەند چاك کردنەوەکـەی ئاسـایی دیـار بـوو و دەبوایـە لـەوە بەدوا هەمیشە ئاگامان لێی بێت.

لەگـەڵ پیـاوە یارمەتیـدەرەکانیش گرفتمـان لـیٚ پەیـدا بـوو. گلایـە و گازندەیان لـە یـەکتر هـەبوو و کـاری یـەکتریان قبـووڵ نـەبوو. تکام لە **فون یەزریتس** کـرد بـۆ تـاقی کردنـەوەی یـەکێکیان بباتـەوە لای خـۆی و دوای ئـەوە ئـیتر هـیچ کێـشەیەکمان نـەما. کرێکارێکیـشیان بۆنـاردم کـە لـەویٚ تووشـی نەخۆشـی بەردی زراو هـات و ناچـار بـووم بینێرمـەوە. بۆخۆشـم نەخۆشی مالاریام گرت، بەلاّم بە کەمی و چەند رۆژێك کەوتم و نەمتوانی لە ئیش کردن بەردەوام بم. دووجاریش ئەوەنـدەی نـەمابوو لـەناو قوورِ و چڵپاودا بخنکێم. بەهـەرحاڵ ئەو رۆژە داهات کە لەدوای **فون یەزریتس** بنێرم کە بارودۆخی زەوییەکەی رێکوپێکە.

کاتێـك دەمویـست بـچمە ژووری کـاریی **فـون یـەزریتس**، تووشـی بابـە **ویلهلم** هاتم. بە دەست ئیشارەیەکی دۆستانەی پێکردم کە بەلامەوە سەیر بوو و لەبیرم چوو وەڵامی بدەمەوە. بابە **ویلهلم** یـەکێ لـە خـاوەن کارەکانی **فـون یـەزریتس** بـوو و خـاوەن کارەکـان هەمیـشە خۆیـان لـە کرێکـار و خزمـەتگوزار و کـارداری تەویلـەکان بـەجیا دەزانـی و تەنانـەت ئەوەنـدە زەحمەتیان بەخۆیان نەدەدا دوو وشە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە بدوێن.

**فون یەزریتس** لەناو کوورسیەکەیدا پاڵی دابۆوە و پیپە درێژەکەی لەناو دەسـتیدا بـوو و قاچە چەکمەپۆشـەکەی لەپێش خـۆی درێـژ کردبـوو. لای راسـتی، لەسـەر مێزێکـی بـچووك شـەش پـەرداخی گـەورەی بیرە و شـەش پێکی بچووکی پڕ لە **شپانس** چنرابوو.

- تەواو بوو **هێر ئۆبێرست**.

**فون یەزریتس** پێکێك شناپسی بە دەستی راست گرت و وتی: – **گوت!** هەستایە سەرپێ و پێکەکەی بۆلای من درێـژ کـرد. وتم: – "**دانکە شون، هێـر ئۆبێرسـت**". دانەیەکیـشی بۆخـۆی دەسـتدایە و یـەك قـم هەڵیـدا و پەرداخێك بیرەی هەڵگرت و ئەویشی بەدوایدا خستە خوارەوە.

**شپانس**ەکەی خۆم کە تەواو کرد، پێکەکەم لەسەر مێزە بچووکەکە دانا، بەڵام **فون یەزریتس** ئیتر بیرەی پێ نەدام. دەستێکی بە لێوەکانی داهێنا و وتی:

- کەواتە، کارەکەت تەواو کرد.
- **یا، هێر ئۆوبرست.**

چـاوێکی لێکـردم، رووخـساری پـڕ چرچولووچـی بـوو و حاڵـەتێکی فێڵزانانـەی بەخۆیـەوە گـرت و هـەر ئـەمجۆرەی کـە پـشتی دەسـتی لـەژێر چەنەگە درێژەکەی دەسووڕاند وتی:

- ناین، ناین، هێشتا بە تەواوی کۆتایی پێنەهاتووە، کارێکی دیکە ماوە کە دەبێ بەڕێوەی ببەی.

- کام کار، **هێرئۆبێرست؟**

چاوەکانی درەوشانەوە:

- کەواتە تۆ کۆتاییت پێهێنا. نیشتوار؟ ماڵ ئامادە کراوە و دەتوانی بچیتە ناوی؟

- **یا، هێرئۆبێرست.**

- ئەمجۆرە، هیچ شتێکت نییە، نە سفرەیەك، نە قاپ و قاچاخێك، دەتەوێ ئاوا بچیتە ناوی؟ گریێوت لەگەڵ دەکەم کە بیرت لەم شتانە نەکردبۆوە.

- **ناین، هێرئۆبێرست.**

- باشە، کەواتە دەبینی هێشتا تەواو نەبووە.

ژێر چەنەگەی خوراند و دەستی بە پێکەنین کرد:

- دەبێ بۆ کڕینی هەموو ئەوانە پارە بدەی. ڕەنگە پارەت هەبێ، **نیشت وار؟**

- **ناین، هێرئۆبێرست.**

بە سەیرەوە وتی: - **واس، واس؟** پارەت نییە؟ پارەت نییە؟ ئاوا کە نابێ دۆستی من، ئەمجۆرە کە هەر نابێ. بۆ کڕینی ئەشیا پێویستیت بە پارە هەیە.

- من کە پارەیەکم نییە، **هێر ئۆبێرست.**

دووبارە دەستی بە راوەشاندنی سەری کرد کە:

- نیتـە؟ **"شـادە شـادە"** (حـەیف – بەداخـەوە) نـەبوونی پـارە، یـانی نـەبوونی ئەشـیای مـاڵ و هـەر ئـاوا بـە ئاسـانی، نـەبوونی ئەشـیا یـانی نەبوونی زەوی و مەزرا!

سەیری منی کرد، چاو لێکردنەکەی جددیانە بوو و خۆم زۆر بـە دڵگرانـی هاتەبەرچاو.

- بەلامـەوە ئەوەنـدە سـەخت و دژوار نییـە کـە لـەناو جـل و کورتـانی ئەسبدا بخەوم، **هێر نۆبێرست.**

بەشێوەیەکی گاڵتەجارییەوە پێکەنی و وتی:

- یـانی کـە مـن، مقـەدەم **بـارون فـون یـەزریتس،** کەسـێکم، رێگـە بـدەم کرێچییەکەم لە جێگەیەکی خراپ بخەوێت. **ناین، ناین، ماین فوریند!** بێ ئەشیای ماڵەوە یانی ئیتر بیر لە مەزرا و زەوی مەکەوە، تەواو!

بە ناجسنییەوە سەیرێکی کردم و لە قسەکانی بەردەوام بوو کە:

- کەواتە دەبینی هێشتا ئیشەکە کۆتایی پێنەهاتووە، هێشتا ئیشێک ماوە کە دەبێ ئەنجامی بدەی.

- چ ئیشێک **هێرنۆبێرست؟**

خوار بۆوە و پێکێك **شناپس**ی هەڵگرت و یەك پێك هەڵیهاویشت، لەسـەر مێزەکـە دایـنایـەوە، پـەرداخێك بیرەشـی هـەڵگرت و بـەدوای ئـەودا ناردیـە خواری؟ دەنگێکی لەزمانی دەرهێنا و چاوەکانی بریقەیان هاتێ:

- زەماوەند بکەی.

بە دەنگی لەرزۆکەوە، بە تەتەپەتە وتم:

- بەڵام، **هێرنۆبێرست،** من هیچ حەزم لە ژن هێنان نییە.

رستەکەم تەواو نەکردبوو کە رووخساری گۆڕا و هاواری کرد:

- واس، حەزت لە ژن هێنان نییە؟ قەباعەتیش شتێکی باشە! حەز دەکەی کرێچی بی و ئەوکات ناتهەوێ ژن بێنی؟ وادەزانی بەرامبەر بە کێ وەستاوی؟

- "فرزای هونگ" (بمبوورە) هێرئۆبێرست، ئەمن هیچ حەزم لە ژن هێنان نییە!!!!

قیژاندی: – چی؟ (دەستەکانی بە ئاسمان بەرز کردەوە) ئەمجۆرە وەلام دانەوە و وتنی "نا"، ئەویش بەمن! بە مقەدەمێکی ئەلمانی و سەرووتر لە تۆ! بە من کە، تۆم لە قوور و چلپاو دەرهێناوە!

چاوەکانی بە توورەیی لەمن بری:

- لانیکەم بیر لەوە ناکەیەوە کە رۆژێك نەخۆش بکەوی؟

- ناین، هێرئۆبێرست.

- هێرگوت، ناکا تۆش وەکوو ئێمە بی؟ ... لەوشتە...

بە توندی وتم: – ناین، هێرئۆبێرست.

لەناکاو دەستی بە قیژاندن کرد: – ئەی چیتە، ئەی چیتە؟

وەلامم نەدایەوە. چاوێکی دوورودرێژی لێکردم ودوایی بە دەستەی پیپ پشتگوێی خوراند و وتی:

- کەواتە بارودۆخت ئاسایی و عاددیە، مەگەر نا؟

تەنیا سەیریم کرد؟

- مەبەستم ئەوەیە کە انشاالله خۆ یەختە نی؟ هەموو شتێکت لەسەر شوێنی خۆیەتی.

- هەلبەت، هێرئۆبێرست، هیچ عەیب و کەموکورییەکم نییە.

- دەتوانی مندالت ببێت، ئەویش بە زۆریی نیشت وار؟

- وابزانم دەتوانم، هێرئۆبێرست.

لەناکاو لە قاقای پێکەنینی دا:

- "وابزانم" یانی چی ها؟

دەست و پێی خۆم ون کردبوو و وتم:

- مەبەستم ئەوەیە کە هیچکات تاقیم نەکردووەتەوە کە ئایا دەتوانم ببم بە باوك یان نا، **هێرئۆبێرست**.

پیپەکەی بەرامبەر بە من گرت و پڕ بە دڵ پێکەنی.

- هەرچی نەبێ، خۆ وەکی دیکە تاقیت کردووەتەوە؟

- یا، **هێرئۆبێرست**.

قیژاندی: چی؟!

بـۆ ماوەیـەکی زۆر پێکـەنی. پێکەنینەکـەی ئـارام بـۆوە و دوابـەدوای پێکەنینەکـەی پێکێـك شـناپس و پـەرداخێك بـیرەی هەڵاویـشت، رەنـگ و رووی سوور هەڵگەڕا و بە چاوی درەوشاوە سەیری منی کرد و هاواری کرد:

- راوەستێ بزانم! دەبێ بۆم روون بکەیتەوە، وتت چەند جار؟

- دووجار، **هێرئۆبێرست**.

- هەردووجاریش لەگەڵ کەسێك؟

- ناین، **هێرئۆبێرست**.

بە ترسێکی ساختە پیپەکەی بۆلای ئاسمان بەرز کرد:

- ئەی وای! تۆ راستی راستی ئەو شتەی.... چی پێدەڵێن؟... باشە، ئەوەندە گرنگ نییە! ... وابزانم پێی دەڵێن "**دون ژوان**".... کە وتت لەگەڵ هـەر کامـەیان جارێك؟ جارێك! هاهاها.... بێـچارە ژنـەکان! چ بەڵایـەکیان بەسەرت هێناوە؟

بە منەمن و بە تەتەپەتە وتم:

- یەکەمیان زۆری دەوت. دووهەمیشیان خاوەن ماڵەکەم بوو.

فون یەزریتس کە دووبارە بە پەلە پێکەکەی پڕ دەکردەوە و پەرداخێك بیرەی هەڵدەدا، هاواری کرد: - سەیرە! ژنەتیوی خاوەن ماڵ؟ زۆر بەتامە! لانی کەم پێویستی بە لەدەرگالێدانی کەس ناکات و هەرکات ویستت لەژێر سەرتە!

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتم:

- دەی باشە. منیش رێك ترسم لەوە بوو. ترسم لەوە بوو کە ..... خووی پێوە بگریْ.

بەجۆرێك لە قاقای پێکەنینی دا وەکوو ئەوە دەچوو کە نایهەویْ هیچکات واز لە پێکەنینی بێنیْ؟ خۆم گرتەوە و وتم:

- هێرئۆبێرست، گوناه لە خۆم نییە کە گەرموگوڕ نیم.

سەیری منی کرد و واپێدەچوو شتێکی بەفکردا هاتبیْ. پێکەنینەکەی بڕی و بە رووخسارێکی رەزامەندانە وتی: -

ئاها، دەمویست ئەوە بڵێم: گەرم مەزاج و گەرموگووڕ نی. وشەکە ئەمەیە. لە "مێینە" روو وەردەگێڕی. بەڵیْ، زۆر ئەسبیشم بینیوە ئەمجۆرەن.

پاڵی بە ئاگردانەکە دا، پیپەکەی پێکرد و بە قەڵافەتێکی رەزامەندانە سەیری منی کرد و دوای کاتێکی کەم وتی: - بەم حاڵەشەوە نازانم بۆچی حەز ناکەی زەماوەند بکەی و ژن بێنی.

بە سەرلێشێواوی سەیریم کرد و وتم:

- ئاخر، هێرئۆبێرست، وابزانم.....

- ئەهاااااا! بێهۆ وادەزانی و شکت هەیە! کاتێك ژنێکت هێنا، لە ماوەی پێنج ساڵدا دەتوانی پێنج منداڵت بێت. نیشتمان هیچ شتێکی

جگە لەوە لە تۆ ناوێ! ناین، ناین، هیچکام لەم قسە قۆرانەی کە باست کردن نابێتە هۆی ئەوەی ژن نەهێنی.

بەم قسانەوە سەیری چاوەکانی منی کرد

رووم وەرگێڕا و وتم:

- ئەمە بیروڕایە. هێرئۆبێرست.

پیپەکەی بۆلای ئاسمان بەرز کرد و هاواری بەرز بۆوە کە:

- واس! بیروڕا! تازە ئاغا بۆ من بووەتە خاوەنی بیروڕا! باش گوێ بگرە! ئێستا کە باس لە بیروڕا دەکەی، منیش دوو بیروڕا دەخەمە ناو ئەم کەللە گەچ تێکراوەت: یەکەمیان ئەوەیە کە هەر ئەڵمانییەکی باش دەبێ تۆو تۆرەمەی هەبێ، دووهەمیشیان لە هەر زەوی و مڵکێکدا بوونی ژنێك پێویستە! "ستیم راتس" (راستە).

چونکە بینی من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە نەڕاندی: - ستیم راتس؟

- یاوول، هێرئۆبێرست!

لە راستیدا بەشێوەی گشتی حەق بەئەو بوو.

وەکوو ئەوەی کۆتایی بە گفتوگۆ و وتووێژەکە دێنی، وتی:

- زۆر باشە، کەواتە کێشە نەما.

بێدەنگییەك رووی دا، وتم:

- ئاخر، هێرئۆبێرست، تەنانەت ئەگەر دەمویست ژن بێنم، خۆتان کە دەزانن، لێرە من کەس ناناسم کە...

لەسەر کوورسییەکەی پاڵی دایەوە و لینگە درێژە چەکمەپۆشەکانی بۆ پێشەوە درێژ کرد: - غەمی ئەوە مەخۆ، بۆخم بیرم لەوەش کردووەتەوە.

واق مام. رووی لە لایەکی دیکە کرد و لە هەمانحاڵدا وتی: - بێشك وا بیر مەکەوە کە دەستی فلانە ژنە بگرم و بیهێنمە ناو مەزرا کە لە تۆی بێ ....

پیاوێکم بۆ دروست بکات کە ناچار بی خۆت لەناو کحولدا بخنکێنی و لێگەڕێی ئەسبەکانی منیش بتۆپن؟ .... خۆشت ئەوە باش دەزانی ئەمە مەحاڵە کە لە ژیاندا دەست لە کارێکی ئاوا بدەم.

سووتووی پیپەکەی لەناو ئاگردا تەکاند و سەری بەرز کردەوە:

- ئەو کچەی کە بۆتۆم دیاری کردووە، "**ئێلزی**"یە (Elsie).
- وە تەتە پەتە کەوتم و وتم: – **ئێلزی**؟ کچی بابە **ویلهلم**؟
- مەگەر **ئێلزی**یەکی دیکە لەم دەوروبەرە دەناسی؟
- بەڵام پێم وانییە ئەو منی بوێت **هێرئۆبێرست**!
- بێشك تۆی دەوێت.
- چاوەکانی ڕێککوشین و بە چاوێکی کڕیاری سەیری کردم و وتی:
- هەرچەند باڵای تۆ نەختێك لە باڵای ئەو کوورتترە. ئەوەش قسەیەکە. بەڵام ئەوەندەش ناحەز نی. چوار شانە و خڕ و پڕی... ئیٚ، هەڵبەت ئەو نەختێك بۆتۆ درێژە. بەڵام چ باشتر: تۆ بە سینگ و ژێرباڵی پڕت، ئەویش بە لینگی درێژەوە.... تۆ و تۆرەمەی ڕێکوپێکتان لیٚ وەپاش دەکەویٚ.... ئیٚ نەختێك بیری لێبکەوە!

دەستێکی بە چەنەگە درێژەکەی داهێنا وبەردەوام بوو:

- ... دوو نیژاد کە تێکەڵ دەبن، مرۆڤ هیچ نازانیٚ چی دێتە پێش. بۆنموونە هیچ سەیر نییە کە منداڵەکان تەنیا بەتۆ بچن و لە کۆتاییدا چییان لیٚ دەرچیٚ؟ .... سینگ و ژێرباڵی بەهێز، بەڵام قاچەکان کوورت، وەکوو مراوی!

دوایی، هەستایە سەرپیٚ و لە قسەکانی بەردەوام بوو کە:

- بەڵام باسەکە ئەمە نییە و لەمە رابوێریٚ بۆ ئیش کردن لەسەر زەوی دەست و پێی کوورت باشترە...نا، ئەو شتەی بە حسێب دێت نیژادە و

بەس. ئێوە هەر دووکتان ئەڵمانین و ئەڵمانی باشیش لە ئێوە دەبێت. تەنیا ئەمە گرنگە! هەر ئەوەندە ئسلاوە پیسانەمان بەسە کە لە "پومرانی"ن!

بێدەنگییەك ژوورەکەی داگرت و ڕێك وەستام، ئاوی دەمم قووت دا و وتم:

- لە ڕاستیدا، **هێرئۆبێرست**، من حەزم لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەری نییە.

بە دەمی کراوە سەیری کردم. دوایی دەمارەکانی ناوچاوانی ئەستوور بوون. نەختێك بەم شێوەیە مایەوە، بێ ئەوەی بتوانێ هیچ شتێ بڵێت و لەم کاتەدا چاوە شینە ترسناکەکانی لەمن بڕیبوو. ئەوکات لەناکاو نەڕاندی کە:

- دو، **گوتفردام تس ئارش لوخ**؟ (تۆ، نەنێر نەمێی نەعلەتی).

هەڕای کردە لام و یەقەی گرتم و شێتانە ڕایتلەکاندم.

دەیقیژاند:

- ئەشیای ماڵ، ئەشیای ماڵ، **ویلهلم**ی پیر ئەشیای ماڵیشت پێدەدات.

بەریدام. پیپەکەی هاویشتە سەر مێزەکە، دەستەکانی لەپشت سەریدا قفڵ کرد. دوایی گەڕایەوە لای من و هاواری کرد:

- "**دۆ! لومپ**" (تۆی بێ سەروپێ) من مەزرایەکت پێدەدەم، من کچێکت دەدەمێ! ئەوکاتە تۆ....

بەجۆرێك هاتەلام کە وامزانی ئێستا لێمدەدات. هاواری کرد:

- "**دۆ شواین**" (تۆی پەست) تۆ حەزت لە ژن هێنان نییە؟ ئەویش دوای ئەم هەموو چاکەیەی لەگەڵ تۆم کردوە؟

- هەڵبەت، **هێر ئۆبێرست**، من تا ماوم چاکەی تۆم لەبیر ناچێ!

قیژاندی: – بێدەنگ بە.

دوایی هێرشێکی دیکەی عەسەبی رایچڵەکاند و هەر ئەمجۆرەی کە لەملای ژوورەکە بۆ ئەملای ژوور هەنگاوی دەنایەوە و بە مست لە سینگی خۆ دەدا، بە پرتەپرت وتی: – ئەوەندە ..... غیر...ەت ....دەداتە... بەر.. .خۆی.... لەبەرچاوی ....ئەفس....مر.....یکی.....

گەیشتە کۆتایی ژوور، سووڕا و نەڕاندی: – ئەش....یای....ما...ڵت...

بۆلای من هات و مستێکی لەبەرچاوم جووڵاند و وتی: – دەستێك تەختی خەوتن لە دار بەلووت، مێزێکی ژووری خواردن، کەوەنتەرێکی سپی، شەش کورسی حەسیری، چوار جووت مەلافە..... گوێت لێیە؟

مەلافە! ئەتۆ کە بە هەموو تەمەنت چەند قووماش نەبێ نەتبووە. هیچ نەبێ لەسەر یەك دەبێتە شەش سەد مارك! ئەوکات کچێکیش سەرانە! بەڵام تۆ...! حەقت ئەوەیە لێت بدەم و بە شەق لەم دەرگایە بتنێرمە دەرێ. چ "ئێس ئا بێ چ ئێس ئا نەبێ"! هەر بۆ ئەوە دەبی لە کووچە و کۆڵانەکاندا بتۆپی! وەکوو بەرەڵلایەکان بژی! تێدەگەی، تێتهەڵدەدەم!

سەیرێکی ترسناکی لێکردم. وەکوو رۆژ بۆ من روونە کە ئەوەی دەیهەوێ دەبێ ئاوا بێ و چۆکەکانم وەلەرزین کەوتن.

هەر ئەمجۆرەی کە سەیری دەکردم وتی:

- "دا شلاگ دوخ ئاینر" ( پیاو بە دانیشتنەوەش ئەگەری کەوتنی هەیە) سەیریکە دەستی رەت لەسینگی ئێلزی دەدات. جانوولەیەکی بەو جوانی و خاوێنە! بارکێشێك کە دەتوانێ بەقەدەر دوو پیاو ئیش بکات!... تازە، جگە لەمە ئەشیای ماڵیشت پێدەدەم! تۆ وەکوو باوکی ئەوی! دەی باشە ئیتر، هەمووتان بەیەك دەچن! بە من بڵێ کە بۆ وەرگرتنی رەزامەندی باوکی ناچار بووم تێروپڕ لێیدەم... هێرگوت! مەزرایەکی ئاوا رێك و

پێکم بۆ پێکهێناوی کە بەقەدەر مووچەی سێ کرێکاری باش بۆ ماوەی ساڵێك لێی سەرف کراوە. تازە باسی ئەشیا و کەرەستەی بەکارهاتوو ناکەم. ... نامەوێ باسی ئەو فیداکاریانە بکەم کە بۆتۆ کردوومە. "**شواینهوند**" (سەگی پیس)! مەزرایەکە بەتۆ دەدەم، ئەم هەموو ئەشیا و کەرەسەی ماڵت دەدەمێ و تۆی حەرامزادەش رەتیان دەکەیتەوە؟

لەناکاو ئارام بۆوە و بە دەنگێکی وشك وتی:

- هیچ تێناگەم، هەر هیچ پێویست بەوە ناکا یەك و دووت لەگەڵ بڵێم.

دوو هەنگاو چووە پشتەوە، باڵای راست راگرت و دەنگی وەکوو قامچی دای بە گوێما: – **ئونتە روفیت زیر!**

سەربازانە راست راوەستام و وتم: – **یاوول، هێرئۆبێرست.**

- دەبێ ئەوەت لەبیر بێت کە سەربازێك دەبێ بۆ ژنهێنان ئیزن لە فەرماندەکەی وەربگرێت.

- **یا، هێرئۆبێرست.**

بە دەنگێکی هێواش و لەسەرەخۆ وتی:

- "**ئونتە روفیت زیر**"! من رێگەت پێدەدەم لەگەڵ "**ئێلزی بروکر**" ژیانی هاوسەری پێکبێنی. (بە دەنگێکی بروسکئاسا بەردەوام بوو) ئەوەش بزانە کە ئەمە ئەمرێکی سەرووی خۆتە!

دوایی پشتی تێکردم، دەرگایەیکی بچووکی کردەوە کە لەلای ئاگردانەکە بوو و بانگی کرد:

- **ئێلزی، ئێلزی!**

وتم: – ئاخر، **هێرئۆبێرست...**

گەڕایەوە و نیگایەکی توندی تێبڕیم: ئەو چاوانە چاوی باوك بوون. شتێك ئەوکمی گرت و ئیتر نەمتوانی هیچ شتێ بڵێم.

ئێلزی هاتە ژوورێ. فون یەزریتس زلەیەکی سەبری لە سمتەکانی دا و بێ ئەوەی رووی وەرگێڕێت چووە دەرەوە.

ئێلزی بەسەر سلاوێکی لێکردم، بەلام دەستی نەهێنایە پێشەوە. راست و بێ جووڵە لە تەنیشت ئاگردانەکە وەستا. نەختێك کە تێپەڕی سەری بەرز کردەوە و سەیری منی کرد، خۆم پێ کەم و بچووك هاتەبەرچاو.

بێدەنگییەکی زۆر لە ژوورەکە حاکم بوو.

وتم: – ئێلزی.... دەتوانم بە ئێلزی بانگت بکەم.

- هەڵبەت.

بینیم نەختێك سینگی بەرز بۆوە. دەست و پێی خۆم ون کرد و سەیری ئاگرم کرد: – ئێلزی دەمهەوێ بڵێم کە... ئەگەر کەسێکی دیکەت خۆش دەوێ پێویست بەوە ناکا بەڵێنمان بدەیتێ.

وتی: – ئێرە خۆ کەسی دیکەی لێ نییە (دوایی کە بینی من هیچ ناڵێم، بەردەوام بوو) تازە وا بیر بکەینەوە کە نەختێك دوور لە خەڵك ژیاوم و گێلەکەمە.

نەختێك جوولایەوە.

وتم: – شتێکی دیکە.... ئەگەر منت خۆش ناوێ و بە کەسێکی باشم نازانی، دیسانیش وا باشترە بەڵینمان نەدەیەی.

- من کە تۆم پێ خراپ نییە.

سەرم بەرز کردەوە. نەدەکرا هیچ لە رووخساری تێبگەی. سەرلەنوێ سەیری ئاگرم کرد و بە شەرمەزارییەوە وتم: – من نەختێك وردیلەم.

بە توندی وتی: – ئەم شتانە بەلامەوە گرن نییە. بێشك ئەو کارانەی لەوێ کردووتن زۆر چاوگر و گرنگن. مەبەستم سەر مەزرایە.

شەپۆلێك لە متمانە و بڕوا بەخۆبوون دایگرتم. "کچێکی ئەڵمانی" بوو، "کچێکی ئەڵمانی ڕاستەقینە" باڵابەرز و ورەبەرز و بە متمانە. بۆ قسە کردن چاوەڕوان مایەوە و دووبارە من شتێ بڵێم.

وتم: – متمانەت بە خۆت هەیە کە منت ناخۆش ناوێ؟

ڕاست و بێ پێچ و پەناو وتی: – نا، نەخێر. هیچ ناخۆشم ناوێی.

ئاگرەکانم سەیر دەکرد و ئیتر نەمدەتوانی هیچ بڵێم و لەناکاو شتێکم بە مێشکدا هات کە "ئەگەر بمهەوێ هی خۆمە" و هەرچی ویستم نەمتوانی ئەوە بزانم کە خۆشیم لێی دێت یان نا، سەرم بەرز کردەوە و سەیریم کرد. ئارام، بێ ئەوەی چاو لێکبنێ سەیری دەکردم. کەللەم لەکار کەوتبوو. ئەوکات بێ ئیرادە دەستم درێژ کرد و داوە پرچێکی زەرد کە لە تەنیشت گوێی هاتبووە خوار، بۆ شوێنی خۆی گەڕاندمەوە. زەردەیەکی هاتێ و سەری خوار کردەوە و ڕوومەتی بە دەستی من وەنووساند.

ئەوەندەم زانی ئەوەی دەبوایە ببێت، ئیتر ڕوویدا.

ساڵی یەکەمی ژیان لە کێڵگە و سەرزەوی وەکوو شیشێك تێپەڕی کە لە کەباب بگووزەرێ! ئەگەر ئەم بڕە پارەیەی کە لە لایەن پووری بە "ئێلزی" نەگەیشتبا، پێمواندبوو بتوانین لەوێ بمێنینەوە. بەمحاڵەشەوە، شەش مانگ تێنەپەڕیبوو کە ناچار بووم فاتیحەی دارستانەکە بخوێنتم.

کەواندنی دارەکانی دارستان بەم زوویە، بۆ ئێمە حوکمی لەت لەت بوونی جەرگمانی هەبوو. چونکە بەمکارە ئەوەندە پاشکەوتەی هەمانبوو لەدەست ڕۆیشت.

بەڵام نیگەرانیی گەورەمان بێ پارەیی نەبوو. ژیانی ناو مەزرا و کێڵگە، هەروەها خوودی مەزرا و ژیانی ئێمەی ژن و مێرد، بەستە بە بەندئاوەکە هەبوو و ئاگاداریی کردن لە بەندئاوەکە مانای ڕکابەری بۆ مانەوە هەیە.

هەر کە باران نەختێك بەردەوام دەبوو، ئێمە بە نیگەرانییەوە سەیری یەکترمان دەکرد. ئەگەر شەو و نیوەشەو گەردەلوولێك بهاتبایە، ناچار بووم هەستمە سەرپێ و چەکمەکان لەپێ بکەم و فانۆس هەڵگرم و بڕۆمە لای بەنداوەکە و بزانم بارودۆخەکە چۆنە.

جاری وابوو ڕێك لەکاتی خۆیدا دەگەیشتمێ، دوو سێ کاتژمێر لەناو ئاو و چڵ و چڵپاو دەخولامەوە و هەوڵم دەدا بە هەرچی لەبەردەستم دایە پێش لە رووماڵی ئاوەکە بگرم. یەك دووجار کە نەمتوانی بە تەنیا پێش لە لافاوەکە بگرم، ناچار دەهاتمەوە ماڵ و یارمەتیم لە "ئێلزی" وەردەگرت. لەگەڵ ئەوەی دووگیان بوو لە تەختەکە دەهاتەخوار و لەگەڵم دەکەوت و بێ ئەوەی بچووکترین نارەحەتی لەخۆی نیشان بدات هەتا بەیان و ئەوکاتەی کە باران دەوەستا، شان بە شانی من کاری دەکرد و ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدەهات توانای ئەوەمان نەدەبوو خۆمان لە قووڕ و چڵپاو بێنینە دەرێ بۆ ئەوەی بێینەوە ماڵ و لەبەر ئاگر خۆمان وشك بکەینەوە.

بەهار، "**فون یەزریتس**" سەردانێکی کردین. لەبارەی ئەسپ و مەزرا هیچی نەدۆزییەوە کە پەنجەی لەسەر دابنێ. دوای ئەوەی بە دەعوەتی ئێمە هات و دانیشت و پەرداخێك بیرەی لەگەڵ ئێمە خواردەوە پرسیاری لێکردم حەز دەکەم ئەندامێتی "بۆند دێر ئاتامانن" (Bund der Atamanen) وەربگرم یان نا؟ هەروەها شی کردەوە بزواتێکی سیاسییە کە لە بواری نوێ کردنەوە و پاکسازی و چاکسازی کشت و کاڵ و جووتیاریی ئەڵمانیا چالاکی هەیە.

لە راستیدا پێشتریش وشەی بۆندم بیستبوو و دروشمەکە یانی "بلوت، بۆدێن، ئوند، شوێرت"[30] وەکوو کورتکراوەیکی ئایدیالی ئەو ئایینانەی خستبووە ژێر کاریگەری کە عافییەتی ئەڵمانیا وابەستە بەوانە. لەگەڵ ئەوەش وەڵامی "فون یەزریتس"م دایەوە کە ئەندامی حزبی ناشنالْ سۆشیالیستم و نازانم کە دەتوانم ئەندامێتی بۆند وەربگرم یان نا.

ئەوەی کە گوێ لێبوو دەستی بە پێکەنین کرد. مقەدەم سەرانی ئێس. ئای ناوچەکەی یەکە بە یەکە دەناسی و ئەگەر دەیوت حزب رێگە دەدات، ئەوا قسەکانیم قبووڵ بوو. لەوە بگوزەرێ، ئەمەشەم دەزانی کە خۆی ئەندامی حزبە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامێتی بۆند کارێکی باش بوو، چونکە جووتیاران هێشتا لە ئەندامبوونیان لەناو حزبێکدا دوودڵ بوون. لە کاتێکدا بەنسبەت کۆبوونەوەکانی مێژوویی کە بە وشەی "بۆند" (رێکخراوە) دەهات، حەساسیەتیان نیشان دەدا.

بەم شێوەیە منیش قبووڵم کرد و ئەوەندە پێنەچوو کە فون یەزریتس داوای لەمن کرد بەرپۆەبەرایەتی "رێکخراوی جوتیاری" گوند بەئەستۆوە بگرم. چونکە وەرگرتنی ئەم بەرپرسایەتیە لەلایەن ئەندامێکی بۆند گرنگ بوو. تەنانەت بە مێشکیشمدا نەهات کە ئەم بەرپرسایەتییە وەرنەگرم و رەتی بکەمەوە. چونکە ئەو ئەم متمانەیەی پێدام کە بۆ چالاکیی سیاسیی لەناو لاوەکان لەسەر من حسێبی کردووە و تێم رادەبینێت. لە لایەکی دیکەوە شێوەکاری من وەکوو پلەدارێکی پێشووی سوپای ئازاد بۆ ئەو لە هەمو شتێك گرنگتر بوو.

---

30 - (Blut, Boden und schwert) (خوێن، خاك و شەمشێر)

هاوین داهات و کەش و هەوا باش بوو. بەندئاوەکە وازی لە ئەزیەت و ئازاردانمان هێنا و توانیم کاتێکی زیاتر بۆ ئەرکی نوێم دابنێم.
گروپێکی بچووك لەوانە لە گوند بوون کە دژایەتیان دەکرین کە سەرەتا هەرچی دەمانڕست دەیانکردەوە بە خووری. بەڵام کاتێك من توانیم گروپێك لاوی نەترسی بێ مێشك لە دەوری خۆم کۆ بکەمەوە، شێوەی "زەربە لێدان"م بەرامبەر بە ئەوان بەکار هێنا کە لە حزب و لە سوپای ئازاد فێری ببوم و دوای چەند زەربەی گیانانە و بەدوای یەکدا دژایەتیان بوو بە نان و سەگ خۆرم کردن. ئەوکاتە بوو کە بە حەزی خۆم توانیم ئامانجەکانی سیاسی بە گوێی لاوەکان بگەیەنم. دوایی توانیم بە هەڵبژاردنی چەند کەس لەنێوان ئەوان گروپێکی باشی سوارکاریم پێکبێنم کە ئەم هەلەی بۆ من دەرەخساند هەرکات لە گوندەکانی دیکە کێشەیەك بۆ بۆند بهاتبایە پێش، ئەوا خێرا خۆم دەگەیاندێ و تێکەڵاوی کێشەکە دەبووم. لە ئەنجامدا، ئەم سوارکارانە بەجۆرێك راهێنران کە بۆ شەڕێکی گەورە تەنیا پێویستیان بە چەك و تفەنگ هەبوو. لەگەڵ ئەوەش من متمانەم بەوە هەبوو کە ئەم تفەنگانە لە شوێنێك بوونیان هەیە و هەر ئەوەیکە "سپێدەی ئەڵمانیا" سەر دەربێنێ، ئەوا حەسرەتی هەبوونیانمان نامێنێ.
قوورسایی " ئێلزی"ی زۆر ماندوو دەکرد. بۆ ئەوەی بە ئیشەکانی رابگات لەڕاستیدا خۆی رادەکێشا. رووخساری لەبەریەك دەچوو و بە هنە هنە دەکەوت.
شەوێکی دوای خواردنی نان لەپێش ئاگردانی ژووری چێشتخانە دانیشتبووم و پیپەکەم پڕ دەکردەوە (ئەوەندە نەبوو کە دەستم بە کێشانی پیپ کردبوو.) ئەویش لە تەنیشت من لەسەر کوورسییەکی

کـوورت دانیـشتبوو و شـتێکی دەچـنی کـە، لـەناکاو سـەری لـەناو دەستەکانیدا شاردەوە و هق هق دەستی بە گریان کرد.

بە لەسەرەخۆیی و سۆزەوە وتم:

- زۆر باشە، ئێلزی؟

هـق هقـی دووبەرامبـەر بـوو، هەسـتام و ئاگرێکم خستە سەر توتنەکەم. پیپ کە داگیرسا بە هێوری لەپێش ئاگردانەکە جوولاندم بۆئەوەی پۆلـووە ئاگرەکە بکەوێ.

گریانی ئێلزی وەستا. گەڕامەوە سەر جێگەم و چاوێکم لێی کرد. گۆنـای وشـك کـردەوە و دەسـرەکەی کـۆ کـردەوە و خـستیە نـاو پێـشبەندەکەی و خەریکی چنینەکەی بوو.

بە سۆزەوە وتم: - ئێلزی.

چاوەکانی لەمن بڕی.

- پێم نالێی چیتە؟

- ئۆە، هیچم نییە.

بێ ئەوەیکە هیچ شتێك بڵێم، سەیرم کرد. دووبارە وتی: - هیچم نییە.

بەڵام دەمزانی هەر ئێستایە و دەست بـە گریـان دەکاتـەوە. هـەر ئەمجۆرە سەیریم کرد و زانی کە چاوەڕێی وەڵامـی ئـەوم، چونکە دوای نـەختێك بـێ ئەوەی سەری هەڵبێنێ یان واز لە چنین بێنی وتی:

- وابزانم تۆ هیچ لە من رازی نی. تەنیا ئەوە.

بـە تونـدی وتم: - ئـاخر ئەوە چجۆرە بیر کردنەوەیەکە ئێلزی! بۆخـۆت باش دەزانی هیچ هۆیەکی نییە من تۆ سەرزنشت بکەم.

وەکـوو منـداڵان لـووتی هەڵکێـشایەوە و دوایـە دەسـرەکەی لـە بـەرکی پێشبەندەکەی دەرهێنا و فینی کرد و وتی:

- ئۆه، سەبارەت بە ئیش، خۆم دەزانم هەر کارێکی لەتوانام بێت ئەوا بەڕێوەی دەبەم. بەڵام مەبەستم ئەوە نەبوو.

ئەوەندە وەستام هەتا خۆی وەقسە هات. بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە وتی:

- تۆ زۆر لە من دووری.

هەر ئەمجۆرە سەیریم کرد تا ئەوەی سەری بەرز کرد و چاوی لە چاوم بڕی.

- دەتهەوێ چی بڵێی " ئێلزی"؟

- تۆ ئەوەندە بێدەنگی ڕۆدۆلف کە....

قسەکەیم هەڵسەنگاند و وتم:

- ئاخر ئەتۆش کە زۆربڵێ نی و بە کەمی دەدوێی، ئێلزی.

ئەو شتەی دەیچنی لەسەر چۆکی دانا، پاڵی دایەوە کوورسییەکەی و جەستەی هێنایە پێش بۆ ئەوەی سکی ئازاری نەدات و وتی:

- من سەیری تۆ دەکەم، کە بێدەنگم دەبینم تۆ هیچ قسە ناکەی.

بە میهێرەبانییەوە وتم:

- من زۆر چەنەباز نیم، تەنیا ئەوە.

بێدەنگییەك پەیدابوو و ئەو وتی:

- ئاخ ڕۆدۆلف، مەبادا وا بیر بکەیەوە گلەییم لێتە، تەنیا چونکە پرسیت ویستم هۆیەکە بزانی.

لە سەیر کردنەکەی دەست و پێی خۆمم ون کرد. سەرم دانواند و چاوم بڕیە پیپەکەم.

- ئێ، هۆیەکەی بڵێ، ئێلزی.

وتی: – راستییەکەی، ئەوەندەش سەبارەت بە قسە نەکردنت نییە، **رۆدۆلف**....

نەختێك وەستا. هەناسەی بەرزیم بیست. بە هەیەجانەوە لە قسەکانی بەردەوام بوو کە:

- خوا دەزانێ کە چەندە دووری، **رۆدۆلف!** جاریوایە لە پشت مێز دانیشتووی و بەجۆرێك بە چاوی ساردەوە سەیری بۆشایی دەکەی کە وابیر دەکەمەوە بۆتۆ گرنگ نیم.

"چاوە ساردەکانم" .... **شرادریش** چەند جارێك باسی چاوی ساردی منی کردبوو. بە هەوڵێکی زۆرەوە وتم: – سرووشتم ئەمجۆرەیە.

وەکوو ئەوەی گوێی لە دەنگی من نەبووبێت: – ئاخ، **رۆدۆلف!** ئەگەر دەتزانی هەستی ئەوەیکە لە تۆ جیام چەندە بۆ من مەترسیدارە! تەنیا بەنداو و ئەسبەکان و مەزرا و مڵك گرنگە. جاریوایە کە دەچیتە تەویلە و لای ئەسبەکان دەمێنییەوە بەجۆرێك بەحەزەوە سەیریان دەکەی کە وابیر دەکەمەوە تەنیا ئەوانن کە تۆ خۆشت دەوێن و عاشقیانی.

زۆریم لەخۆم کرد کە پێبکەنم: – ئۆە، واز بێنە بابە، ئەو قسە گێلانەیە چییە کە تۆ دەیانکەی؟ بێشك تۆم خۆش دەوێ، تۆ ژنی منی.

سەیری منی کرد. چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون: – راستی منت خۆش دەوێ؟

- دەی، هەڵبەت کە خۆشم دەوێی **ئێلزی**، ئەوە سرووشتییە.

بە سەیرەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر سەیری کردم، لەناکاو خۆی بە ملمەوە کرد و روومەتی ماچباران کردم. لێیگەڕام هەرچی حەزی لێیە بیکات، دوایی سەریم لەسەر سینگم دانا و دەستم بە پرچی داهێنا. بێ ئەوەی

بجووڵێ، خۆی بەمنەوە وەنوساندبوو. بەڵام دوای ماوەیەکی کوورت کە وەخۆم هاتمەوە بینیم تەنیا ئەو شتەی بیری لێ ناکەمەوە ئەو بوو.

کەمێك لە لەدایکبوونی کوورەکەم تێپەڕیبوو کە رۆژێك سەرو گوێلاکی کاردارێکی **فون یەزریتس** بە ئەسبەوە پەیدا بوو و هەواڵی ئەوەی هێنا کە ئەربابەکەی خێرا منی ویستووە. ماینەکەم زین کرد و رۆیشتم. ئەو ماینە زۆر بەخێرایی غاری دەبرد. دە کیلۆمەتری هەتا ئیلخیم خێرا بڕی و لەدەرگای ئیشی **فون یەزرییس**م دا و دەنگی مقدەم بەرز بۆوە کە "وەرە ژووری! و چوومە ژووری.

دووکەڵی توندی جگەرەی بەرگ ئەوکمی گرت و بە زەحمەت توانیم ئەو دە کەسە ببینم کە لە دەوری مێزی **فون یەزریتس**ن. دەوری کەسێك بە ئۆنیفۆرمی "**ئێس. ئێس**"یان دابوو. ("ئێس. ئێس" پۆلیسی ئەمنییەتی ئەڵمانیای هیتلێر).

دەرگام بەست و رێك وەستام و سلاوی سەربازیم دا.

**فون یەزریتس** وتی: — لێرە دانیشە.

ئیشارەی بە کورسییەکی پشت خۆی کرد.

دانیشتم. گفتوگۆ و وتووێژەوکان دەستیان پێکردەوە. سەیرێکی پیاوەکانی ئامادەبووم کرد هەموویانم ناسییەوە. خاوەن مڵکی ئەو دەوروبەرە بوون و هەموویان ئەندامی **بۆند** بوون. بەڵام ئەو ئەفسەرەی "**ئێس. ئێس**" کە قەڵافەتی مقەدەم لێیدەشاردمەوە و نەمدەوێرا بۆ دیتنی خوار ببمەوە، تەنیا دەستیم دەبینی بچووك و گۆشتن لەسەر مێزەکە، بەردەوام لە هاتووچۆدا بوون و دەکەوتنە سەر یەك.

خاوەن مڵکێك راپۆرتێکی سەبارەت بە پێشکەوتنی **بۆند** پێشکەش کرد و باسی ژماری باوەڕپێکراوی ئەندامانی کرد. راپۆرتەکەی ئەو کە تەواو

بـوو، وتوویـژێکی گـەرموگووڕ دەسـتی پێکـرد. دوایـی دەسـتە بـچکۆڵە گۆشـتنەکە لـە مێزەکـەی دا و بێـدەنگی بەرقـەرار بـوو و زانـیم کـە ئێـستا "ئێس. ئێس"ەکە قسە دەکات.

دەنگی خەفە و بێ ئاهەنگ بوو. بەڵام زۆر ئاسایی قسەی دەکرد. بێ هیچ جـۆرە دوودڵییـەك و بـێ وەسـتان. رێـك وەکـوو ئـەوەی لـە رووی کتێبێـك بخوێنێتەوە. ئامـاژەی بە بـارودۆخی سیاسیی وڵات کـرد. باسـی بـەخت و شانسەکانی حزبـی کـرد بـۆ گەیشتن بـە دەسـەڵات و داوای لـە ئەنـدامانی بۆنـد کـرد کـە بەرژەوەنـدی تایبـەتی ناوچـە و بەرژەوەنـدی کەسـیی لـەبیر بکەن بۆ ئـەوەی بتـوانن زیـاتر لـە جـاران چالاکیان لەگـەڵ سـەرانی ناشـنال سۆشیالیـــست هـــەبێت. دوای ئـــەوە وتوویـــژێکی کـــەم کـــرا و دوایـــی بەشداربووانی کۆبوونەوەکە هەستانەسەرپێ و لەناکاو غڵبە غڵـب و دەنگە دەنگ دەستی پێکرد و بوو بە بازاڕی شام.

فون یەزریتس بە منی وت: – لێرە بمێنەوە ئیشم پێتە.

بە چاو بەدوای "ئێس. ئێس" دەگەڕام لەکاتێکدا هەندێ لە مڵکدارەکانی ئـەم دەرڤـەرە دەورەیـان دابـوو، بـۆ لای دەرگـا دەچـوو. جارێـك کـە سـەری سووڕاندەوە بینیم چاویلکەیەکی پەنسی بەچاوەوەیە.

فون یەزریتس وتی کۆلکەیەك لە ئاگر باوێم و بەقسەیم کرد.

دەرگا دەنگی هات و بێدەنگی ژوورەکەی پڕ کرد و سەرم کە بەرز کردەوە ئەفسەری "ئێس. ئێس"م بینی کە بۆلای من دێت. گەڵای بەلووتم لەسەر یەقەی بینی و ناسیمەوە. "هیملێر"[(٣١)] بوو. پانییەکانم لێکدا و قوڵم بەرز کردەوە. دڵم بەخێرایی لێیدەدا.

---

31 - HENRICH HIMMLER، خاوەن جووجەخانەیەك کە بە چاویلکە پەنسییەکەی وەکوو بەڕێوەبەری قوتابخانە دەچوو و لە قوتابخانەی هونەری هوخ شەلەی مونیخ دیبلۆمی کشت و کاڵی وەرگرت.

**فون یەزریتس وتی: – ئەوە "لانگ"ە.**

ئارام ئارام گاردی (پاسەوان)ی تایبەتی هیتلێر – یان ڕەشپۆشەکانی "ئێس. ئێس"ی پێکدەهێنا، ئەو لەژێر دەستی "روهم" فەرماندەی گشتی "ئێس. ئا" و "ئێس. ئێس"دا کاری دەکرد و لە دەرەوەی شوێنی لەدایک بوونی کرا بە بەڕێوەبەری گشتاپۆی پروس و خێرا پۆلیسی مەترسیداری پێکهێنا کە لەژێر چاودێری ئەودا بن. هەر لەم ساڵەدا دوای ئەوەی توانی ڕەزامەندی هیتلێر پێکبێنێ کە روهم دەیهەوێ دژ بەئەو پلان بگێڕێت و دەیهەوێ کودەتا بکات، فەرمانی لە هیتلێر وەرگرت کە سەرکووتیان بکات و زیاتر لە دەهەزار کەسیان لێ بکووژێت. بەم شێوەیە توانی پۆلیسێکی ترسناك پێکبێنێ. ژێردەستانی ئەو بەجۆرێك ترسیان خستبووە ناو دڵی خەڵك، بە تایبەت جوولەکەکان کە بۆ نموونە لەکاتی شەڕ زیاتر لە سەد هەزار لە سەرمایەدارترین جوولەکەکانی ڤیەنا هەموو سەروەت و سامانی خۆیان پێبەخشیهەتا تەنیا ماڵ و منداڵی خۆیان بۆ وڵاتێکی دیکە بگوازنەوە. دەزگای ترسناکی هیملێر بە جێگرایەتی "هایدریش" و "ئایشمن" بوو بە ڕێکخراوێك کە ئەرکیان لەناو بردنی میلیۆنەها مرۆڤ بوو. ئەم بەدناوە کە بوو بە خاوەن دەسەڵاتی کوشتن و ژیانی هەشتا ملیۆن ئەڵمانی و دوو بەرامبەر خەڵکی دیکە، لەساڵی ١٩٤٣ لە خیتابەیەکی سیری و مەحرەمانەدا بە ئەفسەرانی خۆی وت: "ئەوەی بەسەر رووسییەك یان چەکسلوڤاکییەك دێت، بەهیچ شێوەیەك بۆمن گرنگ نییە. ئەوەیکە دەهەزار ژنی رووسی لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکی دژە دەبابە لە ماندوویان بمرن، تەنیا ئەوەندە بەلامەوە گرنگە کە خەندەکی دژە دەبابە بۆ ئەڵمانیا کۆتایی پێهاتبێ!" – هیملێر، لە شەوی خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا لە ڕێنس، لە حکوومەت درکرا، چونکە

دەریاسالار دونیتس "جێگری پێشەوا" وایدەزانی دوورخستنەوەی ئەو دەتوانێ ڕەزامەندی هاوپەیمانان پێکبێنێ! ... هیملێر هەتا ۲۱ی مانگی مەی ١٩٤٥ لە ناوچەی فلنسبۆرگ سەرگەردان بوو و لەم ڕۆژەدا، لەکاتێکدا سمێڵی خۆی تاشیبوو و قوماشێکی ڕەشی بەچاوی خۆیەوە نابوو و ئۆنیفۆرمێکی سەربازی ئاسایی لەبەر بوو، لەگەڵ یازدە کەس لە ئەفسەرەکانی "ئێس. ئێس" بەڕێکەوت هەتا لە بەرەی شەڕی ئەمریکا و ئینگلتەرا بگوزەرێ و خۆی بە شوێنی لەدایک بوونی خۆی بگەیەنێ. بەڵام لەنێوان هامبورگ و بێرمرهاون لە پازگایەکی ئینگلتەرا ڕێگەیان لێگیرا. ئەویان ناسییەوە و لەگەڵ ئەوەی رووتیان کردەوە نەوەکوو ژەهێرێکی پێبێت، هەربۆیەش زۆر بەجوانی گەڕایان و پشکنیان، بەڵام توانی کەپسولێکی سیانوور لەژێر پووکیدا بشارێتەوە. بەڵام لە ڕۆژی ۲۳ی مەی کە ئەفسەرێکی ئینگلیزی ئەمری بە پزیشکێکی خۆیان کرد ناو دەمی بگەڕێت، هیملێر توانی کەپسوولەکە بە ددانی خۆی بشکێنێت و لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵە بۆ نەمردنی، لەماوەی ۱۲ خوولەکدا خۆی کووشت و بەم شێوەیە خۆی لە سێدارەدانی سزا و تاوان ڕزگار کرد.

هیملێر وەڵامی سڵاوی منی دایەوە. دوایی کۆتە چەرمییە ڕەشەکەی کە لەسەر کوورسییەکە بوو، هەڵیگرت و لەبەری کرد. قوبچەکانی بەرێکی بەست. یەك بە یەك هەتا دوایین قوبچە. ناوقەدبەندەکەی ڕێك کرد و پەنجەوانە ڕەشەکانی پۆشی. ڕووی لەمن کرد و سەری بەلامەوە خوار کردەوە و سەیری کردم. هیچ شتێکی لێ تێنەگەیشتم.

وتی: – تۆ لە سێدارەدانی "کادوو" (KADWE) بەشدار بووی، وایە.

یاوول، هێر...

بەپەلە وتی: — پلەی من مەڵێ و دوایی بەردەوام بوو — پێنج ساڵ لە زیندانی داخاو زیندانی بووی؟

- یا.
- پێش ئەویش لە تورکیا بووی؟
- یا.
- باوکیشت کە نییە؟
- نەخێر....
- بەڵام دوو خوشکت هەیە کە مێردیان کردووە؟

نەختێك دوودڵ مامەوە و وتم: — ئاگام لە مێرد کردنیان نییە.

فون یەزریتس، بە پێکەنینەوە وتی: — ها! ها! حزب ئاگای لە هەموو شتێ هەیە!

بێ ئەوەی پێکەنینی پێوەدیار بێ یان تۆزقاڵێك سەری بجووڵێنێ بەردەوام بوو کە: — کەواتە خۆشحاڵم پێت بڵێم هەردوو خوشکت شوویان کردووە و دوایی وتی:

- ئێوە لە گروپی خۆتاندا دەستەیەکی چریکی بۆندتان پێکهێناوە....
- یاوول.
- ئەوە... زۆر...( بێ ئەوەی هۆیەکی هەبێ نەختێك وەستا) ئەوە بیرۆکەیەکی زۆر باشە. پێشنیارت پێدەدەم کە چالاکیت لەم بوارەدا زیاتر بکە و هەر لە ئێستەوە ئەم ئەرکەت پێدەسپێرم کە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرانی بۆند و حزب، ئەسواران (سوارکاری شەڕ) پێکبێنن.

لەحاڵی قسەکردندا، سەیری سەرووی منی کرد و وام هەست کرد کە ئەوشتەی پێم دەڵێت ئەوا لە رووی نووسراوەیەکی سەر سەری من دەیخوێنێیەوە.

نەختێك وەستا و من وتم: – یاوول. و ئەو دووبارە وەقسە هاتەوە:

- حەق ئەوەیە کە بە سوارەکانی خۆتان بڵێن بەم نزیکانە دەبن بە "سوارکارانی "ئێس. ئێس" و لە رووی دەروونییەوە ئامادەیان بکەن. زۆریش ئاگاتان لەوە بێت کە کەس لە ئەوان نابێ ئەم دیدارەی ئێمە بزانێ و ئاگاداری بن. ئەمە دەبێ لەنێوان خۆمان و بەرپرسانی بۆند بمێنێتەوە.

بەری هەر دوودەستی لەسەر کۆتەکەی دانا و پەنجەکانی خستە ناو ناوقەدبەندەکەی.

- خاڵی زۆر گرنگ ئەوەیە کە سوارەکان بە رێکوپێکی و وردبینانە هەڵبژێرن. لەرووی جەستەیی، پاکی نەتەوایەتی و بڕوای ئایینیش من ئاگادار بکەنەوە. دەبێ پێش لەو کەسانە بگیرێت کە بڕوایەکی زۆریان بە ئایینەوە هەیە. ئێمە هیچ پێویستیمان بەو کەسانە نییە کە لە رووی ئایینییەوە بەردەوام لەگەڵ ویژدانی خۆیان کێشەیان هەیە.

**فون یەزریتس** لە قاقای پێکەنینی دا.

**هیملێر** هەر بەم شێوەیە مایەوە. سەری بە لای راستەوە ناوبوو و سەیری ئەم خاڵە نادیارەی دەکرد. وەکوو ئەوەدەچوو کە بە سەبر و حەوسەلەیەکی تەواو چاوەڕوانی ئەوە بوو **فون یەزریتس** پێکەنینە بێ کۆتاییەکەی ببڕێ تا ئەو بتوانێ قسەکانی لەوشوێنەی کە پچڕاوە، دەست پێبکاتەوە.

**فون یەزریتس** هەر بە پێکەنینەوە نەڕاندی کە: – ناین! ناین! ئێمە پێویستیمتان بەو کەسانە نییە بەردەوام بەربەرەکانی لەگەڵ ویژدانی خۆیان دەکەن.

لە قسەکردن وەستا و **هیملێر** خێرا لە قسەکانی بەردەوام بوو کە:

- هەروەها پێویستە لە رووی رەوشتەوە زۆر لەسەر پیاوەکانتان ئیش بکەن. ئەوان دەبێ ئەم خاڵە بزانن کە "ئێس. ئێس"ێك ئەگەر ئەمریان پێکرد کە دایکی بە دەستەکانی خۆی بکوژێت، ئەوا بێ یەك و دوو دەبێ ئەمکارە بکات!

نەختێك وەستا و قوبچەی پەنجەوانە رەشەکانی بەست. هەر لینگە پەنجەوانە سێ قۆبچەی هەبوو، ئەو هەر سێ قۆبچەی دوو پەنجەوانەکەی بەست. دوایی سەری بەرز کردەووە لەپشت شووشەی چاویلکەکانی سەیرێکی کردین:

- بۆ دوایین جار پێتان دەڵێم کە تەواوی باس و رووداوەکانی ئەم دانیشتنە دەبێ بە شاراوەیی بمێنێتەوە. (دووبارە نەختێك بێدەنگ بوو):

- تەنیا ئەمە و بەس.

سڵاوێکی سەبارزیانەم دا و ئەویش زۆر بە رێکی وەڵامی دامەوە و لە ئیدارە چووە دەرەوە،

دوای کوورەکەم دو کچمان بەدونیا هاتن و هەستم دەکرد باری ئەرکەکانم قوورستر بووە. ئێلزی و من بە سەختی ئیشمان دەکرد، بەڵام دوایی بەم ئەنجامە گەیشتین کە ئەم مەزرا قوور و چڵپاوییە تەنیا نانێکی بخۆ نەمرەمان دەداتێ و بۆ داهاتوو نە ئێمە دەتوانین هیچ ئومێدێکمان پێی بێت و نە منداڵەکان. ئەگەر ئەسبەکان هی خۆمان بان، یان فون یەزریتس ئێمەی، هەرچەند کەمیش لە قازانج و سوودی ئیلخی بەشدار کردبا، بە جۆرێك دەمانتوانی بژیوی خۆمان پەیدا بکەین. بەڵام ئەوەی لە بەراز و مریشك و سەوزەکاری وەدەست دەکەوت ئەوەندە نەبوو کە کوێرە بڵێ شیفایە، یان بەیانی کە منداڵەکان گەورە بوون بکرێ تێدا بە باشی پەروەردە بکرێن، بێ ئەوەی موحتاج بن.

بەم حاڵەشەوە بیرم لەوە نەدەکردەوە کە لەسەر کارکردن بەردەوام نەبم. بەڵکوو بەپێچەوانە، زۆر بە حەزەوە ئیشم دەکرد و تەنانەت چێژم لێی وەردەگرت. لەسەر ئەم بڕوایە بووم کە دیسانیش بژێوی ژیانمان دابین دەکات.

ئەم هەستە بوو کە ئێلزێ نەیەتوانی درکی پێبکا، چونکە ئەو هەمیشە لە مەزرا و زەوی ئەمجۆەدا ژیاوە. بەڵام من ژیانێکی دیکەم بووە و جاروبارە شەوانە خەوی ترسناکم دەدیت کە فون یەزریتس کە هەر ئەمجۆرەی کاتی ژن هێنان حەزم نەدەکرد ژن بێنم، دەری دەکردم و دووبارە بێکار و بێ پەنا دەمامەوە، بە پێی لەرزۆکەوە و بە سکی برسییەوە لە کوچە و کۆڵانەکانی شاری "و" سەرگەردانم. بە لەرزە لەرز و تەڕی ئارەقە لەخەو رادەپەڕیم و تەنانەت دوای هەستان لە خەویش ماوەیەکی پێویست بوو هەتا بەخۆم بێمەوە کە لە مەزرا و لەناو ژووری خۆمم و ئێلزێ لەتەنیشتم راکشاوە.

رۆژ دادەهات. بە ئاژەڵەکان رادەگەیشتم، بەڵام سەبارەت بە خەونەکە ئازارم دەچێشت. ئەوکات بیرم دەکردەوە کە فون یەزریتس ناچێتە ژێرباری ئەوەیکە ئیزننامەیەکم پێبدات و هەر ئەمڕۆ بەیانی کلکمان دەگرێت و لە مەزرا و مڵکەکەی خۆی دەرمان دەکات.

جاریوابوو ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ ئێلزێش باس دەکرد و سەرەتا دەیوت مەحاڵە فون یەزریتس کارێکی ئاوامان لەگەڵ بکات، چونکە بێشك هیچکەسی بەگیر ناکەوێ ئاگای لە ئەسبەکانی بێت و بچێتە ژێرباری ئەو بارودۆخە سەختەی کە لەم چەند ساڵەدا تووشی بووینە. بەم قسانە ورەی دەدامێ، بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەندەم وت و وت وت، ترس ئەویشی داگرت تا ئەو جێگەیەی بڕیاری دا لە هەموو شتێکدا خەرجییەکان کەم بکاتەوە و

پاشەکەوتێکمان هەبێت بۆ ئەوی بتوانین ڕۆژێك مەزرایەکی بچووك بکڕین و تێیدا بحەسێینەوە.

"پاشەکەوت کردن" بەم بڕە پارەیەی کە بەدەست ئێمە دەکەوت وایکردبوو لەسەر سکەیەکی ڕەشیش حسێب بکەین و تەنانەت واز لە زۆر شتی پێویست بێنین. بەمحاڵەشەوە بڕیاریمان دا و هەر لەم ڕۆژەوە بۆ ئێمە و منداڵەکان ڕێجیمێکی خۆراکی پێکهات کە سەختی ئەو بەرنامە خۆراکییە لەرادە بەدەر بوو. سێ ساڵی تەواو تەنانەت یەکجاریش پارەیەکی ئەوتۆمان خەرج نەکرد.

ئەوە روون و ئاشکرایە کە ژیانێکی زۆر ناخۆشمان تێپەڕاند، بەڵام بەمحاڵە و بە هەرچەشنە کەموکوڕییەك، تەنانەت کاتێك ناچار بووم چاوپۆشی لە توتن بکەم، لە فکری ئەوەی کە کەم کەم لە ئامانج نزیك دەبین و ڕۆژێك دادێ زەوی تایبەت بە خۆمان هەبێت و لە کۆتاییدا بە متمانەیەکی تەواو بەخۆمان بڵێین کە ئیتر سەبارەت بە برسێتی ئازار ناچێژین، چێژێکی زۆرم وەردەگرت.

ئێلزی دەیدیت کە ڕێکخراوی گوندییەکان و بۆند کاتێکی زۆر لە من دەگرن و لە کۆتاییدا، چونکە نەمدەویست کاروباری مەزراش وەپاش کەویٚ لەوەیکە سەری ساڵ و بنی ساڵ بیٚ پسانەوە ئیشم دەکرد، پرتە پرتە و نەقە نەقی پەیدا بوو. لەلایەك، خۆشم زۆرجار هەستم بە قورسایی ئەرکەکانم دەکرد و لای خۆم دانم بەوە دادەنا کە وەکوو جاران لە چالاکی و جمموجۆڵی سیاسی چێژ وەرناگرم. هۆکارەکەی ئەوە نەبوو کە غیرەت و نەتەوەپەرستی و وەفاداری من بەنسبەت فورر کەمتر لە خەڵکانی دیکەیە، بەڵکوو حەزی کڕینی زەوییەکی بچووك و دروست کردنی خانوویەك بۆ ماڵ و منداڵەکانم بەجۆرێك هەوڵی گەیشتنی زیاتر دەکردم کە جاریوابوو

پشووم لەوە دەخواردەوە کە بزواتی سیاسیی و چالاکی رۆژانی رابردووم کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی من داناوە.

بۆ نموونە وەکوو رۆژ بۆ من روون بوو کە ئەگەر لە فەوجەکانی ئازاددا شەڕم نەکردبا یان لە گرووپی "ئێس. ئا" رکابەری و ململانێم نەکردبا و یان گادووم نەکوشتبا، هیچکات فون پەزریتس و هیملێر بیریان لەوە نەدەکردەوە کە من بۆ بۆند یان پێکهێنانی سوارکارانی "ئێس.ئێس" هەڵبژێرن. جاریوابوو ئەم بیرۆکەیە بە مێشکمدا تێدەپەڕی کە لە رابردوودا شتێکی زۆرم لە سەر بڕوای سیاسی داناوە و لە داهاتووشدا دەبێ شتێکی زۆری لەسەر دابنێم و پاشەکەشە لە سیاسەتیش ناکرێ و بەم شێوەیە رەنگە ئیمکاناتی ژیانێکی ئاسوودە و ئارام بۆ خۆم و کەسوکارم بکەوێتە مەترسییەوە.

بەرهەحاڵ رۆژ نەبوو کە شەڕ لەگەڵ هزر و هۆش و رابردووی خۆم نەکەم. بەوە دەگەیشتم کە ئەم بیرکردنەوەیە هۆکاری خۆ بەزلزانینی منە و بەهیچ شێوەیەك ناتوانم بۆ ژیانی ئاسایی بگەڕێمەوە.

بەڵام خاڵی سەیر و سەمەرە ئەوە بوو کە ورەبەرزی و بیرکردنەوە لە رابردووی باوکم بوو کە دەمتوانی بەسەر ئەمجۆرە بیرکردنەوەیەدا زاڵ بم. لە راستیدا بەخۆم دەوت: "ئەگەر باوکم غیرەتی ئەوەی پەیدا کردبا بەرامبەر بە خوایەك کە بوونی نەبوو، لە هەموو شت بگوزەرێت، منێك کە بڕوام بە ئیمانێکی دیار و ئاشکرا هەیە، ئەویش لەناو مرۆڤێکی دروستکراو لە ئێسقان و گۆشت، رێك دەبوایە خۆم بە هۆیەکی پتەوتر فیدای ئیمانم بکەم، بێ ئەوەی لە فیداکردنی بەرژەوەندی و ئەگەر پێویست بێت گیانی خۆم، بگوزەرێم.

لەگەڵ ئەم هەموو بیرکردنەوە و شەڕ لەگەڵ رابردوو رووداوێکی سەیر لە ئاڤریلی ساڵی ١٩٣٢ پێش هات.

لە ماوەیەکی پێشترەوە بەهۆی پروپاگەندەی ئاسنگرێك بەناوی "**هێرتزفلد**" کە رەنگە سەبارەت بە هێز و تاقەتی زۆری خۆی یان گاڵتەجاری و یان سادەیی قسەکانی لای جووتیاران کەسایەتی و دەسەلاتێکی زۆری هەبوو. پێشکەوتنەکانی **بۆند**ی گوندی دراوسێمان بە تەواوەتی وەستابوو. ئەو نیشانەی لە **بۆند** گرت، بە ئاشکرا گاڵتەی بە سەرکردەکانی **بۆند** دەکرد و بەشێوەی گشتی قسەی هەڵوەشاندنەوە و دژە نەتەوایەتی دەکرد.

**بۆند**ی ناوچە کە توانای بەستنی زمانی ئەوی نەبوو، منی بۆ یارمەتی خواست. سەردانی بەرپرسەکانم کرد و دەسەلاتی تەواوم لێ وەرگرتن. تەڵەیەکم بۆ **هێرتزفلد** دانایەوە و خستمە ژێر دەستی خۆم. دوازدە کەس لە لاوەکانی من گۆپاڵ بەدەست کەوتنە گیانی. ئاسنگر وەکوو شێر شەڕی دەکرد و دوویانی لەپێ دەرهێنا. ئەوانیتر کە کەوتنی دوو هاوڕێیەکەیان بینی، خوێن بەری چاویانی گرت، کاتێك کە من چوومە پێشی، کار لە کار ترازابوو، **هێرتزفلد** بە سەر و مێشکی پرژاوەوە بە عەردەوە مەلاس ببوو.

لەم بارودۆخەدا خۆ شاردنەوە نەدەکرا و سەرکردەکانی حزب و **بۆند** وەهەوڵ کەوتن و پۆلیسیش رووداوەکەی بە هەند نەگرت. چەند شایەدمان پەیدا کرد کە وتیان: شەڕ و لێدانێك بووە لە حاڵەتی مەستی لەسەر کچێك رووی داوە و فایلەکە چووە ناو فایلەکانی ئەرشیڤ کراو.

پۆلیس، دوو مانگ پێش ئەم رووداوە لەبارەی هاوڕێیەکی "**ئێس. ئا**" کە تووشی کێشەیەکی ئەوتۆ ببوو، سەختییەکی زۆری نیشان دابوو و شێوەی ئارامی گەڵ ئێمە، لە راستیدا بۆ دەسەلاتی شکۆمەندی "**فورر**"

دەگەڕایەوە کە پازدە رۆژ پێشتر لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری بە ئەنجامێکی درەوشاوە و بە چواردە ملیۆن دەنگ لەپاش **"لیوا هیندنبورگ"** بوو! ئەوە بوو کە بیرم کردەوە ئەگەر مردنی **هێرتزفلد** پێش هەڵبژاردن بوایە، شك لەوەدا نەبوو کە پۆلیس ئاوا بە ئاسانی وازی لە ئێمە نەدەهێنا. تا ئەو جێگەیەی لە کۆتاییدا دەبوایە بچمە زیندان. تا ئەو جێگەیەی پەیوەندی بە منەوە بوو دیسانیش ئامادە بووم بۆ بەرژەوەندی بۆند و حزب فیداکاری بکەم، بەڵام بە نیگەرانییەوە لەخۆم پرسی ئەوکات ژنەکەم و سێ منداڵە وردیلانەکەم لە ملك و مەزرای خەڵك چیان بەسەر دێت. بە هیچ شێوەیەك نەدەبوایە چاوەڕوانی یارمەتیم لە بابە **ویلهیلم** هەبێت، بۆخۆشم باش **فون یەزریتس**م دەناسی کە ئەو لەسەر قسەی خۆی بوو کە هەر بەڵایەکی بەسەرتان بێت چاوەڕوانی ئەوە نەبن یارمەتیتان بدەم. ئەویش ئەوە نەبوو پێ بنێتە پێش و بارێك لەسەر شانی ژن و منداڵەکانم هەڵگرێت.

**ئێلزی** باش ئاگاداری ئەوە بوو کە من شتێکمە و بەردەوام پرسیاری لێدەکردم، بەڵام من بە دروستی وەڵامیم نەدەدایەوە. کەچی لە راستیدا سەبارەت بەم بوارەی هاتووتەپێش، دڵم پڕ لە خوێن بوو. جاری وابوو بیرم لەوە دەکردەوە چی دەبوو لە گۆشەی شارێکی دوورکەوتوو بام و کەس ئاگای لە رابردووی سیاسیی من نەبوایە و لەئەنجامدا سەرکردەکانی حزب لێمبگەڕێن و بۆخۆم ئیش بکەم! — بەڵام بەم ئەنجامە دەگەیشتم کە ئەمجۆرە بیرکردنەوانە بۆمن زۆر منداڵانەیە. دۆزینەوەی کار لە ئەڵمانیا لەو سەردەمەدا کارێکی سەخت و دژوار بوو و بۆخۆم لە هەموو کەس باشترم دەزانی کە ئەگەر کەسێکی وەفادار نەبام و هەموویان ئاگاداری وەفاداری و ئازایەتی من نەبان، ئەوا حزب منی بە **فون یەزریتس**

نەدەسپارد و ئەگەری ئەوە نەبوو **فون یەزریتس** دەست و باڵی من بگرێت و بە متمانەیەکی تەواوەوە ئەم شوێنەم پێ بسپێرێت.

بەهەرحاڵ توانیم، بێ کێشە و گرفت گروپێك لە سواراکان پێکبێنم کە **هیملێر** ئەمری پێکردبووم. بە رەزامەندی ئەوان منیش فایلێکی ئەندامێتی "**ئێس. ئێس**"م بۆ درووست کرد و بۆ **هیملێر**م نارد. ئەم فایلانە کاتێکی زۆریان لێگرتم و زەحمەتێکی زۆرم پێوە کێشان. بە تایبەت لە وەرگرتنی شەجەرەنامەی هەر یەك لە پاڵێوراوەکان، چونکە دەمزانی حزب لە هەڵبژاردنی ئەندامانی "**ئێس. ئێس**" گرنگی زۆر بە باری نیژاد و نەتەوەپەرستی دەدات و بۆخۆم لە وەزارەتی ناوخۆ باری کەسێتی ئەوانم وەرگرت. هەربۆیە لە کۆتایی راپۆرتەکەمدا ئاماژەم بەوە کرد کە بە شایستەم نەزانی فایلی خۆشم لەگەڵ فایلی ئەوانە بەرێبکەم، چونکە باش دەزانم لەرووی جەستەییەوە بارودۆخێکی باشم نییە. "**ئێس. ئێس**" لەسەر ئەوە پێداگر بوو کە دەبوایە ئەندامانی "**ئێس. ئێس**" دەبێ باڵایان کەمتر لە مەترێك و هەشتا سانتی مەتر نەبێت و لانیکەم باڵای من زۆر لەوە کەمتر بوو.

رێك رۆژی دوازدەی دیسەمبەر بوو کە وەڵامی **هیملێر**م بەدەست گەیشت. پاڵێوراوە پێشنیارکراوەکانی قبووڵکرد و رێز و پێزانینی سەبارەت بە ماندووبوونم ئاراستە کردم و ئەمەشی نووسیبوو کە سەبارەت بە من هیچ کێشەیەك نییە و بە پلەی "**ئۆبێرشار فورر**" (پلەیەکی "**ئێس. ئێس**" بەرامبەر بە مفەوەزی سوپا و ئەرتەشە) وەردەگیرێم.

لەپێش مێزی چێشتخانە وەستابووم، هێڵەکانی نامەی **هیملێر** لەبەرچاوم سەمایان دەکرد. ژیانم بە تەواوەتی مانایەکی نوێی پەیدا کردبوو.

مردم هەتا ئێلزیم تێگەیاند کە وەرگێرانی من لە "ئێس. ئێس" چەندە بۆ من گرنگە و تا چ رادەیەك خۆشبەختی بۆ من لەگەڵە و بۆ یەکەمجار لە ژیانی هاوبەشیماندا لەسەر ئەم مەسەلەیە قسەمان لەیەك توند هات، بە تایبەت سەبارەت بەوەیکە من بۆ کرینی ئۆنیفۆرم لەم پارەیەم هەڵگرت کە بەم هەموو بەدبەختییە پاشەکەوتمان کردبوو.

ئێلزی بیانووی هێنایەوە کە "ئێس. ئێس" سوپا نییە و ئەوان مووچە وپارەم پێنادەن، لەوە بگوزەرێین کەس نەیدەزانی کە سەرکەوتنی حزب مسۆگەرە و ئەگەر بە جوانی چاوم بکەمەوە بۆخۆشم دەبینم لە هەڵبژاردنی دوای هەڵبژاردنەکەی سەرۆك کۆماری رێژەیەکی زۆر لە دەنگەکانی کەم بووەتەوە.

کە قسەکانی گەیشتە ئێرە، زۆر بە توندی قسەکانیم بری، چونکە نەمدەتوانی رێگە بدەم کە تەنانەت بۆ ساتێکی کەمیش سەرکەوتنی حزب بخاتە ژێر شك و گومان و دوودڵییەوە.

ئەو سەرکەوتنەی کە ئەم رۆژە بە ئیمانەوە باسم لێیدەکرد، زۆر زووتر لەوە بەدەست هات کە بەئومێدەوە باسم لێیدەکرد.

مانگێك لە کێشەکەمان تێنەپەریبوو کە "فورر" بوو بە گەورەترین پلەی رایش و دوای چەند هەفتە حزب هەرجۆرە دژایەتییەکی یان تێکدەشکاند یان لەناوی دەبرد هەتا لەسەرر کوورسی دەسەلات دانیشت.



## ١٩٣٤

لە مانگی ژۆئەن فەرمانێك بەدەستی من گەیشت كە لەگەڵ سواركارانم بۆ شاری "**س**" بچم كە لەوێ ڕێژە بڕۆین و بمانبینن.

ڕێوڕەسمی ڕێژە لە كۆڵانە رازاوەكان بە ئاڵای سەلیبی شەكاوەوە، بەپێی پـیلان و بـە ڕێكـوپێكی لـەنێوان هوتـاف و خۆشـی و چـەپڵەڕێزانی ئامادەبووان بەڕێوەچوو.

**هیملێر** دوای ئەوەیكە بەشێوەیەكی وردبینانە هەموو سواراكارنی بینی، وتـارێكی پێشكەش كـرد كە زۆر بەقووڵی كاریگـەری خـستە نـاو مـن. لـە راسـتیدا ئـەوەی كـە ئـەو باسـی كـرد زۆر لـەوە پێـشتر وەكـوو هـەموو ئەنـدامانی "**ئێس. ئێس**" لەگـەڵی ئاشـنا بـووم. بـەڵام بیـستنی ئـەو وتـارە لەناو ئەم خەڵكە پـڕ خرۆشـە و لـە ڕێـوڕەسمێكی ئاوا پڕشكۆ، ئـەویش لـە زمانی "**رایشس فورر**" (گرنگترین پلە لە ئێس. **ئێس**" بەرامبـەر بە فـەریق لە سوپا) وەكوو پێداگرییەك لەسەر راستییەكی رووناك بوو.

**رایشس فورر** زۆر بوێرانە و پڕشكۆ وتی:

– "ئەم سـەركەوتنە هیـچ شـتێك ناگۆڕێـت و نابێ بارودۆخی دەروونـی و رووحی كراس رەشان هیچ گۆڕانكارییەك پێكبێنێ. "**ئێس. ئێس**"ەكان لـە رۆژەكانی رووناك و بێ تـەنگ و چەڵەمەشدا هەر بەم شێوەیە دەمێننەوە

کە لـە بـارودۆخی گـەردەلول و گێژەڵووکـەدا بوون: "ئـەو سـەربازانەی کـە تەنیا بە ویژدان و شەرەفەوە خزمەت دەکەن."

بەردەوام بوو و وتی:

- لـە هـەموو قۆناغـەکان، لـە سـەردەمی دوورەوە پیـاوانی "**تویتـونی**" (ئەڵمانییەکانی دووسەد ساڵ پێش زایین) بەملاوە، شەرەف وەکوو دوایین ئارمـانی هـەر سـەربازێك بـووە. بـەڵام لـەو سـەردەمدا زانیارییـەکی ئـەوتۆ لەسەر شەرەف نەبوو و هەر بۆیەش لە هەڵبژاردنی رێگەی شـەرافەتمەدانە تووشی گرفت دەبوون."

رایشس فورر وتی:

- بـە شـانازی دەزانـیٚ کـە بڵێـت "بـۆ پیـاوانی ئـێس. ئـێس" ئـیتر کێشەیەکی ئەوتۆ لەئارادا نییە: پێشەوای ئێمە "**ئەدولف هیتلێر**" جارێك بۆ هەمیشە شەرافەتی "**ئێس. ئێس**"ی بە راشکاووی دیاری کردووە. ئەو دروشمی گروپە هەڵبژێردراوەکەی بەم شێوەیە بەیان دەکات: "شەرەفی تۆ، وەفاداری تۆیە!"...

کەواتـە لەمەوبـەدوا هـەموو شـت زۆر سـاددە و روون و ئاشـکرایە. ئـیتر هیچجۆرە مەسەلەی ویژدانی بۆ ئێمە نایەتەپێش، تەنیا ئەوە بەسە کە تاك وەفادار بێت و بە واتایەکی دیکە: گوێڕایـەڵ بێت! ئەرکی ئێمـە، ئەرکی تایبەتی ئێمە، گوێڕایەڵییە و تەواو. بە لوتفی ئەم ئیتاعەت و گوێڕایەڵییە بێشك هیـچکات هەڵـە ناکەینـەوە و هەمیـشە رێگـەی راسـت دەگرینەبەر و ئەسڵی سـەروەری ئەڵمانیا، ئـەڵمانیا سـەرووتر لـە هەمووان لـە رۆژەکـانی باش و خراپدا دەخەینەبەرچاو.

دوای کۆتایی هاتنی وتارەکە، بەرپرسەکانی حزب و فەرماندەکانی "ئێس. ئێس" چوونە بەردەم هیملێر. من لە کەمی پلەی خۆم ئاگادار بووم و کاتێك بینیم تەنیا منی بانگ کردە لای خۆی، زۆر بەلامەوە سەیر بوو.

لە تەلارێکی شارەوانی لەپشت مێزێکی بەتاڵی گەورە وەستابوو.

- "ئۆبێرشارفورر "لانگ" تۆ لە کووشتنی کادوو بەشداریت کرد، مەگەر نا؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

- پێشتر لە تورکیا بووی؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

- بە پلەی مفەوەزی؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

- باوك و دایکت مردوون؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

وام هەست کرد کە گێژ و سەرلێشێوام. هیملێر ژیانی منی لەبیر بوو، بەڵام ئەوەی لەبیر نییە کەخزمەتێکیشم پێیکردبێت.

- دووساڵ پێش لەماڵی موقەدەم "بارون فون یەزریتس" تۆم بینی؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

- موقەدەم باروون فون یەزریتس لەگەڵ تۆ وەکوو کرێچییەك هەڵسوکەوت دەکات؟

- یاوول، هێر رایشس فورر.

چاویلکەکانی درەوشانەوە و بە دەنگێکی وشك وتی: - پێشتریش هەموو ئەمانەم لێپرسیوی؟

بە تەتەپەتەوە وتم: - یاوول، هێر رایشس فورر.

چاوەکانی لە پشت چاویلکەوە ئازاری دام.

- وات دەزانی ئیتر لەبیرم کردووە.

بەدوودڵییەوە وتم: - **یاوول، هێر رایشس فورر.**

- بە هەڵەدا چووی!

دڵم دەستی بە لێدانێکی توند کرد. بە جۆرێک رێک وەستام کە ماسوولکەکانم وەژان کەوتن و بە دەنگێکی لەرزۆک وتم: - هەڵەم کرد، **هێر رایشس فورر!**

بە میهرەبانییەوە وتی: - سەربازێك هیچکات نابێ لەبارەی فەرمانەکەیدا شك و گومانی هەبێت.

دوایی بێدەنگییەك رووی دا. لە خەجاڵەتیانەوە وشك ببووم. گرنگ نەبوو کە شك و گومانی من شتێکی بێ مانایە یان نا. ئەوەندە بوو کە من شکم کردبوو. ورەی جارانم نەمابوو و بێ ورەیی جێگەی خۆی لە دەمار و ریشەی مندا خۆش کردبوو: غیرەتم وەبەر خۆم نابوو و بە شکەوە سەیری فەرماندەی خۆمم کردبوو.

**رایشس فورر** بە وردی سەیری کردم و بەدوای قەسەکانیدا رۆیشت و وتی: - ئیتر ئەم بوارە دووبارە نەبێتەوە!

- **ناین، هێر رایشس فورر.**

بێدەنگییەکی دیکە هاتەپێش و ئەو بە سادەیی و بەسۆزەوە وتی: - ئیتر هەر باسیشی ناکەین.

ئەمنیش بە جەستەیەکی لەرزۆکەوە بەوە گەیشتم کە دیسانیش متمانەم پێدەکات.

سەیری **رایشس فوررم** کرد. هەستێکی پڕ لە متمانە هەموو جەستە و ناخی داگرتم.

رایشس فورر چاوە ساردەکان لە سەرووی سەری من بڕی وەکوو ئەوەدەچوو کە دەیهەوێ شتێك لەرووی نووسراوە بخوێنێتەوە و وتی:

- ئۆبێرشارفورر! پەیوەندی لەگەڵ چالاکییەکانی تۆ لە پلەی ئەندامێکی "ئێس. ئێس" ئەو هەلەی بە من داوە کە متمانەیەکت پێ بکەم. خۆشحاڵم کە بە تۆ دەڵێم ئەم بڕوایە، بڕوایەکی گرنگە. تۆ ئارام، هێور و پۆزەتیڤی. تۆ گوێڕایەڵی و لەم بوارانەی کە ئازادی تەواوت هەبووە، داهێنانت هەبووە وهێزی تەشکیلاتیت دەرخستووە. بەتایبەت، لەم بوارە کە فایلی کەسەکانی خۆت بۆ من نارد، جێگەی پێزانینە. ئەم فایلانە نیشانەی سەداقەت و راستیی و ئیمانی راستەقینەی ئەڵمانی بوونتە. ( بەدەنگێکی بڵندتر وتی): - "ئیرە بزوندەرە ئشترکە ئیست دی پراکسیس!" (خاڵی بەرچاوی کەسایەتی تۆ، کردەوەیە).

چاوەکانی بۆ پێش خۆی سوراند و بەردەوام بوو: - خۆشحاڵم کە پێتان بڵێم قۆناغی زیندانی ئێوە دەتوانێ بۆ "ئێس. ئێس" بەسوود بێت.

چاوەکانی دووبارە لە شوێنی سەرووی سەری من بڕی و بێ دوودڵی و بێ پسانەوە، بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بۆ دۆزینەوەی وشەیەك بەوەستێ وتی:

- حزب لە ناوچە جیاجیاکانی ئەڵمانیا دەیهەوێ ئۆردوگا دروست بکات کە ئامانجی باش کردن و پەروەردەکردنی جەنایەتکارانە. هەروەها ناچار دەبین دوژمنانی حکوومەتی ناشنال سۆشیالیستیش لەم ئۆردوگایانەدا زیندانی بکەین بۆئەوە ی لە نفرەت و تووڕەیی هاوشاریەکانیان لە ئەماندا بن. لەمبارەشەوە ئامانج ئامانجێکی پەروەردەییە. یانی ورەیان بگەڕێنینەوە دۆخی پێشوو و ژیانێکی ئاساییان پێ ببەخشین. من دەمهەوێ هەر لە دەسپێکدا و لەرووی

ئیدارەی (**کنسانتراسیونس لاگێر**[32]" داخاو) پلەیەکی باشت پێدەدەم. مووچەی پلەت وەردەگری و لەگەڵ ئەوەش چاومان لێت دەبێ و هەروەها خانوو و سووتەمەنی و خۆراکیشت دابین دەکرێ و بنەماڵەکەشت لەگەڵ خۆت دەبەی. نەختێك بێدەنگ بوو و وەقسە هاتەوە – ژیانێکی خێزانی تەواو ئەڵمانی، وابزانم دەتوانیّ بۆ هەر "ئێس. ئێس"ێك کە لە "کەی ئێل"ێك پلەی ئیداری هەبێت، ئەوا کەسایەتێکی بەنرخ لەرووی رەوشتی و ئەخلاقی دەبێت. (چاوێکی لەمن کرد) – کەواتە نابیّ وەکوو ئەمرپێکردنێك وەریبگری. ئەوە تەنیا پێشنیارە و قبووڵ کردن و رەت کردنەوەی پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە. بۆخۆم وا هەست دەکەم کە ئەزموونی تۆ وەکوو زیندانییەك و کەسایەتییەکەت بۆ حزب بەسوودە و لە بەرژەوەندی حزبدا دەبێت. هەر بۆیەش دوای ئەم هەموو خزمەتە

[32] - ئۆردووگا کە عەلامەتەکەی (KL)ە و (بە کورتکراوەیی "کەی ئێل") پیاو کوژەکانی نازی لە سەرتاسەری ئەڵمانیا دەستیان بە دروست کردنی ئۆردوگا کردبوو بۆ مرۆڤ کوژی. پیاوکوژەکانی دەستیان لە جەنایەتی وا دەدا کە بەشێوەی گشتی قێزەونترین و غەیری مرۆڤایەتیترین لاپەڕەی مێژووی مرۆییان پێکهێنا. ئەم ئۆردوگایانە بەرەبەرە بوون بە کوشتارگە کە ئەوانەی دەهێنران، دوو رێگەی چارەنووسی وەکوو یەکتریان هەبوو: ئەگەر منداڵ یان پیر بوون و توانای کاریان نەدەبوو هەر لە یەکەم کاتژمێری هاتنیان بۆ ژووری غاز دەنێردران و دەکوژران و دوایی لە ئاگردانی تایبەت دەکرانە خەڵوون، ئەگەریش هێزی کاریان هەبوایە دەیانتوانی لە بارودۆخێکی زۆر خراپ ئیش بکەن بۆ ئەوەی نەکوژرێن. لە کۆتاییدا هەر کە توانایان لەدەست دەدا، ئەوا رێگەی گرووپی یەکەمیان دەگرتەبەر. کە جیاوازییەکەی تەنیا یەك یان دوو مانگ زیاتر نەبوو. گرنگترین ئۆردوگاکان ئەمانە بوون: پاپن بورگ، نوین گامە، راونس بروك، زاخ زن هاوزێن، بێرگن بێلزن، دورا نوردهاوزن، بوخن والد، لندسبێرگ، داخاو لە ئەڵمانیا، ناتزویلر لە فەرەنسا. ماوت هاوزن لە نەمسا. فلوسن بورگ، ترمزینئشتات، گروس رۆزن لە چێکسلڤاکیا، شتوتهوف، شلم نو، ترێبلینکا، زوبی بور، مایدانك، بلزك، پلاس تزوف و ئاوش ویتس لە پۆلۆنیا کە تێدا بە ملیۆن کەس بە بێ رەحمانەترین شێوە بەدار هەڵواسران، تیرباران کران، بە غاز خنکێنران و یان وەکوو بەرازی تاقیگەکان تاقیکردنەوەی مەترسیداری زانستی و پزشکیان لەسەر بەرێوەچوو و لە کۆتاییدا کوژران.

شایستەیەی کە بە حزبت کردووە، دەیهێڵمەوە بۆخۆت بڕیار بدەی و ئەگەر هەر شتێکت هەیە دەتوانی بیڵێی.

نەختێك دوودڵ مامەوە و بەڵام وتم:

- هێر رایشس فورر، دەمەوێ پێتان بڵێم کە من بەپێی بەڵگەنامەی نووسراوە بۆ ماوەی دە ساڵ دەبێ لەخزمەت بارون فون یەزریتس دابم.

- ئەم بەڵێننامەیە دوولایەنەیە؟

- ناین، هێر رایشس فورر.

- کەواتە تۆ ئازادی و دەتوانی وازی لێبێنی.

- ناین، هێر رایشس فورر.

- کەواتە پێموانییە بە رۆیشتنی تۆ لەوێ، هیچ شتێك لە کیسەی تۆ کەم بێتەوە.

- ناین، هێر رایشس فورر، بەڵام بە مەرجێك هێرفون یەزریتس رێگەم پێبدات.

نیوچە پێکەنینێکی هاتێ و وتی: - لەم روویەوە متمانەت هەبێ. بە باشی بیر بکەوە و لەماوەی هەشت رۆژدا وەڵامم بدەوە. (بە سەری نینووکەکانی چەند جارێك لە مێزەکەی دا) ئەوەندە و بەس.

بەربەرەکانیم کرد، بە کەمی رێزم گرت و هاتمەدەرەوە.

هەتا سبەی شەو بۆ لای منداڵەکان نەگەڕامەوە. کاتێك گەیشتمەوە منداڵەکان خەوتبوون. لەگەڵ ئێلزی نانی شەومان خوارد و دوایی پیپەکەم پڕ لەی توتن کرد و لە حەوشە لەسەر کورسی دانیشتم. هەوا خۆش و شەو زۆر روون بوو.

دوای ماوەیـەکی کـورت ئێلـزیش هاتـە لام. پێـشنیارەکەی هیملێـرم بـۆ باس کرد و قسەکانم کە تەواو بوو سەیریم کرد. هەر دوو دەستی بە ڕێکی خستبووە سەر چۆکی و سەریشی ڕاست و بێ جووڵە ڕاگرتبوو.

لەقسەکانم بەردەوام بووم و وتم: – لەسەرەتادا بارودۆخی ئابوورییەکەی زۆر لێرە باشتر نییە، جگە لەوە کە کار و ئیشی تۆ کەمتر دەبێتەوە.

بێ ئەوەی سەری بجووڵێنی وتی: – باسی بارودۆخی من نییە.

وتم: – کاتێك ببم بە ئەفسەر، بارودۆخمان زۆر لەوە باشتر دەبێ.

- یانی پلەی ئەفسەری وەردەگری.
- هەڵبەت. ئێستا من لە کۆنە حزبیەکانم و خزمەتی قۆناغی شەڕیشم بۆ حسێب دەکرێ.

ئێلزی سەری وەرگەڕاندە لای من و بینیم بە سەیرەوە چاو م لێدەکات:

- ئەفسەری هەر ئەوەیە کە هەمیشە حەزت دەکرد هەتبێت، مەگەر نا؟
- ڕاستە.
- کەواتە دوو دڵیت لە چییە؟
- پیپەکەم پێکرد و وتم: – ئەوەندە پێی دڵخۆش نیم.
- بە چییەوە دڵخۆش نی؟
- زیندان زیندانە، تەنانەت بۆ زیندانبانیش.

دەستەکانی لەسەر یەکە دانا و وتی: – ئی، کەواتە روونە، دەبێ پێشنیارەکەی ڕەت بکەیتەوە.

وەڵامم نەدایەوە و دوای ماوەیەکی کوورت ئێلزی وەقسە هاتەوە:

- یانی ئەگەر بڵێی نا، ڕایشس فورر لێت دڵگران دەبێ؟
- بێشك نا، کاتێك فەرماندەیەك هەڵبژاردنەکە دەخاتە ئەستووی سەربازی خۆی، هەر بڕیارێك بدات لێی دڵگیر نابێ.

ئێلزی زۆر بە جوانی سەیری منی دەکرد و منیش لێم پرسی: – ئەی تۆ؟ ئەم کارەی منت پێ خۆش دەبێ؟

بێ کەمترین شك و گومانەوە وتی: – نا. پێم خۆش نییە. تۆزقاڵێکیش پێم خۆش نابێ. (خێرا قسەکەی قۆستەوە) و وتی: – بەڵام تۆ کە هیچکات بیروڕای منت وەرنەگرتووە و هیچ حسێبێکم بۆ ناکەی.

چەند مژی توندم لە پیپەکە دا، دوایی خواربوومەوە مستێکم وردکەبەرد هەڵگرت و دەستم کرد بە هەڵاویشتنی.

- رایشس فورر پێیوایە کە حزب لە "کەی ئێل"ێك باشتر دەتوانێ سوود لە من وەربگرێت.

- کەی ئێل؟

- کونسانتراسیونس لاگێر.

- لە کوێوە ئەم بڕوایەی پەیدا کردووە.

- لەوجێگەوە کە پێنج ساڵی تەواو لە زیندان بوومە.

ئێلزی پاڵی بە کوورسیەکە دا وسەیری بەرامبەری خۆی کرد: – بوونی تۆش لێرە بەسوودە.

زۆر بە ئارامی وتم: – بێشك، لێرەش سوودم هەیە.

- هەروەها ئەوکارەی کە دەیکەی حەزت لێیەتی.

- بۆ چەند خوولەکێك بیرم لە قسەکانی کردەوە و وتم: – ئەوە وەبەرچاو ناگرم، ئەگەر بوونی من لە کەی ئێل لە بەرژەوەندی حزب دا بێت، بێ مەعتەل بوون دەبێ بچمە کەی ئێل؟

- ئاخر رەنگە بوونی تۆ زیاتر لە بەرژەوەندی حزب دا بێت.

لەجێگەی خۆم هەستام: – رایشس فورر وا بیر ناکاتەوە.

وردکە بەردەکانم یەك بەدوای یەك بۆ لای چاڵاو دەهاویشت و پیپەکەم بۆ بەتاڵ کردنی خەڵووز لە چکمەکەم دا و بۆ ناو ژووریْ گەڕامەوە. دەستم کرد بە رووت بوونەوەوە و دوای نەختێك ئێلزیش هات.

درەنگ بوو، زۆر ماندوو بووم، بەڵام خەوم لێنەدەکەوت.

بەیانی ئەمڕۆژە، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، بەرلەوەی بچێت و قاپەکان بشوات و منداڵەکان بخەوێنیْ؟ من لەبەر پەنجەرەی نیوەکراوە لەسەر کورسی دانیشتم و پیپەکەم داگیرساند. پشتی ئێلزی لەمن بوو و تەقە تەقی شۆردنی قاپەکانم بەگویْ دەگەیشت. بەرامبەر بە من دوو سپیداری لێبوو کە خۆریان پێدەکەوت و دەدرەوشانەوە. دەنگی ئێلزیم بیست کە پرسی: - ئاخرییەکەی چ بڕیارێکت دا؟

بۆلای سووڕامەوە، تەنیا پشتیم بینی: لەسەر قابشۆرەکە خوار ببۆوە.

وتم: - نازانم.

بینیم کە پشتی خوار بۆتەوە.

قاپەکان بە نەرمی تەقە تەقیان بوو و منیش لەناو دڵمەوە وتم: - "زۆر ئیش دەکات و خۆی زۆر ماندوو دەکات."

سەرم سوڕاند و سەرلەنویْ چاوم لە سپیدارەکان بڕی.

ئێلزی دووبارە وەقسە هات و وتی: - بۆچی ناچیتە ناو سوپا؟

- "ئێس. ئێس" هیچکات بۆناو سوپا ناچیْ.

- لەناو ئێس. ئێس ناتوانی پلە وەربگریْ؟

- نازانم. رایشس فورر لەمبارەیەوە هیچ قسەیەکی نەکرد.

دوایی بێدەنگییەك رووی دا و من وتم: - لەناو سوپا بۆ ئەوەی کەسێك بتوانیْ پلەی باش وەربگریْ، پێویستی بە پەروەردەکردنێکی باش هەیە.

- لەناو ئێس. ئێس چی؟

- لەناو ئێس. ئێس زیاتر بارودۆخی جەستەیی وەبەرچاو دەگیرێت لەگەڵ ئەزموونەکەی.

بۆلای سووڕامەوە و لە قسەکانمدا بەردەوام بووم: – **"ماینە بزوندە رە ئسترکە ئیست دی پراکسیس"** (تایبەتمەندی بەهێزی کەسایەتی من، کردەوەمە.)

پارچە قوماشێکی لەسەر بزمار هەڵگرت و خەریکی وشککردنەوەی قاپەکان بوو. سەرەتا لە قاپەکان دەستی پێدەکرد ویەك بە یەك لەناو کەوەنتەرکە دەیچنین.

- بۆچی حەز ناکەی بۆ **"کەی ئێل"** بچی؟

لەپشتەوە گوێم لە دەنگی هاتووچۆی دەبوو. سەرپایە (نەعلە)ەکانی لە قاچی دەرهێنابوو و بەهێوری لە ژوورەکە هاتووچۆی دەکرد.

بێ سووڕاندنی سەرم، وتم: – چونکە ئەوێ زیندانە ئیتر. هەروەها غارە غاری ئەسب و ماینیشی لێ نییە.

**ئێلزی** وتی: – هاوار لە دەست ئەم ئەسب و ماینانەی تۆ؟

نەختێك وەستا و وتی: – خانووشت پێ دەدەن؟

ئەرێ. سووتەمنیش. خورد و خۆراك و لانیکەم بۆ بنەماڵەی من. پاداشت و ئەمشتانەش. تۆش دەتوانی بۆخۆت بە ئاسوودەیی بحەسێیتەوە و دانیشی.

**ئێلزی** وتی:

- وای، چ باشە!

بۆ لای سووڕامەوە. لەپێش کەوەنتەرەکە وەستابوو. پشتی لە من بوو.

- **ئێلزی** زۆر بە ماندوویی دەتبینم.

- رووی تێکردم و خۆی راست کردەوە:

- بۆخۆم وا هەست دەکەم کە سەلامەتم سەلامەتم.

بۆ بارودۆخی پێشووم گەڕامەوە. خۆرگری پەنجەرە نیوەی سپیداری لای ڕاستی شاردبۆوە.

**ئێلزی** دووبارە وتی:

- **لە کەی ئێڵ** هەڵسووکەوتی خراپ لەگەڵ زیندانییەکان دەکری؟

بە دەنگێکی وشك وتم:

- بێشك نا. لە حکوومەتی ناشنال سۆشیالیست، ئیتر ئەمجۆرە کارانە ناکرێ. "**کەی ئێڵ**"ەکان ئامانجی پەروەردەییان هەیە.

قشقەڵەیەك خۆی بە قوورسی هاویشتە سەر چڵووکی سپیدارەکە. پەنجەرەکەم زیاتر کردەوە بۆ ئەوەی باشتر تەماشای بکەم. دەستم شووشەکەی پیس کرد و دڵم بە پیسایی شووشەکە چڵکن بوو. بە دەنگێکی بەرز وتم:

- باوکم هەمیشە حەزی دەکرد ببێتە ئەفسەر. هەرچەند قبووڵیان نەکرد. ئاخر ئەو ناڕەحەتی سیینەکانی هەبوو.

لەناکاو تەمەنی دوازدەساڵی خۆمم بەبیر هاتەوە: خەریکی خاوێن کردنەوەی شووشەکانی تەلاری ماڵمان بووم و جاروبارەش سەیرێکی وێنەی ئەفسەرەکانم دەکرد. وێنەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست، بەپێی تەمەنەوە ڕیز کرابوون. مامە **فرانتس** لەنێوانیان نەبوو. مامە **فرانتس**یش زۆر حەزی لێبوو ببێتە **ئەفسەر**، بەڵام ئەوەندەی دەرس نەخوێندبوو.

- **ڕۆدۆلف**....

دەنگی پێوەدەرانی دەگارم بیست.

- .... بوونە **ئەفسەر** ئارەزووی لەمێژینەتە، "**نیشت وار**" (مەگەر نا؟)

بە بێ وازی وتم: – بەڵام نە ئەمجۆرە، نە لەناو ئۆردۆگادا.

- ئیّ، کەواتە قبوولّی مەکە!

دەسرەکەی دانایە سەر پشتی کوورسییەکەم. نەختێك سووڕامەوە و بینیم ئێلزی لەژێرچاو سەیرم دەکات. چونکە هیچم نەوت، دووبارەی کردەوە:

- کەواتە قبوولّ مەکە.

لە جێگەی خۆم بەرز بوومەوە.

- رایشس فورر وابیر دەکاتەوە بوونی من لە "کەی ئێلّ" بەسوودترە.

ئێلزی کشەوی مێزەکەی کردەوە و کەوچك و چەتاڵەکانی دەچنی. تەنیشتاوتەنیشت دایدەنان بۆئەوەی بکەونە ناو یەکتر. ماوەیەکی کەم لە بێدەنگیدا سەیری ئیش کردنیم کرد. دوایی دەسرەکەم لەپشت کوورسی هەڵگرت و پەڵەی سەر شووشەکەم پاك کردەوە کە بە دەستم پیس ببوو.

سێ رۆژی دیکەش تێپەڕی و رۆژێك دوانیوەڕۆ نامەیەکم بۆ رایشس فورر نووسی کە پێشنیارەکەم قبوولّ کردەووە. بەرلەوەی نامەکەی لاك و مۆر بکەم، دامە ئێلزی بۆئەوەی بیخوێنێتەوە. بە وردی و بە لەسەرەخۆیی خوێندیەوە و خستیە ناو پاکەت و لەسەر مێزەکەی دانا.

نەختێك دواتر وەبیرم هاتەوە کە دەبێ بچمە مارینتال (MARIENTTAL) و ماینەکەم ناڵ بکەم.

لە داخاو زەمەن زوو و ئارام تێپەڕی.

ئۆردوگا تەشکیلاتێکی نموونەیی هەبوو. زیندانییەکان ئیلتزامێکی باشیان هەبوو و ئەمنیش هەستم بە حەسانەوە و رەزامەندییەکی بێ وێنە دەکرد، رابردووی سەربازخانەم بەدەست هێنایەوە.

لە سێزدەهەمی سێپتەمبەری ١٩٣٦، نزیك بەتێپەڕبوونی دوو ساڵ کار و ژیانی ئێمە لە کەی ئێلّ، بە خۆشحاڵی تەواو پلەیەکی دیکەم وەرگرت و

بووم بە "**ئونترشتورم فورر**" (پلەی ملازم دووهەم). ئیتر دوای وەرگرتنی ئەم پلەیە زۆر خێراتر پلەم وەردەگرت. لە ئۆكتبەری ساڵی ١٩٣٨ پلەی "**ئۆبێرشتورم فورر**"م (ملازم یەكەم) وەرگرت و ژانویەی ١٩٣٩ش بە پلەی "هاوپ تشتورم فورر"ی (نەقیب) گەیشتم.

ئێستا دەمتوانی بۆ خۆم و بنەماڵەكەم داهاتوویەكی باش دابین بكەم.

لە ساڵی ١٩٣٧ " **ئێلـزێ**" كوورێكی دیكەی بوو كە بەناوی مامە فرانتسم كرد. بەم كوورەوە ژماری منداڵەكانمان گەیشتە چوار منداڵ. گەورەكەیان "**كارل**" تەمەنی حەت ساڵ بوو. دووهەمیان"**كاترینا**"پێنج ساڵە و سێهەمیشیان "**هێرتا**" چوار ساڵە بوو.

كە بووم بە ئەفسەر، لەجیاتی نیوە ڤێلایەك كە هەمانبوو و جێگەمان زۆر تەسك بوو، بووینە خاوەن ڤێلایەكی تەواو و زۆر باشتر و خۆشتر دەژیان. مووچەی ئەفسەریشم رێگەی خەرج كردنی پێ دەدام، ئیتر ناچار نەبووم وەكوو ساڵانی پێشوو سكمان بە برسێتی بپێڵینەوە و ترسی دوا رۆژمان نەبوو و بە حەزی خۆمان دەمانخوارد و خەرجمان دەكرد.

چەند مانگ دوای ئەوەی بە پلەی سەروانی گەیشتم، هێزەكانی ئێمە چوونە ناو خاكی پۆلۆنیا و من هەر ئەو رۆژە داوام كرد بۆ بەرەی شەڕ بنێردرێم.

رێك دوای هەشت رۆژ، بەیاننامەیەك لەلایەن رایشس فورر بە دەستم گەیشت. ئەو ستایشی ئەو دەستە ئەفسەرانەی كرد كە لە كەی ئێڵ ئەركی ئەستەمی حزبایەتی بەڕێوەدەبەن و یان خۆبەخشانە چوونەتە بەرەی شەڕ لەگەڵ پۆلۆنیا. ئەوەشی تێدا باس كردبوو كە رایشس فورر ناتوانێ تەشكیلات تێكبدات و چیتر بیاننێرێت و هەربۆیەش داوای لە ئەفسەرەكان كرد كە لە داهاتووشدا داوای ئاڵوگۆڕ لە شوێنەكانیاندا

نەکەن و ڕێگەی پێبدەن کە بۆخۆی بۆ "**وافن ئێس. ئێس**" کەسانێکی باش و بەتوانا هەڵبژێرێت کە شایستەی ئەم شوێنانەن.

تا ئەوجێگەیەی پەیوەندی بە منەوە هەبوو، نەدەبوایە بۆ داهاتوو هیچ ئومێدێکم هەبێت. تا ئەوکاتە پێنج ساڵێك بوو کە لە ئۆردوگا بووم و هەموو پلەکانیم بڕیبوو و بەباشی لە هەموو شتێك دەگەیشتم و هەربۆیەش ئومێدێکی کەمم هەبوو بۆئەوەی بۆ بەرەی شەڕ بەڕێبکرێم. بەمحاڵەشەوە کاتێك کە بیرم لەو هاوڕێیانەم دەکردەوە کە لە بەرەی شەڕن و دەجەنگن، زۆر بە سەختی دەمتوانی درك بەم پیشە ئیدارەییە بکەم کە چوار پێنج ساڵ بوو تێیدا گرفتار ببووم.

پۆلۆنیا، هەر ئەمجۆرەی چاوەڕوانی لێدەکرا، بە خێرایی ڕامالّدرا و شەڕ کۆتایی پێهات.

بەهاری ۱۹٤۰ داهات. لە هەموو شوێن باس باسی "هێرشی بروسکئاسا" (تاکتیکی ئەرتەشی هیتلێر لە شەڕی دووەمی جیهانی)دەکرا. فورر لە سەرەتای مانگی مەی، نوتقێکی گرنگی لە "**رایشتانگ**"دا (پەرلمانی شۆرای نەتەوەیی ئەڵمانیا) فەرموو. ئەو لەو خیتابەیەدا ڕایگەیاند:

- ئێستا کە پۆلۆنیایەك لەئارادا نییە و "**دانتزیگ**" بۆ ناو باوەشی دایکی وەتەن گەڕاوەتەوە، ئیتر دیموکراسییەکان هیچ هۆیەکیان نییە لەگەڵ **رایش** (ئیمپراتۆر) لەسەر مەسەلەکانی ئەورووپا دژایەتی بکەن. ئەگەر ئەوان نایانهەوێ بە برایانە و ئاشتیانە بێنە پێش، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەروەرە جوولەکەکانیان دژایەتی ئەم هەوڵەیان دەکات. — ئەنجام روونە: ڕێکخراوی جیهانی یەهوود وابیر دەکاتەوە کە کاتی ئەوە هاتووە دژ بە **رایش** یەکبگرن و حزبی ناشنال سۆسیالیسمیش رووماڵ

بکەن. ئەڵمانیا لەم ململانێیەدا ناچارە بۆ جارێکی دیکە ریسك بکات و بەدوای چارەنووسی خۆی بکەوێت. بەڵام ئەگەر دیموکراسیەکان رێکخراوی جیهانی یەهوود پێیان وایە سەرژمێری ۱۹۱۸ ئیتر دەتوانێ دووبارە بێتەوە، بێشك بەسەختی تووشی خۆفریوی بوونە:
رایشی سێیەم بە ئیرادەیەکی بەهێز و بە پاڵپشتی ئێوە سەربازانی ئەڵمانی ئامادەیە پێ بنێتە گۆڕەپانی ئەم ململانێیە!
فورر بە گەورەیی و شکۆوە رایگەیاند کە :
- دووژمنانی حکوومەتی ناشنال سۆشیالیزم خێرا و بە توندی تەمبێ دەکرێن، بەڵام جوولەکەکان، لە هەر شوێنێك رێگرمان بن و بیانبینین، یان بەدەستمان بکەون، ئەوا لەسەر لاپەڕەی رۆژگار پاکیان دەکەینەوە!
سێ رۆژ دوای ئەو نوتقە فەرمانێکم لە رایشس فورر ئێس. ئێس بەدەست گەیشت کە بۆ رێکخستن و گۆڕینی سەربازخانەی پێشووی تۆپچیانی پۆلۆنی بە ئۆردوگای راگرتنی ئەسیران بۆ پۆلۆنیا بچم.
ئەم "کەی ئێل"ە نوێیە دەبوایە ناوی قەڵایەکی نزیك خۆی بەناوی "ئاوش ویتس"[۳۳]ی لێ بنرێت.

---

[33] - ویلیام ل. شایرر میژووناس بە تێروتەسەلی باسی "پێکهاتن و لەناوچوونی رایشی سێیەم "هیتلێر" دەکات و لەبارەی ئەم ئۆردوگایە کوشتارگەیەدا دەنووسێت: "لە بیست و یەکەمی فێبریەی ۱۹٤۰، ریچارد گلوکس چاودێری گشت ئۆدروگا زۆرەملییەکان هەواڵی ئەوەی بە هیملێر دا کە لەکاتی سەردان و گەشتەکانیدا لە نزیك کراوکووی باشووری پۆلۆنیا شوێنێکی باشی بۆ ئۆردوگا دۆزیوەتەوە. ئاوش ویتس شوێنێکی دوورکەوتە بوو بە دوازدە کەس جەماوەر کە چەند کارگەی تێدابوو و پێشووتر سەربازخانەی سواراکارانی نەمسا بووە. ئیش خێرا دەستی پێکرد و ئاوش ویتس بەشێوەی فەرمی وەکوو ئۆردوگای کار و ئیشی زۆرەملی دەستی بەکار کرد بۆ زیندانیانی سیاسیی کە ئەڵمانییەکان دەیانویست بە توندوتیژییەکی تایبەت هەڵسووکەوتیان لەگەڵ بکەن. لە بەهاری ۱۹٤۰ بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئۆردوگای نوێ و پێکهێنانی کرێکاری گەیاندنی کۆیلە، گرووپێك لە پیاوخراپان و شەرەنگێزانی ئێس. ئیس کە "یۆزێف کرامێر" و "رۆدۆلف فرانتس هۆس"شیان لەگەڵ بوو. ئەم هۆسە پیاوکووژێکی مەحکووم بە

بڕیارم دا جاریَ ئێلزێ و منداڵەکان هەر لە ئۆردوگای داخاو بهێڵمەوە و خۆم لەگەڵ "ئۆبێرشتورم فورر زێتسلێر" و "هاوپت شار فورر بێنز" (بەڕێوەبەری ئیداری) و شوفێرێك بەڕێ کەوتم. نیوەی شەو گەیشتینە ئاوش ویتس. لە خانوویەك کە داگیر کرابوو خەوتین و بەیانییەکەی ئۆردوگای پێشووم سەیر کرد.

سێ کیلۆمەترێك لە قەڵادوور بوو، بەڵام کەی ئێل دەبوایە زۆر زیاتر لە سەربازخانەی پۆلۆنییەکان پەرەی پێبدرێ و بەهەرحاڵ دەبوایە "لاگێر"ێکی (ئۆردوگا) دیکە لەو نزیکیانە دروست بکرێت کە تەنانەت "بیرکێناو"یش (ئۆردوگای کوشتاری بە کۆمەڵی یەهۆدییەکان) لەخۆوە بگرێت. دەوروبەری هەر دوو ئۆردوگا، ناوچەیەکی پان و بەربڵاوی نزیك بە هەشت سەد هیکتار لە خاوەنەکانیان داگیر کرابوو و یان کشت و کاڵی تایبەتی تێدا بکرێ یان کارگەی تێدا دروست بکرێ.

سەرتاسەری ناوچەکەم لەملاوە بۆ ئەولا بینی. وەکوو بەری دەست ساف بوو، جگە لەوەیکە چەند قوڵکە ودارستانی بچووکی تێدابوو. ڕێگەکانی زۆر خراپ بوون و دیار نەبوون و زۆرجار ڕێگەکان دەپچڕان. تاك تاك خانوویەك دیار بوو کە لەم دەشتە رووتەنەدا بەرچاو دەکەوتن. ئەم ماوە زۆرەی کە لەم دەشتەدا خەریکی گەڕان و سەیر کردنی بووم، رووحلەبەرێکم نەدیت.

---

ئێعدام بوو کە پێنج ساڵ لە زیندان مایەوە. ئەو زۆرینەی ژیانی دوای ئەوەی باڵغ بوو، سەرەتا لە زیندان و دوایی بوو بە زیندانبان و لە ١٩٤٦ بە تەمەنی چل و شەش ساڵی لە دادگای نۆرنبێرگ لەوەیکە لە ئۆردوگای ئاوش ویتس چاودێری کووشتنی دوو ملیۆن و نیو کەس بووە، ستایشی خۆی دەکرد.

ئوتۆمبێلەکەم راگرت و بە تەنیایی چەند سەد مەترێکم پێوا بۆئەوەی پێیەکانم وەجووڵە بکەون. کەش و هەوایەکی بێ تامی هەبوو کە بۆنی باڵندەی مرداربووی لێدەهات و بێدەنگییەکی قوورس سەرتاسەری ئەوێ گرتبوو. خۆر هاوتەرازی خاك بوو و هێڵێکی رەشی پێکهێنابوو کە بە زەحمەت دەتتوانی لە چەند شوێندا چەند دارێك ببینی. بەپێیچەوانەی ئەم وەرزە ئاسمان لەخوار و هەوا بارانی بوو و پارچە هەورێك ئاسمانیان گرتبوو. تا ئەو جێگەیەی چاو کاری دەکرد هیچ گیانلەبەرێك نەدەژیا و نەدەبینرا. سەحرایەکی ساف و بەربلاو، دەشتێکی وەکوو بەری دەست.

بۆلای هاورێیان گەرامەوە. لە سواربوونی ئوتۆمبێلْ هەستم بە خۆشی کرد.

میروستان ئۆردوگاکانی پۆلۆنیان وێران کردبوو. یەکەم کارم ئەوە بوو کە دەبوایە خاوێن بکرێنەوە. دو کارگە لە هامبورگ برێکی زۆر دەرمانی مێرو کوژیان بۆ ناردم. کارپێکردنی ئەم دەرمانە زۆر خراپ و مەترسیدار بوو و هەر بۆیەش دوو کرێکاری لێزانیشیان لەگەڵ ناردبوو، بۆ ئەوەی کاری لەناوبردنی مێروستان وجاڵجاڵۆکە و مشك و ..... بۆخۆیان بەرێوەببەن. گروپێك کۆماندۆی پێکهاتوو لە ئەسیرەکانی پۆلۆنیشیان پێدام بۆ ئەوەی دیرەك بچەقێنن و تێلدروو بکێشن و پێداویستییەکانی دیدەوانی هەردوو ئۆردوگا دروست بکەن. هەروەها دەبوایە دوو شوێنی جیاواز بۆ وەرگرتنی یەهوودیەکان و ئەسیرانی بەرەی شەر پێکبهێنن.

دوای ماوەیەك گروپەکانی ئێس. ئێس گەیشتن و سەربازخانەکانیان داگیر کرد. یەکەم ڤێلاکانی ئەفسەران دروست کرا و لە هەمان رۆژ کە لەشکەرکێشی پر لە شانازی ئەڵمانیا بۆ فەرەنسا کۆتایی پێهات، یەکەم

گروپ لە زینـدانیانی یـەهوودیش گەیـشتن و ئـەوانیش پێیـان سـپێردرا ئۆردوگای تایبەت بەخۆیان دروست بکەن.

لە مانگی ئوت توانیم ئێلزی و منداڵەکان بۆلای خۆم بێنم.

ڤێلای ئەفسەرەکان پشتی لە ئۆردوگا و روویان لە قەڵای ئاوش ویتس دابوو، کەنیسە و دوو بورجی زۆر باشکۆی هەبوو کە زۆر بەرز بوون. لە دەشتێکی ئاوا بەربڵاو و یەکدەست، ئەم دوو بورجە هەر لە دوورەوە دیار بوون و هەربۆیەش خانووەکانم بەرەو ئەوێ درووست کردن.

خانووەکان لە دار دروست کرابوون و جێگەیان زۆر بوو و تەنانەت هەر خانوویەی باغچەیەکی بچووکیشی تێدابوو.

ئێلزی لەم شوێنە زۆر خۆشحاڵ بوو و بەتایبەت ئەم خانووبەرە بەجۆرێك ساز کرابوو کە بەردەوام ئـاوی گـەرمی هـەبوو و هـەر کـە خانووەکـەم پێشکەشی کرد، زۆر خۆشحاڵ بوو و توانی لە گوندی ئاویش ویتس قەرەواشێك (خزمەتگوزارێك) پەیدا بکات و منیش بۆ بەڕێوەبردنی کار و ئیشی سەخت دوو زیندانیم لەژێر دەستی نا.

بەپێی فەرمانی رایشس فورر ئەرکی ئەوەم پێسپێردرابوو کە جگە لە دروستکردنی ئۆردوگا، ئەو زەلاو و ئاوە ماوەکانی دەورووبەری رووباری "وایش زل" وشك بکەم بۆ ئەوەی بە کەڵکی کشت و کاڵ بێن و بکرێن بە کێڵگە. بەخێرایی زانیم کە دەبێ ئەو هەوڵ و کارانەی کە بۆ فون یەزریتس بەڕێوەم بەردووە، لێرە بەشێوەیەکی بەربڵاوتر دەبێ بەکاری بەرم و ئەگەر بە بەنداوێك پێش لە ئاوەکانی وایش زل نەگرم، بەهیچ شێوەیەك بە زلکاوکێشی ناتوانم بە ئامانجم بگەم.

چەند پرۆژەیەکم دارشت و بەیارمەتی ئامێر و ئەشیای دەستی کە ئامادەم کردبوون، پلانێکی باشم رێکخست و رایشس فوررم ئاگادار کردەوە کە بۆ بەڕێوەبردنی ئەمکارە پێویستیم بە سێ ساڵ هەیە.

دوای چوار رۆژ رایشس فورر وەڵامی دامەوە کەیەك ساڵ کاتی پێداوم.

رایشس فورر، ئێس. ئێس.ەکانی بە سزای کەمترین تاوان تەمبێ دەکرد، ئەویش بە توونـدترین شێوە و تەنانەت ئێعدامیشی دەکردن و منیش ئاگاداری چارەنووسی خۆم بووم کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەتوانم ئەرکی پێسپێردراو بەباشترین شێوە بەڕێوەبەرم، ئەوا چ چارەنووسێکم دوبێ. جل و بەرگ و ئەشیای تایبەتی خۆمم هەڵگرت و رۆیشتم لەوێ مامەوە. شەو و رۆژ کارم لە زیندانییەکان دەکێشا. کوشتن و مردن لەناو ئەواندا بوارێکی ترسناکی پێکهێنا، بەڵام بە خۆشییەوە ئەم مەسەلەیە کەمترین کەمتەرخەمی لەئێمەدا پێکنەهێنا، چونکە زیندانی نوێ جێگەی زیندانییە مردووەکانی دەگرتەوە.

ئێس. ئێس.ەکانی منیش تا مردن خۆیان تەرخانی ئەم ئیشە کرد: زۆربەی ئەوانیش لە بچووکترین کەمتەرخەمیدا پلەیان کەم دەکراوە و دوو لە "شارفورر" (عەریف)ەکانم بەهۆی کەمتەرخەمی تیرباران کرد.

لە کۆتاییدا، بیست و چوار کاتژمێر پێش کۆتایی کاتی دیاریکراو پرۆژەکە تەواو بوو. رایشس فورر بۆخۆی بۆ کردنەوەی ئۆردوگایەکە هات و بەرامبەر بە ئەفسەرانی کەی ئێل وتارێکی خوێندەوە و لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانینی خۆی ئاراستەی ئێمە کرد کە بەم شێوەیە ئەم پرۆژە گەورەمان کۆتایی پێهێناوە و وتی: – حکوومەتی ناشناڵ سۆشیالیست شەڕەکەی دەباتەوە و چونکە لە بەڕێوەبردنی پرۆژە وپلانەکانیش وەکوو

هەوڵەکانی ئابووری رۆڵی بنەڕەتی "یانی کەڵك وەرگرتن لە کات" بە باشی دەناسێت.

دە رۆژ دوای سەردانی **رایشس فورر** فەرمانی وەرگرتنی پلەیەکی سەرووتر "**ئشتورم بان فورر**" (رائید)م وەرگرت.

بەڵام بەدبەختانە بەندئاوەکە تووشی کاردانەوەی بەپەلیی بوو کە لەکاری بیناکردنی بەڕێوەمان بردبوو.

رێك دوو هەفتە دوای سەردان و کردنەوەی ئۆردوگا لەلایەن **هیملێر** بارانێکی زۆر لە هەموو ناوچەکەدا باری، **وایش زل** سێڵاوێکی بێ پێشەکەی کرد و بەشێکی لەو هونەرە شکۆمەندەی بە تەواوی لەگەڵ خۆی گێسك لێدا و بردی. پێویست بوو سەرلەنوێ داوای پارە و ئامێر و ئامراز بکەین بۆ ئەوەی دەست بەکار بینەوە و لەگەڵ ئەمەش دەبوایە بۆ باشتر و پتەوترکردنی کارەکەمان سەر لەنوێ دەست پێبکەینەوە.

کەی ئیڵی "**بیرکێناو – ئاوش ویتس**" وەکوو شارێکی دێوئاسای لێهات، لەگەڵ ئەوەیکە ئۆردوگایەکە رۆژبەرۆژ گەورەتر دەبوو، بەڵام سەبارەت بە هێنانی هەموو رۆژەی زیندانییەکان دیسانیش جێگەمان کەم بوو.

نامە لە دوای نامە بوو کە بۆ رێکخراوی **ئێس. ئێس**.م دەنارد کە ئاهەنگی ناردنی زیندانییەکان هێواشتر بکات. پێم راگەیاندن کە نە بۆ ئەم هەموو زیندانیانە هۆڵی داپۆشراوم هەیە و نە خواردەمەنیشم بۆ خواردنیان هەیە. هەموو نامەکانم بێ وەڵام دەمانەوە و ناردنی زیندانی هەروا بەردەوام بوو. لە ئەنجامدا، لاگێر تووشی بارودۆخێکی زۆر مەترسیدار بۆوە. نەخۆشییەکان ماڵوێرانکەر بوون. هیچ ئامرازێکم بۆ بەربەرکانی لەگەڵ نەخۆشییەکان نەبوو و رێژەی مردن بە خێرایی زیاتر دەبوو. بەرامبەر هاتنی شەمەندەفەرەکان کە پڕ بوون لە زیندانی، بێ توانا ببوم.

تەنیا ئەوەم لەدەست دەهات کە دسپلینی ناو زیندانییەکان رابگرم کە لەزۆر نیژاد و نەتەوە بوون. بەڵام ئەمەش کارێکی زۆر سەخت و دژوار بوو، چونکە بەو رادەیە کە شەڕ پەرەی دەستاند، خۆبەخشانی بەشی "جومجومە"ش (نیگابانی ئۆردوگاکان) زیاتر دەبوون و دەهاتنە ریزی ئێس. ئێس.ی ئەڵمانی و لەجیاتی ئەوان بەتەمەنترەکانی ئێس. ئێس.یان بۆ من بەرێ دەکرد. بەداخەوە لەنێوان ئەواندا خەڵکانی بەشك و گومانلێکراوی تێدابوو کەئەمەش کاری ئێمەی سەخت و دژوارتر دەکرد.

چەند مانگێك ئاوا تێپەڕی تا ئەوەیکە لە بیست و دووهەمی ژۆئەن، پێشەوا لەگەڵ ورماخت هێرشی کردە سەر رووسیا. لە بیست و چوارەمی هەمان مانگ، بەیاننامەیەك لە لایەن رایشس فورر گەیشت کە تێدا رایگەیاندبوو لەمەوبەدوا ئەفسەرانی کەی ئێل‌یش دەتوانن خۆبەخشانە داوای چوونە بەرەی شەڕ بکەن. هەر ئەم شەو داواکارییەکەم نارد و شەش رۆژ دواتر هیملێر بۆ بەرلین لەدوای ناردم.

بەپێی ئەم فەرمانەی کە ئەو لەسەر پێداگر بوو بۆئەوەی زۆر بەنزین سەرف نەکەین، بۆ رۆیشتنم بۆ بەرلین سواری شەمەندەفەر بووم.

پایتەخت، تای هەبوو. کۆڵانەکان پڕ لە ئۆنیفۆرمپۆش و شەمەندەفەرەکان پڕ لە سەرباز و لە هەموو شوێن باس باسی یەکەم سەرکەوتنی ئەڵمانییەکان بەسەر بلشویکەکان دەکرا.

رایشس فورر شەو منی بینی.ئەفسەرە سکرتێرەکەی، منی بۆ ژووری ئیداری رێنوێنی کرد و چووە دەرەوە. دوو دەرگای بەدوای یەکی لەپشت سەری خۆی داخست.

سڵاوم کرد و دوایی رایشس فورر وەڵامی سڵاوی دامەوە وبۆلای رۆیشتم.

چرایەکی پایەدار ژوورەکەی نیوە رووناک کردبوو. **رایشس فورر** بێجووڵە وەستابوو و رووخساری لە تاریکی دابوو.

جووڵەیەکی کەمی بە دەستی راستی دا و وتی: - فەرموون دانیشن، تکایە.

دانیشتم. بازنەی رووناکی چرایەکە نیشتە سەر رووخسارم و وام هەست کرد کە رووپۆش لەسەر رووخسارم لادراوە!

لەوکاتەدا زەنگی تەلەفۆن وەدەنگ هات. **هیملێر** تەلەفۆنەکەی دەست دایە و بە دەستی دیکەی ئیشارەی پێ کردم هەر لەو شوێنە بمێنمەوە. گوێم لێبوو کە **رایشس فورر** لەبارەی کەسێك بەناوی **وولفس لانگ** و هەروەها لەبارەی **کەی ئێڵی "ئاوش ویتس"** قسە دەکات. هەستم بە شەرمەزاری کرد کە گوێم لە قسەکانی ئەو راگرتووە و وازم لە گوێگرتن هێنا. چاوەکانم داخست و خۆم خەریکی سەیر کردنی ئەشیاکانی دەوروبەرم کرد و وام نواند کە سەرگەرمی سەیر کردنم.

هاندی تەلەفۆنەکە دانرا ودەنگێکی وشکی لێ دەرهات. سەرم بەرز کرد و **هیملێر** خێرا وتی:

- **ئشتورم بان فورر**! خۆشحاڵم لەوەی پێت بڵێم کە **گروپن فورر گوئرتس** (عەقید گوئرتس) چاودێری ئۆردوگاکان، لەبارەی چالاکییەکانی ئێوە وەکوو فەرماندەی ئۆردوگا، راپۆرتێکی باشی لەبارەی تۆ بە من داوە. لەلایەکی دیکە ئاگادار بوومەوە کە نامەیەکت سەبارەت بەوە ناردووە کە دەتهەوێ بەشێوەی خۆبەخشانە بچیتە بەرەی شەڕ.

- راستە، **هێر رایشس فورر**.

- ئایا ناردنی ئەم نامەیەت بۆ هەستی وەتەن پەرەستانە بگێڕمەوە یان ماندووبوونت لە **کەی ئێڵی "ئاوش ویتس"**

- بێشك هەستی نەتەوەپەرستانەی منە، هێر رایشس فورر.

- لەم رووییەوە خۆشحاڵم. مەسەلەی گۆڕینی شوێن و ئەرکی تۆ جێگەی باس نییە و من تۆم بۆ بەڕێوەبردنی چەند پرۆژەیەك و پلانێك دەوێت و مانەوەت لە "ئاوش ویتس" مسۆگەرە و لە بەرژەوەندی نەتەوەکەت دایە.

بێدەنگییەك رووی دا و دوایی وتی: - ئەم بابەتەی کە ئێستا لەگەڵت باسی دەکەم، مەحرەمانەیە، سڕڕیە. داواتان لێدەکەم بە شەرەفتان سوێند بخۆن کە لەبارەی ئەودا بێدەنگییەکی تەواو بکەی و هیچ کەس لێت نەزانێت.

سەیرێکی کردم.

لە ئێس. ئێس.دا زۆر بابەتی نهێنی هەبوو. نهێنی پارێزی گرنگترین ئەرکی ئێمە بوو کە پێنەدەچوو بۆ نهێنی راگرتنی هەر شتێك سوێندێکی دووبارە بخۆینەوە.

هیملێر دووبارە وتی: - دەبێ ئاگادار بن کە ئەم مەسەلەیە تەنیا مەسەلەیەکی نهێنی ئیداری نییە، بەڵکوو تایبەتە و نهێنییەکی گرنگی حکوومییە!

لە تاریکیدا نەختێك چووە دواوە و بە دەنگێکی جددی وتی:

- ئشتورم بان فورر، حەز دەکەن بە شەرافەتی ئەفسەری ئێس. ئێس.تان سوێند بخۆن کە لەم نهێنی و رازە لەگەڵ هیچ گیانلەبەرێك نەدوێن؟

بێ هیچ دوودڵییەك وتم: - وەکوو ئەفسەرێکی ئێس. ئێس. بە شەرافەتم سوێند دەخۆم.

دوایــی ماوەیــەکی کــوورت وتــی: – ئاگــادارت دەکەمــەوە کــە نــابێ ئــەم نهێنییە لای هیچکەس بدرکێنی، تەنانەت ئەفسەریی فەرماندەت **"گرووپن فورر گوئرتس"**!

خـۆم لـە بـارودۆخێکی خراپـدا دیـت. لەکاتێکـدا کاروبارەکـانی ئۆردوگـا پەیوەنـدی بـە رایـشس **فـورر** بـوو، غـەیری سرووشـتی نـەبوو ئەگـەر ئـەو فـەرمانێکی راسـتەوخۆم پێبـدات کـە لـە رێگـەی **گـوئرتس**ەوە نـەبووبێت، بـەڵکوو بەپێـچەوانە، تووشـی سەرسـووڕمان هـاتم کـە ئـەم مەسـەلەیە بـێ ئاگاداری ئەو ئەنجام بدات.

وابــزانم **هیملێــر** فکــری مــنی خوێنــدەوە و وتــی: – نــابێ تووشــی سەرسووڕمان بی. ئەمە بەهیچجۆرێك بەمانای بێ متمانەیی بە **"گرووپن فــورر گــوئرتس"** چـاودێری ئۆردوگاکانــەوە نییــە، ئــەو بێــشك ئاگــادار دەکرێتەوە. بۆخۆم لە کاتێکی باشدا ئاگاداری دەکەمەوە.

رایشس **فورر** سـەری جوولانـد و خـوارووی رووخـساری لـەژێر رووناکی چرا روون بوو. لێوە باریکەکانی کە دەورووبەریان بەپاکی تاشرابوون، بە ددانەکانی رێککوشران.

بە شەرمەزارییەوە وتی:

**فــورر** فــەرمانێکی ســەبارەت بــە "چارەســەری کۆتــایی جوولەکــەکانی ئەورووپا" دەکردووە. ئێوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە هەڵبژێردراون.

من سەیریم کرد و بە دەنگێکی وشك وتی:

– بێدەنگی، بەڵام خۆ دەربازبوون لەدەست جوولەکەکان شتێکی تازە نییە.

– نایێن، هێر رایشس **فورر**. تـەنیا لەوەیکە منیـان هەڵبـژاردووە تووشـی سەرسووڕمان هاتووم...

قسەی منی بڕی: – هۆکاری ئەم هەڵبژاردنە دەزانی. دەبێتە هۆی سەربڵندیتان. فورر وابیر دەکاتەوە کە ئەگەر ئێمە "هەر ئێستا" جوولەکەکان لەناو نەبەین، دوای ماوەیەکی کوورت ئەوان ئەڵمانیا لەناو دەبەن. کەواتە مەسەلەکە ئاوای لێدێت، یان ئەوان، یان ئێمە.

بە دەنگێکی بوێرانە و توند وتی:

- ئشتورم بان فورر! ئایا لەوکاتەی کە لاوەکانی ئەڵمانی لەگەڵ بلشویزمەکان شەڕ دەکەن، ئێمە حەقی ئەوەمان هەیە بێڵین نەتەوەی ئەڵمانیا لەگەڵ مەترسییەکی ئاوا گەورە رووبەڕوو بێتەوە؟

بە بێ شك و دوودڵی وتم: – ناین، هێر رایشس فورر.

بەری هەر دوو دەستی رێك لەسەر ناوقەدبەندەکەی دانا و بە رەزامەندییەوە وتی: – تەنانەت یەك ئەڵمانی نادۆزرێتەوە کە جگە لەوە وەڵامێکی دیکە بداتەوە.

بێدەنگییەك رووی دا. دوایی چاوەکانی بڕیە سەر شوێنێکی سەرووی من و وەکوو ئەوە دەچوو بابەتێك لەرووی نووسراوە دەخوێنێتەوە و وتی:

- من کەی ئێڵی "ئاوش ویتسم" وەکوو شوێنی پرۆژەکە هەڵبژاردووە و خۆشت وەکوو بەڕێوبەرەی کەی ئێڵی "ئاوش ویتس" هەڵبژاردوی، چونکە چوار هێڵی ئاسنین لەوێ بە یەکە دەگەن و بۆ هاتوچوو باشترین شوێنە و لەبەردەستتر دایە. هەروەها ناوچەیەکی پەرتە، جەماوەرێکی کەمی هەیە و (دەنگی هێنایە خوار و چاوی لە چاوی من بڕی) خۆشت بەهۆی توانایی بێ وێنە لەکاروباری تەشکیلاتی (نەختێك لە تاریکیدا جوولەی کرد و بەردەوام بوو) ئەو ویژدانە پاکەی کە هەتە، هەڵمبژاردووی. دەبێ ئەوە بزانی کە ئێستا لە پۆلۆنیا سێ ئۆردوگای کوشتن خەریکی پرۆژەکەن: "بێلزێك"، "ویلزێك" و "ترێبلینکا". ئەم

ئۆردوگایانە جێگەی رەزامەندی نیین. یەکەم ئەوەیکە بچووکن و شوێنی گەورەکردنیان نییە، دووهەم لەرووی رێگە و بانیش باش نیین، سێهەم شێوەی چالاکییان کامڵ نییە. بەپێی راپۆرتێك کە لەلایەن فەرمانەدەی ئۆردوگای "**ترێبلینکا**" بەدەستم گەیشتووە، لەماوەی شەش مانگ نەیتوانیوە زیاتر لە هەشتا هەزار جوولەکە لەناوببات. (**رایشس فورر** نەختێك بێدەنگ بوو) — ئەوە ئەنجامێکی خراپە.

نەختێك وەستا و دووبارە لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی: — لەماوەی دوو رۆژ "**ئۆبێرشتورم بان فورر وولفسلانگ**" (موقەدەم دووهەم وولفسلانگ) سەردانت دەکات و باس لە گرنگ بوونی هێنان و بردنی زیندانیەکان لە مانگەکانی داهاتوودا دەکات. دوای دیتنی ئەو بۆ "**لاگێر ترێبلینکا**" دەچی و سەیری شێوەی لەناو بردنی جوولەکەکان دەکەی و بەرنامەیەکی باش بۆخۆت دادەرێژی. لەماوەی چوار هەفتەدا، رێك چوار هەفتە پرۆژەیەکی مێژوویی بەپێی ئەرکی پێسپێردراو دەدەیتە من.

به دەستی راست ئیشارەیەکی بچووکی پێکردم.

لەسەر جێگەم هەستام.

- هیچ کێشەیەك لەئارادا هەیە؟
- **ناین، هێر رایشس فورر.**
- زۆر باشە، (زۆر جددی، بەڵام بێ ئەوەی دەنگی بەرز بکاتەوە وتی)

— "**داس ئیست ئەین بەفل دێس فۆرێرس**"! (ئەوە فەرمانی پێشەوایە) لە ئێستاوە ئەرکی قوورسی بەڕێوەبردنی ئەم فەرمانە بە ئەستۆی تۆیە.

رێك وەستام و وتم: — **یاوول، هێر رایشس فورر!**

لە بێدەنگی ژوورەکەدا، دەنگی خۆمم بە لاوازی هاتەبەر گوێ.

رێک وەستام و پانییەکانم لێکدان و ئەویش رەتی رێزەکەی دامەوە. وەرسووڕامەوە و بۆ لای دەرگا بەڕێکەوتم، هەر کە لە بازنەی رووناکایی چراکە بەدەر کەوتم تاریکایی ژورەکە دایگرتم وهەستم بە سەرمایەکی زۆر کرد.

هەر ئەم شەوە بە شەمەندەفەر گەڕامەوە. لەناو شەمەندەفەر و لەو سەربازانەی کە بۆ بەرەی شەڕ لەگەڵ رووسیا بەڕێدەکران، سەرم سووڕ مابوو. سەرەتا ژوورێکم دۆزیەوە، بەلام ئۆبێرشتورم فوررێک هەستایە سەرپێ و جێگەی خۆی پێدام. سەبارەت بە هێرشی ئاسمانی چراکانی ناو ژوورەکانی شەمەندەفەر رووناکییەکی ئەوتۆیان نەبوو و پەردەکانیان بە تەواوی کێشابوو. دانیشتم. شەمەندەفەر لەناکاو هەڵکەنرا و بە هێوری و بە دەنێگێکی پڕئازار بەڕێکەوت. هەستم بە ماندوویی دەکرد، بەلام خەوم لێ نەدەکەوت.

بەیانی داهات و توانیم سەرخەوێك بشکێنم. لە سەفەرەکەمدا هەرچەند شەمەندەفەر بەردەوام و زوو بە زوو دەوەستا. جاریوابوو شەمەندەفەر دوو تا سێ کاتژمێر دەوەستا و دوایی زۆر بە هێواشی بەڕێدادەڕۆیشت، دیسان دەوەستاوە و دیسانیش بەڕێدەکەوتەوە. نزیك نیوەڕۆ خواردن و قاوەی گەرم دابەش کرا.

رۆیشتمە رێڕەوەکە بۆئەوەی جگەرەیەك بکێشم. ئۆبێرشتورم فورر کە جێگەی خۆی پێدابووم بە حاڵەتی دانیشتوو لەسەر جانتا سەفەرییەکەی خەوی لێکەوتبوو. بەخەبەرمهێنا و وتم نۆرەی تۆیە لە شوێنی خۆت بخەوێ. لەخەو هەستا و خۆی ناساند و چەند خوولەکێك بەیەکەوە قسەمان کرد، لە کەی ئێڵی "بوخون والد" پلەی بەڕێوەبەرایەتی هەبوو و لەسەر داواکاری خۆی بەڕێیان کردبوو بۆ "وافن ئێس. ئێس" و ئێستا

دەرۆیشت بۆ رووسیا و دەبوایە خۆی بە بەرەی شەڕ ناساندبا. لێم پرسی رازییە؟ بە پێکەنینەوە پێی وتم:

- یا، زێر (بەڵێ، زۆر).

بالآبەرز و موو زەرد و خۆش قەڵافەت بوو و بەژن و بالآیەکی باریکی هەبوو. واپێدەچوو بیست و دوو ساڵێك لە تەمەنی تێپەڕاندبێ. لە کۆمەڵکوژی پۆلۆنیا بەشداری کردبوو و بریندار ببوو و دوای هاتنەدەری لە نەخۆشخانە بۆ کەی ئێلی "بوخن والد" گوازرابۆوە کە زۆری پێ ناخۆش بوو و بێ واز و لەخۆی بێزاری کردبوو. دیویست بڕوات و خۆی راتڵەکێنێت و شەڕێ بکات. جگەرەیەکەم پێدا و بە زۆی ناردمە شوێنەکەی خۆی بۆئەوەی بحەسێتەوە.

شەمەندەفەر خێرایی وەرگرت و گەیشتە سیلزی. بینینی ئەو سرووشتە جوانانە کە بۆ من ئاشنا بوون، بەری دڵیان گرتم. شەڕەکانی "فەوجەکانی ئازاد" لەگەڵ سوکەڵەکانی پۆلۆنیم وەبیر هاتەوە بە فەرماندایەتی روسباخ. چ شەڕێکمان کردبوو. چ دەستەیەك بووین و چ بێنە و بەرەیەکمان هەبوو. منیش تەنیا حەزم لە شەڕ بوو. ئەوکات تەمەنم بیست ساڵ بوو و زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە هەموو ئەو رۆژانە تێپەڕین و تەنیا بیرەوەرییەکانی ماون کەپێیان دڵخۆش بم. ئای لەو رۆژانە!

لە وێستگەی ئاوش ویتس تەلەفۆنم بۆ ئۆردوگا کرد کە ئوتۆمبێلێکم بۆ بنێرن. کاتژمێر نۆ بوو. لە نیوەڕۆوە بۆ ئەملایە هیچم نەخواردبوو و هەستم بە برسێتی دەکرد.

دوای پێنج خوولەك ئوتۆمبێلەکە گەیشت و منی بۆماڵەوە بردەوە. چرای ژووری خەوی منداڵەکان هەڵبوو. زەنگی دەرگام لێدا و دەرگام بە

کلیلی خۆم کردەوە. کڵاوەکەم لەسەر مێزەکە دانا و بۆ ژووری چێشتخانە ڕۆیشتم. زەنگم لێدا وخزمەتکار کە هات، پێم وت هەرچی هەمانە بیهێنێ. پەنجەوانەکانم دانەکەندبوو. هینامنەدەر و گەڕامەوە لای کڵاوەکە دایانبنێم، کەچی دەنگێ پێیەکم بیست. سەرم کە گەڕاندەوە، ئێلزیم بینی کە لە قادرمەکان دێتەخوار. منی کە بینی پێی سەیر بوو. سەیرێکی کردم و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و پاڵی بە دیوارەوە دا. بە دەنگێکی نزم وتی:

- ئەوە دەڕۆی؟

بەسەرسووڕمانەوە وتم:

- دەڕۆم؟

- بۆ بەرەی شەڕ؟

رووم لێوەرگێڕا و وتم:

- نەخێر.

بە تەتەپەتە کەوت و وتی: بەڕاست؟ بەڕاست؟ کەواتە ناڕۆی؟

- نەخێر

- ڕەنگ و رووی لە خۆشیان کرایەوە. هەر چوار قادرمەی بە هەنگاوێك بڕی و خۆی لە باوەشی من هاویشت.

وتم: – ئەوەندە سەختی مەگرە!

هەر ئەمجۆرە روومەتی ماچ باران دەکردم. پێدەکەنی و فرمێسك لە چاوەکانی دەباری.

پرسی: – کەواتە ناڕۆی؟ یانی ناڕۆی؟

- نا.

سەری بەرز کرد و بە هەستێکی پڕ لە شادی و خۆشی وتی: – "گوت زای دانك" (خوایە شوکرت).

رقێکی نادیار و بیٚ ناو هەموو جەستەی داگرتم. قیژاندم: – خەفە بە!

دوایی بە خێرایی لەسەر پانییەکانم سووڕام، پشتم تێی کرد و بۆ ژووری نانخۆری ڕۆیشتم.

خزمەتکار سفرەی پان کردبوو و قاپەکانی چنیبوو.

دانیشتم.

دوای ماوەیەکی کوورت ئێلزی هاتە ژووریٚ، لە تەنیشتم دانیشت و سەیری نان خواردنی منی کرد. خزمەتکار کە چووە دەرەوە بە سۆز و عەشقەوە وتی: – هەڵبەت. ئەوە درك دەکەم کە بۆ ئەفسەرێك زۆر سەخت و ناخۆشە کە لە بەرەکانی شەڕ نەبێت ونەینێرن.

سەیریم کرد و وتم: – گرنگ نییە ئێلزی. سەبارەت بە خوولەکێك پێشتر بمبوورە. تەنیا نەختێك ماندووم.

بێدەنگییەك هاتەپێش. بیٚ ئەوەی سەرم بەرز بکەمەوە خواردنەکەم خوارد. بینیم ئێلزیسفرەکەی کێشا و چینێکی تێکەوت و بە بەری دەست ساف کرد. بە شێوەیەکی بڵێم و نەڵێم وتی: – ئاخ! هاوار لەدەست ئەم دوو ڕۆژە، ڕۆدۆلف!...

وەڵامیم نەدایەوە و ئەو لە قسەکانی بەردەوام بوو کە: – کەواتە رایشس فورر تۆی بۆ بەرلین خواست کە تەنیا ئەمەت پیٚ بڵێت کە نابیٚ بۆ بەرەی شەڕ بچی؟

- نا.
- ئەی چ کارێکی پیٚ بووی؟
- کاری ئیداری.
- گرنگن؟
- بەڵیٚ، زۆریش.

سەرلەنوێ سفرەکەی کێشا و بە متمانەوە وتی: – بەهەرحاڵ، گرنگ ئەو مانەوەی تۆیە.

هیچ وەڵامێکم نەدایەوە. دوایی دیسانیش وتی: – بەڵام خۆت دەتویست بڕۆی، نیشت وار؟

- وام بیر دەکەردەوە ئەرکمە، بەڵام **رایشس فورر** وابیر دەکاتەوە بوونی من لێرە بەسوودترە.

- بۆچی ئاوا بیر دەکاتەوە؟

- دەڵێت من توانایی پێکهێنانی تەشکیلاتم هەیە و لە ویژدانی وەخەبەرهاتووی ئەڵمانیم لانادەم؟

**ئێلزی** بە زەوقەوە پرسی: – شتێکی ئاوای وت؟ وتی "ویژدانی وەخەبەرهاتووی ئەڵمانی"؟

بەسەر ئیشارەیەکم پێکرد: "ئەری".

هەستامە سەرپێ و دەسرەی سفرەم بەرێکی قەد کرد و دامنایە سەر شوێنی خۆی.

دوو رۆژ دواتر، هەر ئەمجۆرەی کە **رایشس فورر** وتبووی، **ئۆبێرشتورم بان فورر وولفسلانگ**" بۆ دیتنم هات. پیاوێکی قەڵەوی رووخسار سووری موو زەردی زیندوودڵ بوو و بە حەزەوە بانگهێشتی **ئێلزی** قبووڵ کرد و خواردنی نیوەڕۆی لەگەڵ ئێمە خوارد.

دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ جگەرەیەکی بەرگم بۆ راداشت و لەگەڵ خۆم بردم بۆ "**کوماندانتور**" (ناوەندی فەرماندەیی) و لە ئیدارە دوو بە دوو ماینەوە. کڵاو کاسکێتکەکەی لەسەر مێزی نووسینی من دانا و دانیشت و پێیەکانی درێژ کرد و رووخساری گرد و پێکەنیناوی تێکچوو.

لە شێوەیەکی فەرمی وتی: - **ئشتورم بان فورر**، دەبێ ئەمە بزانی کە رۆڵی من تەنیا و تەنیا ئەمەیە کە لەنێوان تۆ لەگەڵ **رایشس فورر** پەیوەندییەکی وتاری پێکبێنم. یانی ئەم پەیوەندییە بە شێوەی نووسراوە نابێ. لەم قۆناغەدا تەنیا چەند شتێکی کوورتم پێیە کە پێتی بڵێم. **رایشس فورر** لەسەر دوو خاڵ پێداگرە. یەکەم: بۆ شەش مانگی یەکەم دەبێ کارەکان بەجۆرێك بەڕێوەبچن کە ژماریان بە پێنج سەد کەس بگات.

دەمم کردەوە، بەڵام ئەو جگەرەی بەرگی لەناو دەمی هێنا و برد و بەخێرایی وتی: - "**ئاینن مومنت، بیتە**" (تکایە نەختێك سەبر بکە). ئێوە لە هەر کۆمەڵێکی هاوردەدا لەناو خەڵکەکە ئەم کەسانە جیا بکەنەوە کە توانای کار کردنیان هەیە و بیانخەنە ناو کارگە و کشت و کاڵ و لە زەوییەکانی "**بیرکێناو - ئاوش ویتس**" و کاریان پێ بکەن.

ئیشارەم کرد کە دەمەوێ قسە بکەم، بەڵام ئەو دووبارە جگەرەکەی جووڵاند و بەدوای قسەکانیدا وتی:

- خاڵی دووهەم: لەبارەی هەر کاروانێك جوولەکە کە دەگاتە دەستت و بەکەڵك ئیش و کار نایەن و دەخرێنە ناو پرۆژەی تایبەتەوە، لیستێك ئامادە دەکەی و دەیدەیتە دەست من و تەنانەت نابێ روونووسی ئەم لیستەش لای خۆت هەڵبگری. بەواتایەکی دیکەوە خۆشتان دەبێ لە ژماری کووژرانی ئەم پرۆژەیە هەتا کۆتایی بێ ئاگا بن و نابێ لە ژمارەکەی بزانی.

وتم: - هیچ نازانم، چۆن شتێکی ئاوا بەڕێوەدەچێت. هەر ئێستا خۆتان لە ژماری پێنج سەد هەزار کەس دەدوان.

بە بێ وازی جگەرە بەرگەکەی جووڵاند کە: - "**بیتە! بیتە**" (تکایە! تکایە) ژماری ئەو پێنج سەد هەزار کەسەی کە من وتم، تایبەت بوو بە هەر

دوو بەش، بە تواناکان و بێ تواناکان. هەر شەمەندەفەرێك کە دەگاتە ئۆردوگا، تۆ لێکیان جیا دەکەیتەوە. کەواتە ئەمجۆرە نازانی بێ تواناکان کە جیا دەبنەوە و دەخرێنە ناو پرۆژەکەوە، چەند کەسن. قسەی ئێمەش لەسەر ئەوانە.

بیرێکم کردەوە و وتم: - ئەگەر بە دروستی تێگەیشتبم، من لە هەر شەمەندەفەرێك کە دەگاتە ئێرە، ژماری بێ تواناکان کە دەخرێنە ناو پرۆژەی لەناوبردن، بیانخەمە ناو خشتەیەك و بە لیست بیاندەمە تۆ، بەڵام ئەم رەقەم و ژمارەیە لای من نەمێننەوە و لەئەنجامدا بۆخۆشم زانیارییەکی ئەوتۆم لەو کەسانە نەبێت کە دەخرێنە ناو پرۆژەکەوە.

جگەرەی بەرگەکەی بە نیشانەی بەڵێ جووڵاند و وتی: - بە تەواوی لە قسەکانی من گەیشتووی. بەپێی فەرمانی رایشس فورر، ئەم ژمارە گشتییە تەنیا دەبێ من بیزانم و بەس. بە واتایەکی دیکە، کۆ کردنەوەی ئەم ژمارانەی کە تۆ بۆمی دەنێری تەنیا ئەرکی منە و ئەوەش پەیوەندی بە راو بیروبۆچوونی رایشس فوررەوە هەیە و بەس. ئەو شتەی کە من دەتوانم ئێستا پێتی بڵێم، تەنیا ئەمەیە والسلام!

بێدەنگییەك هاتەپێش و من وتم: - دەتوانم سەبارەت بە خاڵی یەکەم باسی شتێك بکەم؟

جگەرەی بەرگی خستە ناو دەمی و زۆر بە کورتی وتی: - بیڵێ!

- کاتێك باس لە پێنج سەد هەزار کەس لە شەش مانگ دەکەی، یانی مانگانە چل و هەشت هەزار کەس و هەر بیست و چوار کاتژمێر یانی تەسویەی دوو هەزار و هەشت سەد کەس، ئەمە رەقەمێکی زۆر گەورەیە.

جگەرەی لە دەمی هێنایەدەر و هەر ئەو دەستیشی بەرز کردەوە: - کاتێك کە باس لە پێنج سەد هەزار کەس دەکەم، هەر دووکیان دەگرێتەوە و بە تواناکانیشی لەناو سکی دایە، بە توانا و بێ توانا دەگرێتەوە.

لەمبارەیەوە فکرێکم کردەوە و وتم: - بەبڕوای من ئەمکارە تەنیا نەختێك کارەکە وەپاش دەخات. بەپێی ئەو ئەزموونانەی لە **لاگێر کوماندانت** بەدەستم هێناوە، ماوەی مامناوەندی ئەو کاتەی زیندانییەکە بەکەڵکی کار دێت، هەمووی سێ مانگە. دوای ئەوە، ئەویش دەچێتە پاڵ "بێ کەڵکەکان". کەواتە ئاوای دابنێین کە لە هەر بارێکی پێنج هەزار کەسیدا دوو هەزار کەسیان توانای کارکردنیان هەیە، بێشك ئەم دوو هەزار کەسەش دێنەوە ناو پرۆژەکە و ناچارین ئەوانیش لەناوبەرین.

- **"گەویس"** (هەڵبەتە - بێشك)، بەڵام لانیکەم لەم ناوەدا ئەم هەموو کاتەتان پاشەکەوت کردووە و تا ئەو کاتەی ژوورەکان و ئامێرەکان بە تەواوی ئامادەی پرۆژە نەبن، ئەوا ئەم هەلە بۆ ئێوە زۆر بەنرخە.

جگەرەکەی دانایە ناو لێوەکانی و پێی راستی هاویشتە سەر پێی چەپی.

- ئەمەش دەبێ بزانن کە دوای شەش مانگەی یەکەم، ئاهەنگی ناردنی یەهوودیەکان بەشێوەیەکی بەرچاو دەچێتەسەر.

زۆر بە سەیری چاوێکم لێیکرد. پێکەنی و دووبارە خۆی تێکسماند و رووخساری پێکەنیناوی پێشووی پەیدا کردەوە.

وتم: - ئاخر ئەمە لە توانا بەدوورە و ئەگەری جێبەجێ کردنی نییە!

پێکەنینەکەی قووڵتر بوو. هەستا و دەستی کرد بە لەبەرکردنی پەنجەوانەکانی. رووخسارێکی شاد، بەڵام جددیانەی بەخۆیەوە گرت و وتی:

- "**ماین لێبێر**" (ئازیزم) ناپلیۆن وتوویەتی کە"ئەگەری نییە، وشەیەکی فەرەنسی نییە". لە ساڵی سی و چوار بەملاوە هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە بە جیهان بسەلمێنین ئەم وشەیە ئەڵمانیش نییە. (سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد). زۆر باشە، وابزانم کاتی ئەوە هاتووە بمگەیەنیتە وێستگەی شەمەندەفەر.

کڵاوە کاسکێتەکەی هەڵگرت.

هەستام. وتم: - "**هێر ئۆبێرشتورم بان فورر، بیتە**" (تکایە جەنابی مقەدەم).

رووی تێکردم: - **یا؟**

دەمویست ئەوە بڵێم کە ئەم کارە لە رووی فننییەوە ناکرێ.

رووخساری تێکنا. بە دەنگێکی سارد وتی: - رێگە بدە. باری فەنیی ئەم چالاكییە تەنیا پەیوەندی بە تۆوە هەیە. هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. دەبێ درك بەوە بکەی کە بێشك بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بە منەوە نییە. کەواتە تکات لێدەکەم لە رابردووشدا لەمبارەوە هیچ شتێك بە من مەڵێ و تەنانەت پرسیشم پێ مەکە. من تەنیا بیر لە ژمار و رەقەم دەکەمەوە و تەنیا ئەمەشیان لەژێر دەسەڵاتی من دایە. رۆڵی من تەنیا و تەنیا تایبەت بە ئامارە!

رۆژی دواتر لەگەڵ "**ئۆبێر شتورم فورر**" "**زێتسلێر**" (بەرامبەر بە پلەی ملازمی سوپا) بۆ ئۆردوگای **ترێبلینکا** رۆیشتم. ئەم ئۆردوگایە لە باکووری رۆژهەڵاتی وەرشۆ، لە نزیك رووباری **بوگ** بوو. فەرماندەکەی "**هاوپتشتورم فورر**" (نەقیب) " **ئشمولدە**" بوو. چونکە ئەو نەدەبوایە بەهیچ شێوەیەك لە پرۆژەی تایبەت بە **ئاوش ویتس** شتێك بزانێ، **وولفسلانگ** دیداری منی وەکوو چاودێر بە ئەو ناساندبوو. بە ئۆتۆمبێل

بــۆ وێــستگەی شــەمەندەفەر بەدوامــدا هــات. پیــاوێکی مامناوەنــدی تێکسماوی موو ڕەش بوو بە نیگای بۆش و بەتاڵەوە.

لــە هــۆڵی چێــشتخانەی ئەفــسەران پێــشوازی لێکــردین و زۆر داوای لێبووردنی کرد کە ژنەکەی بە هۆی ژان و ئازار ناتوانێ میوانداریمان لێ بکــات. خواردنەکــەی خــۆش و بــەتام بــوو، بــەڵام بۆخــۆی جاروبــارە پاروویەکی دەخستە ناو دەمی، وابزانم ئەویش سەبارەت بە ڕێزگرتن لە ئێمە ئەمکارەی دەکرد. دەنگی ماندوو دیار بوو و بێ ڕەنگ، پێدەچوو بۆ دەربڕینی هەر وشەیەك دەیەوێ گیان بدات. کە قسەی دەکرد هەر ئەمجۆرە بەردەوام لێوەکانی بە زمانی تەڕ دەکرد.

دوای خــواردنی نــانی نیــوەڕۆ قاوەیــان پێــداین. دوای ماوەیــەکی کــوورت ئشمولدە و مــن ســەیری کاتژمێرەکــەی خۆمــان کــرد و وتــی: - بــۆ شــی کردنــەوەی چــالاکی تایبــەت شــی کردنەوەیــەکی زۆری دەویــست. هــەر بۆیەش ویستم خۆتان بێن و بە چاوی خۆتــان لــە نزیکــەوە کارەکــانی ئێمــە ببینن. ئەمجۆرە باشتر حسێبی کارەکەتان دێتە دەست.

زێتسلێر بێ جووڵە مایەوە و بە خێرایی سەیری منی کرد.

وتم: - هەڵبەت. فکرێکی زۆر باشە.

ئشمولدە لێوەکانی تەڕ کردەوە و بەدوای قەسەکانیدا چۆوە و وتی: - کاتەکەی کاتژمێر دوویە.

چەند خوولەکێکی دیکە قسەمان کرد. ئشمولدە و من سەیری کاتژمێری خۆمان کرد. پێنج خوولەکی مابوو بۆ کاتژمێر دوو، هەستامە سەرپێ و ئشمولدەش بە هێوری و لەسەرەخۆیی هەستا. زێتسلێر خۆی لەســەر کوورســی هێنــاوبرد و وتــی: - ببــوورن، مــن هێــشتا قاوەکــەم تــەواو نەکردووە.

چاوم لە کووپی قاوەکەی کرد، تەنانەت هەر دەستیشی لێ نەدابوو.

پێم وت:– کە قاوەکەت خواردەوە، خۆت بە ئێمە بگەیەنە.

بەسەر قبوولیی خۆی راگەیاند و کەللە بێ موویەکی سوور هەڵگەڕا و چاوی لەمن دزیەوە.

ئشمولدە خۆی کێشایە قەراغ بۆئەوەی من تێپەڕم:

- دوور نییە. خۆ بەڕێداڕۆیشتن ناڕەحەتت ناکات؟

- بەهیچ شێوەیەك؟

کەش و هەوا خۆش بوو و خۆر لە رووخساری ئێمەی دەدا. لەنێوان ئەم رێگەیەی کە لێی تێدەپەڕین دوو هێڵیان کێشابوو و بە بەرینی دوو کەس کە شانە بە شانە پێکەوە بڕۆن.

ئۆردوگا بە تەواوی بەتاڵ بوو، بەڵام کە لەپێش سەرپۆشەکان تێدەپەڕین، هەرا و هووریا و بڵغەبڵغیان لێ بەرز دەبۆوە و رووخسارێکی زۆرم لەپشتی شووشە دەبینی. تێگەیشتم کە زیندانییەکانیان بە خێرایی پێش کاتی دیاریکراو خزاندووەتە ناو سەرپۆشەکان. هەروەها لەوە گەیشتم کە ئەگەرچی ئۆردوگایەکە زۆر بچووکترە لە ئاوش ویتس، بەڵام بورج و نیگابانەکانی دووبەرامبەر زیاترە. هەروەها ئەوەم زانی کە تێلدڕووەکانی دەوری ئۆردوگا کارەبای لێبەستراوە. پایەی بەرز کە تێلدڕووەکانی لێهاڵابوو، سەرووی بۆلای ژووری ئۆردووگا خوار کرابۆوە و تەنانەت بە جۆرێك بوو کە کەسێکی شارەزا لە ئاکرۆباتیش نەیدەتوانی لێی تێپەڕێت.

رووم لە ئشمولدە کرد و وتم: – کارەباکەی بەردەوامە؟

- شەوانە بەڵێ، بەڵام رۆژانە کاتێك کێشە و هەرا دروست دەبێت ئەوا کارەبای لێدەبەستین.

- کێشەشتان بۆ دێتەپێش؟

- زۆرجار.

ئشمولدە لێوەکانی تەڕ کردەوە و بە دەنگێکی نەرمی بێ هەست بەردەوام بوو کە: دەزانن؟ هەموویان دەزانن کە چ چارەنووسێك چاوەڕێیانە؟.

بیرم لە قسەکەی کردەوە و وتم: - نازانم چۆن ئاگادار دەکرینەوە و دەزاانن.

ئشمولدە برۆکانی تێکنا و وتی: - لەراستیدا پرۆژەکە زۆر نهێنییە. بەڵام هەموو زیندانییەکانی ئۆردوگا ئاگادارن و تەنانەت جاریوایە ئەو کەسانەش دەزانن کە تازە دەگەنێ.

- جا ئەوان لە کوێوە دەزانن؟

- لە "گێتتو"ی وەرشۆ. (ناوچەی تایبەت بە یەهوودیەکان)

- هەموویان؟

ئشمولدە سەری خوار کردەوە لای من: هەموویان. بە بڕوای من تەنانەت لە گێتتوش کەسانێك هەن کە دەزانن. ئۆردوگا زۆر بە وەرشۆ نزیکە.

دوای دوایین سەرپۆش گۆڕەپانێکی بەربلاوی لێبوو. دوایی، کێشکچییەکی چەکدار دەرگایەکی دروستکراو لە داری لە ئێمە کردەوە و چووینە ناو جاددەیەکی خیزڕێژکراو کە لە چەپ و راستەوە بە تێلدڕو تەنرابوو. دوایی گەیشتینە دەرگایەکی دیکە کە دەستەیەك ئێس. ئێس. ئاگاداریان لێی دەکرد. پێش ئەم دیوارە بە چەند بێتۆن گیرابوو. دیوارەکەمان کە دەور لێدایەوە، سەرپۆشێکی دووروودرێژ رێك بەرامبەر بە ئێمە بوو کە کولانەکانی بە تەواوی و بە جوانی داخرابوون و سی لە ئێس. ئێس.ەکان بە سەگ و موسەلسەلی دەستی پارێزگاریان لێدەکرد و د ەورەیان دابوو.

یەکێیکان هاواری کرد: - ئاختونگ! (خەبەردار- رێك بوەستن)

ئێس. ئێس.ەکان ریّك وەستان و ئونتر شتورم فورر (بەرامبەر بە ملازم سێی سوپا) هاتە پێش و رێورەسمی رێزلێنانی بەرێوەبرد. مووی رەش و رووخسارێکی چوارگۆشە و چاوی پڕ لە خوماری هەبوو.

دەوروبەری خۆمم چاوێك لێکرد. دوو ریز تێلدرووی کارەبا لێدراو، سەرپۆشەکەی تەنیبوو. لە پشتی تێلدرووەکان دار و درەختی سنۆبەر پێشی گرتبوو.

ئێس. ئێس.کان کشانەوە و ئێمەش بۆلای سەرپۆشەکان چووین.

دەرگاکەی لە دارێکی سەخت و موحکەم دروست کرابوو کە بە ئاسن رۆکەشیان کردبوو وبە قفڵێکی ئاسنی قوورس بەسترابوو. بەشی سەرووی کولانەیەکی خڕی تێدابوو کە بە شووشەی پان و بەرین و سەخت گیرابوو. ئشمولدە دوگمەیەکی سووڕاند کە لەناو دیوارەکەدا بوو. هەوڵی دا قفڵەکەی بکاتەوە کە نەیتوانی و ئونترشتورم فوررێك بە راکردن هات و یارمەتی دا.

دەرگا کرایەوە و چووینە ناو سەرپۆشەکە. وام هەست دەکرد کە ئێستا بەسەرماندا دەرۆخێت. میچەکەی ئەوەندە لەخواریّ بوو کەدەکرا دەستی لەسەر دابنێی. سێ گڵۆپ کە بە تەل پاریزگاری دەکران، رووناکی ژوورەکەیان پێکدەهێنا. هیچی لەناودا نەبوو. لای دیکەشی دەرگایەکی هەبوو کە بۆ پشتی بیناکە دەکرایەوە، بەڵام ئەم دەرگایە پەنجەرە بچووکەکەی نەبوو.

ئشمولدە وتی: – پەنجەرەکان شووشەیان نییە. هەر ئەمجۆرەی کە دەبینن، بە تەواوی (لێوەکانی تەڕ کرد): –ناوپڕن و لە دەرەوەڕا دەبەسترێن.

لە تەنیشت شەبەکەی گڵۆپەکان کوونێکم بینی بە پانتایی پێنج سانتی مەتر.

دەنگە دەنگی دەورلێدان هات وهاوار و قیژە و چریکە و خێراخێرا گەیشتە گوێم و سەگەکانیش دەستیان بە وەڕین و حەپە حەپ کرد.

**ئشمولدە** وتی: بۆخۆیانن.

کەوتەپێش و هەرچەند کڵاوەکەی چەند سانتی مەترێکی مابوو بە میچی سەرپۆشەکە بکەوێ، بەڵام لە کاتی ڕێکردن دیسانیش سەری ددزیەوە.

کاتێک لە سەرپۆشەکان چووینە دەرەوە، ڕیزی زیندانییەکانیش بە ڕاکردن بەرەو ئێمە دەهاتن. **ئێس. ئێس.** و سەگەکان شان بەشانی زیندانییەکان ڕایاندەکرد. قیژە و هەرا لەگەڵ حەپە حەپی سەگەکان تێکەڵ ببوو و گوێی کەڕ دەکرد. تۆز و غوبارێکی زۆر بەڕێکەوت و **ئێس. ئێس.**ەکان دەست بەکار بوون.

کە ڕێکخران و تۆز و خۆڵەکە نیشت، توانیم زیندانییەکان باشتر ببینم. لەنێوانیاندا چەند کەسێکی تەندروست وساغی تێدابوو، بەڵام بەشی زۆر ڕیزی زیندانییەکان لە ژن و منداڵ پێکهاتبوو. هەندێ لە ژنەکان مەلۆتکەی شیرەخۆریان لەباوەشدا بوو. گشت زیندانییەکان جلکی مەدەنیان لەبەر بوو و هیچکامیان مووی سەریان کوورت نەبوو.

**ئشمولدە** وتی: – وابزانم هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ ئەمانە نابێ، چونکە هەر ئێستا گەیشتوون.

**ئێس. ئێس.**ەکان زیندانییەکانیان بە ڕیزی پێنج ڕێکخست. **ئشمولدە** بە دەست ئیشارەتێکی دا و وتی:

- **"بیتە"(تکایە) هێر ئشتورم بان فورر.**

بۆلای تەپۆڵکەیەکی دەستکرد رۆیشتین. بەمشێوەیە هەم لێیان دوور دەکەوتینەوە و هەمیش سەبارەت بە سەراوژێرییەکە باشتر و هەموویان بەیەکەوە دەبینران.

دوو هاوپت **شارفورر** و **شارفوررێك** خەریکی سەرژمێری زیندانییەکان بوون. **ئونتر شتورم فورریش** لەپێش ئێمە وەستابوو. جوولەکەیەکی زیندانی کە جلکی رێ ڕێی زیندانیانی لەبەر بوو و سەری تراشرابوو، لای راست و نەختێك لەدواتر وەستابوو. زیندانییەکە قۆڵبەندێکی لە قۆڵی چەپی بەسترابوو.

یەکێ لە دوو **هاوپ شارفوررەکان** بە ڕاکەڕاکە هاتە پێش **ئونتر شتورم فورر** و رێك وەستا و هاواری کرد: – دوو سەد و چوار! **ئونتر شتورم فورر** وتی: –چوار کەسی کۆتایی ریز بێننە دەرەوە، بیانبەنە ناو سەرپۆشەکان.

رووم لە **ئشمولدە** کرد و پرسیم: – بۆچی ئەمکارەت کرد؟

- بۆئەوەی قەوەتی دڵ بێت وجۆرێك دڵدانەویە بۆ زیندانییەکان.

**ئونتر شتورم فورر** وتی: – "**دۆلمێتچر!**" (دیلمانج – وەرگێڕ – موترجم) زیندانییەکەی قۆڵبەندی لەدەست بوو هەنگاوێك چووەپێش و رێك وەستا و رووی لە ریزی زیندانییەکان کرد و بە زمانی پۆلۆنی وتی: – سێ کەسی کۆتایی زیندانییەکان (دوو ژن وپیاوێك کە کلاوێکی رەشی نووشتاوەی لەسەر بوو) بێ هیچ کێشەیەك لە ریزەکە جیا بوونەوە.

چوارەمینیان کچێکی دە ساڵە بوو. **شارفوررێك** قۆڵی گرت و هەر ئەوکات ژنێك لەناو ریزی زیندانیان خۆ بۆلای هاویشت و کچەکەی لە چنگ هینایەدەر و بە سینگی خۆیەوە کووشی و دەستی بە هاوار و قیژاندن

کرد. دوو ئێس. ئێس. چوونە پێش و پرتە بۆڵە و هەراهەرا لە هەموو ریزەکە بەرز بۆوە.

ئۆتتر شتورم فورر دوودڵ مایەوە.

ئشمولدە هاواری کرد: - لە منداڵەکەی گەڕێن!

ئێس. ئێس.ەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان. ژنە جوولەکەکە بێ ئەوەی درك بەوە بکات کە چی رووی داوە سەیری دوورکەوتنەوەی ئەوانی دەکرد وهەر بەمجۆرە کچەکەی بە سینگییەوە رێکدەکووشی.

ئشمولدە وتی: - دۆلمێتچرا بەم ژنە بڵێ کە فەرماندە رێگە دەدات کچەکەی لەلای بمێنێتەوە.

زینداننییەکە کە قۆڵبەستی لە قۆڵ بوو، رستەیەکی دوور و درێژی بە زمانی پۆلۆنی بە ژنەکە وت و سەیرێکی من و ئشمولدەی کرد. دوایی رووخساری گیراوی بە پێکەنینێك کرایەوە و بە هاوار شتێکی بە ئێمە وت.

ئشمولدە بێ سەبرانە پرسی: - ئەو چی دەڵێت؟

دۆلمێتچر بۆلای ئێمە گەڕایەوە و روو بە ئێمە رێك و سەربازانە وەستا و بە زاراوەی ئەڵمانی پێمانی وت: - دەڵێت ئێوە زۆر باشن و سوپاستان دەکات.

ئشمولدە شانەکانی هەڵاویشت. سێ زیندانی کە بۆلای سەرپۆشەکە دەبردران، بەدوای شارفورریك لەپێش ئێمە تێپەڕین. دوو ژنەکە بێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە تێپەڕین، بەڵام پیاوەکە سەیرێکی ئێمەی کرد، دوودڵ مایەوە و دوایی کڵاوە رەشە تێکنووشتاوەکەی بە جووڵەیەکی سەیروسەمەرە لەسەر هەڵگرت. دوو سێ زیندانی وەپێکەنین کەوتن و ئێس. ئێس.ەکانیش دەستیان بە پێکەنین کرد.

ئشمولدە خوار بۆوە لای من: – وابزانم کارەکە بێ هەرا و کێشە کۆتایی پێبێت.

ئونتر شتورم فورر رووی لە دۆلمێتچر کرد و بە ماندوەویی وتی: – وەکوو هەمیشە.

دۆلمێتچر هەنگاوێك چووە پێش و رێك وەستا و بە زمانی پۆلۆنی قسەی کرد.

ئشمولدە دیسان خوار بۆوە لای من و وتی:

– پێیان دەڵێت جلکەکانیان دەربێنن و بیانکەن بە چەند کۆگایەك. دیاننێرین بۆ شۆردن بۆ ئەوەی هیچ بەکتەرییەك لە جلکەکانیاندا نەمێنێ وتا ئەوکاتەی بۆیان دەهێنینەوە، دەبێ لەناو سەرپۆشەکاندا بمێننەوە.

هەر کە دۆلمێتچر قسەکانی تەواو بوو، دەنگە دەنگ و بۆڵە بۆڵ و هەراوهوریا لە هەموو ریزەکە بەرز بۆوە. بۆلای ئشمولدە گەڕامەوە و سەیریم کرد. سەرێکی بۆلای چەپ و راست جوولاند و وتی: – ئەمە شتێکی ئاساییە. تەنیا کاتێك گرفت و کێشەکە گەورە بوو، ئەوا دەبێ روو لە توندوتیژ بکرێ.

ئونتر شتورم فورر دەستی بۆلای دۆلمێتچر بەرز کردەوە و دۆلمێتچر سەرلەنوێ دەستی بە قسەکردن کردەوە. دوای ماوەیەکی کوورت، سەرەتا چەند ژن دەستیان بۆ خۆ رووت کردنەوە کرد و دوایی کەم کەم هەموویان جلکەکانی خۆیانم دەرهێنا و یەك دوو خوولەك تێپەڕی هەتا پیاوەکان بە شەرمەوە خۆیان رووت کردەوە. سێ چوار ئێس. ئێس. لە ریزی خۆیان جیابونەوە و یارمەتی منداڵەکانیان دا بۆئەوەی خۆیان رووت بکەنەوە.

سەیری کاتژمێرم کرد. دوو و نیو بوو. سووڕامەوە لای **ئشمولدە** و وتم: لوتف بفەرموون یەکێ لەدوای **ئۆبێرشتورم فورر زێتسلێر** بنێرن، وابزانم ڕێگەی وون کردووە.

**ئشمولدە** ئیشارەیەکی بە **شارفوررێك** کرد و نیشانەکانی **زێتسلێری** پێدا و **شارفورر** بە ڕاکردن لێمان دوور کەوتەوە.

بۆنی ناخۆش و قوورسی زیندانییەکان ئەوێی پڕ کردبوو. زیندانییەکان، لەراستیدا پیس و پلتۆخ و چڵمن بێ جووڵە لەبەر خۆر وەستابوون. چەند لە کچەکان لەرووی رووخسار و ڕێکوپێکی لەش و لاریان بەڕاستی جوان بوون.

**ئونتر شتورم فورر** ئەمری پێکردن بۆئەوەی بچنە ناو سەرپۆشەکان و بەڵێنی پێدان کاتێك هەموویان چوونە ژوورەوە، ئەوا پەنجەرەکانیشیان بۆ بکاتەوە. دوایین کەس کە چووە ژوور، **ئونتر شتورم فورر** بۆخۆی دەرگا قوورسە بەلووتەکەی بەست و ئاڵقەڕێزە ئاسنەکەشی پێداکرد و خێرا سەر و گوێلاکی چەند کەسێکیان لەپشت پەنجەرە پەیدا بوو.

**زێتسلێر** گەیشتی. وەکوو چەوەندەر سوور و تەڕی ئارەقە بوو. ڕێك وەستا:

لە خزمەت دام، **هێر ئشتورم بان فورر**.

بە دەنگێکی وشك وتم: – بۆ ئەوەندە درەنگ گەیشتی؟

سەبارەت بە **ئشمولدەش** وتم: – وون ببووی؟

– بەڵێ، وون ببووم، **هێر ئشتورم بان فورر**.

ئیشارەیەکم پێکرد و **زێتسلێر** لای چەپی من وەستا.

ئوتتۆ شتورم فورر فیکەیەکی لە گیرفانی هێنایەدەر و دووجار تێی فیکاند. بێدەنگییەك بوو و دوایی، مەکینەی ئوتۆمبێلێ دەستی بەکار کرد. ئێس. ئێس.ەکان تەسمەی موسەلسەلەکانیان هاویشتە سەر شانیان.

ئشمولدە وتی: – بیتە، هێر ئشتورم بان فوورا

رۆیشتە پێشێ. ئێس. ئێس.ەکان بۆدوایی رۆیشتن و ئێمە دەورمان لە بیناکە دا. زێتسلێر لەپشت سەری من بەرێکەوت.

لۆرییەك، بەجۆرێك وەستابوو کە پشتی رێك بە بینا سەرداپۆشراوەکە وەنووسابوو. سەرێکی سۆندەیەك لە ئیگزۆزی لۆرییەکە بەسترابوو و سەرەکەی دیکەشی خرابۆیە ناو کوونەکەی سەرس سەرپۆشەکە. مەکینەی لۆرییەکە کاری دەکرد.

ئشمولدە وتی: – غازی مەکینە لە کونی تەنیشت چرای ناوەڕاستەوە دەچێتە ژووری.

نەختێك گوێی لە دەنگی مەکینەی لۆری راگرت، برۆیەکانی تێکنا و بۆلای شوفێرەکە بەڕێکەوت. منیش بەدوایدا چووم. ئێس. ئێس. جگەرەیەکی بەلێوەوە بوو و لەپشت سووکان دانیشتبوو. چاوی کە بە ئشمولدە کەوت، جگەرەکەی لە دەمی دەرهێنا و بۆلای دەرەوە خوار بۆوە.

ئشمولدە وتی: – ئەوەندە پێ لە بەنزین مەنێ!

دەوری مەکینەکە کەم بۆوە.

ئشمولدە رووی لەمن کرد و وتی: – بەنزینەکە هەتا کۆتایی پاڵ دەدات کە زووتر کۆتایی پێبێت. ئەنجامەکەی ئەوەیە کە لەجیاتی ئەوەی زیندانییەکان خەویان لێ بکەوێ، خەفە دەبن و دەخنکێن.

بۆنێکی ناخۆش دەهات.

دەوروبەری خۆمم سەیر کرد و جگە لە بیست زیندانییەك کە جلی ڕیّ ڕیّیان لەبەر بوو و بە ریزی دوو کەسی وەستابوون، کەسم نەدیت. لاو بوون بە ردێنی تراشراو و بەهێز دەهاتنە بەرچاو.

**ئشمولدە** وتی: - "**سوندر کۆماندۆ**"نە (کۆماندۆی تایبەتن) کاری ژێرخاك کردنی مەیتەکان ئەرکی ئەوانەیە.

هەندێکیان تێکسماو و وەرزشوان بوون. جۆری ڕێك وەستانیان هیچ کەموکووڕییەکی نەبوو.

- جوولەکەن؟
- بێشك.

**زێتسلێر** بۆ پێشەوە خوار بۆوە و وتی: - ئەوکات بەجۆرێك یارمەتی دەدەن کە.... پیاو بە زۆر باوەڕی دەبیّ!

**ئشمولدە** بە حاڵەتێکی ماندوو شانەکانی هەڵاویشت: - لێرە هەموو شتیّ ئەگەری هەیە. (رووی لە من کرد): - **بیتە، هێر ئشتورم بان فورر**....

بەدوای کەوتم. لە بیناکە دوور کەوتینەوە. هەرچی دوورتر دەڕۆیشتین بۆگەن زیاتر دەبوو. نزیك بە سەد مەترێکمان پێوا، هەتا گەیشتینە چاڵێکی پان و زۆر قووڵ. بە سەدان مەیت لە سیّ ریز لەویّ لەسەر یەك چنرابوون. **زێتسلێر** لەناکاو پێی تێکچوو و پشتی لە مەیتەکان کرد.

**ئشمولدە** وتی: - کێشەی گەورە، مەیتەکانن. کەمێکی دیکە بگوزەریّ، تەنانەت زەویمان نامێنیّ بۆئەوەی چاڵ و قووڵکەی تێدا هەڵکەنین. هەربۆیەش ناچارین قووڵکەی ئاوا قووڵ هەڵکەنین و لێگەڕێین هەتا بە تەواوی پڕ دەبن و ئەوکات سەریان دادەپۆشین. هەرچەند بەم حاڵەشەوە دوای ماوەیەکی دیکە زەویمان دەست ناکەویّ.

چاوەکانی بە دەوروبەری خۆیدا سووڕاند. برۆکانی تێکنا و بە دەنگێکی پڕ لە ناڕەحەتی وتی: – لە راستیدا مەیتەکان دەست و پێمان دەگرن. (ئەوکات بێدەنگییەك هاتەپێش): – **بیتە، هێر ئشتورم بان فورر**....

نەختێك سووڕایەوە، لێیگەڕام ئشمولدە نەختێك پێش کەوێت و خۆم گەیاندە زێتسلێر. رەنگ بە روویەوە نەمابوو. بە دەنگێکی وشك لەژێر لێو وتم: – تکا دەکەم بەسەر خۆتدا زاڵ بە!

خۆم گەیاندە ئشمولدە. مەکینەی بە نەرمی خورەخوری بوو. کە گەیشتینە نزیك سەرپۆشەکە، ئشمولدە چووە لای شوفێرەکە و ئێس. ئێس. سەری خوار کردەوە. ئشمولدە وتی: – ئێستا پێ لەسەر بەنزین دانێ.

سووڕانی مەکینە لەناکاو خێرا بوو و سەرپۆشی تانکەرەکە وەلەرزە کەوت.

دەوری بیناکەمان لێدا. ئێستا ئیتر زیاتر لە دە ئێس. ئێس. لەوێ نەبوون.

ئشمولدە وتی: – حەز دەکەن سەیرێکی بکەن؟

هەڵبەتە.

بۆلای دەرگا رۆیشتین و لە کوونێکی گرد سەیری ژوورەوەم کرد. زیندانییەکان لەوێدا کەوتبوونە سەر یەك. رووخساریان ئارام بوو. جگە لە چاوەکانیان کە ئێستاش کراوە بوو، واپێدەچوو هەموویان خەوتوون.

سەیری کاتژمێرم کرد: سێ و دە خوولەك بوو. رووم کردە ئشمولدە. وتم: – کەی دەرگاکان دەکەنەوە؟

- کاتەکەی لە گۆڕانکاری دایە. هەمووی پەیوەندی بە پلەی هەواوە هەیە. ئەگەر وەکوو ئەمڕۆ هەوا وشك بێ، زۆر بە خێرایی کۆتایی پێدێت.

- ئشمولدەش لە كونەكەوە ناو ژووریی سەیر كرد.
- تەواوە؟
- چۆن دەزانی؟
- لە رەنگی پێست: رەنگیان لە رووخساردا نەماوە. یانی تەواو.
- تا ئێستا هیچ تووشی هەڵە بوونە؟
- سەرەتای كار، بەڵێ. پەنجەرەكانم كە دەكردەوە، هەندێكیان دەژیانەوە. ناچار بووم سەر لەنوێ دەست پێبكەمەوە.
- پەنجەرەكان بۆچی دەكەنەوە؟
- بۆئەوەی هەوا بچێتە ژوورەوە و زۆندێر كۆماندۆكان بتوانن بچنە ژوورەوە.

جگەرەیەكم داگیرساند و وتم: – دوایی چی روو دەدات؟

- زۆندێر كۆماندۆكان مەیتەكان دێننە دەروە و دەیانبەنە پشت بیناكە. دەستەیەكیان باری لۆرییان دەكەن و لۆرییەكە دەیانبات بەتاڵیان دەكاتە تەنیشت قووڵكەكان. دەستەیەكی دیكە مەیتەكان لە قووڵایی قووڵكە و چاڵەكاندا دەچێنن. دەبێ زۆر بە رێكی بچندرێن بۆئەوەی تا دەتوانین جێگەی كەمتریان پێ بگرین. دوای ماوەیەكی دیكە بۆ بەستە زەوییەك مەعتەل دەبم. (ڕوی لە زێتسلێر كرد و وتی): – حەز دەكەن سەیر بكەن.

زێتسلێر دوو دڵ مایەوە، چاوەكانی بە خێرایی لە چاوی من بڕی. دوایی بە دەنگێكی لاواز وتی: – هەڵبەتە.

لە كوونە گردەكەوە سەیرێكی ژوورەكەی كرد و هاواری كرد:

- ئەوانە كە رووتن!

ئشمولدە وتی: ئێمە ئەمرمان پێکراوە جلکەکانیان داگیر بکەین. ئەگەر بە جلکەوە بیانخنکێنین، ئەوا داکەندنی جلکەکانیان کاتێکی زۆری دەوێ.

زێتسلێر لە کوونەکەوە سەیرێکی کردن. بە دەستی راستی پێش چاوی تاریك کرد بۆئەوەی باشتر ببینێ.

ئشمولدە وتی: - هەروەها کاتێك کە شوفێرەکان زیاتر پێ لە بەنزین بنێن ئەوانە بەر لە مردن تووشی خەفەبوون دەبن و ئازاری زۆر وادەکات بۆئەوان ناخۆشتر بێت. ئەگەر جلکیان لەبەر بێت زۆر بۆئەوان ناخۆشترە.

زێتسلێر کە هەر لە کوونەکەوە سەیری دەکردن وتی: - چ رووخسارێکی ئارامیان هەیە!

ئشمولدە رووی لەمن کرد و پرسی: - حەز دەکەن هەتا کۆتایی چالاکییەکە ببینن؟

- ئیتر هیچ سوودێکی نییە، خۆت کە هەمووت بۆ باس کردووم.

گەڕامەوە، ئشمولدە پێی خۆی لەگەڵ پێی من هەماهەنگ کرد. چەند مەترێك کە رۆیشتین گەڕامەوە و وتم: - زێتسلێر، ئێوەش نایەن؟

زێتسلێر وازی لە کوونە شووشەییەکە هێنا و بەدوای ئێمە کەوت. ئشمولدە سەیری کاتژمێرەکەی کرد و وتی: - شەمەندەفەرەکەتان کاتژمێرێکی دیکە بەڕێ دەکەوێ. رەنگە کاتی ئەوەمان هەبێ شتێکی فێنك بخۆینەوە.

سەرم داخست و باقی رێگەمان لە بێدەنگیدا پێوا.

لە ژووری بچووکی خواردن بوتڵێك شەڕابی "رێن" (Rhin) و کەمێك شیرینی وشك چاوەڕوانمان بوو. هیچ ئیشتیای خواردنم نەبوو، بەڵام شەڕابەکەم بەدڵ بوو.

دوای ماوەیەك وتم: - بۆچی تیرباران نەکرێن؟

ئشمولدە وتی: – هەم گران تەواو دەبیٚ و هەم کاتی دەویٚ و هەمیش پێویستی بە خەڵکی زۆرە. بەم حاڵەشەوە ئەگەر لۆرییەکان خراپ بن، ئەمکارە دەکەین.

- دێتە پێش؟

- زۆرجار. ئەمانە چەند لۆری پەککەوتەن کە لە رووسەکان گیراون. کارێکی زۆریان لێکێشراوە و ئەشیاشیان دەست ناکەویٚ. جاروبارەش بەنزینمان دەست ناکەویٚ و کەوگیرەکە وە بن قابڵەمە دەکەویٚ. جاریوایە بەنزینەکە خراپە و غازەکەی تا ئەو رادەیە پێویستە ژەهێراوی لەکار دەرنایەت.

پێکەکەم لەناو دەستدا سووڕاند و وتم: – کەواتە بە بڕوای تۆ ئەمشێوەکارە شێوەیەکی باش و بە متمانەوە نییە.

نەختێك بێدەنگ بوو.

- نەخێر، نییە.

- زێتسلێر وتی: – بەهەرحاڵ لانیکەم "مرۆڤایەتییە": مرۆڤەکان خەویان لێدەکەوێت، والسلام. زۆر بە ئارامی دەمرن. ئاگاتان لێیان بوو رووخساریان چەند ئارام بوو؟

- ئشمولدە شانەکانی هاویشە سەرەوە: – ئەوکاتانەی کە بۆخۆم لەویٚ بم (زێتسلێر زۆر بەسەرلێشێواوی سەیری کرد و ئشمولدە لە قسەکانی بەردەوام بوو): – بۆخۆم کە لەویٚ بم، ناهێڵم شوفێرەکان زۆر پیٚ لەسەر بەنزین دابنێن.

من وتم: – ناکریٚ لەجیاتی لۆرییەك، دوو لۆری دابنێی کە بەیەکەوە غاز بدەن؟ ئەمجۆرە کارەکان خێرایی زیاتریان پیٚ نابەخشریٚ؟

**ئشمولدە** وتی: — نەخێر. من دە ژووری غازی دوو سەد کەسیم هەیە، بەڵام هیچ کات چوار لۆریم نەبووە کە بە باشی ئیش بکەن. ئەگەر بۆ هەر ژوورێك لۆرییەك وەبەرچاو بگرم، هەر نیو کاتژمێر دەتوانم غاز لەخواردی هەشت سەد کەس بدەم. ئەگەر دوو لۆری بۆ ژورێك تەرخان بکەم، ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە لە هەر چارەکە کاتژمێرێك چوار سەد کەس دەمێنێ کە دەبێ ئەوانیش لەناو ببەم. بەم ئەنجامەش گەیشتووم کە هیچکات لۆری نوێم پێ نادەن.

دوای ماوەیەکی کوورت من وتم: — دەبێ رێگەیەکی باشتر و سادەتر بدۆزیتەوە. غازێکی خنکێنەر، وەکوو ساڵەکانی هەڤدە[٣٤].

**ئشمولدە** وتی: — نازانم ئێستاش لەم غازانە دروست دەکەن یان نا. لەم شەڕەدا بەکاریان نەهێناوە. (پێکەکەی هەڵویشت و بۆ لای مێزەکە رۆیشت کە دووبارە پڕی بکاتەوە) — لە راستیدا مەسەلەی گرنگ، مەیتەکان نیین، بەڵکوو ژێرخاك کردنیانە. من ناتوانم خێراتر لە بەرهەمهێنانیان، مەیتەکان ژێرخاك بکەم. ژێرخاك کردنیشیان لەراستید کاتێکی زۆری پێویستە. (قمێکی نۆشی و بەدوای قسەکانیدا رۆیشت کە): — ئەنجامی کار و چالاکی من لە بیست و چوار کاتژمێردا، هیچکات بە پێنج سەد مەیت ناگات. (سەری جووڵاند و بەردەوام بوو): — بێشك رایشس فورر حەقی ئەوەی هەیە ئەم ئەنجامە بە هیچ بزانێ. لەلایەکی

34 - مەبەست ساڵی ١٩١٧یە، ساڵێك پێش کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم، کە ئەڵمانیا لە گۆڕەپانی شەڕدا غازی خنکێنەری بەکار دەهێنا. دوایی بەکارهێنانی هەموو جۆرە غازێك لە بەرەکانی شەڕ رێگەی لێگیرا هەتا ئەم دواییە کە ئەمریکا لە شەڕەکانی ڤیتنام کەڵکی لە غاز وەرگرت.

تەنانەت منداڵێکی دە ساڵەش خێرا دەزانێ کە لەمناوەدا گرفتێك هەیە.

دیکەوە، منیش نەمتوانیوە لۆری نوێ بەدەست بێنم، ئەمەش لەخۆیدا کێشەیە. جاروبارە لەگەڵ شۆڕشییەکانیش ڕووبەڕوو دەبینەوە. ئاگاتن لێیە، ئەوان دەزانن کە چ شێوێکیان بۆ لێندراوە. جاریوایە ڕووراست سەرپێچی لە چوونە ناو سەرپۆشەکان دەکەن. تەنانەت جاریوایە هێرشمان دەکەنەسەر. هەڵبەت ئەوان هەر لە شوێنی خۆیان فاتیحە و کاریان خێراتر دەکەین، بەلام بەهەر حاڵ ئەمەش هەمووی کێشەکانی ئێمەن.

بێدەنگییەك رووی دا و پێکێکم خواردەوە و وتم: - بەبڕوای من ئەگەر کارەکە دەگاتە شۆڕش، هۆیەکەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە لەرووی دەروونییەوە بەباشی ئامادە ناکرێن. ئێوە پێیان دەڵێن "دەمانەوێ ئەسپێی جلکەکانتان بکووژین و لەم ماوەیەدا دەبێ لەناو سەرپۆشەکەدا بمێننەوە." لەڕاستیدا ئەوان باش دەزانن کە لەهیچ شوێنێکی دونیادا ئەمە رەسمە نییە. یانی بەم مانایە کە کاتێك جلکەکانیان بۆ خاوێن دەکەنەوە، واباشترە خۆشیان خاوێن ببنەوە. جلکی خاوێن کراوە هیچکات لەبەر کەسێك ناکەنەوە کە خۆی پڕ لە ئسپێیە. هەموو کەس ئەمە دەزانێ.

ئشمولدە وتی: - هەڵبەت، هێر ئشتورم بان فورر، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە. بەلام مەسەلەی گەورە... (پێکەکەی یەکجارەکی هەڵدایە سەرەوە و داینایە سەر مێزەکە و وتی) : - بەلام کێشەی گەورەی ئێمە مەیتەکانن. (چاوێکی ماناداری لێکردین و وتی) : - بۆخۆتان دەبینن.

بە هێوری و زۆر بە وشکی وەلامیم دایەوە: - مانای تانە و تەشەرتان نازانم. من تەنیا بۆ وەرگرتنی زانیاری هاتووم.

**ئشمولدە** سەری وەرگێڕا و وتی: – هەڵبەتە، **هێر ئشتورم بان فورر**. لێکدانەوەی خۆشم هەر ئەمجۆرەیە. بە خراپی بۆ منیان باس کردبوو.

دوای بێدەنگییەکی دوورودرێژ **زێتسلێر** لەناکاو پرسی: – ناکرێ لانیکەم واز لە ژنەکان بێنن؟ **ئشمولدە** سەرێکی راوەشاند و وتی: – لە راستیدا رێك ژنەکانن کە دەبێ لەناو بچن. چۆن دەکری نیژادێك لەناو ببڕێت، کەچی مێینەکانیان بمێننەوە؟

**زێتسلێر** وتی: – راستە، راستە. هەر باسی مەکە، زۆر زۆر ترسناکە.

سەیریم کرد، قەڵافەتی داچەماوی رێك داشکابۆوە. جگەرکەی لەناو دوو پەنجەی دەستی راستی دەسووتا و دووکەڵی دەکرد.

**ئشمولدە** بۆ جارێکی دیکە چووە لای مێزەکە و پێکێکی دیکەی پڕ لە شەڕاب کرد.

تەواوی هەفتەی داهاتووم بە دڵەڕاوکێی پڕ لە ترس و خۆفەوە تێپەڕاند.

بەرهەم وکاری بیست و چوار کاتژمێری **ترێبلینکا** پێنج سەد مەیت بوو. ئـی **ئاوش ویتس** دەبوایە بەپێی بەرنامە سێ سەد هەزار جوولەکەی سوتێنراو بێت. ئەوپەڕی هەتا چوار هەفتەی دیکە دەبوایە پرۆژەیەکی گشتی پێشکەش بە **رایشس فورر** بکەم و هێشتا بچووکترین بیرۆکەم لەمێشکیدا نەبوو.

بوارەکەم هەزار جار لە هەموو روویەکەوە لەناو هزر و هۆشمدا هێناوبرد. تەنانەت بەشێوەی نادیاریش نەمدەتوانی ئامانجی کارکە لێکبدەمەوە. رۆژانە بیست جار قووڕگم بەشێوەیکی پڕ لەژان لە یەقینەوە بە شکست دەکووشرا و بە ترسەوە لەناو دڵمدا دووبارەم دەکردەوە کە سەرەتای کار بە ناشیاوترین شێوە لە ئەنجامی کار تووشی بەربەست دەبم. دەبوایە شەش بەرامبەر ئەنجامی **ترێبلینکا** بەدەست بێنم، بەڵام بۆ گەیشتن بەم

ئەنجامـە کـەمترین ڕێگـە بـە عـەقڵم نەدەگەیـشت. بـە ئاسـانی دەکـرا شـەش بەرامبـەری تریبلینکا ژووری غاز بینـا بکـەین، بـەڵام چ فایـدە وسـوودێکی هەبوو؟ دەبوایە شەش بەرامبەری ئەوێش لۆری دابنێم و لەمبارەیەوە هـیچ بـیری لێناکەمـەوە: کاتێـك ئـشمولدە لەگـەڵ ئـەم هـەموو داواکاریانـە نـەیتوانیوە لـۆری بۆخـۆی دابـین بکـات، کەواتـە لـە ڕۆژ ڕوونـترە منـیش ناتوانم.

دەچـوومە ژووری ئیـدارەم و دەرگـام لەسـەر خـۆم دادەخـست و تـەواوی دوانیـوەڕۆ هـۆش و هـزرم دەخـستە سـەر ئـەمکارە و بـەڵام سـەرکەوتوو نەدەبووم. دیسانیش وەسوەسەی خۆڕاگریم خۆی دەهاویشتە ناو گیانم و سەرلەنوێ لەجێ بڵند دەبوومەوە لەم ژوورە چواردیوارییە بچمە دەرێ کە لەراستیدا لەوێدا هەستم بە خنکان دەکرد. پاڵەپەستۆم دەخستە سەر خۆم دابنیشم. هزرم لەهەرجۆرە بیرکردنەوەیەك بەتاڵ بوو. یانی بەرامبەر بەو ئەرکەی کە رایشس فورر بە متمانەوە پێی سپاردبووم، ئاوا بێتوانام، هەربۆیەش هەستێکی پڕ لە شەرمەزاری هەموو جەستەی دادەگرتم.

لە کۆتاییدا دوانیوەڕۆیەك وام بیر کردەوە کە ئەگەر هەر بەم شێوەیە لـە تەنیاییـدا پاڵەپەستۆ بخەمـە سـەر هۆش و هـزرم ئـەوا بەشێوەی کرداریی بەهیچ شوێنێك ناگەم و بڕیارم دا لە ئۆردوگای خۆم ناوەندێکی ئـەزموونی وەکـوو تریبلینکا پێکبێـنم هـەتا لانیکـەم بتـوانم ئـەو شتە نوێیانـەی کـە بەدوایانەوەم، لەوێدا بەدیان بێنم. هەر کە فکری "ناوەنـدێکی ئـەزموونی" لە هزرمدا تێپەڕی وام هەست کرد پەردەیەك لەپێش چاوم لادرا. ترس لـە شکست لەناوچوو و هەستێکی پێکهاتوو لە هێز و گرنگی وەکوو تیرێك لەجەستەم نیشت.

هەستام و کڵاوەکەم دەست دایە و لە ژووری ئیداریم چوومە دەرەوە و بە خێرایی کارەبا بۆلای **زێتسلێر** رۆیشتم و بە پەلە وتم: - **زێتسلێر** وەرە، پێویستیم پێتە.

بێ ئەوەیکە چاوەڕوانی وەڵامەکەی بم، لە ژوورەکەی هاتمە دەرەوە و لە قادرمەکان چوومە خوارێ و خۆم خزاندە ناو ئوتۆمبێلێ. شوفێر بەخێرایی خۆی هاویشتە پشتی سوکان. وتم: - "سەبر کە!". **زێتسلێریش** هات و لە تەنیشت من دانیشت. وتم: - **بیرکێناو**. زەوییەکانی داگیرکراو!

شوفێر وتی: - **هێر ئشتورم بان فورر**. رێگەی ئەوێ بە تەواوی زەلاو و قوورێ و چڵپاوە.

بە توندی وتم: - ئەو ئەمرەی پێمداوی جێبەجێی بکە!

شوفێر بەڕێکەوت. بۆ پێشەوە خوار بوومەوە و هاوارم کرد: "خێراترا!" و ئوتۆمبێلێ فڕی. هاتبووە ناو مێشکم کە بە خێراترین پلەی خێرایی دەست بەکار بین، رێك وەکوو ئوتۆمبێلێك.

ئوتۆمبێلێ لە دووسەد مەتری زەوییەکانی داگیرکراو، رێك لەناوەڕاستی دارستان حاسێ بوو. نووسراوەیەکم بۆ "**لاگێرفورری خزمەت**" (جێگری بەشی کار و خزمەتگوزاری) دایە دەست شوفێر کە بیگەیەنێتەوە ئۆردوگا.

شوفێر بە راکردن رۆیشت. هەوڵم دا خۆم بگەیەنمە ئەو کێڵگە و مەزرایانەی لەوێڕا زەوی بەرداویەکەی دیار بوو. بەڵام دوای چەند هەنگاو بەناچاری وەستام، چونکە چەکمەکانم هەتا جمگە لەناو قووڕ رۆچوون.

دوای بیست خولەك دوو لۆریی پڕ لە زیندانی و ئێس. ئێس گەیشتن. چەند فەرمانیان پێدرا و زیندانییەکان خۆیان هاویشتە خواری و خەریکی بڕینی دار و چرپی بوون و دەستیان بە درووستکردنی جاددەیەك کرد.

ئوتۆمبێلەکە لە قوورِ هاتەدەر و شوفێرەکە بۆ هێنانی دوو لۆریی دیکە بۆ ئۆردوگا گەڕایەوە. فەرمانم بە زێتسلێر دا لەدواییدا ئێس. ئێس.ەکان دەست بەکار بن، چەند دەنگێکی بڵند بەرز بۆوە و زیندانییەکان شێتانە وە هەوڵ و کۆشش کەوتن.

شەو داهات کە جاددە گەیشتبووە ئەو کێڵگەیەی کە دەمویست. زێتسلێر خەریکی دانانی ئیناره (رووناکی– گڵۆپی بەهێز) بوو کە دەبوایە لە نزیکترین دارکارەبا بدرێت. هەر دوو مەزرام بەجوانی خستە بەرچاو. کاتێك لەوێ هاتمەدەرێ زێتسلێرم بانگ کرد. شارفورریك بە راکردن رۆیشت ودوای دوو خوولەك سەر و گوێلاکی زێتسلێر پەیدای بوو. هەموو شوێنێکم پێ نیشان دا و لەو کارانەی کە دەبوایە بەڕێوەبچن، تێمەگەیاند. کە تەواو بوو، سەیریم کرد و وتم "سێ رۆژە!"

سەیرێکی کردم. دەمی کرایەوە کە شتێ بڵێ، بەڵام من بە توونندی و خێرا دووبارەم کردەوە: "سێ رۆژە!"

گۆڕەپانی کارم جگە لە کاتی خواردن و خەوتن جێنەدەهێشت و لە نەبوونی مندا زێتسلێر کارەکانی بەئەستۆ دەگرت. کارەکانمان بە خێراییەکی سەیر و سەمەرە بەرەو پێش دەبرد و ئێوارەی رۆژی سێیەم دوو سەرپۆشی دووسەد کەسی ئامادەکرا.

لەراستیدا من کێشەم چارەسەر نەکردبوو، تەنیا ئەرکی من پێی نابووە قۆناغی جێبەجێ کردن و ئێستا ناوەندێکی تاقیگەم لەبەردەست دابوو کە بتوانم رۆژ بە رۆژ فکرەکانمی تێدا تاقی بکەمەوە.

هەر لە یەکەم هەنگاودا توانیم لە شێوەی بەڕێوەبەری ترێبلینکا چاکسازییەکی بەرچاو پێکبێنم: رامسپارد لەسەر هەردوو بینایان نووسی "تەلاری دوورخستنەوەی بۆگەن" و ئەمرم کرد لەناو هەردوو بینادا

کۆمەڵێك ئاوپاشی حەمام بە بۆڕییەکی زۆری منداڵ فریودەر دروست بکەن هەتا ئاوا نیشانی زیندانییەکان بدەین کە ئەوانمان بۆ حەمام کردن هێناوەتە ناو ئەم بینایە و دیسانیش ئەم کارانەم بە **"ئونتر ئشتورم فورری خزمەت"** راسپارد:

دەبێ بە زیندانییەکان رابگەیەنێ کە دوای حەمام کردن قاوەی گەرمیان دەدرێتێ. هەروەها بۆخۆی دەبێ لەگەڵیان بچێتە ژورێ و بە سەیر و سۆحبەت لە لای ئەم گروپە بچێتە لای گروپەکەی دیکە و لەوەیکە ناتوانێ سابوونیان بداتێ داوای لێبووردنیان لێبکات و تا ئەوکاتە هەموو زیندانییەکان نەهاتوونەتە ژوورەوە دووبارەی بکاتەوە.

خێرا کارگەکەم لەکار کرد و ئەزموون، رێگەی بۆ خۆش دەکردین کە کارەکان باشتر بەڕێوەببەین. زیندانییەکان بۆ چوونە ژووری ناو بینایەکان هیچجۆرە نارەزایەتییەکیان نیشان نەدا و لەئەنجامدا توانیم سەرکەشی و شۆڕش وکێشەی پێشهاتوو وەکوو نەبوو بگرم.

ئیتر باقی کارەکە ماوەتەوە لەخواردانی غاز.

هەر لە سەرەتای کار کەڵك وەرگرتن لە لۆریم بەکارێکی پڕ لە کێشە و لاواز لە بواری خنکاندنی جوولەکەکان زانی و تەواوی دوو هەفتەی دوایی بە پەلە و بە بیرکرنەوەی زۆر خەریکی دۆزینەوەی رێگەیەکی کاریگەرتر و متمانەتر بووم. بەدوای رێگەچارەیەك دابووم کە خۆم بە **ئشمولدەم** راسپاردبوو. بە **وولفسلانگم** راسپارد پرسیار لە **رایشس فورر** بکات کە ئایا دەکرێ هەندێك غازی خنکێنەرم پێبدەن یان نا؟

وەڵامەکەی ئەمە بوو کە **"ورماخت"** (سوپای ئەڵمانیا) هەندێ لەم غازانەی لەبەردەست دایە هەتا ئەگەر دوژمن ویستی لەم جۆرە غازانە کەڵك وەربگرێ، ئەوا دەستی خۆی رەپێش بخات، بەلام ئێس. ئێس.

ناتوانێ بێ وروژاندنی هەستی پڕبەدواچوونەوەی **"ورماخت"** سوپای ئەڵمانیا بەنسبەت چالاکییەکانی خۆی بەشێکی لەم "شتانە" بۆخۆی داوا بکات.

بەهەرحاڵ بۆ بەدەستهێنانی ڕێگەیەکی ئەوتۆ بە تەواوی بێ هیوا ببووم کە تەقدیرێکی رەببانی بۆمن کارساز بوو. ڕێك هەفتەیەك پێش ئەو رۆژەی کە دەبوایە پرۆژەکەم بە تەواوی کامڵ بێت، بەشێوەی فەرمی پێم راگەیاندرا کە **"گرووپن فورر گوئرتس"** بۆ بینینی پرۆژەکە و کارکردمان سەردانی ئۆردوگا دەکات. لەئەنجامدا ئەمرم کرد کە چوارگۆشەی **"کەی ئێل"** خاوێن و پاك بکرێتەوە و رۆژی پێش هاتنی بۆخۆم سەردانی هەموو لایەکم کرد و لەم دیتنە لەناکاو لەژوورێکی بچووکدا کۆمەڵێك قوتییم بینی بە نووسراوەی **"گیفتگاس"** (Giftgas)(غازی ژەهێراوی) و لە ژێریشیان: "تزیکلونی ب"(٣٥).

ئەمانە باقی بارێك بوو کە ساڵی پێشوو کارگەی **"ورلە"** و **"فریشلر"** لە هامبورگ بۆ کووشتنی مێش و مەگەس و میروستان لە سەربازخانەی تۆپچییەکانی پۆلۆنی بۆی ناردبووین. هەرکام لەم قوتیانە کیلۆیەك کێشی هەبوو و بەشێوەیەکی زۆر وردبینانە دەرگاکەیان داخرابوو و لەبیرمە کە کاتێك دەرگای قوتییەکانیان دەکردەوە دنکی بلووری سەوز رەنگی تێدابوو کە هەر هەوای پێدەکەوت دەبون بە غاز و دیسانیش لەبیرمە کە بەر لە کردنەوەی دەرگای قوتییەکان ماسکی دژە ژەهێریان لە رووخسار دەدا و بە هەمووجۆر ئاگاداریان لە خۆیان دەکرد و لە وەبیرهاتنەوەی

[35] - جۆرێك غازی ژەهێراوی مەترسیدارە کە بەشێوەی دنکی بلوورینە (دنکی بچووکی روونی شووشەیی) و لەگەڵ گەیشتن بە هەوا دەبێتە غازی ژەهێراوی.

ئەمانە بەم ئەنجامە گەیشتم کە ئەم غازانە زیاتر بۆ مرۆ مەترسیدارن هەتا مێش و مەگەس و دووپشك و مێروستان.

بیّ بەدرەنگ کەوتن بڕیارم دا ئەم بەرهەمە ژەهێراوییە تاقی بکەمەوە. رامسپارد لە دیواری هەر دوو بینایەکە کوونێکی بە پانایی پێویست دروست بکەن کە لە دەرەوە سەرپۆشی هەبێت. بەئەمری من دووسەد زیندانیان کە توانای کاریان نەبوو، هێنایە ناو سەرپۆشەکە و قووتییەکی "تزیکلون ب"یان لەناو کوونەکەدا بەتاڵ کرد. هەر ئەوکات ناڵەناڵی جەرگبڕی زیندانییەکانم گوێ لێبوو و بارانێك لە مشت و پێلاقە کە لە دەرگا و دەر و دیوار دەدرا. دوایی هاوار و قیژەکان کۆتاییان پێهات و بێدەنگی کوشتن و مردن ناو سەرپۆشەکەی داگرت. ئێس. ئێس.ەکانم راسپارد ماسکی دژە غاز لە رووخسار بدەن و هەموو دەرگاکانیان بۆ چوونی هەوا کردەوە. چەند خولەکێکی دیکە وەستام و دوایی لەپێش ئەوانی تر چوومە ناو سەرپۆشەکان:

کوشتن، شاکارەکەی زیندوو بوو.

ئەنجامی ئەم چالاکییە زیاتر لەرادەی چاوەڕوانکراوی من بوو: قووتییەکی یەك کیلۆیی "تزیکلون ب" بەس بوو هەتا لەماوەی دە خولەك دووسەد کەس بنێرێتە ئەم دونیای دیکە. کاتەکە زۆر بەرچاو بوو، یانی بەشێوەی ئاسایی ترێبلینکا گەیشتن بەم ئەنجامە نیو کاتژمێر زیاتری کات دەگرت.

لە لایەکی دیکەوە، ئەنجامی بەدەستهاتوو پەیوەندی بە نەبوونی بەنزین و ژماری لۆری و کێشەی فەننی و ... هەبوو. لەمانە بگوزەریّ، ئەم شێوەیە لەرووی ئابوورییەوە بە قازانجی ئێمە بوو، چونکە هەر یەك کیلۆ "گیفت گاس" بایی سیّ مارك و نیو بوو.

ڕێگەچارەکەم دۆزییەوە و خێرا لێکمدایەوە کە لە ماوەیەکی کەم و کوورتدا چەند جوولەکە لەناو دەبردرێن.

لەراستیدا ئەم ئەنجامە هەر لە خۆیەوە بەدەست هاتبوو کە دەبوایە شێوەی سەرپۆشەکانی دووسەد کەسی کە لە ترێبلینکا بەدەستم هێنابوو، وەلایان بنێم.

دەبوایە بیر لە دروستکردنی بینای گەورەتر بکەمەوە، چونکە ئەم سەرپۆشە بچووکانە لەگەڵ مەکینەیەکی لۆری یەکتریان د ەگرتەوە. هەروەها د ابەشکردنی شەمەندەفەری هەڵگری دوو هەزار جوولەکە ودابەش کردنیان بۆ ژووری دووسەد کەسی و گواستنەوەیان کاتێکی زۆری لێدەگرتین. ئەم شێوەکارە کاتێکی زۆری دەویست و پێویستی بە سیستەمێکی زۆر تێکەڵاو هەبوو کە لە پێکهاتنی کێشە یان شۆڕشێك بێشك بارودۆخی خراپ بۆ ئێمە دەهاتەپێش.

لەکارکردنی "تزیکلون ب" ڕێگەچارەی هەموو ئەو کێشانە بوو. کاتێك ریشمان لەبەر دەست غازی بەرهەمهاتووی لۆرییێکدا نەبێت، سرووشتییە کە لەکارکردنی رادەیەکی زیاتر لە گیفت گاس دەتوانێ هەموو زیندانییەکانی شەمەندەفەرێك لە تەلارێکی سەرپۆشدا لەناو ببات.

بە لێکدانەوە لە درووست کردنی تەلارێکی بەم گەورەییە کە جێگەی خەڵکێکی زۆر بێتەوە، توانیبووم بۆ یەکەمجار ئەرکێکی مێژوویی گەورە دابڕێژم کە پێمسپێردراوە.

تەنیا پێویستی نەدەکرد کە خێرا بڕۆم. دەبوایە بیر لە کاردانەوەیشی بکەمەوە، ئەویش هەر لە دەسپێکی کار. بەم ئەنجامە گەیشتم کە دروستکردنی تەلارێکی ئاوا گەورە دەبێ ژێرعەردی بێت، ئەویش پێکهاتوو لە بێتۆن (چیمەنتۆ و شیش) یانی دەبوایە بەرامبەر بە رهێڵی

ئەم خەڵکە زۆرە خۆی بگرێت. لەرووی ژمار و هەروەها لەناوبردنی هاوار و قیژاندنیان. لە لایەکی دیکە سەبارەت بە نەبوونی هەرجۆرە پەنجەرە و دەرگای زۆر، پێویستی بە هواکەشی گەورە دەبوو هەتا بکرێ دوای راگرتنی غاز، هەوا بنێردرێتە ژوور تەلارەکان. هەروەها بەدیار کەوت کە دەبێ جۆرێك بۆ ژووری جلکدانان پلانێك دابنرێت کە کۆمەڵێك کووسی و شوێنی جلك هەڵواسین و کۆمەڵێك شتی دیکەی لێبێت کە بکرێ متمانەی زیندانییەکان بۆ مانەوەیان پێك بهێنرێت.

هەروەها بیرم لە فەرمانبەرەکان کردەوە کە دەبوایە کۆماندۆکانی زیندانییەکان و هەروەها کۆماندۆکانی ئێس. ئێس. بینایان لە نزیك تەلارەکە بۆ دروست بکرێت و بەتەواوی هەرجۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ ئۆردوگا بپچڕێ و هەروەها بەم ئەنجامە گەیشتم کە جەماوەری ناو ئۆردوگا نابێ بەهیچ شێوەیەك لە کار و چالاکییەکانی ئەم تەلارانە ئاگادار بکرێنەوە.

خاڵی دیکە کە دەبوایە ئەنجام بدرێ ئەوە بوو کە ژوورەکانی غاز دەبوایە پەیوەندی لەگەڵ هێڵی شەمەندەفەرەوە هەبێ و دەبێ هێڵی ئاسنینی بۆ بکێشرێ کە زیندانییەکان لەپێش ژوورەکانی غاز بەتاڵ بکرێن بۆئەوەی پێش لە بەفیڕۆچوونی کات بگیرێت و هەمیش زیندانییەکان لە جەماوەری غەیری ئەڵمانی ئاوش ویتس بشاردرێنەوە.

بەم شێوەیە کەم کەم پرۆژەکە لەمێشکمدا پێکهات، بە ڕێکوپێکییەکی مەست کەرەوە و بە درووستکردنی تەلاری دیوئاسا کە هەموو ئەشیا و پێداویستییەکانی راستەوخۆ لە هێڵی ئاسنین و بە شەمەندەفەر بۆی دابین دەکرا و بینای زەبەلاحی ژێرزەوینی بە ژووری چێشتخانەی گەورە و ژووری خواردن، خەوتن، **"بیوتکامێر"** (ژووری غەنیمەت و ئەشیای

داگیرکراو ) و هەروەها ژووری دانیشتن و لێکدانەوە و توێژینەوە و شی کردنەوە و لێکۆڵینەوە بۆ زانایانی ناشنال سۆشیالیستی لەخۆی دەگرت.

چل و هەشت کاتژمێر پێش کۆتایی هاتنی ئەو کاتەی کە **هیملێر** دیاری کردبوو تەلەفۆنم بۆ "**ئۆبێر شتورم بان فورر وولفسلانگ**" کرد کە پرۆژەی تایبەتی "**رایشس فورر**" لە کاتی خۆیدا ئامادە دەبێت. بۆخۆم لە سەرتاوە تا کۆتایی تایپم کرد کە کاتێکی زۆری لێگرتم. کاتژمێر هەشت تەلەفۆنم بۆ **ئێلزی** کرد کە چاوەڕوانم نەبێت و دوای ئەو تەلەفۆنم بۆ چێشتخانە کرد و داوای خواردنێکی ساردم کرد کە بە پەلە قووتم دا و لە ئیش بەردەوام بووم. کاتژمێر یازدە بۆ جارێکی دیکە لاپەڕەکانم خوێندەوە، ئیمزام کرد و خستمە ناو پاکەت و پێنج شوێنی پاکەتەکەم لاك و مۆر کرد، خستمە ناو بەرکی ئۆنیفۆرمە سەربازییەکەم و وتم ئوتۆمبێلم بۆ بێنن.

خۆم خستە سەر کوشینی پشتەوە و ئوتۆمبێل کە بەڕێکەوت، سەرم خستەسەر پشتی کوشینەکە و چاوەکانم بەست.

ستاپێکی لەناکاو و توندی ئوتۆمبێلەکە لەخەو راپیەڕاندم. رووناکی چرادەستییەك کەوتە رووخسارم و گرووپێکی "ئێس. ئێس" دەورەی ئوتۆمبێلەکەیان دابوو. لە ژێر بورجی چوونەژووری **لاگێر** بووین.

دەنگێك هات کە: - ببوورە "**هێر ئشتورم بان فورر**" ئاخر ئێوە چرای ناوەوە بە پێکراوی دێڵنەوە.

- "**ماخت نیشتس**" (ئاساییە) **هاوپت شارفورر!**

- چرای ناو ئوتۆمبێل کوژابۆوە، ویستم بزانم کێیە. دەیسانیش داوای لێبوردن دەکەم **هێر ئشتورم بان فورر!**

- "**شون گوت**" (ئێ باشە) هەر ئاوا دەبێ کە بەردەوام هۆشیار بن.

ئیشارەیەکەم دایە. **هاوپت شارفورر** پێیەکانی لێکدان. دوو دەروازەی تەنراو بە تێلدڕووی ئۆردوگا بە جیغەجیغ کرایەوە و ئوتۆمبێلّ بەڕێ کەوت. دەمزانی کە پازگایەکی (سێتەرە) دیکە لە پێشمانە و چرای ناو ئوتۆمبێلّەکەم پێکرد.

شوفێرەکەم لە پێنج سەد مەتری ڤیلایەکە راگرت و گەڕاندمەوە بۆ ئۆردوگا. ترسام دەنگی ئوتۆمبێلّ منداڵەکان بەخەبەر بێنێ.

هەر ئەمجۆرەی کە بەپێیان دەڕۆیشتم، لەسەر رێگەم پێم کەوتە چەند قوولّکەوە و بیرم لەوە کردەوە کە بەیانی زوو چەند زیندانییەك بنێرم چاکیان بکەنەوە. لەماندوویان وەخت بوو بمرم، بەلّام ئەم چەند هەنگاوە رێپێوانە هینامیەوە سەرحالّ. شەوێکی جوانی مانگی ئوت بوو. شەوێکی ئارام و رووناك.

دەرگام بە کلیلی خۆم کردەوە و زۆر بە ئارامی پێمەوەدا. کلّاو و پەنجەوانەکانم لەسەر مێزەکە دانا و بۆ ژووری کارم رۆیشتم. ناوی ژوورێکی بچووکم نابوو ژووری کار کە دەرگاکەی رووبەڕووی چێشتخانە بوو و ئەو شەوانەی کەدرەنگ لە ئۆردوگا دەهاتمەوە لەوێ دەخەوتم. ئەشیاکانی پێکهاتبوون لە مێزێك، کوورسییەکی حەسیری، دەستشۆرێك و تەختێکی سەفەری بۆ خەوتن. لە سەر مێزەکەش تابەقێك لە داری سپی بەدیوارەوە بوو کەچەند کتێبێکی لەسەر بوو. **ئێلزی** هەمیشە دەیوت کە ئەم ژوورە بە حوجرەی زیندان دەچێت، بەلّام هەرچییەك بێت، ئەوا من پێم خۆش بوو.

دانیشتم و بێ ئیرادە دەستم بردە لای چەپی سینگم بۆئەوەی بزانم راپۆرتەکە لە جێگەی خۆیەتی یان نا. چەکمەکانم دەرهێنا و بە سەرپایە

(نەعلە)، و بەبێدەنگی دەستم بە ڕێپێوان کرد. لە ماندوویی وەکوو خۆڵ و مشکیم لێهاتبوو، بەڵام خەوم نەدەهات.

دوو تەقەیەك بە دەرگا کەوت. وتم: "فەرموو وەرە ژووری!" و ئێلزی هاتە ژوورێ. لە دوو جلی خەوی، جوانترینەکەی لەبەر کردبوو و تەنانەت بۆنێکی خۆشیشی لەخۆی دابوو.

– خۆ موزاحیم نیم؟

– هەڵبەتە کە نا. وەرە ژووری.

– دەرگای لەپشت خۆی بەست و ڕوومەتیم ماچ کرد. لەوەیکە چەکمەم لەپێ نەبوو و کوورتەباڵاتر لە ئەو بووم، ناڕاحەت بووم.

بە دەنگێکی وشك وتم: – دەکرێ دانیشی ئێلزی؟

لەسەر تەختە سەفەرییەکە دانیشت و بە ناڕەحەتی وتی: – کاتێك هاتییەوە گوێم لە دەنگت بوو.

– من کە زۆر بە ئارامی هاتمەوە.

– ئەرێ، ئەرێ، هەمیشە بە ئارامی دێیتەوە.

بێدەنگییەك ڕووی دا و دیسانیش دەستی بە قسە کردەوە: – دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم.

– ئێستا.

زۆر بە دوودڵی وتی: – ئەگەر ڕێگەم پێبدەی، خۆت ئاگاداری، ئەمڕۆژانە کەمتر دەتبینم.

– خۆ من ناتوانم هەر کارێکی حەزم لێبێت، بیکەم.

چاوەکانی لەمن بڕی و وتی: – دیارە زۆر ماندووی ڕۆدۆلف، تۆ زۆر ئیش دەکەی.

– یا، یا. دەتویست چیم پێ بڵێی ئێلزی؟

نەختێك سوور هەڵگەڕا و بە پەلە وتی: – باسی منداڵەکانە.

– یا.

– سەبارەت بە خوێندنیانە. کاتێك بگەڕێینەوە ئەڵمانیا زۆر لە دەرس و وانەکانیان وەپاش دەکەون.

بەسەر وتم "راستە" و ئەو بەدوای قسەکانیدا وتی: – لەسەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ "فراو بیتمان" و "فراو پیك" قسەم کردووە. منداڵەکانی ئەوانیش ئەم بارودۆخەیان هەیە. ئەوانیش لەم بابەتەوە دڵگرانن.

– یا.

– ئەوە بوو کە بیرم کردەوە....

– یا؟

– ... کە رەنگە بتوانین بۆ منداڵە ئەفسەرەکان مامۆستایەکی ئەڵمانی بێنین.

سەیریم کرد و وتم: – فکرێکی زۆر باشە ئێلزی. خێرا ئەم کارە بکە. من دەبوایە زووتر بیرم لە هێنانی مامۆستایەك کردبایەوە.

ئێلزی بە دوودڵی وتی: – تەنیا ئەمە نازانم کە لەکوێ جێگەی بکەینەوە....

– دیارە ئیتر. لای خۆمان. (بێ ئیرادە دەیسان دستم برد بۆ لای چەپی لەشم و وتم:) – کەواتە باشە هیچ گرفتێکمان نامێنێ.

ئێلزی هەر ئەمجۆرە دانیشتبوو. سەیرێکی خوارەوەی کرد و دەستی لەسەر چۆکی دانابوو. بێدەنگییەك پەیدا بوو. دوایی سەری بەرز کردەوە و دیار بوو پاڵەپەستۆیەکی زۆری لەسەرە، بەڵام وتی: – ناتهەوێ لای من دانیشی، رۆدۆلف؟

سەیرێکم کرد:

– ئێ، دیارە کە حەز دەکەم لات دانیشم.

لە تەنیشتی دانیشتم و سەرلەنوێ بۆنی عەترەکەی وە لووتم کەوت. زۆر بە کەمی رووی دەدا کە ئێلزی بۆنی لە خۆی بدات.

– دیسانیش قسەت هەیە کە بتهەوێ پێم بڵێی، ئێلزی؟

– نا. هەر دەمویست ئاوا چەنەبازی بکەم. (دەستی گرتم. بە هێواشی رووم وەرگێڕایەوە) و وتی: – ئیتر زۆر لەو کاتانەدا ناتبینم، رۆدۆلف.

– کار و ئیشم زۆرە.

بە دەنگێکی حەزینەوە وتی: – ئەرێ؟ بەڵام کە لە کێڵگە و مەزرا بووین، کارت زۆر بوو، خۆشم کارم زۆر بوو، بەڵام بارودۆخەکە ئاوا نەبوو. لەوێ نە فلووسێك پارەمان هەبوو، نە حەسانەوە، نە خزمەتگوزار و نە ئوتۆمبێل، بەڵام بەم حاڵەشەوە......

– ئیتر بۆ ئەو سەردەمە مەگەڕێوە، ئێلزی! (لەناکاو هەستامە سەرپێ و بە تووڕەییەوە وتم): – یانی تۆش باوەڕ ناکەی کە بۆخۆشم....(چەند هەنگاوێکم نایەوە و بە دەنگێکی ئارامتر بەردەوام بووم) – ئەگەر ئەمن لێرەم، ئەوا سەبارەت بەوەیە کە بوونی من لێرە پێویستترە.

دوای ماوەیەکی کورت ئێلزی وتی: – حەز ناکەی دووبارە لە لام دانیشی، رۆدۆلف؟

لەسەر لێوی تەختەکە دانیشتم. بە هێواشی خۆی بۆ لای من کێشا و دووبارە دەستی گرتم. بێ ئەوەی سەیرم بکات، وتی: – رۆدۆلف! یانی لەراستیدا پێویستە هەموو شەوێ بە تاك و تەنیا لێرە بخەوی.

– ئاخر خۆت باش دەزانی کە شەوانە من زۆر درەنگ دێمەوە. دڵیشم نایات منداڵەکان بەخەبەر بێن.

– تۆ کە بێ دەنگە دەنگ دێیتەوە. تازە دەتوانم سەرپایەکانت لەبەر دەرگا دابنێم.

بێ ئەوەی سەیری بکەم وتم: – ئاخر تەنیا ئەوە نییە. ئەم ڕۆژانە زۆر بە خراپی دەخەوم، بەردەوام لە ناو تەختی خەوتندا ئەو تەنیشت و ئەم تەنیشتە دەکەم. جاری وایە هەڵدەستم و جگەرەیەك دەکێشم، یان ئاوێکی دەخۆمەوە. حەز ناکەم ناڕاحەتت بکەم.

بۆنی عەترەکەی زیاتر لووتی گرتم و هەستم کرد کە بەسەرمدا خوار بووەتەوە:

– ناڕاحەتم ناکەی. (دەستی خستە دەوری ملم و بە دەنگێکی نەرم وتی): – تا ئێستا هیچ کات نەهاتووەتە پێش کە ئاوا بۆ ماوەیەکی زۆر.....

بەخێرایی وتم: – لەو قسانە مەکە ئێلزی دەزانی کە من بەم قسانە ناڕەحەت دەبم.

بێدەنگییەکی زۆر هاتەپێش. وتم: – بۆخۆت باش دەزانی کە کەسێکی گەرموگوڕ نیم.

دەستمی ڕێکووشی: – مەبەستم ئەوە نییە، تەنیا ئەم دواییە دەبینم زۆر گۆڕاوی. لە سەفەری بەرلینەوە بەملایەوە زۆر گۆڕاوی.

بە توندی وتم: – خوا عەقڵت بداتێ، ئێلزی!

هەستامە سەرپێ و بەرێکەوتمە لای مێزەکە و جگەرەیەکم پێکرد. دەنگی نیگەرانی ئێلزیم لە پشتە خۆم بیست: – زۆر بە زۆری جگەرە دەکێشی.

– یا، یا....

جگەرەکەم خستە ناو لێوەکانم و دەستم بە بەرگی کتێبەکان داهێنا.

– تۆ چییتە، ڕۆدۆلف؟

– هیچ بابە هیچ (رووم تێیکرد) : – یانی ئاوا پێویستە ببیتە هۆی پەرێشانحاڵیم، ئێلزی؟

هەستایەسەرپێ و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە خۆی لە باوەشی من هاویشت.

– من نامهەوێ پەرێشانحاڵت بکەم، رۆدۆلف. تەنیا ئەوەندە بیر دەکەمەوە کە تۆ منت خۆش ناوێ.

موویەکانم ناز کرد و بە دڵگرانییەوە وتم: – ئەوە چ قسەیەکە، بێشك پڕ بە دڵ خۆشم دەوێی.

– لەو مووچە و مەزرایە شتێکی ئاوامان نەبوو، بەڵام لانیکەم خۆشبەخت بووین. لەبیرتە بۆ کڕینی پارچە ملکێك پارەمان پاشەکەوت دەکرد؟ چ سەردەمێکی خۆش بوو!

خۆی زۆرتر بەمنەوە رێککوشی. خۆم کێشایەوە پاش و رووخساریم ماچ کرد: – ئێستا ئیتر برۆ بخەوە، ئێلزی.

دوای ماوەیەکی کوورت وتی: – حەز ناکەی ئەمشەو بێیتە سەرەوە بخەوی؟

لە رووی بێ وازی وتم: – ئەمشەو نا، ئێلزی ، ئێستا نا.

خوولەکێکی تەواو سەیری کردم. رووخساری سوور هەڵگەڕا. لێوەکانی جووڵان، بەڵام هیچی نەوت. روومەتی ماچ کردم و رۆیشت.

دەرگام بەست. دوایی گوێم لە دەنگی قادرمەکان گرت کە لەژێر پێی ناڵەیان دەکرد. کاتێك کە ئیتر دەنگێ نەما، بە ئارامی دەرگام داخست. کراسی سەربازیم دەرهێنا و بۆ ئەوەی خاتەرجەم بم دەستم کردە ناو بەرکی چەپی بۆئەوەی ببینم پاکەتەکە لەجێگەی خۆیەتی یان نا. دوایی چەکمەکانم هەڵگرت و بە ووردی سەیریم کردن. پانییەی راستی لووس

ببوو. بڕیارم دا هەر بەیانی بیانگۆڕم. چەرمەکەی نەرم بوو. هیچکات کاری واکس (بۆیە) کردنیانم بەکەس نەدەسپارد.

چووم واکسەکەم لە کشەوی مێزەکە دەرهێنا. نەختێك واکسم لێدان. ماوەیەکی باش خەریکیان بووم. چەکمەکان بریقەیان دەدا، بەڵام دەستی من هەر وا دەهاتوو دەچوو.

چەند خوولەکێك تێپەڕی.

شەپۆلێکی گەرم لە خۆشحاڵی هەموو جەستەمی داگرت.

دوو بەیانییەکەی کە ڕۆژی پێنجشەممە بوو، **ئۆبێر شتورم بان فورر وولفسلانگ**" (مقەدەم دووهەم) بە ئوتۆمبێلێك سەر و گوێلاکی پەیدا بوو. راپۆرتەکەم پێدا. بە تووڕەییەوە دەعوەتی منی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ ڕەت کردەوە و بەخێرایی ڕێگەی خۆی گرت و ڕۆیشت.

هەر دوا نیوەڕۆی ئەوڕۆژە **زێتسلێر** داوای دیدارێکی لەمن کرد. بە گوماشتە (خزمەتگوزار)م وت بیهێنێتە ژوور، هات، پانییەکانی لێکدا و بە ڕێزەوە بەرامبەرم وەستا. منیش سڵاویم وەڵام دایەوە و داوام لێیکرد دانیشێت. کڵاوەکەی هەڵگرت و لەسەر مێز لە تەنیشت دەستی خۆی داینا و دەستی درێژی بە سەرە بێ موویەکەی داهێنا. غەم و پەژارە لە ڕووخساری دەباری.

- **هێر ئشتورم بان فورر**، بۆ مەسەلەی "ناوەندی تاقیگە" هاتوومە خزمەت جەنابتان. شتەهایەك لەئارادایە کە من دەجوون، بە تایبەت یەکییان.
- یا؟
- دەتوانم راپۆرتێکت لە شێوەی کارەکانی پێشکەش بکەم؟
- هەڵبەت.

دەستە درێژەکەی سەرلەنوێ بە سەرە بێ موویەکەی داهێنا؟

– لەبارەی ئەوشتەی پەیوەندی بە باری دەروونی زیندانییەکانەوە هەیە، هیچ شتێکم پێ نییە. لەگەڵ ئەوەش ئەگەرچی بەڵێنیان پێدەدەم کە دوای "حەمام کردن" قاوەی گەرمیان لەناودا دابەش دەکەم، بەڵێنیشم پێداون کە مەکینەیەکی کۆن بێنم بۆ ئەوەی دیکۆری ئەوێ رێك بەخەم.

سەرم خوار کردەوە و بەدوای قسەکایندا رۆیشت:

– لەبارەی گەیاندنی غازیش رێگە بە خۆم دەدەم پێتان بڵێم کە جاریوایە زیاتر لە دە خوولەك دەگرێت، ئەویش بە دوو هۆ: یەکیان نمی کەش و هەوا و دووهەمیان بەهۆی نمی ناو تەلارەکە.

– نمی تەلار؟

– من رێگەم بە زۆندێر کۆماندۆ داوە دوای گەیاندنی غاز ئاو بە مەیتەکان دابکەن، بە تەواوی پیس دەبن. هەڵبەت خێرا ئاوەکەی لە تەلار دەرژێننە دەرێ، بەڵام ئیتر نەختێکی هەر دەمێنێ.

لاپەڕەیەکەم دەست دایە و قەڵەمەکەم بەسەردا هێنا و نووسیم: چ پێشنیارێکت هەیە؟

– عاردەکەی نەختێك سەراوژێری بدرێتی و جۆگەیەك بۆ رۆیشتنەدەری ئاوەکە دروست بکرێ.

نەختێك بیرم کردەوە و وتم:

– یا، ئەمە بەس نییە. دەبێ ئامێرێکی گەرم کەرەوە پێکبێنین. جگە لەمە، هەواکەشێکیشی دەبێ هەبێ. ئامێری هەواکەشەکە بۆ بردنەدەری غاز بەکەڵکمان دێت. دوای گەیاندنی غاز، ناردنی هەوا بۆ تەلار چە ماوەیەکی پێویستە؟

- لە راستیدا، هێر ئشتورم بان فورر، منیش دەمویست لەمبارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەم: ئێوە بۆ گەیاندنی هەوا دە خوولەکتان وەبەرچاو گرتووە، بەڵام ئەم ماوەیە کەمە: سەربازەکانی زۆندێر کۆماندۆ کە بۆ هێنانەدەری مەیتەکان دەچنە ناو تەلار، بەردەوام لەبەر ژانی سەر و مل و دڵیان دەناڵێنن و هەر بۆیەش کارەکە هێواش دەبێت.

- جارێ هەر کاتێکی پێویستە بیاندەیە، دواتر ئامێرەکانی هەواکەش رێگەتان پێدەدات کە کاتەکەی بەرادەی پێویست کورت بکرێتەوە.

زێتسلێر کۆخی و وتی:

- شتێکی دیکە، هێر ئشتورم بان فورر، ئەو دنکە بلووریانەی غاز هەر دەکەونە ناو هۆڵەکە و هەڵبەت دیارە ئیتر: کاتێک زیندانییەکان دەمرن، دەکەونە سەریان و چونکە ژمارەیان زۆرە، پێش لە ئازادبوونی غازەکان دەگیرێت.

- هەستامە سەرپێ، سووتوی جگەرەکەم خستە ناو ژێرجگەرە و لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم کرد: - چ پێشنیارێکت هەیە؟

- ئێستا هیچ، هێر ئشتورم بان فورر.

بێ ئەوەی کە دانیشم هەموو شتەکانم نووسی، دوایی ئیشارەم بە زێتسلێر کرد کە بەردەوام بێت.

- سەربازانی زۆندێر کۆماندۆش بۆ هێنانەدەری مەیتەکان کێشەیەکی زۆریان دێتەپێش. دوای ئاوپاشی مەیتەکان تەڕ دەبن و ئەوانیش هیچ شتێکیان لەدەستدا نییە.

- نووسراوەکەم دەست دایە و سەیری زێتسلێرم کرد. وەکوو رۆژ بۆم روون بوو کە شتێکی گرنگتری پێیە و لەبەریەکی دەکێشێتەوە و بۆ باس کردنی لە کاتێکی گونجاو دەگەڕێ. بە بێ وازی وتم: - بەردەوام بە.

زێتسلێر کۆخەیەکی هاتێ و رووی لێ وەرگێرام:

– دیسانیش..... شتێکی دیکە.... هێر ئشتورم بان فورر... یەکێ لە سەربازەکانی زۆندێرکۆماندۆم لەسەر هاورێیەکی خۆی بە جاسووسی دانا و کە گەڕامان، بینیم بیست ئەڵقەیەکی زێڕی پێیە کە لە مەیتەکانی دزیوە.

– دەیویست چییان لێبکات؟

– بەخۆی وتی چونکە ناتوانێ بێ کحول کارەکەی بەڕێوەبەرێت، لەگەڵ شپاس دەیانگۆڕێتەوە.

– لەگەڵ کێ؟

– لەگەڵ ئێس. ئێسەکان! ئێس ئێسەکانیشم گەڕا. شتێکم بەگیر نەکەوت. بەڵام ئەو جوولەکەیە، دیارە ئیتر تیرباران کرا.

لەسەر ئەم مەسەلەیە بیرێکم کردەوە و وتم:

– لەمەوبەدوا پێش غاز تێکردن هەموو ئەنگووستیلەکان کۆ بکەنەوە. ماڵی لەناوچووەکان بێشك هی رایشە.

بێدەنگییەك رووی دا و سەیری زێتسلێرم کرد؟ کەللەی بێ مووی وردە وردە سوور هەڵگەڕا. چاوی لە من دزیەوە. لە ژوورەکەدا دەستم بە رێپێوان کرد، وتم: – تەواو بوو؟

وتی: – ناین، هێر ئشتورم بان فورر.

کۆخەیەکی هاتێ. بێ ئەوەی سەیری بکەم لە ژوورەکەمدا دەستم بە هەنگاو نانەوە کرد. چەند چرکەیەك تێپەڕی، کوورسییەکەی وەدەنگ هات، سەرلەنوێ کۆخەیەکی کرد. وتم: – ئێ؟

لەناکاو دڵەڕاوکێیەکی تەواو هەموو لەشی داگرتم. من هیچکات بەنسبەت زێتسلێر تووڕەیی و توند و تیژیم نیشان نەدابوو: کەواتە نەدەبوایە

ترسەکەی لەلای منەوە بێت. لە گۆشەی چاوەوە سەیریم کرد. ملی بۆ پێشەوە هێنا و هەناسەیەکی قووڵی کێشا و وتی: – بەڵام سەبارەت بە کار و ئیشی گشتی، **هێر ئشتورم بان فورر**، بە داخەوە دەبێ پێتڕابگەیەنم کە ئەنجامەکەی ئێمەش ئەوەندە زیاتر لە **ترێبلینکا** نییە.

ساف و ڕێك و ڕاست وەستام و سەیریم کرد. دەستی ڕاستی بە سەریدا هێنا و وتی: –هەڵبەت ئێمە بەنسبەت **ترێبلینکا** پێشکەوتنی گرنگمان هەبووە. بە تەواوی شۆڕشەکانمان لەناو بردووە، کاری گەیاندنی غاز لەلایەن ئێمەوە خێرا و کاریگەرە و بە دوو تەلاری بچووکیش ئێستا دەتوانین لەشەو و ڕۆژێکدا پێنج هەزار کەس بە غاز بخنکێنین.

زۆر بە وشکی وتم: – زۆر باشە؟

– بەڵام زیاتر لە پێنج سەد کەس زیاتر ناتوانین ژێر خاك بکەین، لە ڕاستیدا کوشتن کارێکی نییە، تەنیا ژێرخاك کردنیان کات دەگرێت.

– بینیم کە دەستم وەلەرزە کەوتن. لە پشت سەرم شاردنمەوە و وتم: **زۆندێر کۆماندۆکان** دووبەرامبەر بکەن.

– ببوورن **هێر ئشتورم بان فورر**، بەڵام ئەم کارە دەردێك دەوا ناکات. ئێمە ناتوانین هەرجارەو دوو یان سێ مەیت زیاتر لە دەرگاکان بێنینە دەرەوە. بەڵام ئەوانەی لە قووڵایی چاڵەکان دان و مەیتەکان وەردەگرن و ناکرێ زیاتریان بکەین. ئەگەر لەوە زیاتر بن، ئەوا دەست وباڵی یەکتر دەگرن.

– ئەمانەی ناو چاڵەکە چی دەکەن؟

– ئاخر دەبێ بە ڕێکی مەیتەکان بچنین کە جێگەیەکی کەمتر بگرن. بە قەولی **"ئونتر شتورم فورر پیك"** دەبێ وەکوو لۆبیا لەناو قوتیدا بچێنرێن.

– قووڵایی چاڵەکان زیاتر بکەن.

– هەوڵی خۆمم دا **هێر ئشتورم بان فورر**، بەڵام کە بینیم ئەگەر قووڵایی زیاتر بێت، ئەوا کاتێکی زیاتر دەگرێت و تازە ئەو جێگەیەی کە بەدەست دەکەوێ بایەخی گرتنی کاتەکەی نییە. بە بڕوای من قووڵایی باش، سێ مەترە. (بە ئارامی سەری بۆ لایەکەی دیکە سووڕاند و وتی): مەسەلەیەکی دیکە ئەوەیکە چاڵەکان بە شێوەیەکی ترسناک دەخزێن و زەوی خۆرەیان هەیە!

– ئێرە کە **ترێبلینکا** نییە. تا حەز بکەی لێرە زەوی و مڵکی لێیە.

– نا‌ین، **هێر ئشتورم بان فورر**، بەڵام من شتێکی دیکە دەبینم: هەر قووڵکە و چاڵی تازە کە هەڵیدەکەنین، بە ناچاری لە ژووری غاز دوور دەکەوینەوە و هەڵگرتنی جەنازەکان لە ژووری غاز بۆ چاڵەکان بەرەبەرە دژوارتر دەبێ و ناچار لە خێراییمان کەم دەبێتەوە.

بێدەنگییەکی تەواو ژوورەکەمی داگرت و خۆی راست کردەوە و وتی: – رێگە چارەیەکت بە مێشکی دادێت؟

– بەداخەوە، نەخێر، **هێر ئشتورم بان فورر**.

بەخێرایی و بێ ئەوەی سەیری بکەم وتم: زۆر باشە **زێتسلێر**، دەتوانن بیری لێ بکەنەوە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەنگم دەلەرزی!

کڵاوەکەی دەست دایە، هەستایە سەرپێ و بە دوودڵییەوە وتی: – سرووشتییە **هێر ئشتورم بان فورر**، دیسانیش بیری لێدەکەمەوە. لەراستیدا سێ رۆژ دەبێ بیری لێدەکەمەوە و خۆم دەخۆمەوە. ئەگەر سەبارەت بە کەناڵ و چاڵەکان قسەم لەگەڵ تۆ کرد، ئەوا هیچ رێگە چارەیەکم نەبوو.

- ڕێگەیەکی بۆ دەدۆزینەوە زێتسلێر. ئەوە کە گوناهی تۆ نییە. خۆشحاڵم کە پێت دەڵێم خزمەتی تۆ بە تەواوی وەبەرچاو دەگرم.

ڕێك وەستا وڕێزی دانا و چووە دەرەوە.

دانیشتم و سەیری ئەو لاپەڕەیەم کرد کە بابەتەکانیم تێدا نووسیبوو. سەرم خستە نێوان دەستەکانم و هەوڵم دا نووسراوەکان بخوێنمەوە. دوای ماوەیەکی کەم بوغز ئەوکمی گرت. هەستام و چوومە بەر پەنجەرە وەستام: پرۆژەیەکی دێوئاسام بۆ رایشس فورر ناردبوو و هیچ بایەخێکی نەبوو. کێشە و گرفت وەکوو پێشوو باقی بوو. بە هیچ ئامانجێك نەگەیشتبووم. لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکەمدا بە تەواوی شکستم خواردبوو.

دوو رۆژی دوای ئەوە بۆ من زۆر وەحشەتناك و ترسناك بوو.

یەکشەممە داهات و "هاوپ تشتورم فورر هاگێمان" منی بۆ یەك "موزیکالیشر تێی" (خواردنەوەی چا بە مۆسیقییەوە) بۆماڵیان دەعوەت کرد. دەعوەتەکەیم قبووڵ کرد، ئاخر نیوەی ئەفسەرەکانی ئۆردوگا لەگەڵ ژنەکانیان لەوێ بوون. هەرچەند ناچار نەبووین زۆر لە گفتوگۆکردن بەردەوام بین: فراو هاگێمان هەر لە سەرەتای ڕێوڕەسمەکە لەپشت پیانۆ دانیشت و جگە لە چەند جار پشوو، ئیتر مۆسیقاژەنەکان بەردەوام پارچە مۆسیقایان پێشکەش دەکرد.

کات تێپەڕی و کاتێك بەخۆم هاتمەوە کە بینیم مۆسیقا لە ڕاستیدا هۆش و هزرمی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە و ڕاستی ڕاستی چێژی لێوەردەگرم.

زێتسلێر بە کەمان سۆلۆیەکی ژەنی. قەڵافەتی بڵندی خواربۆوەی لەسەر ئارشە خوار ببۆوە و حەڵقەی مووی سەری ماش و برنجی دەوری سەری

لەژێر چرا دەدرەوشایەوە. بەشێك لە مۆسیقایەکەم پێشتر بیستبوو و دەمزانی.

دوای بەرنامەی سۆلۆ، هاگێمان خەریتەیەکی گەورەی لە بەرەی شەڕی رووسیا هێنا سەر مێزەکە و پانی کردەوە. لە دەوری کۆ بووینەوە و رادیۆمان کردەوە. هەواڵەکان باش و بەرچاو بوون. پانزرەکان لە هەموو لایەکەوە لە پێشڕەویدا بوون و هاگێمان سەلیبە شکاوەکانی بە بەردەوامی لەسەر نەقشە دەهێناو دەبرد. بەرنامەی رادیۆ کە تەواو بوو، بێدەنگییەکی شاد و خۆش ڕێوڕەسمەکەمانی زیاتر رازاندەوە.

ئوتۆمبێلەکەم ناردەوە و بۆخۆم بەپێیان لەگەڵ ئێلزی بەڕێکەوتین. لە ناو گووند تاکە چرایەکیش نەدەهاییسا. دوو دیرەکی کەنیسەی ئاوش ویتس، لە گۆشەیەکی ئاسمانەوە بە رەشایی قیرەوە خۆیان دەنواند و من دووبارە بە داماوییەکی تەواو هەستی شکستم وەرگرتەوە.

رۆژی دواتر، لە بەرلینەوە بە تەلەفۆن ئاگاداریان کردمەوە کە ئۆبێرشتورم بان فورر وولفسلانگ" بۆ دیتنم دێتە ئۆردوگا.

نزیك بە نیوەڕۆ بوو کەگەیشت. سەر لەنوێ دەعەوتی منی بۆ نیوەڕۆ رەت کردەوە و چەند خوولەکێکیش زیاتر نەمایەوە. زۆر روون و ئاشکرا بوو کە بە تەواوی دەیهەوێ کاری گەیاندنی هەواڵ و پەیامی خۆی بەڕێوەببات و دووری لە هەموومان بکات.

وولفسلانگ کە رۆیشت، دەرگای ئیدارەم بەست و دانیشتم و بە دەستی لەرزۆکەوە نامەی رایشس فوررم کردەوە.

لە ئینشای نامەدا هەستم بەوە کرد کە بەجوانی نووسراوە و لایەنی خۆپارێزی تێدا بەڕێوەچووە. جگە لە من و زێتسلێر هیچکەسی دیکە لێی تێنەدەگەیشت. رایشس فورر پرۆژەکەی منی بەم پێیەوە کە "هەموو

خزمەتگوزاری پێویست بۆ پرۆژەیەکی تایبەت لە بینایەکی بەربلاودا دەبێت" بە گەرمی ستایشی کردووە لەوەیکە لەباری "بەشێکی کاریی پرۆژەکە" پێشم لە خەرجی زۆر گرتووە، سوپاسی کردبووم. لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەوەی کردبوو کە بەربلاوی دیدم زیاتر بکەم و پێویست بوو لانیکەم دروست کردنی چوار بینای بەربلاو پێشبینی بکەم، چونکە "پیلانی کارکرد دەبێ لە ۱۹٤۲ بگاتە دە هەزار کەس لە رۆژدا" و "لەبارەی بەندی پێنجەمی راپۆرتەکەدا"، رایشس فور "پێشنیارەکانی منی" بە تەواوی بەجێ زانیبوو و ئەمری کردبوو "لەگەڵ گەیشتنی ئەم ئەمریە بۆ ناوەندی تاقیگەی کۆلمهۆف بچم و دەستوور و فەرمانی پێویست لە شتاندارتن فورر کێلنێر (مقەدەم لە ئێس. ئێس) وەربگرم.

ئەم رستەیەی دواییم خوێندەوە، خۆشییەکی تەواو سەرتا پێی گرتم: "بەندی پێنجەمی راپۆرت"ی من تایبەت بوو بە ژێرخاك کردنی مەیتەکان. ئەوە روون بوو کە رایشس فورر پێشبینی کێشە و گرفتەکانی بەندی پێشووتری کردووە و من بۆ کۆلمهۆف دەنێرێت هەتا سوود لە لێکۆڵەرێکی ژێردەستی ئەو وەربگرم کە بە ئەنجامێکی باش گەیشتووە.

بەپێی فەرمان و ئەمر، نامەی رایشس فوررم سووتاند. دوایی تەلەفۆنم بۆ کۆلمهۆف کرد و قەرار و کاتێکم بۆ بەیانییەکەی دانا.

سەفەرەکەم بە ئوتۆمبێل و لەگەڵ زێتسلێر دەستپێکرد. نەمویست شوفێر لەگەڵ خۆم ببەم. بەیانییەکی جوان بوو و لەژێر خۆری مانگی ژانویە، بای پێکهاتوو چێژی بە مرۆڤ دەبەخشی ئەویش لە خێرایی ئوتۆمبێل کە رووخساری مرۆڤی وەبەر قامچی دەدا. دوای ئەم هەموو هەفتەیە پڕ لە کار و هەوڵە، ئەم نەختە دوورییە لە ئۆردوگا و هەڵمژینی هەوای پاکی دەرەوە، ئەویش لە بارودۆخێك کە نیوچە بڕوایەکم پەیدا

کردبوو کە لە کۆتایی ئەم هەموو خوێن و دڵ خواردنەوە بە ئەنجامێکی باش دەگەم، زۆر خۆشحاڵ و دڵخۆش بووم.

باسی نامەکەم لەگەل زێتسلێر کرد و ئەمانجی سەفەرەکەمانم بۆ شی کردەوە. رووخساری کرایەوە و بەجۆرێك پێی لەسەر پێداڵی بەنزین نا کە ناچار بووم لەکاتی تێپەڕین لە گوندەکان هۆشداری بدەمێ هێواشتر بڕوات.

بۆ خواردنی نانی بەیانی لە گوندێکی نەختێك گەورەتر وەستاین و بارودۆخێکی سەیر هاتەپێش: گوندی پۆلۆنی، هەر کە پێمان لە ئوتۆمبێل هێنایەخوار و چاویان بە جلکەکانی ئێمە کەوت، هەموویان کلکیان نایە سەر پشت و دوو پێیان هەبوو و دووی دیکەشیان قەرز کرد و دەستیان بە راکردن کرد و چوونە ژوورەکانیان و دەرگا و پەنجەرەکانیان داخست. ئێمە تەنیا دوو کەس بووین. بەڵام وا پێدەچوو پێشتر سابوونی ئێس. ئێس.یان بە جەستە و جلەکانیان کەوتووە!

پێمان کە بە تاقیگەی ناوەندی کۆلمهۆف گەیشت، دەست و پێم ون کرد سەبارەت بەم هەموو بۆنە رشێنەرەوەیە کە هەموو ناوچەکەی داگیر کردبوو. پێش ئەوەی بگەمە بورجی نیگابانی، بۆنەکەی دڵ و ریخۆڵەمانی هێنایە دەرەوە. هەرچی لە ئۆردوگا بەرەو پێشتر رۆیشتین، بۆنەکەی توندتر و توندتر بوو و تەنانەت کاتێك چووینە "کۆماندانتۆر" (ژووری ئیداری و فەرماندەیی) و دەرگا بەرووومان بەسترا، دیسانێش بۆنەکە بەری نەدەداین. واپێدەچوو ئەم بۆنە لەگەڵ جلك و ئەشیا و درگا ودیوار تێکەڵ ببوو. بۆنی چەورایی بوو کە تا ئەو کاتە لەهیچ شوێنێك بە لووتم نەگەیشتبوو و تەنانەت نەتدەتوانی لەگەڵ بۆنی ئەسبی تۆپیو بەراوردی بکەی، یان لەگەڵ بۆنی مەیتە بە کۆمەڵەکان.

دوای چەند خوولەك، **هاوپت شارفورریك** ئێمەی بۆ ژووری **"کۆماندانت"** رێنوێنی کرد.

پەنجەرەکە چوارتاق کرابۆوە و پێم کە نایە ژوورەکە بۆنێکی ناخۆشی چەوری و بۆنی مەیتەکان بەری دڵمیان گرت، بە حاڵەتی رێك وەستام و سلاوم کرد.

**ئشتاندارتن فورر** لەپشت مێزی کار دانیشتبوو. بەشل و بێ وازی رەتی سلاو و رێزەکەمی دایەوە و کوورسییەکی پێ نیشان دام. خۆم ناساند، زێتسلێریشم پێی ناساند و دانیشتم. **زێتسلێریش** لای راستی من و نەختێك دوواتر لەسەر کوورسییەك دانیشت.

**کێلنێر** زۆر بەرێزەوە وتی:

- **شتورم بان فورر**، زۆر خۆشحاڵم لە دیتنی تۆ.

رووی لە پەنجەرە کرد و نەختێك بێ جووڵە مایەوە. جۆرێك وەستابوو کە نیوەی رووخساریم دەدیت و چاویلکەی یەکچاوی لەچاو بوو. بۆ پلەی "**ئشتاندارتن فورر**" زۆر لاو بوو.

هەر ئەمجۆرەی کە سەری بۆلای پەنجەرە وەرگێرابوو، لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- دەبێ چەند وشەیەك لەبارەی راسپێردراوی تایبەتی خۆمت پێ بڵێم.

سەیرێکی کردم، قدوویەکی زێرینی لەسەر مێزەکەی هەڵگرت و بۆلای درێژ کردم. جگەرەیەکەم هەڵگرت. چەخماغی پێکرد و هینایەپێش و من بۆ پێشەوە خوار بوومەوە. دەستەکانی سپی و جوان بوون.

زۆر بە ئەدەب و بەحەیاوە وتی: - **رایشس فورر** ئەمری پێکردووم لە سەرتاسەری **"ئوشتراوم"** مەیتە بە کۆمەڵەکان بدۆزمەوە. هەڵبەت مەیتی

غـەیری سـەربازەکان (قسەکەی بـڕی، رووی کـردە زێتـسلێر و وتـی): — ببوورە جگەرەم بۆ تۆ رانەگرت.

دووبارە قدووەکەی کردەوە، بۆلای زیتسلێر رایگرت، زێتسلێر سوپاسی کـرد و کێلنێـر جگەرەکـەی بـۆ هـەڵکرد. دوایـی، هـەر ئـەمجۆرەی کـە دیسانیش سەیری پەنجەرەی دەکرد، لە قسەکانی بەردەوام بوو:

— کەواتە من دەبێ هەموو مەیتە بە کۆمەڵەکان لە ئوشتراوم بدۆزمەوە. یانی نە تەنیا ئەوانەی کە پۆلۆنین..... (جووڵەیەکی کەمی بە دەستەکانی دا) :، بەڵکوو، ئەو مەیتە بە کۆمەڵانەی کە سوپای ئێمە لە کاتی پێشڕەوی لەپـشت سـەری خـۆی بـەجێی هێـشتوون، دەبـێ بگـەڕێم و ئـەوانیش بدۆزمـەوە. خـۆ لـە مەبەسـتم دەگـەن: جوولەکـەکان، خـەڵکی ئاسـایی و مـەدەنی، پارتیزانـەکان و چـالاکی تایبـەت......(دووبـارە جووڵەیـەکی دیکەی بەدەستەکانی دا): هەروەها لەم شەتانە. کەواتە دەبێ من لەمجۆرە کـوژراوە بـە کۆمەڵانـە بدۆزمـەوە و گۆڕەکانیـان هەڵکـەنن.... و هەرچـی لەوانـەوە مـاوە، ئـەوا دەبـێ لـەناویان ببـەم. (سـەیری مـنی کـرد و دەسـتی راستی بە هێواشی بەرز کردەوە): و بیانـدەم هـەموو باقی مـاوەی ئـەوان لـەناو ببـەن. بـە قـەولی رایشس فورر: "هـیچ بەندەخوایـەك لـە دوای ئێمـە نەتوانی بیاندۆزێتەوە و ژمـاری ئەو کەسانە بەدەست بێنێ کە بەدەستی ئێمـە شـوێنەون کـراون و لـەناو چوونە." ئەم راسـپێردراوەگرنگە نـەختێك کێشەی هەبوو. بە خۆشییەوە توانیم مۆڵەتێك لە رایشس فورر وەربگرم... بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر و ئەم ناوەندە تاقیگەیە بۆ ئەم مەبەستەیە. (سەیری پەنجـەرەی کـرد و سـەرلەنوێ نیـوە رووخـساری ئاشـکرا بـوو): — خـۆ ئاگادارن؟ هیچ خاڵێکی هاوبەش لەگەڵ ترێبلینکا.... یان ئۆردوگا بچووکە مەترسـیدارەکانی وەکـوو ئـەو لـەئارادا نییـە... هەڵبـەت منـیش غـاز لـە

خـواردی کەسـانێك دەدەم، بـەڵام هـەوڵی مـن تـەنیا بـۆ ئەویـە بمـرێنم. (بێدەنگییەك): – من ئەزموونی جۆراوجۆرم تاقی کردووەتوە، بۆ نموونە مـەواددی تەقـەمنیم تاقی کردووەتـەوە. (لـە پەنجـەرەوە سـەیری دەرەوەی کرد و برۆکانی تێکنا و لەژێر لێو وتی):

– "دو، لێبێر هیمل" (وای خوای خۆشەویست) چ بۆن تۆپیوێك!

هەسـتا و چـەند هـەنگاوێکی نایـەوە و پەنجـەرەی داخسـت و وتـی: – دەبوورن!

دانیشت.

بـۆن، هـەروا لـەناو لووتمانـدا بـوو، چـەور و بۆگـەن و رشـێنەرەوە. لـە قسەکانی بەردەوام بوو کـە: ئـەنجامی مـەواددی تەقەمـەنی، ئـشتورم بـان فورر، لووت سووتان بوو. بۆن کردنی مەواددی تەقەمەنی تەنیا مەیتەکانی لەحاڵـەتی ئاسـایی دەخـست. ئەمـە و بـەس!... ئـێ چـۆن دەکرا باقی ئـەم لووت سووتاوانە لـەناو ببردرێن؟ ..... لەناوچوونی یەکجارەکی مەیتـەکان کـە ویـستی رایـشس فـورر بـوو، لەدەسـت مـەواددی تەقەمـەنی نـەدەهات. (دەسـتی راسـتی بەهێواشـی بـەرز کرد): با سـەرتان بـە ژان نـەهێنم: تـەنیا رێگەچارە، سووتاندنی مەیتەکان بوو.....

کوورەکـان..... زۆر سـەیرە، چـۆن تـا ئـەو کاتـە مـن بـیرم لـە کوورەکـان نەکردووەتەوە؟

بە دەنگێکی بڵند وتم: – کوورەکان، هێر ئشتانارتن فورر؟

– بـۆ خۆیـەتی. بـەڵام ئاگـاداری ئەمـە بـن ئـشتورم بـان فـورر، کـە ئـەم شێوەکارە هەمیشەش کاریگەر نییە. ئەگەر من لەناوەڕاست دارستانێك لـە پەنجا کیلۆمەتری ئێرە چاڵێکی پڕ لـە مـەیت بدۆزمەوە، پێویست بە وتن

ناکات کە ناتوانم کوورەکانم بۆ ئەوێ ببەم. کەواتە ناچار بووم ڕێگەیەکی دیکە بدۆزمەوە.... (هەستایە سەرپێ و بە هێوری وتی): – دۆزیشمەوە!
قدووی جگەرەی خستە ناو گیرفانی (باغەڵی) و کڵاوەکەی دەست دایە و وتی: – **بیتە!**
هەستام و **زێتسلێریش** لاسایی کردمەوە. **کێلنێر** دەرگای کردەوە. ئێمەی وەپێش خۆی دا و دەرگاکەی بەست. دوایی دووبارە وتی: – "**بیتە!**"، بۆخۆی وەپێش کەوت و ئیشارەی بە "**هاوپت شارفورر**"ێک کرد کە بەدوامانەوە بێت.
کاتێک پێمان نایە گۆڕەپانی دەرەوە، **کێلنێر** لووتی تێکنا و سەیرێکی منی کرد و بە پێکەنینیەوە وتی: – بێشک ئێرە ناوچەیەکی خۆش ئاو و هەوا نییە بۆئەوەی نەخۆشەکانی تێدا چارەسەر بێت. (شانەکانی هەڵاویشت و بە زمانی فەڕەنسی وتی): – "**کو فولە فوس**"؟ (چۆنتان بیر دەکردەوە).
من لە لای راستی ئەو دەڕۆیشتم؟ خۆر، ڕێک لە رووخساری دەدا. دەستی پەنجەوانەپۆشەکەی لەسەر دوایی ئۆتۆمبێلێ دانا و وتی: – لۆری بەهەرمهێنەری غاز....(دوایی) – بەجۆرێک کە سەیر دەکەن غازی مۆتۆر بە سۆندەیەکە دەنێردرێتە ژوورەوە. ئێستا وابیر بکەنەوە کە گێشتاپۆ گرووپێک پارتیزانی سی کەسی رادەگرێت و دوایی بەوپەڕی ڕێزەوە بیانداتە دەست من. لۆرییەکە دەچێتە دوایان و سواریان دەکات و دەیانهێنێ، تا دەگەنە ئێرە هەموویان مردوون. (پێکەنی) ئاگاتان لێیە؟ بە تیرێک لە دوو نیشان دەدەین: بەنزین هەم بۆ هێنانیان بەکار هاتووە و هەمیش بۆ لەخوارددانی غاز.... بەواتایەکی دیکە.... کەمخەرجی!
ئیشارەیەکی کرد و **هاوپت شارفورر** دەرگای گەراجی بەست.

دیسان وەڕێکەوتین و ئەو لە قسەکانی بەردەوام بوو:

– وابزانین کە من ئەم شێوەکارە بەکەس پێشنیار نادەم. شێوەیەکی باش نییە. پێشووتر، دەرگای لۆریمان کە دەکردەوە بۆئەوەی مەیتەکان بێنینەخوارێ، ئەوان تەنیا لە هۆش چووبوون و کاتێك دەمانهاویشتنە ناو گڕی ئاگر، قیژەیان دەگەیشتە ئاسمان.

زێتسلێر لەرزێکی هاتێ.

من وتم: – هێر ئشتاندارتن فورر! خۆ دەکرا لە ڕەنگی پێستیان بزانی کە مردوون یان نا؟ ئەگەر مردبان ئەوا ڕەنگیان سپی هەڵدەگەڕا، ئەگینا.....

کێلنێر قسەکانی منی بڕی و وتی: – لەخوارددانی غاز بۆ من شتێکی گرنگ نییە. هەر ئەمجۆرەی وتم من تەنیا بۆ ئەوە غاز لەخواردی زیندانییەکان دەدەم کە مەیتەکانیان بەدەست بێنم. تەنیا ئەو شتەی بەلامەوە گرنگە، مەیتە و بەس.

بینایەکی بەردینی درێژ لە دوکەڵکێشێکی بڵندی دروست کراو لە خشتی سوور لەوێ بوو کە بە دووکەڵکێشی کارگە گەورەکان دەچوو و لەناوقەدەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە.

کێلنێر وتی: –

لەوێیە.

کە گەیشتینە بەر دەرگاکەی، خۆی کێشایە دواوە. بیناکە بە تەواوی بەتاڵ بوو. وتی: – کوورەکانی جووت جووتن.

بۆخۆی دەرگای قوورسی ئاسنینی کوورەیەکی کردەوە و ناوەکەی نیشانی ئێمە دا.

جێگـەی سـێ مـەیت دەبـۆوە و ئاگردانەکـەی بـە بـەردی خـەلووز ئیـشی دەکرد. پەنکەی گەورەی تێدا بکارهاتبوو کە لەچاو بەستنێك گەرما و گڕی ئاگرەکەی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زیاد دەکرد.

دەرگای کوورەخانەکەی کە بەست، پرسیم: – بیتە، هێر ئشتاین ئرتن فـورر، بۆئـەوەی کـە هـەر بیـست و چـوار کاتـژمێر دوو هـەزار مـەیت بسووتێنرێ، پێویست بە چەند کوورە دەکات؟

دای لـە قاقـای پێکـەنین: – دو.... هـەزار..... مـەیت! "ماین لـی برمـان" (ئاغای بەڕێزم) ماشاالله لەم بوارەدا چەند سینگ فراوانن!

دەفتەرێکی بچووك و قەڵەمێکی لە گیرفانی هێنایەدەر و بە خێرایی چەند ژمارەیەکی لەسەر کاغەز نووسی.

– هەشت جووت کوورە..

سەیرێکی زێتسلێرم کرد. کێلنێر لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:- مـن تـەنیا دوو جـووت کـوورەم هەیـە، بـەڵام وەکـوو ئـامێری یارمەتیـدەر سەیریان دەکەم.

چاویلکە یەك چاوەکەی دانا و وەپێش کەوت. لێگەڕام زێتسلێر وەپێش بکەوێ و دەستێکم لە شانی دا.

ئوتۆمبێڵی ئشتاندراتن فورر لەبەر دەرگا چاوەڕیمانی دەکرد. زێتسلێر لە تەنیشت شوفێر و منیش لە پشتەوە لای چەپی کێلنێر دانیشتم. بۆنی پیسی و چـەوری تونـد و تیـژتر دەبـوو. ئوتۆمبێـلْ بـۆ لای دارسـتانێك دەڕۆیشت کە مارپێچی دووکەڵەڕەشەی تێدا بۆ ئاسمان دەچوو. کێلنێر ئەمری راوەستانی دا. گۆڕەپانێکی کەم دار و درەختی جوان لەبەرچاومان بوو کە رێك لە کۆتاییەکەی دووکەڵێکی رەش لە زەوییەکی بە درێژایی نزیك بە پەنجا مەتر بۆ ئاسمان دەڕۆیشت. لەنێوان دووکەڵەکە کۆمەڵێك

ئێس. ئێس و زیندانییەکان لە هاتووچۆدا بوون و خەریکی کار و ئیش بوون. جاروبارە گڕێکی ئاگر خۆی لە زەوی بەرز دەکردەوە و خەڵکەکەی بە رەنگی سوور دەردەهێنا. بۆگەنیو لە راستیدا تەحەمووڵ نەدەکرا.

زیاتر چووینە پێش: دووکەڵ و گڕ لە چاڵێکی بەرین و قووڵ هەڵدەستا کە تێدا کۆمەڵێك مەیتی ژن و پیاوی تێدا بوو. مەیتەکان سەبارەت بە گڕی ئاگر وێکدەهاتن و وەکوو ئەوە دەچوو زیندوون و بە جووڵە و هاتووچۆ لێك جیا دەبنەوە. جزە جزی کەباب بوو دەهات کە بەردەوام لەناو هەوا لەبن گوێی مرۆڤ دەتەقییەوە. جاروبارە رووناکییەك بە رەنگی سووری روون، سەرزیندوو وەکوو یاری ئاگر خۆی دەهاویشتە دەرەوەی چاڵەکە. لە قەراغ چاڵە بەرینە قووڵەکە تەپۆڵکە تەپۆڵکە لە مەیتی رووت بە مەودای یەکسان بەیەکتر لەسەر یەکتر دانرابوون و زیندانییەکانی "زۆندێر" (مەبەست کۆماندۆی تایبەت) لە دەوروبەری ئەم تەپۆڵکە مەیتانە دەهاتن و دەچوون و سەرگەرمی کار و ئیش بوون. دووکەڵ، هەندێ لە جووڵەکەکانیانی دەشاردەوە، بەڵام جاروبارە لەهەر دوولا و بەدرێژایی چاڵەکە، مەیتی رووت و قووت بوو کە بۆ هەوا دەهاویشتران، لە درەوشانەوەی گڕ بریقەیان دەهات و دەخرانە ناو خەرمەنی ئاگر.

لە دە هەنگاویی خۆم "کاپۆ"[٣٦] یەکەم بینی کە سەری وەرگێڕا و دەمی وەکوو ئەشکەوت کرایەوە. دەبوایە بە دەنگێکی بەرز فەرمانێکی دابێ، بەڵام من هیچم نەبیست، جزە جز و کەباب کرانی مەیتەکە هەموو دەنگێکی دەشاردەوە.

[36] - Kapo، سەرکارگەرێك کە لە خوودی زیندانییەکان هەڵدەبژێردرا و چاودێری لەسەر کار و ئیشی زیندانییەکان دەکرد.

**کێلنێر** کە رووخساری سەبارەت بە گڕی ئاگر سوور هەڵگەڕابوو و دەسەرەیەکی لەبەر دەمی راگرتبوو، دەمی بە گوێی من وەنا و وتی: – وەرن!

بەدوایدا چووم. منی بۆ کۆتایی چاڵەکە برد. لەژێر پێم و رێك لە سێ مەتری قوڵایی چاڵەکە لەناو باکێك کە لەناو دیواری چاڵەکە دروست کرابوو، ئاوەکییەکی خەست دەکووڵی. لەسەر ئەم ئاوە بەردەوام بڵق دەتۆقین و دووکەڵێکی بۆگەن و بۆن ناخۆشی لێ دەهاتەدەر.

زیندانییەك، سەتڵێکی کە لەسەری دارێکی درێژ بەسترابوو بردە ناو باکەکە و هێنایە سەرەوە. **کێلنێر** لەبنان گوێی مندا وتی: – چەوریی، ئەمە چەورییە!

لەم شوێنەی کە وەستابووم، دەمتوانی هەموو ناو چاڵەکە بە جوانی ببینم.

زیندانییەکان لە دەوروبەری ئێمەدا شێتانە کاریان دەکرد. دەسرەیەکیان بە لوتیانەوە بەستبوو کە واپێدەچوو هەر روومەت و رووخساریان نییە. زیندانییەکانی نەختێك دوورتر، لەپشت مارپێچی دووکەڵی رەش نادیار بوون و ئەو مەیتە رووتانەی کە دەیانهاویشتە ناو ئاگر، لەناکاو لەناو گڕی ئاگردا دیار نەدەمان. وەکوو ئەوە دەچوو کە ئاگر تەردەستی لەگەڵ دەکردن و بە چاو لەسەرنانێك هەمووی دەشاردنەوە.

زیندانییەك بە دلویەکەوە (سەتڵێکەوە) هاتەپێش. حەبلەکەی کرایەوە و سەرلەنوێ چووە ناو چەورییەکە. دەنگی جزەجز گوێی کەڕ دەکرد.

**کێلنێر** هاواری کرد: – وەرن!

بۆ ناو ئوتۆمبێلْ گەڕاینەوە. زێتسلێر پاڵی وەدەرگا دابوو و چاوەڕوانمان بوو. منی کە بینی رێك وەستا و وتی: - ببورن، لەناو ئەم دووکەڵدا ونم کردن.

سواری ئوتۆمبێلْ بووین. هیچ قسەیەك نەکرا. کێلنێر بێ جووڵە بوو. رێك و راست دانیشتبوو. کاتێك کە دەیویست سەرلەنوێ لەپشت مێزەکەی دانیشێت، وتی:

- ئاگاتان لێیە، شێوەی کار زۆر ئاسانە.... بەڵام تا ئێرەش کۆمەڵێك ئەزموونی لەپشتە. سەرەتا... چاڵەکە.... چۆن دەڵێن؟ ..... دەبێ قووڵایی و پانتاییەکی دیاری کراوی هەبێت.

برۆی راستی بەرز کردەوە. چاوێکی کەوت. لەناو هەوا گرتییەوە و لەناو دەستیدا دەیهێنا ودەیبرد.

- بەم ئەنجامە گەیشتم کە چاڵێکی باش دەبێ پەنجا مەتر درێژایی هەبێت، شەش مەتر پان بێت و سێ مەتریش قوولْ بێت.(وەکوو تونەلێکی سەرکراوە)

ئەو دەستەی کە یەکچاوەکیەکەی لەناودا بوو، بەرزی کردەوە:

- خاڵی دووهەم، تێیدا خوێن و دڵمم خواردووەتەوە. هاوسەنگی لەنێوان سووتەمەنی و مەیتەکان دایە. ئاگاتان لێیە کە: هەر ئاوا کە ئەڵلابەختەکی نابێ. ئێستا پێتان دەڵێم: سەرەتا تابەقێك دار دەچنمە سەر زەوی. سەد مەیتی لەسەر دادەنێم و دیسانیش داریان لەسەر دەچنم. ئەوکاتە کۆنە قووماش بە نەوت دەکەم. کاتێك ئاگرەکە بە تەواوی پێبوو، ئەمکاتەیە کە داری پێوە زیاد دەکەم و سەر لەنوێ مەیتەکانیشی پێوە زیاد دەکەم....

جووڵەیەکی بە دەست کرد و:

- هەر ئەمجۆرە تا کۆتایی....
- چاوێکی هەڵێنا:
- خاڵی سێیەم: چەورییە.

سەیری منی کرد و بەردەوام بوو:

- دەبێ ئەم خاڵە بزانن کە لەسەرەتاوە، زیادە رۆنی مەیتەکان کاری گڕگرتنی تووشی کێشە دەکرد. گەڕام و گەڕام تا بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە رێگەچارەیەك بدۆزمەوە..... سەراوژێرییەك بە چاڵەکە دەدەم و بۆ ئاسانکاری جۆگەڵەم تێدا درووست کردووە بۆئەوەی رۆنی چەورییەکان بچێتە ناو باکەکان و لەوێدا کۆ ببنەوە.

وتم: هێر ئشتاندارتن فورر، ئەی ئەو زیندانیانەی ئەم رۆنەیان دەکێشایە سەرەوە....

بە نیشانەی سەرکەوتووانە زەردەیەکی هاتێ و وتی: - راستە.

بەری هەر دوو دەستی خستە سەر مێزەکە و بە وردی سەیری منی کرد و وتی:

- ئەو رۆنانە سەرلەنوێ دەرژێننە سەر مەیتەکان. هەموو زیرەکایەتی کارەکە لێرە دایە: من مەیتەکان بە نەختێك رۆنی خۆیان تەڕ دەکەم و بەڵام بۆچی؟ چەورایی زۆر کاری گڕگرتن بەدوا دێخێت، بەڵام ئەم نەختە چەورییە دەبێتە هۆی زیاتر گڕگرتنی ئاگرەکە. بۆ نموونە ئەوکاتەی کە هەوا بارانییە، رۆن بە ئاگرداکردن کارەکەمان پێش دەخات.

قدووی جگەرەکەی دەرهێنا و بۆلای من رایگرت و دوایی بۆلای زێتسلێر و چەخماخی بۆ پێکردین. دوایی خۆیشی جگەرەیەکی هەڵگرت، چەخماخەکەی کوژاندەوە و دووبارە پێیکردەوە و جگەرەکەی داگیرساند.

وتم:

– هێر ئشتاندارتن فورر! کارکردی چاڵێکی ئەوتۆ لەهەر بیست و چوار کاتژمێردا چەندە؟

پێکەنینێکی هاتێ:

بە بیست و .... چوار کاتژمێر! راستی راستی بەرزەفڕانە سەیری هەموو شتێ دەکەن!

بە سیلەی چاوەکانی سەیرێکی کردم و بە روویەکی جددیانە چاوی لێکردم:

– دەزانن؟ کارکردی بیست و چوار کاتژمێر بۆ من گرنگ نەبووە. یانی هیچکات ئاوا بیرم نەکردووەتەوە. بەڵام بەم حاڵەشەوە دەتوانم کارکردی یەك کاتژمێری خۆمو بۆ دیاری بکەم: لەنێوان سێ سەد هەتا سێ سەد و چل مەیت: یانی ئەگەر هەوا وشك بێت سێ سەد وچل و ئەگەریش باراناوی بێت، ئەوا سێ سەد مەیت دەسوتێنرێت.

حسێبم کرد و وتم: لە بیست و چوار کاتژمێردا دەبێتە هەشت هەزار مەیت!

– وابزانم.

دوای ماوەیەکی کورت وتم: – بێشك هەر قووڵکە و چاڵەی دەکرێ هەتا ماشاڵڵا کەڵکی لێوەربگیرێت؟

– بێشك.

بێدەنگییەك هاتەپێش و زێتسلێر سەیری کردم.

قۆناغی بێ ئەزموونی و ترسان و دڵەڕاوکێ کۆتایی پێهات. ئێستا ئیتر دەمتوانی بە متمانەوە سەیری داهاتوو بکەم. ئێستا ئیتر متمانەم بەخۆم هەبوو کە نە تەنیا دەتوانم بەو ژمارەیە بگەم کە لە پرۆژەکەدا دیاری کراوە، بەڵکوو لێشی تێدەپەڕم.

تا ئێرە کە پەیوەندی بە منەوە هەیە، دەمتوانی کەم تا زۆر قەناعەتم بە کوورەکانەوە بێت.

بە پێشبینی سی و دوو کوورە بۆ کۆی چوار بینای گەورە کە دەبوایە دروستیان بکەم، دەمتوانی لە بیست و چوار کاتژمێردا بە ژمارێکی هەشت هەزار کەسی بگەم. یانی بەو ژمارەی کە لە پێشبینی "رایشس فورر" تەنیا دوو هەزارم کەم بوو. لەئەنجامدا تەنیا پێویست بە قوڵکە و چاڵێکی یارمەتیدەر هەبوو کە لەکاتی پێویست دوو هەزار کەسەکەی دیکەشی تێدا بسووتێنین و لەناویان ببەین.

لە راستیدا من ئەوەندە خۆشیم لەم قووڵکانە نەدەهات. ئەم شێوەیە بۆ نەتەوەیەکی گەورەی پیشەگەر، بەبڕوای من کارێکی قێزەون و ناشیرین و ناشیانە بوو. دەمویست لە قووڵکەکاندا شێوەیەکی ئەمڕۆژیانەتەر پێک بێنم. لەگەڵ ئەمەشدا لە قووڵکە و چاڵەکاندا دەکرا نهێنی پاریزتر بین. چونکە سووتاندن لە کوورەکان، وەکوو قوڵکەکان و چاڵەکان کارەکە لە شوێنی ئاشکرا و سەرکراوە بەڕێوەنەدەچوو، بەڵکوو بە تەواوی لە چاو بەدوور بوون. لەلایەکی دیکەوە، هەر لەسەرەتاوە ئارەزووی من ئەوە بوو کە لەناو بینایەك و لەژێر سەربانێك هەموو "چالاکی پرۆژەکە" بەڕێوەببەم. زۆرم حەز لێبوو و لە وەڵامەکەی رایشس فووریش وام بۆ دەرکەوت کە ئەویش ئەمجۆرەی پێ باشترە و بە دڵێتی. یانی بەم مانایە کە شەمەندەفەرێکی دوو هەزار کەسی لە جوولەکەکان هەر لەکاتی جلك دەرهێنانیان تا ئەو کاتەی دەبنە خەڵوز، لە ناو بینایەکدا بن. بۆ ئەم مەبەستەش تەنیا شتێك لە ئارادا بوو، کە هزر و خەیاڵی مرۆڤ ئاسوودەتر دەبوو.

بە بیرکرندەوەیەکی زیاتر، بینیم کە دەبێ وەکوو کارگەیەکی تەسمە زەنجیرەیی کار بکەین کە خەڵکەکە لە ژووری دانانی جلك بۆ ژووری غاز و لەوێش بۆ کوورەکان ببەین، ئەویش لە کەمترین کاتدا. چونکە دەبوایە ژووری غاز ژێرعەرد بێت و تەلاری کوورەکان دەبوایە لە ژووری سەرەوە بێت، بەم ئەنجامە گەیشتم کە تەنیا بە ئامێری میکانیکی گواستنەوەکەیان دەکرێت و هیچ رێگەیەکی دیکەمان نییە. بیرکردنەوە لەوەیکە زیندانییەکانی زۆندێر کۆماندۆ بتوانن چەندین سەد مەیت لەسەر قادرمەکان بگوازنەوە، زۆر نادروست بوو. ئەوکاتەی کە لەم ناوەدا لەدەست دەرۆیشت یەکجار زۆر بوو. هەر بۆیەش دەستکاریم لە پرۆژەی سەرەتایی خۆمدا کرد و بڕیارم دا لەشوێنی زۆر باش چوار ئامێری بردنەسەر دابنێم کە لە هەرکامەیاندا جێگەی بیست و پێنج مەیت بێتەوە. بەم شێوەیە بۆ گواستنەوەی دوو هەزار مەیت لە تەلاری غاز بۆ تەلاری کوورەکان تەنیا ئەوە بەس بوو کە ئامێرەکان بیست جار بچنە سەرەوە و بێنەوە خوارەوە. دەبوایە چەند عارەبانەیەك لە نزیك ئامێرەکان بێت و کار تەواو و کامڵ دەبوو.

کاتێك پرۆژەکەم بەم شێوەیەی لێهات، راپۆرتێکی دیکەم بۆ رایشس فورر ئامادە کرد. **"ئۆبێرشتورم بان فورر وولفسلانگ"** جارێکی دیکەش هاتەوە لام و بیست و چوار کاتژمێر دواتر وەلامی **هیملێری** پێدامەوە.

پرۆژەکە بە تەواوی قبووڵ کرابوو. پارەیەکی زۆریان بۆ دیاری کردبووم و رێگەم پێدرابوو بۆ وەرگرتنی هەرجۆرە خشت و چیمونتۆ و ..... خۆم بڕیار بدەم.

لە دەستنووسەکەی رایشس فووردا زیاد کرابوو کە دوو ئامێر لە چوار ئامێرەکە دەبێ "هەتا پازدەهەمی ژوئیەی ١٩٤٢" و دوو ئامێرەکەی دیکە

هەتا سی و یەکی دیسەمبەری هەمان ساڵ "ئامادەی کەڵك وەرگرتن" بن. بەم حسێبە، بۆ گەیاندنی یەکەم بەشی کارەکان بۆ قۆناغی کۆتایی کەمتر لە ساڵێکم کات پێدرابوو.

بێ بەدرەنگی کەوتن کارەکانم دەست پێکرد. لە هەمانحاڵ، کارگە کاتییە دووانەکەی بیرکێناو لەژێر چاودێری زێتسلێر لەکار و چالاکی بەردەوام بوو و جگە لەمە زێتسلێرم راسپاردبوو سەری قوڵکەکانی پێشوو هەڵبگرێت و مەیتەکانی بسووتێنێ.

ئەوەندەی پێنەچوو ئەو بۆگەنیوەی کە لە کۆلمهۆف هەڵمانمژتبوو، بەسەر هەموو ئۆردوگاکەدا زاڵ بوو و ئاگاداری ئەوە بوومەوە کاتێك تەنانەت لەلای رۆژئاواشەوە دێت، دیسانیش بۆنەکە کەم نابێتەوە. کاتێك با لەلای رۆژهەڵاتەوە دەهات، بۆگەنیوەکە زۆرتر دەڕویشت و گوندی ئاوش ویتس و تەنانەت لەویش دوورتر، هەتا بوبیتس. رامسپارد کە پروپاگەندەی کارکردنی کارگەیەك کە تایبەت بە خاوێن کردنەوەی پێستی ئاژەڵ وەکار کەوتووە و ئەم بۆگەنیوە هی ئەوە، هەرچەند خۆم بە سەرکەوتوویی ئەم پروپاگەندەیە فریو نەدەدا: لە راستیدا بۆنی بۆگەنی پێست بەهیچ شێوەیەك وەکوو بۆنی پیی و چەوری هەڵپروزانی مووی سەری مرۆڤ نەدەچوو. بە دڵەڕاوکێیەوە بیرم لەوە کردەوە کە دووکەڵی چوار دووکەڵکێش ئەویش لەماوەی بیست و چوار کاتژمێر دۆخەکە لەوە خراپتر و ترسناکتر دەکات لەوەیکە ئێستا هاتووەتە پێش.

بەم هەموو قسانەوە کاتێکی زۆرم لەبەردەست نەبوو کە کات بۆ ئەم شتانە بەفیڕۆ بدەم. بەردەوام لە گۆڕەپانی کار و ئیش وەستابووم و ئێلزیش لەوەیکە هیچکات لەماڵەوە من نابینێ، وەپرتەبۆڵە کەوتبوو. لەڕاستیدا من بەیانیان کاتژمێر حەوت لە ماڵ دەردەکەوتم و شەوانەش

پــێش دە و دوازدە نەدەگەڕامــەوە، ئــەویش هــەر بــە گەیــشتنم خــۆم دەهاویشتە سەر تەختی سەفەریم و وەكوو تەختەبەردێك بۆی دەخەوتم.

لە كۆتاییدا ئەم هەوڵ و تێكۆشان و كۆششە بوو كە بە میوە دەگەیشت: نۆئلی ساڵی چل و یەك نزیك دەبوو و كارەكانی هەر دوو بینا بە رادەیەك پێشوەچوونی بەخۆیەوە بینیبوو كە منی خۆشبین دەكرد لەوەیكە لەكاتی دیاریكراودا كۆتاییان پێ بێت. بەمحاڵەشەوە من بۆ چركەیەكیش لە هەوڵ و كار و ئیش نەوەستام و لەنێوان ئەم هەموو غەم و نەهامەتیانەی كە بەردەوامی هەر دوو **لاگێرەكان** بۆیان پێكدەهێنام و وەرگرتنی هەموو رۆژانەی شەمەندەفەری پڕ لە زیندانی نوێ و بێ ئیلتزامی جاروبارەی ئێس. ئێس.ەكان، هەموو رۆژێ هەلی ئەوەی بۆ دەرەخساندم كە چەند جارێك لە گۆڕەپانی ئیش و كاردا خۆم نیشان بدەم.

لە سەرەتای مانگی دیسەمبەر، یەكێ لە **لاگێرفوررەكانی بیركێناو** – یانی **هاوپ تشتورم فورر هاگێمان**" داوای كاتێكی لێكردم بۆ گفتوگۆ كردن. وتم بێتە ژوورێ، رێزی دانا و كوورسییەكم پێ نیشان دا كە دانیشت. سەرگەردانی و دڵەڕاوكێ لە رووخساری دەباری.

بە دەنگێكی پچڕ پچڕ وتی: – **هێر ئشتورم بان فورر**.... لەبارەی **زێتسلێر** شتێك هەیە...... كە دەمهەوێ.... باسی بكەم.

وتم: – **زێتسلێر**؟

ئەو سەرسووڕمانەی كە نیشانم دا، دڵەڕاوكێی **هاگێمان**ی زیاتركرد.

– راستە **هێر ئشتورم بان فورر**.... بە وەبەرچاو گرتنی ئەوەیكە.....من بەرپرسی "**ئۆبێرشتورم فورر زێتسلێر**" نیم.... بەڵكوو راستەوخۆ لە ژێردەستی ئێوە دایە.... رەنگە وا جوانتر بوو كە.....

وای نواند كە دەیەوێ هەستێتە سەرپێ.

- چییە، پەیوەندی بە کاری ئیدارییەوە هەیە.
- هەڵبەت هێر ئشتورم بان فورر.
- کەواتە پێویست بە شاردنەوە ناکات.
- هەڵبەت، هێر ئشتورم بان فورر، ئاخر منیش بیرم لەوە کردۆتەوە... لەلایەکی دیکەوە، بارودۆخ، زۆر خراپە... زێتسلێر (بە زەحمەت هەناسەی کێشا) خۆی هاوڕێی منە... لە راستیدا ڕێز بۆ رووحیاتی هونەرمەندانەی دادەنێم....

بە تووڕییەوە وتم: - ئەمە هیچ پەیوەندی بە مەسەلەکەوە نییە. ئەگەر زێتسلێر خەتایەکی کردووە، ئەرکی ئێوەیە کە ئاگادارم بکەیتەوە.

- منیش ئاوام بیر کردووەتەوە هێر ئشتورم بان فورر. (ئەمەی وت و نەختێك هێور بۆوە) - بێشك من هیچ شکایەتێکم لە زێتسلێر نییە و پێم وابێ پێویستی بە رابواردن هەبێت..... کەواتە ئەمە هەڵەیە.... ئەویش لەبەردەم سەربازەکانی.... چۆن بڵێم؟ ..... لەرووی پلە و پایە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.... بەڵام بۆ ئەفسەرێك!....

بە بێ وازی تەواو وتم: - ئێ، دوایی؟

هاگێمان پەنجە ئەستوورەکەی خستە ناو یەقەی و سەیری لای پەنجەرەی کرد:

- من ئەوەم گوێ لێبووە.... هەڵبەت، هێرئشتورم بان فورر، ڕێگەم بەخۆم نەدا کە.... بێ ئیزن وەرگرتن لە جەنابتان راپۆرتێك ئامادە بکەم..... بەم پێیەوە، بۆخۆتان کە ئاگادارن، من لە لایەن خۆمەوە.... هیچ شکێکم نییە.....

هەناسەیەکی تازە کردەوە:

– بەهەرحاڵ، مەسەلەکە ئەوەیە. هەرکات شەمەندەفەر دەوەستێ و زیندانییەکان بەتاڵ دەکرێن..... زێتسلێر.. بێشك سەبارەت بە خزمەتێك کە لەوێ ئامادەیە.. لەمبارەیەوە هیچ شکێك نییە.... بەهەرحاڵ ئەمر دەکات.. کچێکی جوولەکە جیا بکەنەوە.... ئەویش ئەوەی لە هەموویان جوانترە و کاتێك هەموو زیندانییەکان چوونە ژوورەوە.... کچەکەی بەدوای خۆیدا دەکێشێت و دەیبات.. ئاگاداری ئەوە بن کە کچەکە رووت رووتە..... یانی ئەو شتەی کە دۆخەکە نارێکتر دەکات، رایدەکێشێت و دەیباتە ژوورێکی پەرت....... و لەوێ....

سەرلەنوێ پەنجەکەی خستە ناو یەقەی و:

– لەوێ، کچەکەی لە هەردوو جمگەی دەستەوە.... بە دوو پەت کە داویەتی لە میچەکەیان بستووە، دەبەستێتەوە..... بۆخۆم ئەم دوو پەتەم بینیوە هێر ئشتورم بان فورر.... بەهەرحاڵ، کچە رووت و قووتە.... جمگەی دەستەکانیشی کە بە پەتەوە بەستراونەتەوە... ئەوکات زێتسلێر بە دەمانچە دەست دەکات بە تەقە کردن بۆلای کچەکە.... هەڵبەت ئێس. ئێس.ەکان هەموویان شاهیدن.....

زۆر بە سەختی و دژواری هەناسەی هەڵکێشا.

– هەموویان قیژەی کچە و دەنگی گوللەکان دەبیسن.... و زێتسلێر، لە راستیدا هەموو کاتەکەی بۆ ئەمە تەرخان کردووە....

هاگێمان دیسانیش هەناسەیەکی نوێ کردەوە:

– دیسانیش ئەگەر شارفوررێکی سادە ئەمکارەی دەکرد.... هەڵبەت خۆتان کە باشتر دەزانن.....

پەنجەم لەسەر دوگمەیەکی سەر مێزەکەم داگرت، تەلەفۆنەکەم دەست دایە و وتم: – ئێوەن زێتسلێر، دەبێ قسەتان لەگەڵ بکەم.

**هاگێمـان** رووخـساری تێکـچوو و لـەناکاو دڵـەڕاوکێ و تـرس لەهــەموو رووخساری باری:

- **هێر ئشتورم بان فورر!** یانی ئەمن دەبی لە رووی **زێتسلێر**.....
- ئێوە دەتوانن بڕۆن **هاگێمان**.

خێـرا سـڵاوێکی دا و رۆیـشت. خوولـەکێکی نەکێـشا هـەتا لـە دەرگـای ژوورەکەمیان دا. وتم"فەرموون وەرنە ژووری" و سەر و گوێلاکی **زێتسلێر** هاتـە ژووری. دەرگـای داخـست و سـڵاوی کـرد و رێـك وەسـتا. سـەیری چاوەکانیم کرد و کەللەی بێ مووی دەستی بە سوورهەڵگەڕان کرد.

بە دەنگێکی گڕ و وشك وتم: گوێ بگرە **زێتسلێر**. من نـە لۆمـەت دەکـەم و نە دەمهەوێ بۆم شـی بکەیتـەوە. بەڵکوو داوات لێدەکەم کە کاتێك لەسەر ئیشی، جگە لەکاتی شەڕ و شۆڕش دەمانچەکەت بەکار مەهێنە.

رەنگ لە رووخساری فڕی.

- **هێر ئشتورم بان فورر**....
- شی کردنەوەم ناوێ **زێتسلێر**. من زۆر بـە سـاددەیی، کردەوەتم دوور لـە کەسـایەتی ئەفـسەری زانیـوە و ئـەمرتان پێدەکـەم کـە کۆتـایی بـەم کردەوەت بێتە. ئەمە و بەس.

**زێتسلێر** دەستی لاوازی بە کەللە سەری داهێنا و بە دەنگێکی نـزم وتـی:

- ئەم کارە بۆیە دەکەم کە قیژە و هاواری کەسـانی دیکـەم گـوێ لـێ نـەبێ!

(سەری داخست و بە شەرمەوە وتی):- ئیتر ناتوانم.

**زێتسلێر** لە قسەکانی بەردەوام بوو:

- بـەڵام زۆرتـری سـەبارەت بـەو بۆنـە بۆگـەنیوەی گۆشـتی سـووتاوە. بـەردەوام ئـەم بۆنـە پێمەوەنووسـاوە. تەنانـەت شـەوانەش. کـە لـە خـەو هەڵدەستم وا هەست دەکەم باڵنجەکەم بۆگەنی لێدێ. هەرچەند ئەمە تـەنیا

وەهم و خیاڵە.... و بەڵام ئەم قیژە و هەرایانە. هەر كە ئەم دانە بلووریانە دەڕێژن.. ئەو مستانەی بە دیوار دەكەون! .... ناتوانم خۆم رابگرم.... دەبێ كارێكی بكەم....

زۆر بە وردی سەیری زێتسلێرم دەكرد. لە قسەكانی نەدەگەیشتم. بەبڕوای من هەڵسوكەوتی تەنیا دژایەتی كردن لە گەڵ ئەمر و فەرمانە و بەرژەوەندی ئەڵمانیایە.

سەبر و حەوسەلەم كۆتایی پێهات و وتم: – گوێ بگرە، زێتسلێر. ئێوە تەنیا شارفورر بوونە..... بەڵام ئێستا ئەفسەرن. ئاخر بۆچی تێناگەی؟ ئەمە قبوول ناكرێ.... لە پشت سەری تۆ هەزار قسە و پروپاگەندە دەكرێ.... (رووم وەرگێڕا و بە زەحمەت بەردەوام بووم):– دیسان ئەگەر كچەكە جلكی لەبەر بوایە.....

بی سەبرانە وتی: – ئاخر بۆ تێناگەن هێر ئشتورم بان فورر.... من توانای ئەوەم نییە كە هەر ئەمجۆرە بوەستم و قیژە و هەرا جەرگبڕەكانیان گوێ بگرم.....

بە دەنگێكی تووڕە وتم:

– لێرە هیچ باسێكی "تێگەیشتن" لەئارادا نییە. ئێوە نابێ كردەوەیەكی ئەوجۆرەتان هەبێت.

زێتسلێر رێك وەستا و بە دەنگێكی توند و قوورس وتی:

– ئەمە ئەمر و فەرمانە، هێر ئشتورم بان فورر؟

– هەڵبەتە.

بێدەنگییەك رووی دا. زێتسلێر بێ جووڵە رێك وەستابوو. بە دەنگێكی هێور و ساختە وتی:

- هێر ئشتورم بان فورر! تکاتان لێدەکەم داواکاری گواستنەوەم بۆ بەرەیەکی شەڕ بە جەنابی رایشس فورر بگەیەنن!

تووشـی سەرسـوڕمان هـاتم. بـە خێرایـی رووم وەرگێـڕا و دانیـشتم. پێنووسـەکەم دەسـت دایـە و چـەند سـەلیبێکم لەسـەر دەسـتەی دەستنووسەکە کێشایەوە. دوای ماوەیەکی کوورت سەرم بەرز کردەوە و چاوم لە زێتسلێر بڕی:

- هـیچ پەیوەندییـەك لـەو فەرمانـەی کـە پـێم کـردووی و داواکـاری بـۆ بەرەی شەڕ لەئارادا هەیە.

چاوێکی لێکردم و دوایی سەیری چرای سەر مێزەکەی کرد و وتی: - یا.

پێنووسەکەم دانا.

- وادیـارە لـەو فەرمانـەی کـە مـن پێمـداوی، پێـداگرم...(زێـك سەیری چاوەکانیم کرد) و بەڵام سەبارەت بە ناردنت بۆ بەرەی شەڕ: ئەوە دەزانن کە داواکاریتـان دەبـێ لـە رێگـەی منـەوە بێـت... ئـێ، مـن داواکـاری ئێـوە دەنێرم، بەڵام لێت ناشارمەوە: ناڕەزایەتی خۆشمی لەگەڵ دەنێرم.

زێتسلێر جووڵەیەکی بەخۆی دا و من دەستم بەرز کردەوە:

- زێتسلێر! ئێوە لە سەرەتای ئەم پرۆژەیە، هـەنگاو بە هـەنگاو لەگەڵ مـن بوویـە. لـەمن کـە بگـوزەرێین، تـەنیا ئێـوەن کـە بـۆ پێشوەچوونی ئـەم پرۆژەیە کاتییە سەلاحیەت و توانای پێویستت هەیە. ئەگەر ئێوە بڕۆن، دەبێ بۆخۆم ئەفسەرێکی دیکە هەڵبژێرم و هەموو شتێکی سەرلەنوێ فێر بکەم... من کاتی ئەوەم نییە. ناچارم هەتا مانگی ژۆئیە هـەموو کات و ساتی خۆم بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژەیە تەرخان بکەم (لە جێگەی خۆم

هەستام) هەر لە ئێستاوە تا ئەو کاتە بوونی تۆ بۆ من لە نانی شەویش پێویستترە.

بێدەنگی بوو و منیش بەدوای قسەکانمدا وتم:

- لەم رۆژدا، ئەگەر شەڕ هەر بەردەوام بوو، ئێوە دەتوانن داواکاری خۆتان بدەن بۆئەوەی بۆ بەرەی شەڕ بچن و منیش پشتیوانی لێدەکەم.

بێدەنگ بووم. زێتسلێر بە رووخسارێکی وشك و تێکسماو، بێ جوولە وەستابوو و دوای کاتێکی کەم وتم: – ئەمە و بەس.

شەق و رەق سلاویکی دا و بۆ دوایە گەڕایەوە و رویشتە دەرەوە.

دوای چەند خوولەکێك هاگێمان هاتەژووریٚ، سوور و سپی و لە هەناسە کەوتوو و کاغەزەکانی بۆ واژووکردن دایە دەست من. لەناو کاغەزەکاندا هیچ شتێکی خێرا و پێویستی تێدا نەبوو. پێنووسەکەم هەڵگرت و وتم:– دژایەتی قسەکانی نەکردم.

هاگێمان سەیری کردم و غونچەی رووخساری پشکووت:

- سرووشتییە... پیاوێکی ڕووڕاستە.... زۆر سادق و ڕاستگۆیە....

- بەڵام ئەم مەسەلەیەی زۆر بە خراپی بەدڵ گرت.

بە سەرسووڕمانەوە وتی: – ئاخ، ڕاستی؟.... ئاخر هیچ نەبیٚ ئەو هونەرمەندە. نیشت وار؟ رەنگە هۆیەکەشی ئەمە بێت کە....(چاوەکانی لە من بڕی و هەناسەی تازە کردەوە): – ئەگەر بتوانم بۆ ورەی دابەزیوی ئەگەرێك بدۆزینەوە، هێر ئشتورم بان فورر بێشك دەبیٚ بە "هونەرمەند بوونەکەیەوە" وەنووسێین. ئاکریٚ بیریشی لیٚ بکەینەوە: یەك ئەف.....سەر!.... هێر ئشتورم بان فورر! چ هەوا و هەوسێکی باوەڕنەکراو!..... هونەرمەندە ئیترٚ هۆیەکەی ئەمەیە....(دەستە قەڵەوەکانی بەشێوەی سەرکەوتووانە بڵند کرد و لە قسەکانی بەردەوام

بوو): باش ئاگادار بن هێر ئشتورم بان فورر، کە بە قەولی خۆتان "ئەم مەسەلەیەی زۆر بە خراپی بەدڵ گرت"... دەی ئیتر: "ئرایست ئەبن مونست لر" (بەراستی هونەرمەندە).

سەری پێنووسەکەم بەست.

**هاگێمان**! بۆئەوەی کەس لە مەسەلەکە نەزانێ چاوی ئومێدم بە تۆیە.

- خاترجەم بە.

هەستام و کڵاوەکەم لەسەر نا و بۆ سەردانی کارگەی بیناکە رۆیشتم.

"**ئونتر شتورم فورر پیك**" بەرەوپیرم هات. پیاوێکی کورتەباڵا و ئارام و سارد بوو.

وەڵامی سڵاوەکەیم دایەوە و پرسیم:- لەناو زیندانییەکان هەولی لیپرسینەوەتان داوە؟

- یاوول، هێر ئۆبێرشتورم بان فورر. رێك ئەم جۆرەیە کە ئێوە بیر دەکەنەوە. بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانیوە حیکمەتی ئەم بینایە بزانن.

- ئێس. ئێس.ەکان چۆن؟

- ئەوان وا بیر دەکەنەوە کە پەناگای خۆپاریزی لە فڕۆکەکانە. ناوی هەردوو بینایان ناوە "بونکر" (ئەمباری گەورەی چیمەنتۆ) یان "بونکری دووانە".

- زۆر فکرێکی باشە. ئێمەش لەمەوبەدوا ئەم ناوانەیان لێ دەنێین.

رێك دوایی وتی:

- بەڵام کێشەیەکی بچووك هێرئۆبێرشتورم یان فورر: لە خەریتەکەدا چوار ئامێری گەورە بۆ بردنەسەر کە جەماوەرەکە لە تەلاری "حەماوەکان" دەبەن بۆ تەلاری سەرووتر کە تەلاری داهاتووی کوورەکانە. هەڵبەت ئەم تەلارە رێگەی بۆ شوێنی دیکە نییە. ئەندازیارێك ئەمەی زۆر بەلاوە

سەیرە. هەڵبەت ئەو نازانێ کە لەم تەلارە دەبێ کوورە دابنێین و لەراستیدا لەم جێگەیەیە کە خەڵکەکە دێنەدەر!

دوای ماوەیەکی کوورت وتم: - چ وەڵامێکتان داوەتەوە؟

- پێیم وت کە منیش لێی تێناگەم، تەنیا گوێڕایەڵم و بەس.

سەرم خوار کردەوە و چاوێکی مانادارم لە پیک کرد و وتم:

- لەبیرتان بێت کە ئەم ئەندازیارە ئەگەر پرسیارێکی ئەمجۆرەی لێکردی، پێمی نیشان بدە.

پیک مانای سەیرکردنی منی درك كرو چووە ناو بینایەك. كاریان لەسەر ئەم شوێنە دەكرد كە ژووری غازی ژێر عەردی لەگەڵ هەوای ئازاد دەبەستەوە. ئەم هەواكەشانە دەبوایە لە حەوشە لەنێوان بینایەك سەر دەربێنن و كڵاوەی بێ كوونیشیان لەسەر دابنرێت.

مەسەلەكە ئاوا لە هزر و هۆشی مندا خۆی لێك دەدایەوە:

كاتێك زیندانییەكان بۆ ژووری غاز ڕۆیشتن و دەرگاكانیان بەڕوودا داخرا، پیاوانی ئێس. ئێس. بە قووتییەكانی گیفت گاس بۆ حەوشەی چۆڵ دەچن و ماسكی دژە غاز لە سەریان دەكەن و دەرگای قوتییەكان دەكەنەوە و كڵاوەی هەواكەشەكان هەڵدەگرن و دانەی بلووری ناو قوتییەكان لە هەواكەشەكان دەكەن و كڵاوەكە لە شوێنی خۆی دادەنێنەوە. ئیتر هیچ كارێكیان نامێنێ جگە لەوە ماسكەكانیان هەڵگرن و ئەگەر جگەرەكێشن، دەست بە جگەرەكێشان بكەن.

پیك وتی:

- كێشەكە لەوە دایە كە دانەكانی بلورین هەر ئەمجۆرە دەكەونە سەر عەرد. وابزانم لەبیرتانە هێر ئشتورم بان فورر، كە زێتسلێر لەسەر كارگەی كاتیش لەم مەسەلەیە وەناڵە كەوتبوو.

- لەبیرمە.
- ئەنجامەکەی ئەوەیە کە جەماوەرەکەی کە غازەکەیان پێگەیشت دەکەونە سەر عەرد، دانەکانی بلوورین لەژێر جەستەیان دەمێنێتەوەو و دروست نابێتە غاز.
- راستە.

بێدەنگییەك رووی دا. پیك سەرو گوێلاکی رێکخست و وتی:

- هێرشتورم بان فورر ئیزنم دەدەی شتێك بڵێم؟
- هەڵبەت.
- دەتوانین لوولەی هەواکشەکان بێنینە خوارەوە و بەم شێوەیە دانە بلوورییەکان دەکەونە ناوەڕاستی ستوونەکان و غازەکەیان بەم شێوەیە بڵاو دەبێتەوە و ئیتر ناکەوێتە ژێر مەیتەکان. من لەم پێشنیارەدا دوو خاڵی گرنگ دەبینم: یەکەم خێرایی لە غاز لە خواردان، دووەهەمیش کەم سەرف کردنی گیفت گاس.

بیرێکم کردەوە و وتم: - بەبڕوای من فکرێکی زۆر باشە. بە زێتسلێر بڵێ ئەم پێشنیارە لە یەکێك لە دوو تەلارەکان تاقی بکاتەوە. دەست لە تەلارەکەی دیکە مەدەن هەتا بتوانین جیاوازی کارکردیان دیار بکەین.

- یاوول هێر شتورم بان فورر.
- بێشك ئەگەر جیاوازییەکە بەرچاو بێت، ئەوا پێشنیارەکەتان لە بونکرەکانیشدا جێگیر دەکەین.

سەیرێکی "پیك"م کرد، نەختێك لە من کوورتەبالاتر بوو. تەنیا ئەوکاتە شتێکی دەوت کە پرسیارت لێیکردبا. ئارام و رێك و پۆزەتیڤ بوو. رەنگە تا ئەو کاتە بایەخی ئەم پیاوەم بە تەواوی نەزانیبێت.

دوای ماوەیەکی کوورت وتم: - بۆ نوئل چ فکرێکت کردووەتەوە، پیك؟

- بەرنامەیەکی تایبەتیمان نییە **هێرشتورم** بان فورر.
- مـن و خێـزانم شەونـشینییەك پێکـدێنین. ئەگـەر تـۆ و فـراو پیـك گەورەمان بکەن، زۆر خۆشحاڵ دەبین.

ئەوە یکەمجار بوو کە بانگهێشتم دەکردن، رووخساری گۆڕا و وتی: — هەڵبەت، **هێرشتورم** بان فورر. ئێمەش زۆر دەبینە هۆی......

بینیم نازانیّ! چۆن رستەکەی تەواو بکات و بەدوای قسەکانمدا وتم:

- کەواتە چاوەڕوانتانین ئیتر.

رۆژێکی بۆ جەژن مابوو، لە یەکەمین سەعاتی دوانیوەڕۆ، **زێتسلێر** داوای دیـتنی کـردم. دوای دوایـین گفتوگۆمـان پەیوەندییەکـەمان ئاسـایی دەهاتەبەرچاو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا کەمتر بینیبووم، ئـەویش تـەنیا بـۆ ئیش و کاری ئیداری.

رێزی دانا. رەتـی رێزەکەیم دایەوە و تکام کرد دانیشێت. بە جووڵەی سەری رەتی کردەوە.

- ئەگـەر رێگـەم بـدەن **هێر شـتورم** بـان فـورر، تـەنیا چەند ووشە قسەم هەیە.
- هەرجۆر حەز دەکەی، **زێتسلێر**.

سەیریم کرد. زۆر گۆرابـوو. چەماوەیی پـشتی زیـاتر ببـوو و رووخساری داچۆڕابوو. لە حاڵەتی چاوەکانی تووشی سەرسووڕمان بووم.

بە میهێرەبانییەوە وتم: — ئیّ، **زێتسلێر**؟

بیـنیم سینگی هاتـەپێش، وەکوو ئەوە دەچوو هـەوای پێناگات و دەمـی کردەوە، بەڵام هیچی نەوت. رەنگی وەکوو گەچ سپی هەڵگەڕابوو.

وتم: — ناکریّ دانیشن، **زێتسلێر**؟

بەسەر وتی نا و بەدەنگێکی زۆر نزم وتی: – سوپاس هێرشتورم بان فورر.

چەند چرکەیەك تێپەڕی. وەکوو بەرد بێ جووڵە بوو، بەرز و چاوە ماندووەکانی لەمن بڕیبوو و زۆر بەسەیریم هاتەبەرچاو.

وتم: – ئێ؟

سینگی هاتەسەر، شێوەلاکەی کراوە و بە دەنگێکی زۆر نزم وتی:

– هێر ئشتورم بان فورر تکا لە جەنابتان دەکەم کە داواکاری من بۆ گواستنەوەم بۆ بەرەیەکی شەڕ بە جەنابی رایشس فورر ئێس. گیر ئێس. بگەیەنن.

کاغەزێکی لە گیرفانی (باخەڵی – بەرکی) هێنایەدەر و کردیەوە، وەکوو روبۆتێك دوو هەنگاو هاتەپێش، لەسر مێزەکەمی دانا و دوو هەنگاو کشایەوە و بە حاڵەتی رێکی سەربازانە وەستا.

دەستم لە کاغەزەکەی نەدا. چەند چرکەیەك تێپەڕی هەتا وتم: – نامەکەتان رەت دەکەم، بەڵام من خۆم رازی نیم و تێیدا دەنووسم.

چەند جارێك لەسەریەك مژۆڵکی لێکدان، قوڕقوڕۆچکەی چەندجارێك هاتووچۆی کرد و تەنیا ئەمە: پانییەکانی لێکدا، سلاوی دا و وەرسووڕا و بۆلای دەرگا رۆیشت.

– زێتسلێرا!

گەڕایەوە.

– وەعدەمان بۆ ئەمشەو، زێتسلێر.

بە سەرسووڕمانەوە سەیری کردم:

– ئەمشەو؟

– هاوسەرم بانگهێشتی کردوون، نیشت وار؟ ئێوە و فراو زێتسلێر"یش، خۆ لەبیرتانە؟ لەژێر دارە کاجی نوئل.

دووبارەی کردەوە: – لەژێر دارە کاجی نوئل. (پێکەنینێکی کورتی هاتێ.) ئاها هەڵبەتە هێرشتورم بان فورر، لەبیرمە.

– هەر کە گەشتی شەوانە کۆتایی پێهات، چاوەڕوانتانم.

سەری خوار کردەوە، سەرلەنوێ سڵاوێکی دایەوە و چووە دەرەوە.

ڕۆیشتم سەرێکم لە کاری بیناسازی دا. ئەو بایەی کە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە دەهات، دووکەڵی قوڵکەکانی بیرکێناوی دەهێنایەوە ناو ئۆردوگا. "پیک"م بۆ لایەك کێشا و وتم:

– لەبارەی ئەم بۆنە چی دەڵێن؟

پیك ناوچاوانی تێکنا:

– هاواریان لەدەست ئەم بۆنە بەرز بووەتەوە هێرشتورم بان فورر.

– ئەمەم لێ نەپرسین.

پیك وتی: – زۆر باشە. ئێس. ئێس.ەکانمان بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە کە بۆگەنی کارگەی پێستە. ئیتر نازانم کە خۆشیان ئەمەیان باوەڕە یان نا.

– زیندانییەکان چی؟

– هێرشتورم بان فورر غیرەتی ئەوەم نییە زۆر پرسیار لە دیلمانجەکان بکەم، ئەگەری ئەوە هەیە کە هۆشیار بنەوە.

– "گەویس" (هەڵبەت) بەڵام دەتوانی قسەیان لەگەڵ بکەی، چەنەبازیان لەگەڵ بکەی.

– ڕاستە هێرشتورم بان فورر. بەڵام کە دێم لەبارەی بۆگەن قسەیان لەگەڵ بکەم، وەکوو ماسی کەڕ لاڵ دەبن.

- ئەمە دەبێ بە خراپ وەربگیرێت.

- لەسەر ئیزنی جەنابتان، منیش وا بیر دەکەمەوە هێرشتورم بان فورر. لێی جیا بوومەوە. دڵەڕاوکێم هەبوو و ناڕازی بووم. وادیار بوو "چالاکی تایبەت" لانیکەم لەناو ئۆردوگا، ئیتر تا ماوەیەکی زۆر بە نهێنی نامێنێتەوە.

بۆ لای گۆڕەپانی ئۆردوگا چووم کە تێدا حازر غیابی تێدا بەڕێوەدەچوو. ئەمرم کردبوو بەبۆنەی نوئل دار کاجێك بۆ زیندانییەکان بچەقێنن.

هاگێمان، زەلام و بڵند بە قەڵافەتێکی جددی پێشوازی لێکردم. بەرلۆغەی پڕ لە چەوریی، چین بە چین کەوتبووە سەر یەك.

- گەورەترین کاجم بۆ ئێرە هێناوە.... بە بەرینی و درێژایی تایبەت بەم گۆڕپانە.....(هەناسەیەکی نوێ کردەوە): - کاجێکی بچووك زۆر ناشیرین و سەیروسەمەرە دەهاتەبەرچاو نیشت وار؟

سەرێکم بۆی جووڵاند و چوومەپێش. کاجەکە لەسەر ئەرد کەوتبووە خوارێ. دوو زیندانی لەژێر چاودێری کاپۆیەك قووڵکەیەکیان هەڵدەکەند. "راپورت فورر" (لە بەرپرسانی فەرمی ئێس. ئێس.) و دوو شارفورر تماشایان دەکرد: هەر کە چاوی راپورت فورر بە من کەوت هاواری کرد: - "ئاختونگ". دوو شارفوررەکان رێك وەستان و کاپۆ و زیندانییەکان کڵاوەکانیان خێرا هەڵگرت و شەق و رەق وەستان.

- خەریك بن!

راپورت فورر هاواری کرد: "لوس! لوس" (زوو زوو) و دوو زیندانییەکە شێتانە دەستیان بە ئیش کردن کردەوە. کە سەیریم کردن، وام هەست نەدەکرد ئاوا شێتانە ئیش بکەن، ئەویش بۆ بەژن و بالایان دەگەڕایەوە،

ئـاخر زۆر لاواز بـوون. سـەیرێكی دارەكـەم كـرد. درێـژایی و كێـشەكەیم بەراورد كرد و بۆلای هاگێمان گەڕامەوە:

– چاڵەكەی چەندە قووڵ دەكەن؟

– یەك مەتر، هێرئشتورم بان فورر.

– بۆ متمانەی زیاتر یەك مەتر و سی سانتی مەتر قووڵی بكەن. رەنگە ئەمشەو بای بێت.

– یاوول، هێر ئشتورم بان فورر.

یـەك دوو خوولـەكێك كـاركردنی زیندانییـەكانم سـەیر كـرد. دوایـی سووڕامەوە. هاگێمـان فـەرمان و ئـەمری مـنی بـۆ راپـورت فـورر دووبـارە كردەوە و هاتە لای من. بۆئەوەی خۆی بە من بگەیەنێتەوە، وە هانكە هانك كەوت.

– وابزانم ئەمشەو بەفر بباریٚ؟

– یا؟

– لە راستیدا بۆنەكەی گەیشتووەتە ناو جمگەكانم.

دوایی چەند كۆخەیەكی هاتیٚ؟

هەربەمجۆرە چەند هەنگاوێكی دیكە بەڕێدا رۆیشتین و هاگێمان دووبارە وەقسە هاتەوە: – ئیزنم دەدەن... بیرۆكەیەكم بۆ هاتووەتەپێش، بۆتانی باس بكەم هێر ئشتورم بان فورر؟

– یا؟

– رەنگـە زیندانییـەكان حـەز بكـەن ئەمـشەو جیرەی سوپەكەیان دوو بەرامبەر بێت.

بە وشكی وتم: – بۆچی دوو بەرامبەر؟

هاگێمان سوور هەڵگەڕا و بە هەناسەبڕكیٚ كەوت.

وتم: – ئەم جیرە سوویە زیادەی لەکوێوە دێنن؟ دەکرێ بە منیش بڵێن؟

هاگێمان بە خێرایی وتی: – هێرئشتورم بان فورر، مەبەستم ئەوە بوو کە شتێك بە جەنابتان تەڵقین بکەم. قسەکەم بە ناجووری پێ گەیاندی.... یانی هەر نەمدەویست شتێك تەڵقین بکەم.. هەر ئەمجۆرە فکریەك بوو کە لە مێشکمدا تێپەڕی... فکریەك، ئەگەر بکرێ لەرووی دەروونناسییەوە .... دانانی کاج، بێشك کارێکی باش و جوانە... تەنانەت ئەگەر زیندانییەکان قەدریشی نەزانن....

بە بێ وازی وتم: – جۆری بڕوای ئەوان هیچ بەلامەوە گرنگ نییە. کارێك کە شایستە بووە بەڕێوەمان بردووە. تەنیا ئەمە و بەس.

هاگێمان وتی: – هەڵبەتە، هەڵبەتە، هێر ئشتورم بان فورر. ئێمە کارێکمان کردووە کە بەجێ و شایستە بووە.

هەوای ژووری ئیداری لە بۆنی بۆگەن و ماوە پڕ ببوو. بارانییەکەم دەرهێنا و لەگەڵ کڵاوەکەم هەڵمواسین و پەنجەرەم چوارتاق کردەوە. ئاسمان تەپ و مڕاوی بوو. جگەرەیەکم پێکرد و دانیشتم. داواکارییەکەی زێتسلێر هەر لەم شوێنە بوو کە دانابوو. کێشامە پێش، خوێندمەوە، سەری پێنووسەکەم کردەوە و لەژێر داواکارییەکە، لای ڕاست، نووسیم:

لەگەڵ ناڕەزایەتی خۆم سەبارەت بەم داواکارییە

بەفر دەستی پێکرد و چەند پەڵە بەفر لە ژوورەکەمدا وەسەما کەوتن، بە هێوری کەوتنە خوارێ و بەخێرایی بوون بە ئاو. دوای ماوەیەکی کوورت هەستم کرد کە سەرما هەموو جەستەی داگرتووم. داواکارییەکەی زێتسلێرم دووبارە خوێندەوە و لەژێر ڕستەی لەگەڵ ناڕەزایەتی خۆم سەبارەت بەم داواکارییەم ئیمزا کرد و نووسیم:

## پسپۆری پێویستی کارگەی کاتی

دووبارە ئیمزام کردەوە.

هێرشێکی با، دنکە پێکوەنووساوەکانی بەفری هەتا نزیک مێزی من کێشا و سەرم کە بڵند کرد بینیم ئاوێکی کەم لەپێش پەنجەرە کۆ بووەتەوە. داواکارییەکەی زێتسلێرم نایە ناو پاکەت و پاکەتەکەم نایە ناو گیرفانم. دوایی فایلەکانم هێنایە پێش. دەستم لە سەرما رەش هەڵگەڕابوو. جگەرکەم لەناو ژێرجگەرە پان کردەوە و دەست بەکار بووم.

دوای ماوەیەك کە سەرم بەرز کردەوە، بینیم کە بەفر نابارێ. هەستام و بۆلای پەنجەرە رۆیشتم و دەستگیرەم گرت و پەنجەرەم داخست. لە هەمانحاڵدا باوکمم بینی، رەش پۆش و شەق و رەق، بە چاوی درەوشاوە: باران نەدەباری، کەواتە دەیتوانی پەنجەرەکە دابخات!

دەستی راستم تەزووی داویشت. بینیم کە دەستگیرەی پەنجەرە بە هەموو هێزێکەوە پاڵ دەدەم. نەختێك سووڕاندم و تەق داخرا. لەدەوری مێزەکەم سووڕامەوە و کلیلی کوورەی کارەباییم پێکرد و لە ژوورەکەمدا دەستم کرد بە رێکردن. دوای ماوەیەك دانیشتم و لەتە کاغەزێکم هێنایە پێش و تێیدا نووسیم:

زێتسلێری ئازیز

دەکرێ تکات لێبکەم دەمانچەکەت بۆ من بنێری؟

لە زەنگم دا و گوماشتە (خزمەتکار) هات، نووسراوەکەم پێیدا و دوای دوو خولەك بە دەمانچەکە و نووسراوەیەك گەڕایەوە:

بەوپەڕی رێزەوە

ئۆبێرشتورم فورر

## زێتسلێر

نیشانەگرتن بە دەمانچەی زێتسلێر بەشێوەیکی بەرچاو ڕێك و ڕاست بوو و هەر بۆیەش ئەفسەرەكانی كەی ئێلْ زۆربەی كاتەكان بۆ مەشقی تیرهاوێژی دەمانچەی ئەویان بە ئەمانەت وەردەگرت.

ئوتۆمبێلەكەم ویست. وتم بۆ گۆڕەپانی تیرهاوێژی بمبەن. كەم تا زۆر چارەكە كاتژمێرێك تەقەم لە نیشانەكانی دوور و نزیك وەستاو و بەجووڵە كرد. دەمانچكەم نایەوە ناو بەرگەكەی و نیشانەكانی پێشوو و نیشانەكانی ئێستایان بۆ هێنام: هەڵمسەنگاندن: دیسان نیشانەگرتنم خراپتر ببوو.

چوومە دەرێ و لەناو دەرگای گۆڕەپانی تیرهاوێژی وەستام.

بەفر سەرلەنوێ دەستی بە بارین كردبۆوە. لەنێوان گەڕانەوە و نەگەڕانەوە بۆ ئیدارە گیرم كردبوو. سەیری كاتژمێرەكەمم كرد: حەوت و نیو بوو. سواری ئوتۆمبێلْ بووم و بە "دیتس"م وت بۆ ماڵێ بمباتەوە.

ماڵێ بە تەواوی بە چرایەكی زۆر ڕووناك كرابوو.

چوومە ناو ژووری كارم، ناوقەدبەندەكەم كردەوە و دامنایە سەر مێز و كڵاو و بارانییەكەم هەڵواسی. دوایی دەستەكانم شوشت و بۆ ژووری خواردن ڕۆیشتم.

ئێلزی و فراو موللر و منداڵەكان لە دەوری مێز بوون. بەڵام تەنیا منداڵەكان نانیان دەخوارد. فراو موللر مامۆستایەك بوو كە لە ئەڵمانیا بۆ وانەوتنەوەی منداڵەكان هاتبوو. ژنێكی تەواو و بەڕێز و خۆش هەڵسووكەوت بوو.

لەنێوان دەرگا وەستام و وتم: – بەفرم بۆ هێناون[٣٧]

**فرانتس**ی بچکۆڵە دەستەکانی گرتم و بە دەنگی روون و هۆشمەندانە پرسی: – ئەی کوا؟

"**کارل**" و دوو کچەکان دایان لە قاقای پێکەنین.

**ئێلزی** وتی: – بابە لە پشت دەرگا دایناوە. زۆر ساردتر لەوەیە کە بیهێنێتە ژوورێ.

"**کارل**" سەرلەنوێ پێکەنی؟

لەتەنیشت **فرانتس** دانیشتم و خەریکی سەیر کردنی نان خواردنی بووم.

"**فراو موللر**" وتی: – پییە! نوئلی بێ بەفر.....

قسەکەی خواردەوە و بە نارەحەتی سەیری دەوروبەری خۆی کرد. واپێدەچوو کە پێی لە گلیمی خۆی زیاتر درێژ کردووە.

**هێرتا** وتی: – مەگەر نوئلیش بێ بەفر دەبێ؟

"**کارل**" وتی: – زیخر (بێشک) لە ئەفریقا هەر بەفر ناباری.

**فراو موللر** کۆخەیەکی کرد و: هەڵبەت نە لە کێوەکان.

"**کارل**" بە متمانەوە وتی: – هەڵبەت، دەی باشە.

**کاترینا**ش بۆ ئەوەی بێ قسە نەبێ وتی: – بەفرم خۆش ناوێ.

**فرانتس** کەوچکەکەی بڵند کرد، سەری بۆلای من سووڕاند و بە سەرسوورمانەوە وتی: – **کاترینا** بەفری خۆش ناوێ.

**فرانتس** هەر کە خواردنەکەی تەواو کرد دەستی منی گرت بردمیە لای دارە کاجە جوانەکەی ناو هۆڵ کە نیشانم بدات. **ئێلزی** چراکانی

---

[37] - لەم روویەوە کە مەسیحییەکان بارینی بەفر لە شەوی جەژنی نوئل بە پیرۆز دەزانن، لانگ بەم رستەوە مزگێنی بە خێزانەکەی دەدات کە بارینی بەفر دەستی پێکردووە.

کووژانـدەوە، وایـەرێکی لـە کارەبـا دا و ئەسـتێرکانی نـاو دارە کاجەکـە درەوشانەوە. منداڵەکان لە سەیر کردنی تێر نەدەبوون.

دوایـی **فـرانتس** وەبیر بـەفر کەوتـەوە و ویـستی بیبینێت. مـن سـەیرێکی **ئێلزی**م کرد و ئەویش دڵسۆزانە وتی: – یەکەم بەفرێتی، **رۆدۆلف**...

چـرای سـەر حەوشـەم هـەڵکرد و پـەردەی پەنجـەرەم کێشا، نزیـك گلۆپ، بەفر سپی و دەدرەوشایەوە.

دوایی، **فرانتس** حەزی لە سەیر کردنی ئەو شتانە بوو کە بۆ میوانـداری ئەم شـەوە ئامادەکرابوو و هـەموویانم بۆ چەند خوولـەکێك بـۆ چێشتخانە بـرد. سەرتاسـەری مێـزە گەورەکـە پـڕ بـوو لـە بابۆڵـەی جۆراوجـۆر، نـانی شیرینی و مۆتە.

شیرینیم دا بە منداڵەکان وچوونە سەرەوە بۆ ئەوەی بخەون. بەڵێنیـشیان پێـدرابوو کـە نیوەشـەو بەخەبـەریان دێـنین کـە مۆتـە بخـۆن و یـان لەگـەڵ گەورەترەکان سروودی **"ئۆ تانباوم"** (ئەی دارە کاج)ی بخوێنن.

منیش چوومە سەرەوە و ئۆنیفۆرمەکەم گۆڕی. دوایـی هاتمـە خـوارەوە و چـوومە ژووری کـار و دەرگـام بـەڕووی خۆمـدا داخـست و خـۆم خـەریکی خوێندنەوەی کتێب کرد کە تایبەت بوو کە پەروەردەکردنی ئەسب و مەزرا و مڵکداری و کێڵگـە کـە **هاگێمـان** بـۆی هێنـابووم. دوای ماوەیـەك کەوتمـە فکـری مـەزرا و کێڵگـە و هەسـتم کـرد غـەمێکی قـووڵ سـەرتاپێی داگـرتم. کتێبەکەم دانا و لە ژوورەکەمدا دەستم بە ڕێپێوان کرد.

نـەختێك دواتـر **ئێلـزی** هاتـە دوام. ڕۆیـشتینە نـاو ژووری خـواردن و لـە گۆشەی مێز دانیشتین و نەختێکمان خواردن خوارد. **ئێلزی** جلـی شـەوی لەبـەر بـوو و شـانەکانی رووت بـوون. کـە تـەواو بـووین، ڕۆیـشتینە نـاو هۆڵەکە، **ئێلزی** لەم گۆشە و ئەم گۆشە مۆمی پێکرد، چلچرای کووژاندەوە

و دانیشتە پشت پیانۆ. گوێم لەو ئاهەنگە گرت کە بە پیانۆ لێیدەدا. ژەنینی پیانۆی لە داخائۆ دەست پێکردبوو، ئەوکاتە کە من ببووم بە ئەفسەر.

دە خوولەکی بۆ کاتژمێر دە مابوو کە ئوتۆمبێلم لەدوای هاگێمان نارد و رێك سەری کاتژمێر دە هاگێمان و "پیك"ەکان سەر و گوێلاکیان بەدیار کەوت. دوایی ئوتۆمبێلم لە دووای بنەماڵەکانی بێتمان، شمیت، و خاتوو زێتسلێر نارد. کاتێك هەموویان هاتن، خزمەتکارەکەم نارد بە دیتس بڵێت کە بچێتە چێشتخانە بۆئەوەی خۆی گەرم بکاتەوە.

ئێلزی خاتوونەکانی بۆ ژووری خۆی نارد و پیاوەکان بارانییەکانیان لە ژووری کاری من داکەند. دوایی بردمنە ناو هۆڵەکە کە لە چاوەڕوانی خاتوونەکاندا پێکێك لێدەین. لەبارەی رووداوەکانی رووسیا قسەمان کرد و هاگێمان وتی:

– باش نییە؟ .... لە رووسیا زستان دەستی پێکردووە... لەکاتێکدا لێرە هیچ باس نییە..

ئەمەی کە وت نەختێك قسە و باس بۆلای زستانی رووسیا و بەرەی شەڕ کێشرا و لەمبارەوە هاودەنگ بووین کە هەتا بەهاری داهاتوو ئۆردوکەشی رووسیا کۆتایی پێدێت.

هاگێمان وتی: – ئەگەر رێگەم بدەن، بیروبۆچوونی من ئەمەیە... بەهارێك بۆ پۆلۆنیا... بەهارێك بۆ فەرەنسا... و بۆ رووسیاش چونکە گەورەترە دوو بەهار.....

ئەوکات هەموومان بە یەکەوە خەریکی چەنەلێدان بووین.

شمیت بە دەنگی توند و تیژی خۆی وەتی: بێشك، رووبەر! دوژمنی راستەقینەی ئێمە، رووبەرە.

**پیك** وتی: رووسیا زۆر مەترسیدارە.

**بێتمان** چاویلکەکەی سواری لووتی کرد و وتی:

– هەربۆیەش لە ئەنجامی ئۆردوکەشی هیچ دوودڵییەك نییە. لە رووی نیژادی یەك ئەڵمانی بایەخی دە رووسی هەیە. ئیتر باسی کولتوورەکەی هەر ناکەین.

**هاگێمان** بە هانکە هانکەوە وتی: – بێشك، بەم پێیەوە..... ئەگەر بتوانم رێگە بەخۆم بدەم کە باسی شتێك بکەم.....

پێکەنی و دەستە خرپنەکەی بەرز کردەوە و چاوەڕێ مایەوە هەتا خزمەتکار لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە....

– پێیان وتووم کە، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵات..... سەربازەکانی ئێمە لە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ ژنە رووسییەکان.... کۆڵێك کێشەیان بۆ هاتووەتەپێش..... ئەم ژنانە هەر هیچ تێناگەن..... ئاگاتان لێیە؟ .... یان لانیکەم، پێویست بە هاوڕێیەتییەکی دوورودرێژ.... بەڵام (دەستی جووڵاند و دەنگی هێنایە خوار):.... بۆ سواربوون و راکردن.... خۆ لێم تێدەگەن.... هیچجۆرە سواری نادەن.

**بێتمان** قاقایەکی لێدا و وتی: نائاساییە ئەمە، تازە ئەوان دەبێ هەست بە شانازی و فەخر و سەربڵندیش بکەن.

خاتوونەکان هاتن و ئێمەش وەکوو رێز لەبەریان هەستاین و هەر کەسە لە شوێنی خۆی دانیشت و **هاگێمان**یش لە تەنیشت **فراو زێتسلێر** دانیشت.

– ئەگەر ئیزنم بدەن.... من ئەمشەو تەنیا بوونی تۆ بە هەل دەزانم و بەهەرحاڵ نەختێك بەدواتاندا موس موس دەکەم...

**فراو زێتسلێر** وتی: گوناهی **کوماندانتە** کە من ئەمشەو بە تەنیام و بە پەنجە هەڕەشەیەکی لێکردم.

وتم: – بەڵام، من، لەمناوەدا هیچ تاوانێکم نییە **"گنەدیگەفراو"** (خاتوونی ئازیز) زۆر سادەدەیە، ئەمشەو نۆرە نیگابانی ئەو بوو.

**هاگێمان** وتی: – بێشك پێش نیوەشەویش لێرە دەبێت.

**ئێلزێ** و **فراو میللر** بابۆڵە و ساردییە فێنکەکانیان دەگێڕا و کاتێك کە قسە کۆتاییان پێهات **فراو هاگێمان**" لەپشت پیانۆ دانیشت. پیاوەکانیش چوون و سازەکانی خۆیان هێنا و دەستیان بە ژەنینی مۆسیقا کرد.

دوایی نزیك بە کاتژمێرێك پشوویەکیان دا. شیرینی دابەش کرا و لەبارەی مۆسیقا قسەمان کرد و **هاگێمان** چەند نوکتەیەکی لە مۆسیقاژەنانی ناودار گێڕایەوە.

کاتژمێر یازدە و نیوی **"فراو موللر"**م نارد منداڵەکانی بەخەبەر هێنا و دوایی لە پشت شووشەکانی دەرگایەکی گەورە کە هۆڵەکەی لە ژووری خواردن جیا دەکردەوە ئەوانمان بینی کە دانیشتوون و بەشێوەی فەرمی و خەواڵوو دانیشتوون. ئەوەندە چاومان لێکردن کە **فراو زێتسلێر** کە منداڵی نەبوو یە هەیەجانەوە وتی:

- ئاخەی، چەندە جوان و شیرینن!

دە خوولەکی بۆ نیوەشەو مابوو و چووم و منداڵەکانم هێنایە ناو هۆڵەکە و سڵاو و چاك و چۆنیان لەگەڵ میوانەکان کرد. دوایی خزمەتکار و خاتوو موللر سینییەکی گەورەیان هێنا و بە چەند پەرداخی شەڕابخۆری و دوو بوتڵ شامپاینەوە. وتم: "بوونی شامپاینەکە لە **هاگێمان**ەوە دەزانم" و هوتاف و هەراهوریای میوانەکان بەرز بۆوە و **هاگێمان** دەروتادەور بەدەم میوانەکان پێکەنی.

کاتێك هەموویان جامی پڕ لە شەڕابیان بەرز کردەوە، هەستاینە سەرپێ. ئێلزی چلچرایەکەی کووژاندەوە و داری کاجی نوئلی پێکرد و هەموومان چاوەڕوانی نیوەشەو بووین و بەشێوەی نیوگۆ لەدەوری دارەکە دەورەمان دا. بێدەنگییەك پەیدا بوو. هەموو چاوەکان لە ئەستێرە بچووکەکانی دار بڕابوو و من هەستم دەکرد کە دەستێکی بچووك دەستی من دەگرێت. فرانتس بوو. خوار بوومەوە و پێم وت ئێستا دەنگە دەنگێکی زۆر دێت، چونکە هەموویان بەیەکەوە دەست دەکەن بە خوێندنەوەی سروود.

یەکێ بە هێواشی لە قۆڵی منی دا. گەڕامەوە بینیم "فراو موللر"ە.

زۆر بە لەسەرەخۆیی وتی: – بە تەلەفۆن دەیانهەوێی هێرکوماندانت.

بە فرانتسم وت بچێتە لای دایکی و خۆم لە جەماعەتەکە دوور کردەوە.

"فراو "موللر" دەرگای هۆڵی بۆ کردمەوە و خۆی چووە ناو چێشتخانە. دەرگای ژوورەکەمم داخست، جامی شامپاینم دانایە سەر مێز و هاندی تەلەفۆنەکەم دەست دایە.

دەنگێك وتی: – هێر ئشتورم بان فورر! من ئونترشتورم فورر"لۆنك"م.

واپێدەچوو دەنگەکە لەناو چاڵێك دێتەدەر.

– ئێ؟

– هێر ئشتورم بان فورر، ئەگەر کارێکی گرنگ نەهاتبایە پێشەوە، ئەوا ڕێگەم بە خۆم نەدەدا لەمکاتەدا موزاحیمتان بم.

بە بێ وازی دووبارەم کردەوە: – زۆر باشە؟

نەختێك بێدەنگ بوو و بەردەوام بوو.

– ئۆبێرشتورم فورر زێتسلێر مردووە.

– چی؟

– ئۆبێرشتورم فورر زێتسلێر مردووە.

- مردووە؟ راست ئەمەتان وت؟
- یا هێر ئشتورم فورر.
- "لاگێرئارتز" (پزشكی ئۆردوگا)تان خەبەر كردووە؟
- هەڵبەت، هێر ئشتورم بان فورر... زۆر سەیرە... هیچ نازانم كە دەبێ....
- ئەوە بۆخۆم هاتم لۆنك، لە بەردەم بورجی ژوورەوە چاوەڕوانم بە.

تەلەفۆنەكەم دانا، رۆیشتم و دەرگای چێشتخانەم كردەوە. دیتس هەستایەسەرپێ. خزمەتگوزار و فراو موللر زۆر بە سەیری چاویان لێكردم.

- بەرێبكەوین دیتس.

دیتس خەریكی لەبەركردنی بارانییەكەی بوو.

وتم: – فراو موللر و ئیشارەم كرد بەدوام كەوێ. بردمە ژووری كار و وتم:

- فراو موللر من ناچارم برۆمە ئۆردوگا. دوای رۆیشتنم هاوسەرم ئاگادار بكەوە.
- یا، هێر كوماندانت.

دەنگی پێی دیتسم لە ناو هۆڵەكە بیست. ناوقەدبەندم بەست، بارانییەكەم لەبەر كرد و كڵاوەكەم دەست دایە. فراو موللر چاوی لێكردم.

- رووداوێكی ناخۆش رووی داوە، هێر كوماندانت؟
- یا.

دەرگام كردەوە و بۆلای گەڕامەوە: – زۆر بە كورتی لای هاوسەرم باس بكە.

- یا، هێر كوماندانت.

گوێم تیژ کرد: تەلار (هۆڵ) لە بێدەنگی تەواو دابوو.

– ئەی بۆچی سروود ناخوێنن؟

– وابزانم چاوەڕوانی هێر کوماندانت.

– بە خاتوو ئێلزی بڵێن چاوەڕوانی من نەبن.

بەخێرایی تێپەڕیم و لە قادرمەکان چوومە خوارێ و خۆم خزاندە ناو ئوتۆمبێل. ئیتر بەفر نەدەباری، سەهۆڵبەندان بوو.

– بیرکێناو!

– دیتس جووڵەی بە ئوتۆمبێلکە دا. نەختێك بەر لەوەی بە بورجەکە بگەین، چرای ناو ئوتۆمبێلم پێکرد. نیگابان کە بە حاڵەتی تووڕەیی سەری بۆلای پاسەوانخانە سووڕاندبوو، دەروازەی تێلدڕووی کردەوە. قاقای پێکەنین و وتنی گۆرانییەکان بە گوێ دەگەیشتن.

قەڵافەتی وەرزشکارانەی لۆنك لە ڕەشایی هاتەدەر. سوارم کرد.

– لەناو کوماندانتور دایە هێر ئشتورم بان فورر. بۆخۆم ئەوم....

دەستم نایە سەر قۆڵی، قسەکەی خواردەوە.

وتم: – کوماندانتور، دیتس!

لۆنك وتی: – سەبارەت بە پاسەوانخانە داوای لێبوردن دەکەم. بیرم لەوە نەدەکردەوە ڕووداوێك.... هەڵبەت، خەتاکاریش هەن....

– یا، یا.

لەپێش کوماندانتور هاتمە خوارێ و بە دیتسم وت بچێت لەلای بورجەکە چاوەڕێ بێت. بەڕێ کەوت و منیش لەگەڵ گەڕامەوە.

– لە کوێیە؟

– بردمە ژووری ئیداری خۆی.

لە قادرمەکان سەرکەوتم و بە خێرایی چوومە ناو مەمەڕەکە. دەرگای ژووری زێتسلێر داخرابوو.

لۆنك وتی: – ئیزن بفەرموون هێر ئشتورم بان فور، بەباشم زانی دەرگا دابخرێت.

دەرگای کردەوە و من چرای ژوورەکەم هەڵکرد. زێتسلێر لەسەر عەردەکە کەوتبوو. بە چاوی نیوە بەستراوەوە. رووخساری ئارام بوو و بەوە دەچوو کە خەوتووە. پێویست بەوە نەبوو دووبارە بگەڕێمەوە و سەیری بکەم بۆ ئەوەی بزانم چۆن مردووە. دەرگام بەست و پەردەی پێش پەنجەرەم کێشا و وتم: – ئێستا گوێم لێتە.

لۆنك سەر و گوێلاکی ڕێك کرد.

– یەك خوولەك، لۆنك.

ڕۆیشتمە پشت مێزی زێتسلێر دانیشتم و لاپەڕەیەکم دەست دایە و دامنایە ناو مەکینەی چاپ. لۆنك وتی: – کاتژمێر یازدە بوو، لەکاتی چوونەدەر لە کوماندانتور دەنگی مەکینەی ئوتۆمبێلێکم گوێ لێبوو کە لە گەراجی ژمارە دوو بەهێوری پێکراوە....

– هێواشتر، تکایە.

ماوەیەکی کەم بێدەنگ بوو و بەردەوام بوو: – دەرگای گەراج پێوەدرابوو.... سەرەتا ئەوەندە بەلامەوە گرنگ نەبوو.... ڕۆیشتمە فرۆشگا و نەختێك شەڕاب....

ئیشارەم پێکرد لەسەرەخۆ. "نەختێك شەڕاب"م پاك کردە و لەجیاتی نووسیم "بوتڵێك ساردی".

– بەردەوام بە.

– ... بەڵێ پێکێك شەڕاب بخۆمەوە و گوێ لە یەك دوو پارچە مۆسیقا بگرم. کاتێك بۆ کوماندانتور گەڕامەوە، بینیم ئوتۆمبێلەکە هێشتا دەنگی دێت.... سەیرێکی کاتژمێرم کرد بینیم یازدە و نیوە... زۆر بەلامەوە سەیر بوو...

دەستم بەرز کرد. کە کاتژمێر یازدە و نیوم تایپ کرد پرسیم: – چیتان بەلاوە سەیر بوو؟

– ئەوەیکە شوفێر لێبگەڕێ هەموو کاتە پێبێت.

ئیشارەیەکەم کرد و لۆنك لە راپۆرتەکەی بەردەوام بوو:

– .... هەولم دا دەرگای گەراج بکەمەوە بینیم لە ژوورەوە بەستراوە....چوومە ناو ڕێڕەوەکە کوماندانتور و ئەو دەرگایەم کردەوە کە لەوێ دەچێتە ناو گەراجەکە.... ئۆبێر شتورم فورر زێتسلێر لەوێ لەپشت سووکان کەوتبوو. ئوتۆمبێلەکەم کوژاندەوە.... هێنامە خوارێ و دوایی هێنامە ژوورەکەی خۆی....

سەرم بەرز کرد: – خۆت بە تەنیایی؟

لۆنك سینگی پانی راست راگرت و وتی: – بەڵێ بۆخۆم بە تەك و تەنیا، هێر ئشتورم بان فورر.

– بەردەوام بە.

– ... دوایی هەناسەم دایە....

– بۆچی؟

– واپێدەچوو کە ئۆبێرئشتورم بان فورر زێتسلێر سەبارەت بە دووکەڵی ئوتۆمبێل بووراوەتەوە....

ڕەستەکەم تایپ کرد و چەند هەنگاوێك لەناو ژوورەکە بەڕێداڕۆیشتم و سەیری زێتسلیێرم کرد. لە ژوورەکە ڕاکشابوو و نەختێك پێیەکانی لێك کرابوونەوە.

سەرم بەرز کرد: – لەمبارەیەوە بڕوات چییە لۆنك؟

– هەر ئەمجۆرەی کە وتم پەیوەندی بە ژەهێرەوە هەیە. یان دووکەڵ....

بە دەنگێکی توند وتم: – مەبەستم ئەوە نییە.

سەیریم کرد. چاوە شینەکانی پڕ لە نیگەرانی بوو و وتی: – نازانم، **هێر ئشتورم یان فورر.**

– ئیٚ، بەهەرحاڵ، فکرێك، بیرۆکەیەك، شتێکت کە هەیە.

بێدەنگییەك رووی دا و لۆنك بەئارامی وتی: – زۆر باشە.... لە دوو حاڵەت بە دوور نییە: یان خۆکووژی یان رووداو. (دەنگی نەختێك هێواشتر کرد): – ئەگەر قسەی منت دەویٚ.... ئێستا پێت دەڵێم....

رێك قسەکەی خواردەوە و منیش رستەکەم کۆتایی پێهێنا: – کەواتە، ئەمە "رووداوە".

ئەویش بە پەلە وتی: – لەراستیدا منیش لەسەر ئەم بڕوایەم گەورەم، **هێر ئشتورم یان فورر!**

دانیشتم و ئەم قسانەم بە راپۆرتەکەوە زیاد کرد:

"بە بڕوای من هۆکارەکەی رووداو بووە."

وتم: – حەز دەکەی راپۆرتەکەت ئیمزا بکەی.

لۆنك هاتە ئەم لایەی مێزەکە، پێنووسەکەم دایە دەستی و بیٚ ئەوەی بیخوێنێتەوە، ئیمزای کرد.

تەلەفۆنم هەڵگرت:

– کوماندانت قسە دەکات. بە شوفێرەکەم بڵێن بێتە ئێرە.

تەلەفۆنەکەم داخست و لۆنك پێنووسەکەی بۆلای درێژ کردم. پێم وت سواری ئوتۆمبێلی من دەبێت و دەچێتە دوای هاوپ تشتورم فورر هاگێمان و لاگەرازرت .... هاگێمان لە مالی ئێمەیە. لەناو ئوتۆمبێلدا لەمبارەیەوە هیچ قسەیەکی ناکەی.

– یاوول، هێرئشتورم بان فورر.

کە گەیشتە بەر دەرگا دووبارە بانگیم کردەوە:

– گیرفانەکانی مەیتەکەت گەڕاوە؟

– نەخێر، رێگەی ئەمکارەم بەخۆم نەداوە هێر ئشتورم بان فورر.

ئیشارەیەکم پێی کرد و چووە دەرێ.

هەستام و چوومە لای مەیتەکەی. دوایی خوار بوومەوە و گیرفانەکانی زێتسلێرم گەڕا. لەناو گیرفانی چەپی کراسە ئەفسەرییەکەی پاکەتێکم بەناوی خۆم دۆزیەوە. پاکەتەکەم کردەوە. نامەیەکی لەناودا بوو کە بەپێی رێوڕسمی ئیداری تایپ کرابوو: –

لە: ئێس. ئێس ئۆبێرشتورم فورر "زێتسلێر"

کەی ئێلی ئاوش ویتس،

بۆ: ئێس. ئێس ئشتورم بان فورر "لانگ"

کوماندانت کەی ئێلی ئاوش ویتس

چونکە ئیتر بەهیچ شێوەیەك تەحەمولی ئەم بۆگەنە نفرەتییەی گۆشتی سووتاو ناکەم، خۆم دەکووژم.

ر. زێتسلێر

## ئێس. ئێس – ئۆشتوف

ژێرجگەرەم لەناو سەتڵی ژێر مێز بەتاڵ کرد، نامە و پاکەتەکەم خستە ناوی و ئاگرم تێبەردا. کاتێك کە بە تەواوی بوونە خەڵوون، پەردەم کێشا و پەنجەرەم کردەوە و خەڵووزەکەم ڕشت.

لە پشت مێز دانیشتم. دەمانچەکەی زێتسلێرم وەبیر هاتەوە. لە بەرگی دەمانچەکە دەرمهێنا و دامنایە ناو کشەوێکی مێز و ئەوکات یەك بە یەك کشەوەکانم گەڕا بۆ ئەوەی لەو شتەی دەگەڕێم، بیبینمەوە: بوتڵێك شپانس. ئەوەندەم لێی نەخواردبۆوە.

هەستام دوو لە سێی بوتڵەکەم لەناو دەستشۆرەکە بەتاڵ کرد. دوایی، نەختێك عەرەقم بە کراسەکەی داکرد. ڕێك ژێر ئەوکی. شێرەی ئاوم کردەوە بۆئەوەی کەمێك ئاوی پێدا بڕژێت و ئەوکات دەرگای بوتڵەکەم بەست و دامنایە سەر مێز. هێشتا دوو بەندی پەنجەی شپانس لەناو بوتڵەکەدا مابۆوە.

دەرگام کردەوە و جگەرەیەکەم داگیرساند و ڕۆیشتمە پشت مێز و دانیشتم و چاوەڕێ مامەوە.

لەو شوێنەی کە دانیشتبووم، مەیتی زێتسلێر نەدەبینرا. چاوەم بە کۆتەکەی کەوت کە هەڵواسرابوو. دەنگی هەنگاوی چەند کەسێکم گوێ لێبوو. سەرەتا هاگێمان هاتە ژووری، بە ڕەنگی زەردهەڵگەڕاو و بارودۆخی تێکچوو. لاگەرارزت هاوپ تشتورم فورر بێنز بەدوایدا و دوای ئەوایش لۆنك کە سەر و ملێك لەئەو بڵندتر بوو.

هاگێمان زوو زوو دەیوت:

– چۆن؟ ئاخر چۆن....؟ هیچ تێناگەم....

بێنز خوار بۆوە و چاوەکانی مەیتەکەی کردەوە و سەرێکی جوولاند. دوایی راست بۆوە و چاویلکەی لەچاوی کردەوە و شووشەکانی خاوێن کردەوە و دووبارە داینایەوە، مووە سپییەکانی سەری بە بەری دەست ساف و لووس کرد و بێ ئەوەی تاکە وشەیەك بدوێت، دانیشت.

وتم: – ئێوە دەتوانن برۆن لۆنك، ئەگەر پێویست بوو بانگت دەکەم.

لۆنك رۆیشت. هاگێمان بێ جوولە وەستابوو و سەیری مەیتەکەی دەکرد.

وتم: – لە راستیدا بەدبەختییەکی ترسناکە.

دوایی راپۆرتی لۆنکم بۆ خوێندنەوە.

ئاگاداری ئەوە بووم کە جگەرەکەم هەر لەدەستمدا هێشتووەتەوە. ناڕاحەت بووم و خستمە ناو ژێرجگەرەکە. راپۆرتی "لۆنك"م خوێندەوە و رووم کردە بێنز و وتم: – بارودۆخەکە چۆن دەبینن، بێنز؟

سەیری کردم، وادیار بوو کە لێمتێگەیشتووە. بە ئارامی وتی: – بە بڕوای من ئەمە تەنیا رووداو بووە. هاگێمان بە سەرلێشێواوی وتی: – ئاخر چۆن؟.... ئاخر چۆن؟

بێنز ئیشارەیەکی بە بوتڵی ئشپانس کرد.

– لەم جەژنەی کە بۆخۆی گرتووە، نەختێك زێدەڕۆیی کردووە. دوایی ویستویەتی ئوتۆمبێل هەڵبکات، لەبەر سەرمای زۆر جەڵتە لێداوە و کار لەکار ترازاوە.

هاگێمان وتی: – ئاخر، تێناگەم. زێتسلێر هەمیشە زۆر کەمی دەخواردەوە و نەیدەهێشت تێکبچێت....

بێنز شانەکانی هەڵاویشت: – باشە، تەنیا پێویست بەوە دەکات بۆنی بکەن.

**هاگێمان** بە هانکە هانکەوە وتی: – بەڵام ئەگەر رێگەم بدەن، لەگەڵ ئەم قسانە... شتێکی سەیر هەیە. بۆچی **زێتسلێر** وەکوو هەمیشە شوفێرێکی بانگ نەکردووە؟ .... هیچ حەقی ئەوەی نەبووە بە تەنیا لەپشت سووکان دابنیشێت.....

من بە توندی وتم: – ئێوە خۆتان باش دەزانن کە **زێتسلێر** هیچ کارێکی بە خەڵکی دیکە نەدەچوو.....

**هاگێمان** وتی: – یا، یا، بە واتایەکی دیکە ئەو "هونەرمەند" بوو... سەیری منی کرد و بە خێرایی بەردەوام بوو): – براوی منیش هەر ئەمەیە، تووشی رووداو هاتووە.

هەستامە سەرپێ.

– تۆ رادەسپێرم کە فراو **زێتسلێر** بۆ ماڵیان بگەڕێنیتەوە و رووداوەکەی بۆ باس بکەی. ئۆتۆمبێلی من هەڵگرن ....، بەڵام ئێوە **بێنز**، دەمهەوێ بەرەبەیانی راپۆرتی خۆتم بدەیتێ بۆئەوەی بیخەمە پاڵ راپۆرتەکەی خۆم.

**بێنز** هەستایە سەرپێ، سەرێ خوار کردەوە و هەردووکیان چوونە دەرەوە.

تەلەفۆنم بۆ نەخۆشخانە کرد ئەمبولانسێك (ئوتۆمبێلی فریاکەوتن) بنێرن و لە پشت مێز دانیشتم و خەریکی تایپی راپۆرتەکەم بووم. کاتێك نێرسەکان هاتن مەیتەکەیان برد، جگەرەیەکم پێکرد و پەنجەرەکەم چوارتاق کردەوە و دووبارە دانیشتم و خەریکی تایپ کردن بوومەوە.

نەختێك دواتر تەلەفۆنم هەڵگرت و ماڵی ئۆبێرشتورم فورر پیلم داواکرد. دەنگی ژنێك لەم لاوە بەگوێ گەیشت.

وتم: – ئـشتورم بـان فـورر لانـگ قـسە دەكـات. دەكـرێ تەلەفۆنەكـە بـە هاوسەرتان بدەن فراو پیك؟

هاندەكەی لەسەر مێزەكە دانا و دوایی گوێم لە دەنگی هـەنگاوەكانی بوو كـە دوور بـۆوە و دەرگایـەك كرایـەوە. بێدەنگییـەك پەیـدا بـوو و دوایـی لەناكاو دەنگێك بە ساردی و ئارامی لـەبنان گوێمـدا وتـی: – ئۆبێرشتورم فورر پیك.

- لە خەوم نەكردبن پیك؟
- نەخێر هێر ئشتورم بان فورر، هەر ئێستا هاتوومەتەوە ماڵێ.
- ئاگاداری ئەم رووداوە هەن؟
- بەڵێ، ئاگادارم، هێر ئشتورم بان فورر.

وتم: – پیك! بەیانی كاتژمێر حەوت لە ژووری خۆم چاوەڕێتانم.

- بە خزمەت دەگەم، هێر ئشتورم بان فورر.

وتم: – دەمهەوێ ئیشەكەتان بگۆڕم.

بێدەنگییـەكی كـوورت هاتـەپێش و دوایـی دەنگەكـە وتـی: – لـە خزمـەت جەنابتان دام هێر ئشتورم بان فورر.

كـووره جمكـەكانی سـووتاندنی مەیتـەكان رێـك چـەند رۆژ پـێش كـاتی دیاریكراو ئامادەی كار بوون و رایشس فـورر رۆژی ١٨ی ژوئیـەی ١٩٤٢ بـۆ ئـاوش ویـتس هـات كـە بەدەسـتی خـۆی رێـوڕەسمی كردنـەوەی بەڕێوەببات.

ئوتۆمبێلـەكانی بەرپرسە فەرمییـەكان دەبوایـە سـەری كاتـژمێر دووی نیـوەڕۆ بگەنـە بیركێنـاو، بـەڵام لـە سـێ و نیـو تێپـەڕیبوو و هێـشتا دیـار نەبوون و ئەم بەدواكەوتنە بوو بە هۆی پێشهاتنی رووداوێكی زۆر جددی.

من دەمویست "چالاکیی تایبەت" بە بێ کەموکوڕی و بێ هیچ کێشەیەك لەبەرچاوی رایشس فورر بەڕێوەبچێت. هەر بۆیەش نەمویست لە کەسانی بێ توانای ناو ئۆردوگا وەکوو خۆراکی ژوورەکانی غاز و کوورەکانی سووتاندنی مەیتەکان کەڵك وەربگرم. هەر بۆیەش کەڵك وەرگرتن لەمانەی کە دروست بوونی ئەم کوورەیان بە چاوی خۆیان بینیوە و تەنانەت ئیشیان تێداکردووە، زۆر سەخت و دژوار و پڕ کێشەتر لەوانە بوو کە لە دەرەوەی ئۆردوگا دەهێنران. هەربۆیەش کارێکم کرد کە شەمەندەفەرێك بە دوو هەزار جوولەکەوە لە گێتتویەکی پۆلۆنی بۆ رێوڕەسمی کردنەوەی کوورەکان بنێردرێن و شەمەندەفەر لە باروخێکی زۆر باشدا نەختێك پێشتر لە نیوەڕۆ گەیشتە ئۆردوگا، کە لەژێر چاودێری توند و تیژی ئێس. ئێس.ەکان و سەگەکان بۆ حەوشەی گەورە و بەتاڵی "کرێمای ۱" (Crematoire No1)(کوەرەی ژمارە یەکی سووتاندنی جوولەکەکان) گواسترانەوە. دە خوولەکی مابوو بۆ کاتژمێر دوو بە جوولەکەکانمان راگەیاند کە دەبێ حەمام بکەن، بەڵام چونکە رایشس فورر نەهات و چاوەڕانیان زۆری خایاند، جوولەکەکان کە لە گەرمای سووتێنەری حەوشە گیانیان دەردەچوو، نیگەران و تووڕە دەستیان کرد بە ویستنی نان و ئاو.و دوای نەختێکیتر دەستیان بە جووڵە و هاوارکێشان کرد.

پیك خوێنساردی و لەسەرەخۆیی خۆی لەدەست نەدا. تەلەفۆنی بۆ من کرد و لەنێوان پەنجەرەیەکی کرێما قسەی بۆ جەماوەرەکە کرد و بە کەڵك وەرگرتن لە دیلمانجێك بۆی شی کردنەوە کە کوورەی حەمام کێشەی فەننی بۆ هاتووەتەپێش و لەکار کەوتووە و خەریکن چاکی دەکەنەوە. لەمناوەدا خۆشم گەیشتمێ و خێرا فەرمانم دا سەتڵەکان پڕ لە ئاو بکەن و بۆ جوولەکەکانی ببەن و بەڵێنیم پێدان دوای حەمام کردن نانیشیان

دەدرێتیٚ و داوام لە **هاگێمان** کرد گروپی مۆسیقا لە گۆشەیەکی حەوشە دەست بە ژەنینی مۆسیقای پۆلۆنی و ڤیەنی بکەن. ئیتر نازانم ئەوەی ئەوانی ئارام کرد، مۆسیقا بوو و بەس، یان نەفسی بەڕێوەبردنی بەرنامەی مۆسیقا بەنسبەت بیروبڕوایان ئەوانی خاترجەم کرد، تەنیا ئەوە دەزانم کە کەم کەم ئەوانی هێور کردەوە و وازیان لە بێقەراری هێنا و بەم ئەنجامە گەیشتم کە کاتێك **هیملێر** دەگاتیٚ، بۆ بردنیان بۆ ژووری جلك دانانی ژێرزەوینی توشی گرفت و کێشە نابین.

لە بابەت بردنیان بۆ تەلاری حەمام زۆر خاترجەم نەبووم. لەوکاتەوە کە **کرێما** جمکەکان تەواو ببوون، چەند جارێك "چالاکیی تایبت"یمان تاقی کردبۆوە و سیٚ یان چوار جار ئاگاداری ئەوە بوومەوە کە جەماوەر، لەکاتێك کە دەچنە ناو تەلاری ئاوپاش (ئاوپاشی حەمام) لەناکاو دەوەستان و دەکشانەوە، کە ناچار بووین بۆ کۆتایی پێهێنان بەم کێشەیە دەست بۆ توندوتیژی بە قۆنداخ و کردنەوەی سەگەکان ببەین، لەئەنجامدا سەرەی پێشوو هەموویان بەسەر یەکتردا بەردەبوونەوە، ژنەکان و منداڵەکان لەژێر دەست و پیٚ دەمانەوە و گریان و قیژە چریکە و تێهەڵدان و جنێو گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد.

بێشك ئەگەر سەبارەت بە پێشهاتێکی ئەم شێوەیە بەرنامەی سەردانی **رایشس فورر** تێکبچێت، ئەوا زۆر ناخۆش و خراپ دەکەوێتە سەر ئێمە. بەمحاڵەشەوە، سەرەتا بۆخۆم توانای پێش گرتنیم نەبوو، چونکە تەلاری حەمام بە لوولەکێشی (بۆری) منداڵ فریودەرانە و کۆمەڵێك چاوپاشی حەمام لەخۆیدا شك و گومانی ئەوانی چارە نەدەکرد و ئەم پاشەکشەیە شتێکی غەریزی بوو و چارەشی نەدەکرا.

ئاخرییەکەی ناچار بووم بڕیارم دا لە رۆژی هاتنی و سەیر کردنی هیملێر، شارفوررەکانیش لەگەڵ زیندانییەکان بنێرمە ژووریٚ هەتا قالبی بچووکی سابوونیان لەنێواندا دابەش بکەن و ئەمرم بە دۆلمیێتچرەکان کرد کە نییەتپاکی ئێمە بەگوێی زیندانییەکان بگەیەنن. هەڵبەت زۆر بە باشی ئەمەشم دەزانی کە بچووکترین لەتە سابوون بۆ زیندانییەکان گەنجێکی باوەڕنەکراو بوو و هەر بۆیەش متمانەم بەم فریودانە هەبوو کە بەم تەڵەیە هیچ کێشە و گرفتێك روو نادات.

ئەم فریودانە جێگەی خۆی گرت و لەگەڵ هاتنی هیملێر، شارفوررەکان بە کارتۆنی گەورە لەنێوان زیندانییەکان تێپەڕین و دیلمانجەکان هەواڵی دابەش کردنی سابوونیان لە "بڵندگۆ" (سەماعە) بە زیندانییەکان راگەیاند و دەنگە دەنگێکی رەزامەندانە لە زیندانییەکان بەرز بوویەوە، کاری جلك دانان بە خێرایی بەڕێوەچوو و هەموو جوولەکەکان بە دڵخۆشییەوە چوونە ناو ژووری غاز.

شارفوررەکان یەك بە یەك هاتنە دەرەوە، سەرژمێری کران و پیك دەرگای قوورسی دروستکراو لە دارە بەلووتی داخست. پرسیارم لە رایشس فورر کرد کە ئایا حەز دەکات لە کوولانەوە سەیری ژوورەکە بکات؟ سەری رەزامەندانەی جووڵاند و من خۆم کێشایەوە پاشەوە و هەر ئەوکات قیژە و هەرا و هوریا و ناڵە ناڵ و چریکاندن و مەستەکانی کە بە دیوارەکان دەکەوتن، دەستیان پێکرد.

هیملێر سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد، بەدەست سێبەری لەچاوی کرد و ماوەیەکی زۆر سەیری کردن. کە لە سەیرکردن وەڕەز بوو ئیشارەی بەئەفسەرەکانی کرد کە دەتوانن ئەوانیش سەیری بکەن.

دوایی ئەوم بۆ حەوشەی **کریما** ڕێنوێنی کرد و هەواکەشە چیمەنتۆکانم نیشان دا کە بلورەکانی غازیان پێدا دەخرایە ناو تەلار.

هەموو ئەوانەی کە لەگەڵ **هیملێر** بوون هاتنە لای ئێمە و هەموویانم بۆ کوورەخانە بردن و هەر بەردەوام بۆیانم شی دەکردەوە. دوای ماوەیەکی کەم دەنگی زەنگیَ بیسترا. وتم: - ئەمە "**پیک**"ە کە داوا دەکا ئامێری هەواکەش بەکار کەوێت، **هێر رایشس فورر**، کاری لەخواردانی غاز کۆتایی پێهاتووە.

پاسەوانی تایبەت بەمکارە دەستەیەکی هێنایەخوار. دەنگی فرەفڕ بەهێزەوە هەوای لەرزاند و **هیملێر** سەرلەنوێ چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد.

لەویَ بۆ ژووری غاز گەڕاینەوە. زیندانییەکانی **زۆندێر کۆماندۆ** کە چەکمەی بڵندی نایلۆنیان لەبەر بوو، سەری لوولەی پڕ لەئاویان بە فشاری زۆر دەڕژاندە سەر کۆمەڵی مەیتەکان. هۆکارەکەیم بۆ **هیملێر** شی کردەوە. لەپشت سەری من ئەفسەرێکی **هیملێر** بە سەیروسەمەرەیی و پێکەنینەوە وتی: - ئیَ، کەواتە حەمام نەکردوو لەم دونیایە ناڕۆن!

دوو سیَ کەسێك لەژێر لێو پێکەینن.

**هیملێر** رووی وەرگێڕا و رووخسارێکی پڕکاریگەری هەبوو. بۆ نهۆمی یەکەم گەڕاینەوە و بۆ تەلاری کوورەکان رۆیشتین. لەهەمانکاتدا ئامێری بردنەسەر (ئاسانسۆر) گەیشتیَ، نەردەکانی پێشی بەشێوەی خودکار کرانەوە و زیندانییە تایبەتییەکان دەستیان کرد بە چنینی مەیتەکان لەسەر عارەبانەکان. دوایی مەیتەکان لەبەرامبەر کۆماندۆیەك تێدەپەڕین کە ئەرکی دەرهێنانی حەڵقە و ئەنگوستیلەی مەیتەکان بوو. کۆماندۆیەکی ئارایشگەر مووەکانی دەچنی و کۆماندۆویەکیش رووکەشی ددانە

زێڕەکانیانی کۆ دەکردەوە. دوایین کۆماندۆش مەیتەکانی دەخستە ناو کوورەوە.

هیملێر هەموو چالاکی پرۆژەکەی یەك بەدوای یەك سەیر کرد، بێ ئەوەی وشەیەك بڵێت. تەنیا لەبەردەم کۆماندۆی ددان زیاتر وەستا: توانا و خێرایی ئەم دەستە بەڕاستی بەرچاو بوو.

دوای ئەو هیملێر م بۆ تەلارەکانی شی کردنەوە و توێژینەوەی کرێما۱ ڕێنوێنیکرد. باش دەمزانی کە رایشس فورر حەزێکی زۆری لە زانست هەیە و هەر بۆیەش بە ڕێکوپێکی و بە جوانی کارەکانم بەڕێوەبردبوو کە بە شانازییەوە تاقیگە و تەلارەکان وەکوو زانکۆیەکی زۆر نوێ بچن.

رایشس فورر بە وردی سەیری هەموو شتێکی کرد و هەروەها زۆر بە جوانی گوێی لە شی کردنەوەکانی من گرت، بەڵام هەر بەبێدەنگی مایەوە و کەمترین رای دەرنەبڕی.

لە کرێما کە چووینە دەرەوە، رایشس فورر هەنگاوەکانی خێراتر کرد و هەستم بەوە کرد کە هیچ حەزی لە دیتنی زیاتری ئۆردوگا نییە. بەجۆرێك هەنگاوی هەڵدەهێنا کە ئکیپەکەی لە دواوە مانەوە و منیش زۆر بە زەحمەت خۆم بە ئەو گەیاند.

کە بە ئوتۆمبێلەکەی گەیشت، وەستا، ڕووی لە من کرد، چاوەکانی نەختێك سەرووتر لە بۆشایی بڕی و بە وردی و یەك ئاهەنگ وتی: — ئەرکێکی زۆر دژوارمان لەپێشە، بەڵام دەبێ بە کۆتایی بگەیەنین.

سەر و قەد و گیپاڵم ڕێك کرد و وتم: — یاوول، هێر رایشس فورر!

سڵاوم دا و سڵاوی منی وەڵام دایەوە و چووە ناو ئوتۆمبێلەکەی.

دوای دوازدە ڕۆژ، ڕێك لە سێیەمی ژوئیە نامەی ژێرەوە بە دەستم گەیشت.

بەپێی ڕاگەیاندراوێك کە لە لایەن بەڕێوەبەری **ئامتسگرووپی "د"**[38] ڕاگەیاندراوە، **ڕایشس فورر ئێس. ئێس.** بەدوای سەردانی خۆی لە کەی **ئێلی "ئاوش ویتس"** کە لە ڕۆژی هەژدەهەمی ژوئیە ١٩٤٢ ڕوویداوە، فەرماندەی ئۆردوگا، **ئشتورم بان فورر ڕۆدۆلف لانگ** لەم ڕۆژەوە پلەی **ئۆبێرشتورم بان فورر** "ئێس. ئێس"ی (مقەدەم دووهەم) پێدەدرێت.

خێرا دەستم بە کار و چالاکی دوو **کرێمای** دیکە کرد. لەسەر ئەم بڕوایە بووم کە ئەزموونی دروستی **کرێما١**، ڕێگە خۆش دەکات بۆئەوەی خێراتر ئامادەی چالاکی بن، هەڵبەت پێش لەم ڕۆژەی کە بۆی دانراوە. لەلایەکی دیکەوە پێویستی بە **کرێمای** نوێ هەست پێدەکرا، چونکە دوای سەردانی **ڕایشس فورر**، خێرا، **"ئێر. ئێس. هـ. ئەی"** (ڕێکخراوی ناوەندی ئاسایشی وڵات) بە ئاهەنگێکی خێراتر بەشێوەیەك دەستی بە ناردنی زیندانیان کرد کە **"کرێمای جمك"**ی ئێمە زۆر بە زەحمەت و دژواری دەیتوانی ئەرکی خۆی ڕاپەڕێنێت.

هەرچەند ئێمە تەنیا بێکەڵك و بێ تواناکانمان لەناو دەبرد، باقیەکەیان بە زیندانی ناو ئۆردوگاوە زیاد دەکران کە ئێستاش ژماریان یکجار زۆر بوو. زیندانییەکان دەخرانە ناو سەرپۆشەکان و بارودۆخی خۆراك و پاك و خاوێنی زۆر خراپ بوو و نەخۆشی جۆراوجۆر بەتایبەت دیفتری و تیفوس، بەردەوام گیانی زیندانیانی دەگرت. بارودۆخ سەخت و دژوار بوو، چونکە دەبوایە کارگەکان لەم کەسانە کرێکار وەربگرن کە لە رووی جەستییەوە بەتوانان و هیچ جۆرە نەخۆشییەکیشیان نییە، هەربۆیەش

---

38 - (Amtsgruppe "D") شی نەکراوەتەوە، واپێدەچێ مەبەست بە لەبەشی ئیدارەیی بێت.

بوونی ئەم نەخۆشیانە وایدەکرد ئەوانیش هیوای خۆیان بە وەرگرتنی زیندانی بەتوانا لەدەست بدەن.

هەربۆیەش سەرلەنوێ و زۆرجار بەدواییەکدا نامەم بۆ "ئێر. ئێس. هـ. ئەی". دەنارد و دەست بە داوێنیان دەبووم کە جەماوەرێکی کەمترم بۆ بنێرن، بەڵام هەموو هەوڵەکانم بێ ئەنجام بوون تا ئەوەیکە لە کۆتاییدا بەهۆی زمان لەقی یەکێ لە بەرپرسان بەم ئەنجامە گەیشتم کە بەپێی فەرمانی رایشس فورر هەرکام لە سەرکردەکانی ئێس. ئێس. بە ئەنقەست یان سەبارەت بە بێ توانایی و هەرچەند کەم، لە خێرایی بەڕێوەبردنی بەرنامەی لەناوبردنی جوولەکەکان کەم بکاتەوە، خێرا تیرباران دەکرێت. شەمەندەفەری هەڵگری جوولەکەکان لە وێستەگان ماڤ خێرا تێپەڕین و ڕۆیشتنیان پێدرابوو و تەنانەت دەبوایە وەپێش شەمەندەفەرەکانی هەڵگری چەك و سیلاح و تەقەمەنی بۆ بەرەی شەڕی رووسیا بکەون.

کەواتە هیچ ڕێگەیەك نەبوو جگە لە سەر دانەواندن.

بەمحاڵەشەوە لە بینینی ئەوەیکە ئۆردوگاکانی من - ئەو ئۆردوگایانەی کە سەرەتا بەشێوەی تەشکیلاتی بەڕێوەم دەبردن - هەفتە بە هەفتە زیاتر تووشی کێشە و هەرا و هوریا و شۆڕش دەبوونەوە، سەرتاپێ لە نفرەتدا دەخنکام.

زیندانییەکان وەکوو مێش دەمردن. نەخۆشییەکانی ڤایرۆسیش بە خێرایی ژوورەکانی غاز زیندانییەکانی دەکوشت و تەپۆڵکەی مەیتەکان بەخێرایی دەخرانە سەر یەك کە گرووپەکانی تایبەت بە گواستنەوەی مەیتەکان بۆ کرێما لەکارەکانیاندا وەپاش دەکەوتن و نەیاندەزانی چۆن بەرەنگاری ئەم هەموو مەیتە ببنەوە.

رۆژی شازدەهەمی ئوت بە تەلەفۆن لە بەرلین پێیان راگەیاندم کە **ئشتاندارتن فورر کێلنێر** چاودێرە و دەبێ سەردانی **کەی ئێلی بیرکێناو** بکات و سەرەتای بەیانی رۆژی دواتر **کێلنێر** بە ئوتۆمبێلێك گەیشتێ. بەحەیا و بەرێز و بە میهێرەبانییەکی زۆر پێشوازیم لێکرد و هەموو شتێك و هەموو شوێنێکم نیشان دا. **"چالاکی تایبەت"** بەلایەوە زۆر گرنگ بوو و تەشکیلاتی **کریماکان** وایکرد کە سەرنجی تەواوی ئەوەی راکێشا.

نیوەڕۆ، بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ بۆ ڤیلای خۆم دەعەوەتم کرد.

لە تەلار چاوەڕوانی نانی نیوەڕۆ بووین. ئەوەندەی پێنەچوو کە **ئێلزی**ش هاتە لامان. **کێلنێر** هەستایەسەرپێ پانییەکانی لێکدا، چاویلکە یەك چاوییەکەی دانا و هەتا عەرد خوار بۆوە و پەنجەکانی ماچ کرد. دوایی بەو خێراییەی کە هەستابوو دانیشت و رووی لە پەنجەرە کرد و وتی:

– ئێ، **گنەدیگە فراو**، لەبارەی **ئاوش ویتس** بیروبۆچوونتان چییە؟

بەلام تا **ئێلزی** هات وەلام بداتەوە خۆی دەستی بە قسە کرد کە: – **یا**، **یا**، بێشك. ئەم بۆگەنە لە راستیدا و بوارەکانی دیکە... ئاخر ئێمەش لە **کۆلمهوف** ئەم کێشەمان هەیە.... باوەڕ بفەرموون.... بەلام ئێوەش زۆر بە رێکی لێرە دامەزراون. بە تەواوی لێرە ماونەتەوە، **گنەدیگە فراو**.... (لە دەرگای گەوەری شووشەیی سەیرێکی ژووری نان خواردنی کرد.).... شوێنەکەشتان خۆشە و ڤیلایەکی جوانتان هەیە.

**ئێلزی** وتی: – حەز دەکەن سەیری ژوورەکان بکەن **ئشتاندارتن فورر**؟

چووینە ژووری نان خواردن. **کێلنێر** لەپێش کەونتەر وەستا و ماوەیەکی زۆر سەیری کاری دەستی سەر دۆلابەکەی کرد و وتی: – بوارەکانی ئایینی.... چەندە ورووژێنەرن! یانی لێکدانەوەیەکی بەهێز (یەهوودی – مەسیحی) لە مەسەلەی مردن....(جوولەیەکی بچووکی بە دەستەکانی دا):

- لەم شتە کۆن و پێشینیانە.... هەڵبەت مردن کاتێك گرنگە و بایەخی هەیە کە تاك، وەکوو خوودی ئەمانە بڕوای بە "یەك دونیا" هەبێت..... بەڵام ئایا بەڕاستی ئەمجۆرەیە ماین لی بڕ! زۆر سەیرە ئەم جیهانە.

وتم: - ئەم کارە دەستییە کاری جوولەکەیەکی پۆلۆنییە هێر ئشتاندارتن فورر.

کێلنێر وتی: - یا، یا، بەم حاڵەشەوە دەبێ نەختێك خوێنی "نوردیك" (مەبەست نیژادی ئاریایی) لە دەمارەکانیدا بێت، ئەگینا ئەگەری ئەوە نەبوو شاکارێکی ئاوا دروست بکرێت. جوولەکەکان توانای ئەمجۆرەیان نییە، زۆر لەمێژە بەم مەسەلەیە گەیشتووم. ئاخ، ئەوەی کە هاوار دەکات و خۆی دەنوێنێ، کاری زیندانییەکانە! .... تەنانەت ئاگاداری ئەوەیان نین کە ڕۆژێك لە هونەرەکەیاندا دەمێننەوە یان نا.... بۆ ئەوان بێشك مردن شتێکی گرنگە... تا زیندوونە دڵی خۆیان بەم ئومێدەوە خۆش دەکەن....

حاڵەتێکی نفرەت و ڕق و کینەی بە ڕووخساری دا و منیش بە سەیرەوە پرسیم: - بەبڕوای ئێوە من دەبوایە پێشم لە هونەری ئەم جوولەکەیە گرتبا و نەمهێشتبا خۆی خەریکی باری ئایینی بێت هێر ئشتاندارتن فورر؟

بۆلای من سووڕایەوە و لە قاقای پێکەنینی دا و بە دەنگێکی پڕ لە مەکر و فریو وتی: -

هاهاها! لانگ! بەری دەستتان بۆن نەکردبوو کە دۆڵابەکەت بەمشێوەیە دژە ئایینی دروست دەکرێت.... (دوایی گاڵتەجاری وەلانا و سەیرێکی دۆڵابەکەی کرد و ئاخێکی هەڵکێشا و وتی): - ئێوە، لانگ، کاریگەریتان لەسەر ئۆروگاکەتان زۆرە. هەروەها کۆمەڵێك هونەرمەند لە ناویاندا هەیە کە پێیان دەگەی.

لە دەوری مێز دانیشتین و **ئێلزی** وتی: – بەڵام منیش وام بیر دەکردەوە کە ئێوەش فەرماندەی ئۆردوگایەکن ئشتاندارتن فورر؟

**کێلنێر** کە خەریکی کردنەوەی دەسرەی سفرەکەی بوو، وتی: – جۆرێکی دیکەیە... منیش وەکوو هاوسەری ئێوە "زیندانی هەمیشەیی و ماوەم" نییە.... زیندانییەکانی من هەموویان... (پێکەنی و بەردوام بوو): – ئەوانیش تێپەڕیوین، یانی دێن و دەڕۆن.

**ئێلزی** تووشی سەرلێشێواوی بوو و **کێلنێر** لە قسەکانی بەردەوام بوو: – هیوادارم ئێوە لە دووری دایکی نیشتمان زۆر دڵگران نەبن **گنە دیکە فراو**، پۆلۆنیا وڵاتێکی پڕ لە غەم و خەفەتە، **نیشت وار**؟ بەڵام وابزانم ئەوەندەی نەماوە: بەم پێیەی هێزەکانی ئێمە بەرەوپێش دەچن، تا ماوەیەکی دیکە بە قەفقاز دەگەن و ئیتر شەڕ کۆتایی پێدێت.

من وتم: – ئەمجارە ئیتر پاییز دانایەت کە کۆتایی پێدێت. لێرە هەموومان بڕوامان ئەمجۆرەیە **هێر ئشتاندراتن فورر**.

**کێلنێر** زۆر بە ورەبەرزی وتی: – لەماوەی دوو مانگ!

**ئێلزی** پرسی: – نەختێکی دیکە گۆشتتان بۆ دابنێم، **ئشتاندارتن فورر**؟

– ئۆه، نەخێر، سوپاس **گنەدیگە فراو**.... لە تەمەنی مندا (پێکنینێکی سەرزارەکی کرد): – دەبێ هێواش هێواش ئاگام لەخۆم بێت و زۆری نەخۆم.

**ئێلزی** بە حاڵەتێکی خۆشویستن وتی:

– ئۆه! ئێوە ئێستاش لاون **ئشتاندارتن فورر**!

**کێلنێر** بەتەواوی رووی لە پەنجەرە کرد و بە دەنگێکی حەزین وتی:

– هەڵبەت، من "ئێستاش" لاوم.

بێدەنگییەك هاتەپێش و **کێلنێر** بەدوای قسەکانیداوتی:

– ئێ، **لانگ**! دوای شەڕ دەتهەوێ چی بکەی؟ ئەم ئۆردوگایانە کە هەتا قیامەت نیین؟

– بیرم کردووەتەوە داوا لە رایش بکەم لە **ئۆشتراو** پارچە زەویەکم بداتێ **هێر ئشتاندرتن فورر**.

**ئێلزێ** وتی: – ئاخر هاوسەرم لە پومرانی کرێچی بارون **فوت یەزمریتس** بوو، کشتوکاڵێکمان هەبوو و ئەسبمان پەروەردە دەکرد.

**کێلنێر** یەکچاوییەکەی دانا، سەیری کردم و وتی:

– ئێ راستی؟ کشتوکاڵ! ئەسب و ئاژەڵداری! کەواتە کەوانی ئێوە زیاتر لە تیرێکی هەیە، **لانگ**! زۆر شت دەزانن.

رووی لە پەنجەرە کرد. حاڵەتێکی نەجیبانە و جددی بە رووخساری دا و بە دەنگێکی وشك وتی: – زۆر باشە. زۆر زۆر باشە. **لانگ**! حکوومەتی رایش پێویستییەکی زۆر بە کۆچبەرەکان دەبێت.

کاتێك کە ئسلاوەکان... (پێکەنینێکی بچووکی کرد) لەناو بچن... لەراستیدا ئێوە ئەو شتە دەبن کە .... دەقی رەستەی **رایشس فورر** چی بوو؟ .... ئاها، "**پێشاهەنگی نموونەی ئەڵمانی ئۆشتراوم**". لە هەموو شتێ بگوزەرێین، وابزانم ئەم قسەیەی لەبارەی تۆدا وت.

**ئێلزێ** چاوەکانی بریقەیان دا و وتی: – راست دەڵێن؟ لەبارەی مێردەکەمدا ئەوەی وت؟

**کێلنێر** وەڵامی دایەوە: – بەڵێ هەڵبەتە، **گنە دیگە فراو**. وابزانم مەبەستی مێردەکەی تۆ بوو و ئێستا کە بیری لێ دەکەمەوە، تەنانەت دەتوانم بە متمانەوە بڵێم کە **رایشس فورر** ناوبژیوانێکی بەتەواو مانایە.

ئێلزێ وتی: – ئاخ، چەندە بۆ **رۆدۆلف** خۆشحاڵم! ئاخر، ئێوە نازانن چەندە زەحمەت دەکێشێ! نازانن چەند رێك و ئەرکناسە!

وتم: – وازبێنە **ئێلزی**!

**کێلنێـر** لـە قاقـای پێکـەنینی دا و بـە ڕووخـسارێکی پـڕ لـە کاریگـەر سەیرێکی هەردووکمانی کرد، دوایی دەستەکانی بەرز کردەوە و وتـی: – چەندە کەیفی هەیە مرۆڤ لە بنەماڵەیەکی تەواو ئەڵمانیدا خۆی ببنێتەوە، **گنە دیگە فراو**! (ئەوکات بە دەنگێکی پڕ لە غەمەوە وتی) : – من بۆ خۆم عەزەبم. یانی لە راستیدا هیچکات بیرم لە ژنهێنان نەکردووەتەوە. بەڵام لە **بەرلین** هـاوڕێی هاوسـەردارم هـەیە کـە ژیـانێکی پـڕ لـە خۆشـی و چێـژیان هەیە.

لە پشت مێز هەستاین و بۆ خواردنەوەی قاوە بۆ تەلار گەڕاینەوە.

قاوەکەمان قاوەیەکی باش و خۆش بوو کە لە فەڕەنسا بۆ "**هاگێمان**"یان ناردبوو و بەستەیەکیشیان دابوو بە **ئێلزی**.

کێلنێر وتی:

– زۆر خۆشە! لە راستیدا ئێوە لێرە لە **ئاوش ویتس** لـە نـاز و نیعمەتـدا دەژیـن!... ژیـانی ئۆردوگـاش هەنـدێ شـتی باشـی هەیـە... ئەگـەر ئـەم .... تـەنیا ئـەم عەیبـە و نەکبەتییـەی نەبوایـە، یـانی عـەیبی ئۆردوگـا تـەنیا ئەمەیـە. ئـەمڕۆ سـەر لەبـەیانی بـیرم لـەوە دەکـردەوە، **لانـگ**، کاتێـک دەتانویـست "چـالاکی تایبـەت"ت بـە مـن نیـشان دەدا.... ئـەم جوولەکانە.....

بەپەلە چوومە ناو قسەکانی کە: – یەك دونیا داوای لێبووردن دەکەم **هێرئشتاندارتن فورر**... **ئێلزی** گیـان! دەکرێ نەختێك خواردنـەوەمان بـۆ بێنی؟

**ئێلزی** بە ڕووخسارێکی سارد و سەیروسەمەرە سـەیری کردم، هەستا و چـووە ژووری چێـشتخانە. **کێلنێـر** سـەری بـەرز نـەکرد. هـەر ئـەمجۆرە

کەوچکەکەی لەناو کوپی قاوە وەردەدا. ئێلزی لەپشت سەری خۆی دەرگاکەی بە تەواوی دانەخست.

کێلنێر کە سەیری کوپە قاوەکەی دەکرد، هەر بەم شێوەیە وتی:

- چەندە ناشیرین و ناحەزن! .... کاتێك بۆ ژووری غاز دەڕۆیشتن، ڕێك سەیریانم دەکرد.... چ دیمەنێك! چ رووت و قوتییەکی سەیروسەمەرە! بە تایبەت ژنەکان...

بە نائومێدی سەیریم کرد.

چاوی لە کوپە قاوەکەی هەڵندەبڕی:

- هەروەها ئەم منداڵانە.... بەم لاوازییەوە... بەم ئەندامە وردیلەیانەوە کە ڕێك وەکوو مەیمون دەچوون..... ڕێك وەکوو مشتێکی گرێدراو... وەکوو مەیت! لە راستیدا ترسناك بوو..... هەروەها ئەمکاتەی غاز دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە....

چاوێکم لە کێلنێر بوو و چاوێکم لە دەرگا. دەست و پێم وون کردبوو. عارەقە لەسەر مۆرەی پشتم ڕێگەی کردەوە، بەڵام هێرچیم کرد نەمدەتوانی لام تا کام شتێ بڵێم. کێلنێر کە، کە بێ ئیرادە هەر کەوچکەکەی لە کوپی قاوە وەردەدا دیسانی بەدوای قسەکانیدا رۆیشت کە: - چ لێقەومان و فەلاکەت و داماوییەك! چ حاڵ و بارودۆخێك!... ڕێك وەکوو پەردەکانی "برۆگێل" (وێنەکێشێکی بەتوانا کە نەقشی جەهەنەمی لەسەر پەردە دەکێشا)! ئاخر کە هەر بەهۆی ناحەزییەکەشیان بێ، مردن حەقیانە! .... تازە، فکری ئەوەیکە....

پێکەنینێکی بچووکی هاتی:

- .... بیری ئەوەی کە دوای مردن، بۆن و بۆگەنیان لە کاتی زیندووبوونیشیان زیاترە....

خێرا جووڵەیەکم کرد و لە چۆکیم دا. لەناکاو بەخۆی هاتەوە، بۆلای خوار بوومەوە، بە سەرم ئیشارەیەکم بە دەرگای نیوە کراوە کرد و بە خێرایی وتم: – "ئەو هیچ لەمبارەیەوە نازانێ!"

دەمی کردەوە و بۆ ماوەیەکی کەم تووشی سەرسووڕمان هات، کەچێ بەدەست دوودڵ مایەوە و بێدەنگبوو کە زۆر مەترسیدار لەو کاتە بوو چەنەبازی دەکرد. ئەوکات بە دەنگێکی ساختە بەدوای قسەکانیدا رۆیشت کە:

بەڵێ، **برۆگێل**.... **برۆگێل**ی دەناسی، **لانگ**؟ .... "**برۆگێلە** پیرە"ی ناڵێم، نا.... مەبەستم **برۆگێل**ەکەی دیکەیە کە پێی دەڵێن "**برۆگێل**ی جەهەنەم" و ئەم نازناوەی تەنیا بەم هۆیەوە پێدراوە کە تەنیا و تەنیا وێنەی جەهەنەمی دەکێشایەوە....

چاوم لە کوپەکەم بڕیبوو.

دەنگی پێیەك هات، دەرگای شووشەیی تەقەیەکی کرد و تەنیا خوا دەزانێ بۆئەوەی سەرم هەڵنەهێنم چ پاڵەپەستۆیەکم لەسەر بوو.

**کێلنێر** بە دەنگێکی بەرزتر وتی: – عاشقی ئەوە بوو کە وێنەی جەهەنەم بکێشێتەوە. بیری لێبکەنەوە. حەزێکی زۆری لە کێشانەوەی وێنەی کوشتن و مردن و فەوتان و جەهەنەم رۆژانی پڕ لە نەهامەتی و شووم هەبوو.

**ئێلزی** سینییەکی خواردنەوەی هێنا و منیش بە ئەدەب و حەیایەکی لەڕادەبەردەر سوپاسیم کرد:

– دەستت نەهێشێت **ئێلزی**!

بێدەنگییەك پەیدا بوو. **کێلنێر** لە سیلەی چاوی سەیرێکی کردم و بە جددیەتێکی زۆرەملانە هاواری کرد:

- خ! دیسانیش لە شتە باشەکان، واپێدەچێ خواردنەوەکەشتان فەڕنسەوی بێت.

هەموو هێز و توانای خۆمم کۆ کردەوە تا توانیم بڵێم: – ئەم شتانە بۆ هاوپت شارفورر هاگێمان دەنێرن. ئەو لە فەڕەنسا زۆر هاوڕێ و ئاشنای هەیە.

بەڵام بەم هەموو هەوڵەی دام دیسانیش دەنگم بە ساختەیی دەرچوو. لە سیلەی چاوم سەیرێکی ئێلزیم کرد: سەری داخستبوو و رووخساری هیچ شتێکی نیشان نەدەدا.

سەرلەنوێ قسە دەستی پێکردەوە. کێلنێر رووی لە ئێلزی کرد و وتی: – ئەم فەڕەنسایەش زۆر سەیرە، گنە دیگە فراو!

ئێلزی بە دەنگی ئارام وتی:

- کۆنیاک، ئشتاندارتن فورر؟

- تەنیا نەختێك، گنە دیگەفراو..... دەبێ کۆنیاك تام بکرێ. (دەستی بەرز کرد): – وەکوو خوودی فەڕەنسییەکان هەرجارەو تەنیا چەند دڵۆپێك، ئەویش زۆر بە هێواشی.... هاوڕێکانی بێ زەوقی ئێمە لەوێ پێکەکەیان لێواولێو دەکەن و هەڵیدەلوشن!

پێکەنینێکی بچووکی کرد کە پێیەوە دیارە بە زۆرەملییە. دوایی سەیرێکی منی کرد. ئاگاداری ئەوە بووم کە دیهەوێ هەرچی زووتر باروبنەی ببەستێ و تێیتەقێنێ.

ئێلزی کۆنیاکی بۆ تێکرد و پێکی منیشی هەتا نیوە پڕ کرد.

وتم: – سوپاس ئێلزی!

سەری بەرز نەکرد و دووبارە بێدەنگی ژوورەکەی پڕ کرد.

**کێلنێـر** وتـی: - لـە **ماکـسیم** (لـە رێـستۆرانتە ناودارەکـانی فەرەنـسا) کونیاکی لە پێکی گەورەدا دێنن کە خڕ و خۆڵە. بەمشێوەیە (بەدەسـتی شێوەی پێکی لە هەوادا نیشان دا).

دیـسانیش بێـدەنگی هاتـەپێش و دیـسانیش **کێلنێر** وەقـسە هاتـەوە: - بەڵێ، پاریس شارێکی سـەیرە **گنە دیگە فراو**. دەبێ دان بـەوە دابنـێم کە ....(پێکەنینێکی بچووکی کـرد).... **جاریوایە غیرەیی بە هێر ئابتس موە دەبم؟**

کـەمێکی دیکـە لـەبارەی **ماکـسیم**ی پـاریس قـسەی کـرد و ئەوکاتـە هەستایەسـەرپێ و ئیزنـی رۆیـشتنی خواسـت. بینـیم کـە تەنانـەت کۆنیاکەکەشی تەواو نەکردووە.

**ئێلـزی**مـان لـە ژووری میوانـداری جێهێـشت. مـن لەگـەڵ **کێلنێـر** هـەتا خوارووی قادرمەکان رۆیشتم و هەتا ئۆتۆمبێڵەکەی لەگەڵ رۆیشتم. ئەو رۆیـشت و منـیش داخ و حەسـرەتم خـوارد کـە بۆچـی کڵاوەکـەم هەڵنەگرتووە، ئەگینا منیش دەڕۆیشتم.

بـە هێواشـی گەڕامـەوە، لـە قادرمـەکان سـەرکەوتم و لـە دەرگـای بیناکـە چـوومە ژوور. ئاگـادرای ئـەوە بـووم کـە کڵاوەکـەم لـەوێ نییـە. دەرگـای ژووری کارم کە کردەوە، هەر لەوێ وشك بووم، **ئێلزی** لەوێ بوو. ساف و رێك و بە رەنگی وەکوو گەچ وەستابوو و دەستی چەپی بە پشت کوورسی گرتبوو.

بێ ئیرادە دەرگـام لـە پـشتەوە بەسـت و رووم وەرگێڕا. کڵاوەکـەم لـەوێ لەسەر مێز بوو.

خوولەکێکی تەواو تێپەڕی.

کڵاوەکەم دەست دایە و لەسەر سەرم دانا و هەر کە ویستم بگەڕێمەوە، ئێلزی وتی:

- رۆدۆلف.

بۆلای گەڕامەوە.... سەیرکردنەکەی ترسناك بوو.

وتم: - کەواتە ئیشی تۆ ئەوەیە!

سەرم وەرگێڕا و وتم: - نازانم دەتهەوێ چی بڵێی!

حەزم دەکرد بچمە دەرەوە و بەردێکی پێنج پووتی لەسەر ئەو قسە و باسە دابنێم. بەڵام هەر لەوێ وشك و ڕێك وەستابووم و توانای ئەوەم نەبوو کە سەیریشی بکەم.

بە دەنگێکی نزم و خەفەکراو وتی: - کەواتە تۆ بە غاز دەیانخنکێنی!..... ئەم بۆنە پیس و ترسناکە هی ئەوانە!

دەمم کردەوە، بەڵام هیچ دەنگێکی لێ نەهاتەدەر.

دووبارە وتی: - ئەم دووکەڵکێشانە! .... تازە دەزانم.

سەیری عەردم کرد و وتم: - ئێ، مردووەکان دەسوتێنین ئیتر. لە ئەڵمانیا هەمیشە مەیتەکانیان سووتاندووە. خۆشت دەزانی. مەسەلەیەکی تەندرووستییە ئەمە. ئیتر وتنی پێ ناوێ. ئەویش بەم هەموو نەخۆشییە ڤایروسیانەوە.

قیژاندی: - درۆ دەکەی! تۆ ئەوان بە غاز دەکووژی!

بە پەشێوی و شێواوی سەرم بەرز کرد: - من درۆ دەکەم؟ ئێلزی! چۆن غیرەتی ئەوەت پەیدا کردووە ....

بێ ئەوەی گوێ لە قسەی من بگرێت، لە قسەکانی بەردەوام بوو.

- پیاوەکان، ژنەکان، منداڵەکان..... هەمووان تێکەڵ پێکەڵ.... بەرووت و قووتی..... ئەو منداڵانە کە هەموویان وەکوو مەیمون دەچن....

سەرم راست راگرت و وتم: – نازانم، ئەم قسە گاڵتەجاریانەت لە کوێ هێناوە.

هەوڵێکی زۆرم دا تا بتوانم بەخۆم بێمەوە. گەڕامەوە و هەنگاوێك بۆ لای دەرگا چووم، بەڵام ئێلزی بەهەنگاوێکی خێرا پێش من گەیشتە دەرگا و پاڵی بەدەرگاوە دا و وتی: – تۆ، یانی تۆ!

هەموو جەستەی دەلەرزی. چاوە زەق و بریقەدارەکانی لەمن بڕیبوو.....

هاوارم کرد کە: – وابیر دەکەیەوە کە من خۆم زۆرم حەز لەم کارانە هەیە؟

لەناکاو شەپۆلێك شەرمەزاری هەموو جەستەمی داگرت: من خیانەتم بە رایشس فورر کردووە. نهێنی حکوومیم لای هاوسەرم ئاشکرا کردووە.

ئێلزی قیژاندی: – کەواتە راستە! تۆ دیانکووژی! (بەگریانەوە دووبارەی کردەوە) دیانکووژی! دیانکووژی!

خێرا خۆم گەیاندێ و بە هەر دوو دەست شانەکانیم گرت، بەری دەستم لەسەر دەمی دانا و وتم: – هێواش، ئێلزی تۆ خوا هێواشتر!

خۆی لەدەست من دەرهێنا. دەستم کێشایەوە. گوێی تیژ کرد و هەردووکمان بۆ ماوەیەك بەئارمی و بێ جووڵە، وەکوو دوو هاوبەشی تاوان گوێمان لە دەنگ و چرپەی ماڵەوە گرت.

بە دەنگی ئاسایی وتی: – وابزانم خاتوو موللر رۆیشتبێ.

– ئەی خزمەتکار چی؟

– لە ژێرخان جلکەکان دەشوات. منداڵەکانیش خەوتوون.

دووبارە بۆ ماوەیەکی کوورت گویمان گرت. دوایی ئێلزی رووی وەرگێڕا و سەیرێکی منی کرد و لەناکاو وەکوو ئەوەی وەبیری هاتبێتەوە کە من کێم، دووبارە ترس رووخساری داگرتەوە و خۆی بە دەرگا وەنووساند.

بە زەحمەتێکی زۆرەوە وتم: - گوێ بگرە ئێلزی! تۆ دەبێ درك بکەی. ئەوانە خوا دایناون بۆ مردن و بەس. ئاخر خۆ ئێمە نانی مفتمان نییە بیدەین بە ئەمانە. تازە خۆشیان بە قازانجیانە کە .....

زۆر بە سەیری چاوی لێکردم.

لە قسەکانم بەردەوام بووم کە : - ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ... ئەمجۆرە مردنە باشترە یان مردنی بە برسێتی؟

بە دەنگێك کە بێزاری لێدەباری وتی: - ئەمجۆرە.... کەواتە تۆ ئەمجۆرە بیر دەکەیەوە!

- بەڵام ئاخر بە ئێمە چی؟ مەگەر من چکارەم. ئەمە فەرمانە و ئەمرێك سەرووترە......

زۆر بە سەیرەوە وتی: - کێ رێگەی بەخۆی داوە کە ئەمرێکی ئاوا دەربکات؟

- رایشس فورر!

نیگەرانییەکی زۆر دڵمی رێککوشی: ئەمەش خیانەتێکی دیکە!

ئێلزی دووبارەی کردەوە: - رایشس فورر! (لێوەکان دەستیان بە لەرزین کرد. بە دەنگێکی خەفە وتی): - پیاوێك.... کە منداڵەکان بەم هەموو متمانەییەوە .... بۆلای دەچن! (بە تەتەپەتە وتی): بۆچی، ئاخر بۆچی؟

شانەکانم هەڵاویشت و وتم: - تۆ ناتوانی درك بەوە بکەی. درکی ئەم شتانە بۆ تۆ سەخت و دژوارە. جوولەکەکان مەترسیدارترین دوژمنانی ئێمەن. ئەگەر ئێمە هەر ئێستە دەست بەکار نەبین و لەناویان نەبەین، ئەوا ئەوان دوایی نەتەوەی ئەڵمانیا لەناو دەبەن.

خێرا قسەکەی منی قۆستەوە و وتی: - ئەم قسە سەیر و سەمەرانە!.... لە کاتێکدا ئێمە براوەی شەڕ دەبین، ئەوان چۆن دەتوانن لەناومان ببەن؟

بە دەمێکی کراوە کە قسەکانی بەلامەوە سەیر بوون، سەیریم کرد. تا ئێستا هیچ کات بیرم لەوە نەکردووەتەوە. ئیتر مێشکم کاری نەدەکرد. سەرم وەرگێڕا و دوای بێدەنگییەکی کوورت تەنیا ئەمەم وت:

– ئەمە فەرمانە و بەس.

– بەڵام تۆ دەتتوانی داوای کارێکی دیکە بکەی.

بە توندی وتم: – مەگەر نەمکرد؟ من کە داوام کرد بمنێرنە بەرەی شەڕ، مەگەر لەبیرت نییە؟ رایشس فورر قبووڵی نەکرد ئیتر!

بە دەنگێك کە تەنیا رق و کینەی لێدەباری وتی: – نەدەبوایە بچیتە ژێر باری ئەم کردەوەیە قێزەونە!

بەسەریدا قیژاندم: "ئێلزی!" وابزانم بۆ خوولەکێك هیچ وشەیەکم نەدۆزییەوە. بە دەنگێك کە لە قووڕگمدا دەشکایەوە وتم: – ئاخر.... ئاخر... ئێلزی! ئەم قسەیەی کە تۆ دەیکەی..... دوور، دوور لە شەڕافەتە، دژی شەڕافەتە.

– ئەم کارەی کە تۆ دەیکەی چیی؟

– ئاخر، سەرباز و سەرپێچی لە فەرمان و ئەمرەکان؟ ..... تازە ئەمکارە چی دەگۆڕی؟ پلەیان لیٚ دەستاندم، ئەشکەنجەیان دەکردم و تیربارانیان دەکردم.... ئەوکات تۆ چیت بەسەر دەهات؟ منداڵەکان چیان بەسەر دەهات؟

ئێلزی وتی: – ئاخ هەموو! هەموو! هەموو!

قسەکەیم بڕی و وتم: – لەگەڵ ئەمەشدا ئەمکارە هیچ کەڵکێکی نەبوو، منیش قبووڵم نەکردبا، کەسێکی دیکە دەیکرد و دیسانیش هەر ئەمەی کە هەیە دووبارە دەبۆوە!

چـاوی بریقایــەوە و وتــی: – بــەڵێ، بــەڵام لەمحاڵــەدا تــۆ ئــەمکارەت نەکردبوو!

بە سەرلێشێواوی سەیریم کرد و وتم: – ئاخر، ئێلزی...

بەڵام ئیتر بیر و هۆشم توانای هیچی نەمابوو.

ئەوەندە کە رێك و شەق و رەق وەستابووم هەستم کرد ماسوولکەکانم ژان دەکەن. رێك سەیری رووبەڕووی خۆم دەکرد، بێ ئەوەی سەیری ئێلزی بکەم، بێ ئەوەی ببینم، بێ ئەوەی هیچ شتێ، هیچ شوێنێ ببینم.

بە زەحمەت وتم: – ئەمە فەرمانە و بەس.

ئێلزی زەردەیەکی هاتێ و وتی: – ئەمە فەرمانە و بەس!

لەناکاو رووخساری لەناو دەستەکانیدا شاردەوە.

دوای ماوەیەك چوومەپێش و شانەکانیم گرت. بە قێزەوە سەیری کردم. بە هەموو هێزەوە پاڵی پێوەنام و بە دەنگێك لە رەنج و ئازاری رووحی و دەروونی لێدەباری، قیژاندی: – دەستت لە من مەدە!

پێیـەکانم لـە ژێـر جەسـتەم دەسـتیان کـرد بـە لـەرزین. قیژانـدم: – ئـەم حەقـەت نییـە ئـاوا لەگـەڵ مـن هەڵسووکەوت بکـەی! مـن لـەم ئۆردوگایـە هەرچی کـە دەیکـەم ئـەمر و فەرمانـە. لـەوێ مـن لـە هـیچ شـتێك بەرپرسـیار نیم.

– خۆ بەڕێوەبەری کارەمان تۆی!

بەوپـەری بـێ هیـوایی سـەیریم کـرد. وتم: – هـیچ لـە قسەکانت ناگـەم ئێلـزی. ئـاخر مـن لـەوێ هیـچکارەم. لـەناو سوپادا، کاتێـك سـەرکردەیەك فەرمانێك دەردەکات، بۆخی تێیدا بەرپرسیارە. ئەویش تـەنیا بۆخۆی بە تـەنیا. ئەگـەر فەرمانەکـە خـراپ بێـت، ئـەوا ئـەوەی تـەمبێ دەکرێـت فەرماندەکەیە، نەوەکوو ئەو کەسەی بەڕێوەی دەبات.

بەهێوری وتی: – کەواتە ئەم هۆیەی دەبێتە هۆکاری بەڕێوەبردنی ئەمەیە. یانی ئەگەر کارەکە خراپ بێت، ئەوەی سزا دەدرێت ئەتۆ نی!

ئیتر بە قیژە وەڵامیم دایەوە: – بەڵام من هیچکات ئاوا بیرم لێ نەکردووەتەوە. مەسەلەکە ئەمەیە کە من ناتوانم سەرپێچی لە ئەمر و فەرمانی بەرپرسانم بکەم. ئاخر بۆچی تێناگەی؟ من ئاوا دروست کراوم کە هیچکات توانای سەرپێچیم نییە!

بە هێورییەکی مەترسیدار وتی: – کەواتە ئەگەر فەرمانیان پێ دەدای فرانتسەی بچکۆڵانەکەت تیرباران بکەی، دەتکرد!

بە سەرلێشێواوی سەیریم کرد.

وتم: – بەڵام ئاخر... ئەمە شێتایەتییە!... ئەگەری ئەوە نییە فەرمانێکی ئاوام پێبدەن.

بە پێکەنینێکی وەحشیانە وتی: – بۆچی نا؟ مەگەر ئەمریان پێنەکردووی منداڵە وردیلانەکانی جوولەکەکان بکووژی؟ چی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەمری کوشتنی منداڵی خۆت پێنەدەن؟ چی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەمری کوشتنی فرانتسەت پێ نەدەن؟

– ئاخر یانی چی؟ شتی وا نییە رایشس فورر ئەمرێکی ئاوام پێبکات. شتێکی ئاوا مەحاڵە! ئەمە....

دەمویست بڵێم ئەمە "غەیری مەحاڵە!" بەڵام وشەکان لەناو ئەوکمدا مانەوە: وەبیرم هاتەوە کە رایشس فورر دابووی خوشکەزای خۆیان تیرباران کردبوو!

چاوەکانم داخست، کار لە کار ترازابوو.

ئێلـزی زۆر بـە شـەرمەزاری سـەیری کـردم: – کەواتـە متمانـەت نییـە! دەبینی؟ متمانـەت نییە... کەواتە ئەگەر رایشس فورر ئەمری کووشتنی فرانتسوت پێ بکات، دەیکووژی. مەگەر نا؟

نیوەی ددانەکانی لەژێر لێوی بەدەر کەوت. وام هەست کرد ئێلزی لەناو دەچێت، لەمکاتەدا شتێکی ئاژەڵی و ترسناکم لە چاوەکانیدا بینی....ئاخ، ئێلزی ئاوا میهرەبان، ئێلزی ئاوا لەسەرەخۆ....

لەناو چووە، تێکقوورماوە، واپێدەچوو کە هەزاران رق و کینەی بەنسبەت من لە دڵ دایە.

بـە تـوورەیی و کینەیـەکی زۆرەوە دووبـارەی کـردەوە: – دەتکـرد! ئەمکارەت دەکرد!

ئیتر نەمزانی چی هاتەپێش. سوێندم خوارد کە دەمویست بڵێم "هەڵبەتە کە نا!".... سوێندم دەخوارد کە بێ هیچ شك و دوودڵییەك دەمویست ئەمـە بڵـێم، بـەڵام وشـەکان لـە ئەوکمـدا رێکنـەدەخران و تـەنیا وتم:– نەمدەکرد!

ئێلزی چاوی لەسەر چاوم هەڵنەدەگرت. ئیتر توانای ئەوەم نەبوو هیچ شـتێك بڵـێم، بـەڵام نائومێدانـە حـەزم دەکـرد سـەرلەنوێ بمتوانیبـا قسە بکەمەوە. حاڵ و بارودۆخی خۆم روون بکەمەوە. شی بکەمـەوە...... بەڵام زمانم بە مەڵاشومەوە وەنووسابوو.

ئێلـزی گەڕایـەوە دەرگـای کـردەوە و چـووە دەرەوە و دەنگـی پێیـەکانیم بیست کە بە راکردن قادرمەکانی دەبڕی.

دوای ماوەیـەکی کـوورت تەلەفۆنەکـەم کێـشایە پـێش خـۆم و ژمـارەی ئۆردوگام گرت. داوای ئۆتۆمبێلەکەم کرد و چوومە دەرەوە، پێیەکانم شلْ و

پەککەوتە بوون. تا گەیشتنی ئوتۆمبێلّ کاتی ئەوەم هەبوو لە ژوورەکەمدا بێم و بچم.

هێشتا چەند خولەکێك لە هاتنم بۆ ئیدارە تێنەپەڕیبوو کە زەنگی تەلەفۆن لێدرا.

تەلەفۆنەکەم وەڵام دایەوە. دەنگێکی سارد لەملاوە وتی:

- **هێرئۆبێرشتورم بان فوررا**

- یا؟

- **پیك لە کرێمای۲** قسە دەکات گەورەم: جوولەکەکانی شەمەندەفەری ۲٦ شۆڕشیان کردووە.

- چی؟

- جوولەکەکانی شەمەندەفەری ۲٦ شۆڕشیان کردووە. خۆیان هاویشتە سەر ئەو **شارفوررریانەی** کە ئاگایان لە دانانی جلکیان بوو. چەکەکانیان لێ سەندوون. وایەری کارەباشیان پچڕاندووە. نیگابانەکانی ناوەوە وەبەر گوللەیان داون، بەڵام جوولەکەکانیش تەقەیان کردووەتەوە.

- دوایی؟

- زۆر سەختە بتوانین بەسەریاندا زالّ بین، گەورەم. لە ژووری جلك دانان پەنایان گرتووە و تا چەکمەیەك دەبینن تەقەی لێدەکەن.

- زۆر باشە پیك، ئێستا بۆخۆم دێم.

تەلەفۆنەکەم داخست، بە خێرایی لە ژووری ئیدارە چوومە دەرەوە و خۆم هاویشتە ناو ئوتۆمبێلّ.

- **کرێمای۲**! (بۆ پێشەوە خوار بوومەوە و وتم): - **خێراتر، دیتس.**

**دیتس** سەری داخست و ئوتۆمبێلّ بەخێرایی بەڕێکەوت، تووشی سەرسووڕمان ببووم: تا ئەو کاتە هیچکات تووشی شۆڕش نەببووم.

قیژەی وەستانی تایەکانی ئۆتۆمبێلێ وەخۆی هێنامەوە.

- چەند لە شارفووڕەکان چەك کراون.
- پێنج کەس.
- چەکەکانیان چی بوو؟
- موسەلسەلی سووك.
- جوولەکەکان زۆریان تەقە کردووە؟
- بەڵێ. بەڵام ئێشتاش دەبێ فیشکەیان مابێ. هەر ئەوەندە توانیم دەرگایان لەسەر دابخەم. تا ئێستا دوو کوژراومان هەیە و چوار بریندار. هەڵبەت ئەم پێنج شارفوورانە حسێب ناکەم. بێشك ئەوان....

قسەکەیم بڕی: - چۆن بیر دەکەنەوە؟

بێدەنگییەك روویدا و پیك وتی: - بە درێژکردنەوەی رووداوەکە دەتوانین بە چۆکیان دابێنین.

بە دەنگێکی وشك وتم: - هەر قسەشی لێمەکە. ناتوانین کرێما بۆ کاتێکی زۆر بێکار بێڵینەوە. دەبێ کارەکان بەردەوام بن.

سەیری ریزی ئێس. ئێس.ەکانم کرد کە بینای دانانی جلکیان دەورە دابوو.

- سەگەکان چی؟
- هەوڵم دا.... بەڵام جوولەکەکان وایەری کارەبایان بڕیوە... ژوورەکە وەکوو قەبر تاریکە و سەگەکان پێ نانێنە ناوی.

فکرێکم کردەوە و وتم: - بنێرن و ئینارەیەك (رووناکی بەهێز) بێنن.

پیك فەرمانێکی دا و دوو ئێس. ئێس. بەڕاکردن رۆیشتن.

وتم: - کۆماندۆی هێرشبەر حەوت کەسە. دوو کەس لەناکاو دەرگا دەکەنەوە و لەپشت سەری خۆیان دەیبەستن. هیچ مەترسییەك بۆ ئەوان

نییـە. کەسـی ناوەڕاسـت ئینارەکـە رادەگـرێ. لـە هـەردوو لای ئـەو دوو چەکداری نوخبە جوولەکەکان وەبەر گوللە دەدەن. لای چەپی دوو ئێس. ئێس.ی بە توانا لە تەقەکردن بە حەزی خۆیـان تەقە دەکەن، ئامانج لـەناو بردنـی جوولەکـەکانی چـەکدارە و هـەروەها رێگەنـەدان لەهەڵگرتنـەوی چەکەکان لەلایەن جوولەکەکانە. هـەر ئێستا کۆمانـدۆیـەکی دیکـە دیـاری بکەن کە جێگەی کۆماندۆی یەکەم بگرێتەوە.

بێدەنگییەك رووی دا و پیك بە دەنگێکی سارد وتـی: – ئەو کەسـەی کـە دەبێ ئینارەکە بگرێ، خوێنی بە ئەستۆی منەوە نییە.

وتم: – سەربازەکانت هەڵبژێرە.

– دوو ئێس. ئێس. بەڕاکردن ئینارەیان هێنا. پیك خۆی لە کارەبای دا و حەڵقەی وایەری کردەوە.

وتم: – وایەرەکـە دەبـێ زۆر درێـژ بێـت. ئەگـەر هێرشـەکەمان وەڵامـی دایەوە، دەبێ بتوانین بچینە ناو بیناکە.

پیك کارەکانی بەڕێوەبرد. دوو کەس هەر لە ئێستاوە لەپشت دەرگا بـوون و پێنجـی دیکـەش لەسـەر قادرمـەی یەکـەم بـە ئامـادەیی لەسـەر سـك راکشابوون. ئەوەی ناوەوە، شارفورریك ئینارەکەی بە سینگییەوە نابوو و ئـەم پێنجـەی دیکـە بـێ جووڵـە بـوون، بـە رووخسـای پـڕ لـە بەرزیـەوە کـە هەوڵ و تێکۆشانیان لێ دەباری.

پیك فەرمانی دا. ئەوان بەیکەوە و بەخێرا لـە قادرمـەکان چوونـە خـوارەوە و وایەری کارەباش بەدوایانەوە وەکوو مار لەسەر عـەرد دەکێشرا. لـە یـەك مـەترونیوی دەرگـا وەسـتان. پێـنج ئـێس. ئـێس.ی دیکـە بـێ بـەدرەنگی کـەوتن لەسـەر قادرمـەی یەکـەم جێگـەی ئـەوانیان گرتـەوە و بێدەنگییـەکی قوورس ئەوێی داگرت.

پیک لەسەر قادرمەکان خوار بۆوە، رووی لە شارفوررەکە کرد کە ئینارەکەی بەسینگیەوەیە و دەستی بەرز کرد.

وتم: – پیک، یەك خوولەك بوەستە!

گەڕایەوە بۆلای من و دەستی شل بۆوە و کەوتە خوارێ. چوومە لای قادرمە، کۆماندۆکانی ژمارەی دوو خۆیان کێشایە پشتەوە و من چوومە خوارەوە:

– بیدەن بە من.

شارفورر تووشی سەرسوڕمان بوو و سەیری منی کرد. سەر و رووخساری تەڕی عارەقە بوو. دوای ماوەیەکی کوورت رێك بەرامبەرم وەستا و وتی:

– یاوول هێر ئۆبێر شتورم بان فورر!

ئینارەکەی پێدام.

وتم: – ئێوە دەتوانن بڕۆن.

شارفورر سەیرێکی کردم، پانییەکانی لێکدا، بۆ دوایی گەڕایەوە، لە قادرمەکان چووە سەرەوە.

لە چاوەڕوانی گەیشتنی بۆ سەرووی قادرمەکان، یەك بە یەك ئێس. ئێس.ەکانم سەیر کرد.

– هەر کە وتم "یا" دەرگاکان بکەنەوە، هەموومان دوو هەنگاو بەیەکەوە دەچینە پێشەوە، ئێوە راکشێنە سەر سینگ و دەست بە تەقە کردن بکەن. ئیتر نابێ ئەمانیان بدەن.

دەنگێك وتی: – هێر ئۆبێرشتورم بان فورر!

گەڕامەوە و سەرم بەرز کردەوە. پیك بوو کە لە سەرەوە سەیری دەکرد. زۆر دڵگیر ببوو. وتی:

– **هێر ئۆبێرشتورم بان فورر... ئاخر ئەمە ناكرێ! ئەمە كە....**

بە توندی سەیریم كرد، دەنگی بڕا. گەڕامەوە شوێنی خۆم و پێش خۆم سەیر كرد و وتم: – **یا!**

دەرگا كرایەوە و لەپشت سەری ئێمە داخرا. ئینارەكەم بە سینگمەوە ڕێككوشی، ئێس. ئێس.ەكان خۆیان هاویشتە سەر عەرد و لەسەر سینگ راكشان و گوللە بوو كە لەهەر دوولای من بەسەر جوولەكەكاندا دەباری. بە هێوری ئینارەكەم لە راست بۆ چەپ و لە چەپ بۆ لای راست دەسووڕاند و دوو ئێس. ئێس.ە نوخبەكان دوو گوللەیان هاویشت. بەسەبری ئینارەكەم بۆلای چەپ سووڕاند، گوللەكان پێكەوتبوون. من لەناو دڵی خۆمدا وتم: "ئێستایە!" ئینارەكەم سووڕاندەوە بۆلای راست و لەژێر تەقەی بێ پسانەوەی موسەلسەلەكان دەنگی دوو تەقەی دیكەم گوێ لێبوو.

هاوارم كرد بەرەو پێشەوە. چووینە ناو بیناكە و دوای چەند هەنگاو ئەمری وەستانی تەقەم دا. جوولەكە نیوە رووتەكان لە گۆشەیەكی ژوورەكە لەخوێندا شەلاڵ ببوون. تێكەڵ و پێكەڵ بوون و رووناكی ئینارە بە چاوە زەقەكانیان كەوتبوو.

سەر و گوێلاكی پیك لای من پەیدا بوو. لەناكاو هەستم بە ماندوویيەكی زۆر كرد. ئینارەكەم دایە دەست ئێس. ئێس.ێك و رووم لە پیك كرد:

– بەرپرسیایەتی بە دەستەوە بگرە.

– "**زۆ بێفهی**" (لە فەرمانی جەنابتان دام)، **ئۆبێر شتورم بان فورر!** (وتی): – دەبێ غازیان لەخوارد بدرێت.

– كێشەتان بۆ دروست دەكەن. یەك یەك لەدەرگای بچووك بیانهێننە دەرێ و بیانبەنە تەلار و تاك تاك تیربارانیان بكەن.

لەو قادرمانەی کە دەچووە ناو حەوشە، بە لەسەرەخۆیی سەرکەوتم. هەر کە ئێس. ئێس.ەکان منیان بینی، بێدەنگییەکی زۆر ناخۆش ئەوانی گرتەوە و هەموویان ڕێك وەستان. بە ئیشارە پێم وتن ئازاد بن. بە حاڵەتی ئاسایی بوون، بەڵام بێدەنگ و بێ جووڵە و چاویان لەمن هەڵنەدەگرت. واپێدەچوو کردەوەی من وایکردووە بە حەزەوە منیان خۆش بوێت. سواری ئوتۆمبێل بووم و بە تووڕەییەوە دەرگام پێوەدا. حەق بە پیك بوو: نەدەبوایە بەهیچ شێوەیەك دەست لە کارێکی ئاوا بدەم، بەڵام بۆ بەڕێوەبردنی کار پێویست بوو و دەبوایە بۆ سەلماندنم ئەمکارە بکەم. خیانەتم بە ئەرکی خۆم کردبوو.

بۆ ژووری ئیداریم گەڕامەوە و هەوڵم دا کاری ڕۆژانەم بکەم.

هزرم بەتاڵ بوو و هەرچی دەمکرد نەمدەتوانی تەرکیز بکەم. ئاگر بە ئاگر جگەرەم دەکێشا.

کاتژمێر حەوت و نیو بوو کە بۆ ماڵ گەڕامەوە.

ئێلزی و فراو موللر نانی شەویان بە منداڵەکان دەدا. منداڵەکانم ناز کرد و وتم: - سلاو ئێلزی.

نەختێك بێدەنگ بوو و بەشێوەیەکی ئاسایی وتی: - سلاو ڕۆدۆلف.

ماوەیەك لە بێدەنگی گوێم لە قسەی منداڵەکان گرت دوایی هەستام و بۆ ژووری ئیش چووم. دوای ماوەیەکی کەم لەدەرگای ژوورەکەم درا و دەنگی ئێلزی هات کە: - خواردنی شەو، ڕۆدۆلف!

گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانی بوو کە دوور دەکەوتەوە.

هاتمەدەرێ و چوومە ژووری چێشتخانە، دانیشتم و ئێلزی و فراو موللریش دانیشتن. خۆم زۆر بە ماندوویی هاتەبەرچاو. وەکوو هەمیشە پێکەکانم پڕ کرد و ئێلزی وتی: - سوپاست دەکەم، ڕۆدۆلف.

**فراو موللر** خەریکی قسەکردن لەبارەی منداڵەکان بوو و **ئێلزی**ش باسی تواناکانی منداڵەکانی دەکرد.

دوای ماوەیەکی کوورت **ئێلزی** وتی: – مەگەر نا، **رۆدۆلف**؟

سەرم بڵند کرد. گوێم لە قسەکانی نەگرتبوو، هەر ئەمجۆرە لەخۆمەوە وتم" "**یا**، **یا**." و سەیری ئەوم کرد: نەدەکرا لە چاوەکانی هیچ شتێك بزانی و بەشێوەی ئاسایی رووی وەرگێڕا.

**فراو موللر** وتی: – ئەگەر ئیزن بفەرموون، **هێرکوماندانت**، بە بڕوای من، "**کارل**"یش منداڵێکی بەهۆشە. بەڵام ئەوەندەی کە حەزی لە ئەشیاکانە، ئەوا حەزی لە مرۆڤەکان نییە.

بە سەر وتم بەڵێ و ئیتر گوێم لە قسەکانیان نەگرت.

دوای خواردنی نانی شەو هەستام و ئیزنم لە **ئێلزی** و خاتوو **موللر** وەرگرت و چوومەوە ناو ژوورەکەم. کتێبێکەم کە باسی لە پەروەردەکردنی ئسب دەکرد، لەسەر مێزەکەم کەوتبوو. چەند لاپەڕەیەکم سەیر کرد و دەستم بە خوێندنەوەی کرد. کەمێك دواتر، دامنایە سەر شوێنی خۆی، چەکمەکانم دەرهێنا و دەستم بە رێپێوان کرد.

کاتژمێر دە دەنگی **فراو موللر**م گوێ لێبوو کە شەوخۆشی بە **ئێلزی** وت و چووە سەرەوە و دوای چەند خولەك گوێم لە پێی **ئێلزی** بوو کە لە قادرمەکان دەچووە سەرەوە. گوێم لە تەقەی وشکی کلیلی کارەبا بوو و سەرتاسەری خانووەکە چووە ناو بێدەنگییەکی تەواو.

جگەرەیەکم داگیرساند و چوار تاق پەنجەرەم کردەوە

مانگەشەو نەبوو، بەڵام شەوەکە رووناك بوو. بۆ ماوەیەك شانێکم لەسەر لێوی پەنجەرە دادا و دوایی بڕیارم دا بچم و قسە لەگەڵ **ئێلزی** بکەم:

جگەرەکـەم کووژانـدەوە و رۆیـشتمە نـاو هـاڵ و بـەئارامی لـە قادرمـەکان چوومە سەرەوە.

دەسـتم بـردە دەسـتگیرەی ژوورەکـەی، پـاڵم پێوەنـا، بـەڵام لـە ژوورەوە داخرابوو.

لە دەرگام دا و دوای چەند چرکەیەك دوو لێدانی وشکی دیکە، وەڵامێك نەبوو.

سەرم بردە نزیك تەختەی دەرگا و گوێم تیژ کرد، ژوورەکە لە ژوورێك کە مەیتی تێدابێت، بێدەنگتر بوو.



## ١٩٤٥

کاری کرێماکانی ٣ و ٤یش لە ڕۆژی دیاریکراودا کۆتایی پێهات و لە ژانویەی ١٩٤٢ هەتا کۆتایی هەمان ساڵ هەر چوار کرێما یەکسەرە بەڕێکەوتن و دەست بەکار بوون.

لە دیسەمبەری ١٩٤٣ بووم بە چاودێری ئۆردوگا و ئاوش ویتسم جێهێشت و بنەماڵەم بۆ بەرلین برد، بەڵام خۆم بۆ ئاوش ویتس گەڕامەوە و بەشێك لەهاوینی ١٩٤٤ لەوێ مامەوە هەتا یارمەتی جێگرەکەم بکەم بۆ چارەسەری کێشەیەك کە بۆ بەڕێوەبردنی "چالاکی تایبەت" لەبارەی چوارسەد هەزار جوولەکەی هەنگاریا پێش هاتبوو.

دوایین سەردانم بە ئەرکی چاودێر، لە مارسی ١٩٤٥دا بوو: سەردانی ئۆردوگاکانی نوین گامن، بێرگن بێلسن، بوخن والد، داخاو و فلوسن بۆرگم کرد و فەرمانی رایشس فوررم پێگەیاندن کە ئیتر جوولەکەکان تیرباران نەکەن و بۆ پێشگرتن لە مردنیان هەموو هەموو هەوڵیکی خۆیان وەگەڕ بخەن.

لەنێوان ئەم هەموو ئۆردوگایانە، ئۆردوگای بێرگن بێلسن بەتایبەت لە بارودۆخێکی مەترسیدار بوو: لەوێ نە ئاو بە هەمووان دەگەیشت و نە خۆراك، ئاودەستەکان پڕ ببوون و لێیان دەڕژا و لە جاددەکانی ئۆردوگادا،

زیاتر لە دە هەزار مەیتی بۆگەن لەژێر ئاسمانی خوا مابوونەوە. لەلایەکی دیکە، خۆراکی زیندانییەکان جێبەجێ نەدەکرا، چونکە ئیدارەی قووتەمەنی نەیدەتوانی خۆراک دابین بکات.

ئەمرم بە فەرماندەی ئۆردوگا کرد کە نەختێك ئەم بارودۆخە رێك بخاتەوە. فێرم کرد کە چۆن لە چاڵ و قووڵکەکاندا مەیتەکان بسووتێنێ و دوای ماوەیەك بارودۆخی تەندروستی ئەوێش تا رادەیەك چارەسەر کرا. بەڵام خۆراك وەکوو پێشووتر زۆر کەم بوو و زیندانییەکان وەکوو مێشی سەرمابردوو دەکەوتن و دەمردن.

لە کۆتایی ئاڤریلی ١٩٤٥ بارودۆخ بە جێگەیەك گەیشت ئەمر کرا کە ئەو ئامتس گروپەی کە منیش ئەندامی بووم لە کەی ئێڵی "راونێسورك" بگواسترێتەوە. ئوتۆمبێلەکانی سەرکردەکانی ئێس. ئێس.ەکان و بنەماڵەکانیان و هەروەها هەموو فایل و پەروەندەکان و ئەشیاکان، بەشێوەیەکی کاروانی بەڕێکەوتن. کاروانێك کە بەردەوام دەبوایە بوەستێ سەبارەت بە رێگرتنی خەڵکی ئاسایی کە لەدەست بۆمباران رایاندەکرد.

لە راونێسبورك بۆ رویسبورگ چووین و تەنیا جێگەیەك کە بتوانم جێگەی ئەم هەموو کەسەی تێدا بکەمەوە، تەویلەیەکی جێگەی حەوانەوەی ئەسبەکان بوو. بەمحاڵەشەوە رۆژی دواتر توانیم قوتابخانەیەك بدۆزمەوە بۆ حەوانەوەی منداڵ و ژنەکان.

لەوە بە دوا، گواستنەوە و کۆچڕەوی وەکوو کامووسێکی راستەقینەی لێهاتبوو: رووسەکان لەم لایە دەهاتنە پێش و ئانلگوساکسونەکانیش لە لایەکی دیکەوە و ئێمەش دەبوایە بەرامبەر بە پێشڕەوی ئەوان، پاشەکشە بکەین.

لە **فلیوسبۆرگ**، لەناکاو وەبیرم هاتەوە کە مامۆستای پێشووی منداڵەکان لە **ئاوش ویتس**، خاتوو "**موللر**" لە **ئاپێنرادە** دادەنیشێت. خێرا **ئێلزی** و منداڵەکانم بردە لای ئەو و **فراو موللر** لەراستیدا چاکەی لە حەقی ئێمەدا کرد و لە خانووی خۆیدا جێگەی بۆ کردنەوە.

من بۆخۆم بە تەنیایی لەگەڵ **دیتس** هەتا **مۆرویك** لە رۆیشتن بەردەوام بووم و لەوێ لەگەڵ سەرکردە ناودارەکانی **ئامتس گروپە** بۆ دوایین جار چووینە لای **هیملێر** کە رایگەیاند ئیتر هیچ ئەمرێك و فەرمانێکی بۆ ئێمە پێ نییە.

کەمێك دواتر، هەویەیەکی خزمەتی هێزی دەریایی، ناوێکی ساختە و دەستێك جلیشیان پێدام. ئەمرم پێکرا کە جلکەکان لەبەر بکەم، بەلام ئۆنیفۆرمی "**ئێس. ئێس**"م لای خۆم هێشتەوە.

لە پێنجەمی مانگی مەی ئەمرم پێکرا بۆ **رانتۆم** بچم. رۆژی حەوتەم گەیشتم و چەند کاتژمێر دواتر ئاگادار کرامەوە کە مارشاڵ **کێیتل** لە **رێنس** تەسلیمی بێ مەرج و ئەگەری سوپای ئەڵمانیای واژوو کردووە.

لە **رانتۆم** منیان بۆ **برۆنسبۆتێل** بەرێکرد. چەند هەفتەیەك لەوێ مامەوە و چونکە لەسەر هەویەکەم نووسرابوو بەر لە خزمەتی سەربازیم جووتیار بوومە، لە پێنجەمی ژوئیە منیان بۆ کێڵگەیەك لە "**گۆترۆپێل**" نارد، لای کەسێك بەناوی **گێئۆرگ پوتزلر**.

هەشت مانگی تەواو لەم کێڵگەیەدا کارم کرد.

گێڵگەیەکی باش بوو و چەند ئەسبیشی هەبوو کە باش و سەرحاڵ بوون و کاتێك کە **گێئۆرگ** زانی سەردەمێك لە کێڵگەیەك کارم کردووە، ئەسبەکانی بەدەست من سپارد. بە دڵ و بە گیان بەم ئەرکە وەنووسام و **گێئۆرگ** کە منی لە ماڵی خۆیدا پەنا دابوو، هەمیشە بە پێکەنینەوە

دەیوت کە ئەگەر شەوانەش لەناو ئاخوور و لای ئەسپەکان ناخەوم، تەنیا بۆ ئەوەیە کە دەترسێم بێ رێزیان پێبکەم و ئازاریان بدەم.

**گێئۆرگ** پیاوێکی کوورتە بالا بوو، بەهێز و ماسوولکەیی، بە چەنەگەی درێژی نووک تیژی چاوشین و هەر لە سەرەتاوە زانیم کە لە "ئێس. ئای" پلەیەکی بەرچاوی هەبووە. منیش نهێنی کار و پیشەی خۆمم لای ئەو باس کرد و لەو کاتەوە هەڵسوکەوتێکی تەواو هاورێیانەی لەگەڵ من پەیدا کرد و کاتێك کە ژنەکەی لەوێ نەدەبوو، بە تەواوی دەردی دڵمان لەگەڵ یەکتر دەکرد.

رۆژێك بەیانی زوو بە تەنیا لەگەڵ ئەسپەکان لە لەوەرگە بووم کە لەناکاو سەر و گوێلاکی پەیدا بوو، لە تەنیشت من دانیشت، چاوی لە چاوی من بڕی و بە رووخسارێکی تەواو جددی وتی:

- **هیملێریان** گرت.

بە تەتەپەتەوە وتم: - گرتیان؟ **گێئۆرگ** وتی: - نا بابا، گوێ بگرە هەتا بۆت باس بکەم: کڵاوی لەسەر ناون! تا ویستوویانە بیگرن و بیخەنە ژێر ئەشکەنجە و لێپرسینەوە، خۆی کووشتووە.

سەیرم کرد و نەمتوانی هیچ بڵێم.

**گێئۆرگ** ناوچاوانی تێکنا و خەریکی دەست رێکخشاندن بوو:

- گوێ بگرە هەتا بۆت باس بکەم..... زۆر زیرەك بوو ئەم **هیملێرە**! لەناو دەمیدا حەبێکی شووشەیی سیانووری شاردبۆوە. دەیجووێت و تەواو! (بە رەزامەندییەوە هاواری کرد): - ئاخ خوایە! عەجەب فێڵێکی لێکردن!

من دووبارەم کردەوە: - کەواتە.... خۆی... کووشت!

**گێئۆرگ** وتی: – هیچ دەزانی چیتە؟ بۆچی ئاوا دەکەی. ئەوە پێیدەڵێن زیرەکی و کڵاو لەسەرنان، شاکارە شاکار!.... ناکا بڵێی کارەکەی هەڵە بووە؟

بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، سەیریم کرد.

**گێئۆرگ** چەنەگەی خوراند و بە ناڕەحەتییەوە سەیری کردم.

– هیچ ناتوانم سەر لە بیروبۆچوونی تۆ دەربێنم. ئەوەیکە سەردارێکی گەورە کاتێك دەستبەسەر دەبێ خۆی بکوژێ کارێکی زۆر شایستەیە ئیتر. نیشت وار؟ لێرە، هەمیشە، هەموو خەڵك ئاوا دەڵێن. لەبیرتە "**پاولوس**"[39] کە دوای شەڕی **ستالینگراد** خۆی نەکووشت و لێگەڕا بە زیندوویی بەدەستیان بکەوێ، چەندە تف و نەعلەت کرا؟

دووبارە دوای ماوەیەك تووشی دڵەڕاوکی و دوودڵی هات و وتی: – ئێ، نەتوت چیتە؟ لانیکەم شتێ بڵێ. هەر دەڵێی وشك هەڵاتووی... شتێك بڵێ: خۆ ئیشاڵڵا ناڵێی خۆ هەڵەی کردووە. ها؟

تووڕەیی و ژان پێش چاومی گرتبوو. هەستم کرد **گێئۆرگ** قۆڵەکانی گرتووم و بە توندی رامدەوەشێنێ. بە دەنگێکی پڕ لە بێزاری وتم: – خیانەتی پێکردم!

– یانی رایشس فورر.!

چاوێکی پڕ لە سەرکۆنەکردنی لێکردم

بەسەریدا قیژاندم: – تۆ نازانی! تێناگەی! ئەو فەرمانە ترسناکەکانی دەردەکرد و ئێستاش ئێمەی لەبەردەم یەك دونیا تاوان بەجێ هێشتووە!

---

[39] - مارشال فریدرخ پاولوس سەرکردەی سوپای شەشەمی ئەڵمانیا لە شەڕی ستالینگراد (١٩٤٣) بوو کە دوای دەستبەسەر بوون لە رادیۆ مۆسکۆ دژ بە هیتلێر قسەی کرد. هیتلێر بەردەوام تف و نەعلەتی دەکرد کە بۆچی خۆی نەکووشتووە! ئەو ساڵی ١٩٥٣ لە ئۆردوگای ئەسیران ئازاد کرا و دوای چوار ساڵ مرد.

گێئۆرگ وتی: - رایشس فورر؟ تۆ بەم شێوەیە دەتهەوێ لەبارەی رایشس فورر قسە بکەی؟

- لەجیاتی ئەوەی لە بەرامبەریاندا راوەستی.... لەجیاتی ئەوەی بڵێت "تەنیا من بەرپرسیارم" تەشریف بێنن تەماشا بکەن چ کارێکی کردووە! های! چەندە ئاسانە!.... حەبێکی سیانوور دەجووین و دەست و باڵی ژێردەستانمان دەخەینە ناو هەویر!

- بەڵام، راستی راستی، تۆ کە ناتهەوێ بڵێی.....

دەستم بە قاقای پێکەنین کرد: - "ماینە ئێهرە هایست ترویە" (شەرەفی من وەفاداری منە) یا، یا. بەڵام تەنیا بۆ ئێمە، نە بۆ ئەو، زیندان و نەنگ و تەنابی دار...

گێئۆرگ بە سەرلێشێواوی وتی: - کەواتە ئەگەر تۆ بگرن..... لە دارت دەدەن؟

- چۆن بیر دەکەیەوە! بۆ من شتێکی ئاساییە، گوێت لێیە؟ بۆ من شتێکی ئاساییە! بۆ من مردن، لە هیچیش پووچترە.... ئەو شتەی کە من شێت دەکات (قۆڵی گێئۆرگم گرت) یانی ئیتر درك بەم شتە ناکەی؟ ئەو وەکوو ترسنۆکەکان تێیتەقاندووە!... تێدەگەی؟ .... ئەو پیاوەی کە من وەکوو باوکم رێزم بۆی دادەنا. ترسنۆك بوو...

گێئۆرگ بە دوودڵی وتی: - باش، ئەرێ، تێتەقاندووە...... دوایی چی؟ مەگەر زیندوومانەوەی ئەو دەیتوانی تۆ رزگار بکات.

بە رق و کینەوە راموەشاند و بەسەریدا قیژاندم: - باس لە ژیان دەکەی کە چی؟ ئەوەیکە لەدارم بدەن یان نا بۆ من ئاساییە! ئەوپەڕی منیش لەگەڵ ئەو دەمردم! لەگەڵ سەرکردەکەم!.... تەنیا ئەوەی دەوت کە من

بووم ئەمرم بە لانگ دەکرد "کە جوولەکەکان لەناو ببات!" ئەوکات هیچکەس نەبوو کە شتێکم پێ بڵێت!....

ئیتر نەمتوانی هیچیتر بڵێم. خەریك بوو لە ژان و شەرمەزای خەفە دەبووم. ئیتر نە کۆچکردن بەلامەوە گرنگ بوو، نە بەدبەختی و نە رۆژگاری رەش.

رۆژەکانی دواتر وردە وردە پرتەبۆڵەی **گێئۆرگ** بەرز بۆوە کە من "لە پێشووش کەمدوێ ترم".

لە راستیدا خەیاڵم زۆر شێوابوو، چونکە قەیرانی دوای مردنی باوکم، کە تووشی دەبووم، لەناکاو سەر و گوێلاکیان پەیدا بۆوە، هەرجارەو بە مەودایەکی کەمتر تووشی دەبوومەوە و هەرجار توندتر لە جاری پێشووتر و تەنانەت کاتێك کە هەستم دەکرد بارودۆخم زۆر باشە، دڵەڕاوکێیەکی ترسناك قوورسایی دەخستە سەر مێشکم. تەنانەت ئەوکاتانەی کە تووشی ئەم حاڵەتەش نەدەبووم، دیسانیش وشەکانی بە هەڵە وەردەگرم، تەنانەت زۆرجار بە تەتەپەتە دەکەوم، یان لەناکاو باسی شتێك دەکەم کە پەیوەندی بە دۆخەکەوە نییە. یان لەناکاو رستەیەك لەناو ئەوکمدا گرێی دەخوارد و هەرچیم دەکرد وشەیەکیشی لێ نەدەهاتەدەر. بە زیاتربوونی ئەم قەیرانە دەروونییە زیاتر تووشی سەرلێشێواوی و مەترسی دەبوومەوە. هەموو ترسم لەوە بوو بارودۆخەکەم خراپتر بێت و کەسانی دەوروبەرم لێم تێبگەن.

رۆژی چواردەهەمی مارسی ١٩٤٦ لەگەڵ **گێئۆرگ** و ژنەکەی خەریکی خواردنی نانی بەیانی بووین کە دەنگی هاتنە ژووری ئوتۆمبێلێکم بیست کە هاتە ناو کێڵگە. **گێئۆرگ** سەری بەرز کرد و وتی: — برۆ بزانە کێیە.

هەستامە سەرپێ و بەخێرا بینایەکەم دەور لێدا و ڕێك سینگ بە سینگی دوو سەربازی ئەمریکایی بوومەوە: یەکیان وردیلە و ئەویتریان بۆر و چاویلکە لەچاو.

وردیلەکە پێکەنی و بە زمانی ئەڵمانی وتی:

- بۆ ئاوا بە پەلەن، ماین هێرا

دەمانچەیەکی بەدەستەوە بوو کە هەر دەیجووڵاند.

سەیرم کرد. دوایی چاوم لەوی تریان کرد و سەرشانیانم کە سەیر کرد، بینیم هەردووکیان ئەفسەرن.

بەرامبەریان ڕێك وەستام و ڕێزم گرتن و وتم: - چ فەرمایشتێکتان هەیە؟

بۆرە چاویلکە لەچاوەکە بە تەمبەڵی پاڵی دایە سەر پێیەکی و وێنەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و چاوێکی لێکرد و دایە دەست ئەفسەرە کورتەباڵاکە. ئەویش چاوێکی لە وێنەکە کرد و سەیری ئەفسەرە بۆرەکی کرد و وتی: - یێپ.

ئەوکات لێوەکانی بە ددانی ڕێککوشی و دەمانچەکەی ڕاوەشاند و پرسی:

- ڕۆدۆلف لانگ؟

کار تەواو بوو. سەرم جووڵاند کە "بەڵێ" و حەسانەوەیەکی سەیر سەرتاپێی داگرتم.

کورتەباڵا چاویلکەییەکە وتی: - ئێوە دەستبەسەرن!

بێدەنگییەك هاتەپێش. وتم: - دەکرێ ئەشیاکانم کۆ بکەمەوە؟

کورتەباڵاکە زەردەیەکی هاتێ. بە ئیتاڵیەکان دەچوو. وتی: - وەپێش کەوە! کە گەیشتینە دەرگای چێشتخانە یەکێکیان بەجۆرێك پاڵی پێوەنام کە بەلاداهاتم و ئەگەر خۆم بە لێوی مێزەکەوە نەگرتبایەوە، ڕێك دەکەوتمە

خوارێ. سەرم کەبەرز کردەوە ئەفسەرە چاویلکەییەکەم بینی کە دەمانچە بەدەست لەپشت **گێئۆرگ** وەستابوو. لە لوولەی دەمانچەی سەر مۆرەکانی پشتم هەستم بەوە کرد کە وردیلەکەش لەپشت من وەستاوە.

ئەفسەرە چاویلکەییەکە وتی: – **گێئۆرگ** پوترلر؟

**گێئۆرگ** وتی: – **یا!**

– دەستەکانت لەسەر مێز دابنێ، **ماین هێر!**

**گێئۆرگ** بەری هەردوو دەستی لەملا و ئەولای قاپێک دانا کەلەسەر مێزەکە بوو

– ئێوەش بەمجۆرە، خاتوون!

ژنی **گێئۆرگ** چاوێکی لەمن کرد و چاوێکیش لە هاوسەرەکەی و ئەمرەکەی زۆر بەهێوری بەڕێوەبرد.

ئەفسەرە وردیلەکە وتی: – وەپێش کەون!

لە قادرمەکان چووینە سەر و چووینە ژووری من. وردیلەکە پالی وەپەنجەرە دا و دەستی بە فیکە لێدان کرد.

جلی فەرمیی ئێس. ئێس.م لەبەرکرد. کاری جلك لەبەرکردنم کە تەواو بوو **"چەمەدانم"** (جانتام) دەست دایە و دامنایە سەر تەختەکەم و رۆیشتم لە ناو دۆلاب ژێرپۆش دەست دەمێ، کە دەرگای دۆلابم کردەوە، ئەفسەرەکە وازی لە فیکەلێدان هێنا. ژێرپۆش و جلەکانی دیکەم خستە ناو چەمەدان و رێك لەمکاتەدا بوو کە وەبیر دەمانچەکەم کەوتمەوە: مەترێك ئەولاتر، بە زامنی کراوە، لەژێر بالنجەکەم بوو.

بۆ ماوەیەکی کەم بێ جوولە وەستام و لەناکاو ماندوویییەکی بێناو هەموو جەستەمی داگرت.

ئەفسەرە وردیلەکە لەپشت سەرم وتی: – تەواو؟

دەرگــای چــەمەدانەکەم بەســت و تەقــەی وشــکی داخرانــی دەرگــای چەمەدانەکە لە بێدەنگیی ژوورەکەدا دەنگی دایەوە.

هاتینــە خــوارێ و چــووینە ژووری چێشتخانە. ژنــی گێئــۆرگ کــە جلــی فەرمی ئێس. ئێس.ی لەبەر مندا بینی بە هــەر دوو دەستی پێش دەمی گرت و لە ژێر چاوی سەیری مێردەکەی کرد.

گێئۆرگ هیچ جوولەیەکی نەکرد.

وردیلەکە وتی: – "بڕۆین!" و بە هێوری پاڵێکی بە من وەنا.

کــە لــە چێــشتخانە چــووینە دەرەوە، رووم وەرگێڕایــە لای گێئــۆرگ و ژنەکەی و وتم: – بەهیوای دیدار!

گێئۆرگیش بە دەنگێکی ئارام، بێ ئەوەی سەری وەرگێڕێ وتی: – بە هیوای دیدار!

ئەفسەرە کورتەباڵاکە پێکەنی و وتی: – ئەوەش ئیتر لەو قسانەیە ها!

ژنی گێئۆرگ لام تا کام هیچی نەوت و دەمی نەکردەوە.

ئەمریکاییــەکان منیــان بــۆ "برێدســتات" (Bredstedt) بــرد. لــەپێش نەخۆشخانەیەکی کۆن هاتینــە خــوار و لــە حەوشــەیەک تێپــەڕین کــە پــڕ لــە ســەرباز بــوو. ســەربازەکان جگــەرەیان دەکێــشا و چــەند ســەرباز پێکــەوە پیاســەیان دەکــرد. هیــچکامێکیان تەنانــەت وەکــوو ســەگیش رێزیــان لــەو ئەفسەرانە نەگرت کەمنیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

لــە نهــۆمی یەکــەم، منیــان بــردە نــاو ژوورێکــی بــچووک. تــەختێك و دوو کوورسی و مێزێك لەوێ بوو. ناوەکەشی کوورەیەك (سۆپە) لەگــەڵ ستلێك رەژوو...

ئەفسەرە کوورتەباڵاکە منی لەسەر کوورسییەك دانیشاند.

دوای ماوەیەکی کوورت سەربازێك هاتەژوور کە دوو مەتر بالاّ و بەم رادەیەش پان بوو. زۆر بە شێوەی ئاسایی سلاّوی لە دوو ئەفسەرەکە کرد. ئەفکسەرەکان کە بەناوی "جۆی" (Joe) بانگیان دەکرد، بە زمانی ئینگلیزی قسەیان لەگەلّ دەکرد. دوایی بۆلای دەرگا بەرێکەوتن. من لەجێگەی خۆم هەستام و رێك بۆیان وەستام و بەشێوەی سەربازی رێزم گرتن، بەلاّم ئەوان بیّ ئەوەی سەیریشم بکەن رۆیشتنە دەروە.

سەربازە زەبەلاحەکە بەدەست ئیشارەی پێکردم کە دانیشم. خۆیشی لەسەر لێوی تەختەکە دانیشت. بەئارامی دانیشت، بەلاّم لەژێر قوورسایی ئەودا تەختەکە وەنالّە کەوت. سەرباز دوو لینگی درێژی لێك کردەوە و پالّی وە دیوار دان. دوایی بیّ ئەوەی بۆ ساتێکی کەمیش چاو لەسەر من هەلّبگریّ شتێکی بچووکی تەختی لە گیرفانی دەرهێنا، کاغەزی دەوری لێکردەوە، هاویشتیە ناو دەمی و ئێستا مەیجوو و کەی بیجوو.

ماوەیەکی زۆری کێشا. سەرباز چاوی لەسەر من هەلّنەدەگرت. ئیتر وردە وردە سەیر کردنەکەی شێت و توورەی دەکردم. سەرم وەرگێرا و چاوم لە پەنجەرە کرد. شووشەکانی مات بوون و نەدەکرا هیچ شتێکی ئەم دیوی پەنجەرە ببینی. چاوم لە کوورەکە بڕی. رادیاتۆرێکیش لەناو ژوورەکەدا هەبوو، بەلاّم واپێدچوو کار نەکات. هەربۆیەش کوورەکەیان پێکردبوو کە ژوورەکەی وەکوو کوورە گەرم کردبوو.

کاتژمێرێکی دیکەش تێپەڕی. دوایی ئەفسەرێکی بچکۆڵە بە خێرایی با هاتە ژوور و لە پشت مێز دانیشت و هەر بەو خێراییە دەستی لە لێکۆڵینەوە و پرسیار کردن لەمن کرد.

هەر شتێکی دەمزانی بۆم باس کرد، بەبێ کەموکوڕی.

لەو کاتەوە بەدوا بەردەوام منیان لەم زیندانە بۆ ئەم زیندانە دەگواستەوە.

لە زیندان بارودۆخم خراپ نەبوو. خورد و خۆراکم باش بوو و قەیرانەکانی عەسەبیم بە تەواوی وەستابوو. بەڵام کات بە هێواشی تێدەپەڕی و منیش پەلەم هەبوو کە هەرچی زووتر کارم تەواو بکەن. (لەدار بدرێم).

سەرەتا زۆر غەمی ئێلزی و منداڵەکانم هەبوو، بەڵام کاتێک زانیم بەپێچەوانەی بیرکردنەوەم نەگیراون، ئەوا خەیاڵم ئاسوودە بوو. **ئێلزی** چەند نامەی بۆ نووسیم و منیش توانیم وەڵامی نامەکانی بدەمەوە.

جاری وابوو وەبیر ژیانی رابردوو دەکەوتمەوە. سەیر لەوە دابوو کە تەنیا قۆناغی منداڵی خۆمم بە راستەقینە دەهاتەبەرچاو، هەڵبەت لە هەموو رووداوەکانی دواییتری ژیانم بیرەوەری زۆر روون و ئاشکرام هەبوو، بەڵام ئەمانە زیاتر وەکوو بیرەوەرییەك دەچوون کە زیاتر وەکوو فیلمێك دەچوو کە پێشتر بینیومە و رووداوەکانیم لەبیرە و کاریگەرییەکانی لە هزر و

هۆشم دان. خۆم دەبینی کە لەم فیلمەدا رۆڵ دەگێڕم و قسە دەکەم، بەڵام وەکوو ئەوە دەچوو کە رووداوەکان لەژیانی مندا نەبوونە.

ناچار بووم دووبارە لە دادگای **نورمبێرگ** دان بە تاوانەکانمدا بنێمەوە. ئەوکاتە بوو کە بۆ یەکەمجار سەرکردە گەورەکانی حزبیم لەوێ و لەسەر کوورسی تاوان بینی کە پێشتر تەنیا لەناو رۆژنامەکاندا دەمدیتن.

لەناو ژووری زیندانم لە **نۆرمبێرگ** چەند دیدارم هەبوو کە گرنگترینیان سەردانی عەمیدێکی ئەمریکایی بوو. پیاوێکی بە قەڵافەتی سوور و سپی بوو و مووی سەری سپی ببوو. دەیویست ئەوە بزانێ کە چۆن لەبارەی ئەو بابەتانەی کە رۆژنامەکانی ئەمریکی سەبارەت بەمن نووسیویانە بیردەکەمەوە (بۆی تەرجومە کردمەوە)... رۆژنامەیەك لە بابەتێکیدا نووسیبووی کە "من و سەدەی بیستەم بەیەکەوە لە دایك بووینە و لەراستیدا من بە باشی دەتوانم نیشانەیەك بم بە ناوەرۆکی نیو سەدەی مێژووی ئەڵمانیا: لە توندوتیژی و لە کۆنەپەرەستی و ...."

منیش پێوە زیادم کرد و وتم :– لە سوێربەختی، "**هێر ئۆبێرشت**" (جەنابی عەمید).

بە دەنگێکی بەرز وتی: – بە من مەڵێ "**هێر ئۆبێرشت**".

دوایی لە بێدەنگیدا سەیرێکی کردم و بە پێداگری لەسەر وشەی "**ئێوە**" پرسی: – یانی "ئێوە" پیاوێکی سوێربەخت بوون؟

سەیریم کرد و وەکوو فەرخەشێرێك کە لەکاتی خۆیدا تەڕ و وشکیان کردبێت و بە تەواوی پێڕاگەیشتبن، سور و سپی و خەپەتۆڵە بوو.

واپێدەچوو تەنیا بۆ ساتێکیش درك بەوە ناکات کە من لە چ بارودۆخێك و چ جیهانێکدا ژیاوم.

وتم: – بەڵێ، وابیر دەکەمەوە و بە تەواوەتی.

بە دەنگێکی جددی وتی: – ئەمە بیانوو نەبوو.

– من پێویستیم بە بیانوو هێنانەوە نییە. من تەنیا ئەمر و فەرمانی سەرکردەکانی خۆمم جێبەجێ کردووە.

دوایی سەری راوەشاند و بە حاڵەتێکی جددی کە غەمی لێدەباری، وتی: – ئەم خاڵەی کە توانیوتە بیرە بگەی، چۆنی شی دەکەیەوە؟

نەختێکم بیر کردەوە و وتم: – منیان بەهۆی توانایی لە پێکهێنانی تەشکیلاتی هەڵبژارد.

بە چاوە شینەکانی کە زیاتر وەکوو بووکەچینی دەچوو سەیری منی کرد وسەرێکی راوەشاند و وتی: – بە باشی لە پرسیارەکەم نەگەیشتی. (دوای ماوەیەکی کورت بەردەوام بوو و وتی): – ئێستاش لەسەر ئەم بڕوایەن کە کووشتنی جوولەکەکان پێویستە؟

– نەخێر، ئیتر لەسەر ئەم بڕوایە نیم.

– بۆچی؟

– چونکە هیملێر خۆی کووشتووە.

بەسەر لێشێواوی سەیری کردم و بەدوای قسەکانمدا چووم و وتم کە: – ئەوە نیشان دەدات کە ئەو "سەرکردەیەکی راستەقینە" نەبوو و چونکە سەرکردەیەکی راستەقینە نەبوو، توانی کووشتنی جوولەکەکان لەبەر چاوی من بە"کارێکی پێویست" نیشان بدات و لەم رێگەوە درۆی لەگەڵ من کرد.

وتی: – کەواتە، ئەگەر بکرایە لەنوێوە دەست پێبکەیتەوە، ئێوە ئیتر ئەمکارەتان نەدەکرد؟

بە خێرایی وتم: – بۆچی. ئەگەر ئەمریان پێکردبام دیسانیش ئەمکارەم دەکرد.

بۆ ماوەیەکی کەم سەیری کردم، ڕەنگی ڕووخساری سوور هەڵگەڕا و بە نفرەتەوە وتی: – یانی بە پێچەوانەی ویژدانت ئەمکارەت کردووە!

ڕێك وەستام و بەرامبەر بە خۆم سەیر کرد و وتم:

– داوای لێبوردن دەکەم! وابزانم ئێوە لە مەبەستی من نەگەیشتوون و درکتان پێ نەکردووە. من لەم رادەیەدا نیم کە هەر شتێکم پێ باش بێت، ئەوا بەڕێوەی ببەم: ئەرکی من تەنیا و تەنیا بەڕێوەبردنی فەرمان و ئەمرەکانە و بەس.

قیژاندی: – بەڵام نە فەرمانێکی ئاوا وەحشیانە!... چۆن لەدەستت هاتووە؟ ..... ترسناکە!.... ئەم منداڵانە، ئەم ژنانە؟ .... یان ئێوە هیچ هەستێکتان نییە؟

بە ماندووییەوە وتم: – واز لەم پرسیارانە ناهێنن!

– ئی، زیاتر چ وەڵامێکی ئەم پرسیارانە دەدەنەوە؟

– شی کردنەوەی سەخت و دژوارە. سەرەتا پاڵەپەستۆیەکی زۆرم لەسەر بوو. دوایی،کەم کەم، ئیتر هەرچەشنە حەساسیەتێکم لەدەست دا. وابزانم پێویست بوو کە ئەمجۆرە بێت ئەگینا مەحاڵ بوو بتوانم دەوام بێنم.... دەزانن: جوولەکەکان بۆ من وەکوو ئاژەڵ دەچوون، نەوەکوو گیانلەبەرێکی مرۆیی. من تەنیا بیرم لە بواری فەننی ئەرکەکەم دەکردەوە. کەم تا زۆر وەکوو فڕۆکەوانێك کە بۆمبێك دەڕژێنێتە سەر شارێك.

بە رووخسارێکی سوورهەڵگەڕاو وتی: – هیچ فرۆکەوانێك ئامادە نییە کە نەتەوەیەك بە تەواوەتی لەناو ببات.

لەمبارەیەوە بیرم کردەوە و وتم: – ئەگەر ئەمکارە دەکرا و ئەمری پێکرابا، ئەوا بێشك دەیکرد!

وەکوو ئەوە کە لەخێر ئەم باسە بگوزەرێ، شانەکانی هەڵاویشت و وتی:

– کەواتە بەهیچ شێوەیەك هەست بە پەشیمانی ناکەی؟

ساف و رێك و خێرا وتم:

– بەمن چی کە هەست بە پەشیمانی بکەم یان نا. رەنگە کرداری کووشتارەکە هەڵە بووە، ئاخر مەگەر من فەرمان و ئەمری ئەم کوشتارەم درکردووە؟

سەری لێ راوەشاندم و وتی: – ئەو شتەی کە دەمهەوێ بیڵێم، ئەوەیە... لەوکاتەوە کە دەست بەسەر کراون، هیچ بۆت هاتووەتەپێش بیر لەو هەزاران بێ تاوانانە بکەیتەوە کە بەدەستی تۆ لەناوبراون؟

– بەڵێ، هەندێ جار.

– ئێ، کاتێك بیریان دەکەیتەوە، چ هەستێکت هەیە؟

– هەست بە هیچ شتێکی تایبەت ناکەم.

بە ناڕەحەتی و تووڕەیییەکی زۆرەوە چاوەشینەکانی لێ زەق کردم و دیسان سەرێکی لێ راوەشاندم و بە دەنگێك کە بەزەیی و رەحمی لێدەباری وتی:

– رێك مرۆڤایەتیت ماچ کردووە و لە قەراغێکت داناوە!

بەم قسەوە پشتی لە من کرد و رۆیشت. لەوەیکە بینیم دەڕوات و جێم دێڵێت هەستم بە حەسانەوە کرد. ئەم دیدارە و ئەم گفتوگۆیانە بە تەواوی بێ سوود بوون و بە تەواوی ماندوویان دەکردم.

دوای شەهادەتم لە دادگای نورمبێرگ، ئەمریکاییەکان بە پۆلۆنییەکانیان سپاردم. هەرچەند ئەوان کۆمەڵێك سەرکردەیان پێسپێردرابوو، بەڵام زیاتر لە هەموویان بە بەدەستەوەگرتنی من خۆشحاڵ بوون، چونکە ئاوش ویتس لە خاکی پۆلۆنیادا بوو.

دادگایی کردنم ڕۆژی یازدەی مارسی ١٩٤٧ دەستی پێکرد، یانی ڕێك ساڵێك دوای گیرانم. دادگایەك لە وەرشۆ پێکهات، لە هۆڵێکی گەورەی ڕووت کە دیوارەکانی سپی بوون. مایکرۆفۆنێکیان لەبەر دەمی من دانابوو و بە هێدفۆن (سەماعە) کە خرابووە ناو گوێم، خێرا وەرگێڕاوی قسەکانیانم بە زمانی ئەڵمانی گوێ لێدەبوو.

خوێندنەوەی سکاڵاکە کە تەواو بوو، داوای قسە کردنم کرد و هەستام و ڕێك وەستام و وتم:

- من بەرپرسیاری هەموو ئەو ڕووداوانەم کە لە ئاوش ویتس ڕوویداوە. کەسانێك کە لەژێر دەستی من کاریان کردووە هیچکارە نەبوونە، بەڵام حەز دەکەم بۆخۆم وەڵامدەرەوەی تاوانەکانم بم.

بەرپرسی دادگا بە دەنگێکی وشك وتی: - ئێوە بەرامبەر بە شایەدەکان قسە دەکەن.

ڕێژەی دوورودرێژی شایەدەکان دەستی پێکرد. زۆرم بە لاوە سەیر بوو پۆلۆنییەکان ئەم هەموو زەحمەتەیان کێشاوە کە ئەم هەموو شایەدەیان لەسەرتاسەری ئەورووپا کۆ کردووەتەوە، ئەویش ڕەنگە پارەیەکی زۆریان تێدا خەرج کردبێت. ئەویش لەکاتێکدابوو کە من دانم بە هەموو ئەو کارانە دەهێنا کە کردبوومن و حاشام لێنەدەکردن. بوونی ئەم هەموو شایەدە لەڕاستیدا زۆر سەیر بوو. بە بڕوای من مانای ئەم کارە بە فیڕۆدانی کات و پارە بوو و بە دیتنی ئەم کارە بەم ئەنجامە دەگەیشتم کە ئسلاوەکان ناتوانن جیلێکی سەروەر پێکبێنن.

لەگەڵ ئەوەش شایەدەکان جاریوابوو باسی شتی وایان دەکرد کە لەراستیدا تووڕەیان دەکردم. بۆنموونە یەکێکیان وتی کە لە کاپۆیەکم داوە. هەوڵم دا شی بکەمەوە کە ئەگەر تەنیا ئەم شایەدە وابنوێنێ کە من ئەو دێوە بێ کلك و شاخەم، دیسانیش من هیچکات کارێکی ئاوام نەکردووە، ئاخر ئەوە لە کەسایەتی ئەفسەرێکدا نییە کە کارێکی ئەوتۆ بکات.

شایەدێکی دیکە وتی کە بە هەردوو چاوی خۆی بینیوە کە من گوللەی خەلاسم لە مێشکی زیندانییەکی تیربارانکراو داوە. دیسانیش شیم کردەوە کە هیچکات ئەمکارەم نەکردووە. لێدانی تیری خەلاس کارێك بوو کە سەربازێك دەیکرد، نە فەرماندەی ئۆردوگایەك. ئەوپەڕی فەرماندەی ئۆردوگا لەکاتی ڕێوڕەسمی تیرباران لەوێ دەبوو، بەڵام ئیتر تیری خەلاس شایستەی پلەی ئەفسەری نەبوو.

وەکوو رۆژ روون بوو کە هیچ بایەخ بۆ شی کردنەوەکانی من دانانێ، بەڵکوو هەوڵی دەدا لە هەر وشەیەکی من دژ بە خۆم کەڵك وەربگرێ.

جارێك، لە هەلێك کە هاتەپێش، دادوەر هاواری کرد:

– ئێوە سێ ملیۆن و نیو مرۆڤتان کووشتووە!

من ئیزنی قسە کردنم وەگرت و وتم:

– ببوورن، دوو ملیۆن و نیو مرۆڤ زیاتر نەبووە.

دەنگە دەنگ و هەرا و هوریا لە سەرتاسەری تەلاری دادگا بەرز بۆوە و دادوەر هاواری کرد کە دەبێ شەرمەزار بم. لەکاتێکدا من تەنیا ژماری کووژراوەکانم راست کردەوە.

زۆرربەی قسەکانی من لەگەڵ دادوەر ئەم کێشانەی لێدەکەوتەوە:

سەبارەت بە ناردنی لۆرییەکان بۆ "دس ساو" بۆ غازی خنکێنەر، لێی پرسیم:

– بۆچی بۆ ناردنی لۆرییەکان بۆ دس ساو ئەوەندە پەلەتان هەبوو؟

- کاتێک کە دەمدیت ئەمباری غاز بەتاڵ دەبێ سرووشتی بوو کە بۆ هێنانی غاز وەپەلە بکەوم.

دادوەر وتی: کەواتە غاز بۆ تۆ حوکمی ئەمباری نان و شیری هەبوو؟

بە سەبر و حەوسەلەوە وەڵامیم دایەوە کە: - ئاخر من بۆ ئەمکارە لەوێ بووم مەگەر نا؟

دادوەر سەرکەوتووانە سینگی هێنایە پێش و هاواری کرد: - کەواتە جەنابتان تەشریفو لەوێ بوو کە بۆ کووشتنی هەرچی زیاتری خەڵك هەرچی زیاتر غاز ئامادە بکەن!

- ئێ، ئەمر و فەرمان ئەمە بوو.

- ئەوکات دادوەر رووی لە هەیئەتی ژووری کرد و پێی وتن من تەنیا تاوانی ئەوەم نییە کە جوولەکەکانم کووشتووە، بەڵکوو ئەم تاوانەشم دێتەسەر کە هەوڵی هەرچی زیاتر کووشتنی جوولەکەکانیشم هەبووە.

لێرەدا من دیسان ئیزنی قسە کردنم خواست و شیم کردەوە کە قسەکانی دروست نییە: چونکە من هیچکات بە هیملێرم نەوتووە کە ژماری جوولەکەکان زیاتر بکات کە دەیاننێرێت. بەڵکوو رێك پێچەوانەی ئەوە بووە و زۆر جار داواکاریم بۆ ناردووە کە ئاهەنگی ناردنی شەمەندەفەرەکان کەم بکاتەوە.

دادوەر وتی: - بەمحاڵەشەوە ناتوانی دان بەوە دانەنێی کە بەتایبەت لە ئەرکی خۆتان سەبارەت بە لەناو بردنی زیندانییەکان کەمکاریت کردووە.

- من لە بەڕێوەبردنی ئەمر و فەرماندا ئەرکی خۆم بەڕێوەبردووە، بەڵام بۆ وەرگرتنی ئەم ئەمر و فەرمانانە هیچ جۆر هەوڵێکم نەداوە.

- ئایا بۆئەوەی خۆت لە بەڕێوەبردنی ئەم ئەمر و فەرمانانە دەرباز بکەی، هیچ هەوڵێکت داوە؟

- بەرلەوەی کە رایشس فورر بۆ لەناوبردنی جوولەکەکان متمانە بە من بکات، داوای ئەوەم کردبوو کە بۆ بەرەی شەڕ بمنێرن.

– ئێ، دوایی؟

– دوایی ئەم مەسەلەیە باسی نەکرایەوە: ئاخر ئەم مانایەی پەیدا دەکرد کە من دەمهەوێ لەژێر باری فەرمان و ئەرکی پێسپێردراو خۆم بدزمەوە.

– کەواتە ئەم کارەت بە دڵ بوو و حەزت لەوە بوو جوولەکەکان لەناو ببەی؟

وتم: – بەهیچ شێوەیەك، بەهیچ شێوە حەزم لەم کارە نەبوو.

ئەوکات بێدەنگ بوو، چاوەکانی لە من بڕی، دەستەکانی بردە پشتەوە و وتی:

– ئێ، کەواتە باسی ئەوەمان بۆ بکە کە خۆت چۆن سەیری ئەم ئەرکە پێسپێردراوەت دەکرد؟

بێدەنگییەکی قوورس هاتەپێش. هەموو چاوەکان لەمن بڕابوون.

ماوەیەکی کەم بیرم کردەوە و لە کۆتاییدا وتم: – کارێکی بێ واز و ماندووکەرەوە بوو.

دادوەر دەستەکانی بۆ تەنیشتەکانی شۆڕ کردەوە و دووبارە دەنگە دەنگ هەموو تەلاری پڕ کرد.

نەختێك دواتر دادوەر وتی:

– ئەمە لە قسەکانی خۆتن کە دەیانخوێنمەوە:

**"ژنە جوولەکەکان زۆرجار لەجیاتی ئەوەی منداڵە شیرەخۆرەکەیان بۆ ژووری غاز ببەن، لەناو تەپۆڵە جلکەکانیاندا دەیانشاردنەوە. لەسەر ئەم حسێبە کۆماندۆی تایبەت کە لە زیندانییەکان پێکهاتبوون، ئەمریان پێکرابوو لەژێر چاودێری ئێس. ئێس.ەکان جلکەکان بگەڕێن و ئەگەر منداڵێکیان بدۆزیبایەوە، بیانهاویشتبایە ناو ژووری غاز"**

سەری بەرز کردەوە و وتی ئەمە قسەکانی تۆن. مەگەر نا؟

– بەڵێ. بەڵام دەمهەوێ خاڵێکی تێدا ڕاست بکەمەوە.

به دەست ئیشارەیەکی پێکردم و من وتم: – من نەموتووه "منداڵەکان بهاوێنه ژووری غاز، بەڵکوو وتومه منداڵەکان بۆ ژووری غاز بنێرن".
دادوەر لەرووی بێ وازی هاواری کرد:
– وشه ئەوەنده گرنگ نییه! (دوایی بەردەوام بوو): – ئایا ئێوه له هەڵسوکەوتی ئەو ژنه بەستەزمانه فەقیرانه که خۆیان به مەرگ و مردن سپاردبوو، بەڵام نائومێدانه هەوڵیان دەدا گیانی منداڵه شیرەخۆرەکانیان رزگار بکەن و له راستیدا به ئاغایی و گەورەیی بەرپرسانی ئۆردوگایان بسپێرن، دڵت بەرەحەم نەدەکەوت، کاریگەری لەسەر تۆ نەدەبوو، نارەحەت نەدەبووی؟
وتم: – من نەدەبوایه رێگه به خۆم بدەم نارەحەت بم. من ئەمرێکی تایبەتم پێکرابوو: منداڵەکان توانایی کاریان نەبوو و منیش جگه لەوەیکه بیاننێرمه ژووری غاز، هیچ چارەیەکم نەبوو.
– کەواته هیچکات بیرت لەوه نەکردەوه که وازیان لێبێنی؟
– هیچکات بیرم لەوه نەکردەوه که خۆم له ئەمر و فەرمانی فەرماندەکەم بدزمەوه. (نەختێك بێدەنگ بووم و دوایی وتم): – لەوه بگوزەرێین، ئاخر من له کەی ئێلێکدا دەمتوانی چی له منداڵەکان بکەم، کەی ئێلێ که ناوەندی شیرەخۆران نییه!
تووڕەیی له رووخساری دەباری و وتی:
– ئێوه بۆخۆتان باوکن؟
– بەڵێ.
– منداڵەکانیشت خۆش دەوێت؟
– بێشك.
نەختێك بێدەنگ بوو. چاوەکانی به ئارامی لەسەر دانیشتووانی تەلارەکه گێڕا. دوایی بۆلای منی گەڕاندەوه و وتی: – چۆن پەیوەندی دەخەیته

نێوان عەشقی بەرامبەر منداڵەکانی خۆت و هەڵسووکەوتت بەرامبەر بە منداڵە جوولەکەکان، چۆن ئاشتیان دەکەیەوە؟

ماوەیەکی کوورت بیرم کردەوە و وتم: – هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. هەڵسوکەوتی من لە ئۆردوگادا هەڵسووکەوتی سەربازیانە بوو و بێشك لەماڵەوە هەڵسووکەوتێکی دیکەم هەبوو.

– دەتانهەوێ ئەوە بڵێن کە سروشتی دوولایەنەت هەیە؟

نەختێك دوودڵ مامەوە، بەلام لە کۆتاییدا وتم: بەڵێ، پێموابێ ئاوای دابنێین باشترە.

بەلام لەم وەلامەمدا هەڵەم کرد، چونکە دادوەر، لە بەرگری لە قسەکانی خۆیدا بە باشترین شێوە سوودی لە "دووڕوویی و دووپیشەیی" وەرگرت و هەلەکەی بە باشترین شێوە بۆ لایەنی خۆی قۆستەوە. دوای ماوەیەکی کوورت کە بینی سەبارەت بە شەهادەتی شایدەکان تووڕە بوومە، وتی:

– ئەم دووڕوویی و دوو پیشەییە بەڕادەیەکە کە تەنانەت لە گۆڕینی حاڵەتی رووخساری تاوانباردا رۆڵ دەگێڕێت و جاریوایە وەکوو فەرمانبەرێکی ئاسایی و ئارام نیشان دەدات و جاریواشە زۆرداری و ستەمگەری چەنگیزخانی مغولیش ناتوانێ بەربەرەکانی بکات.

هەروەها وتی لەگەڵ ئەوەشدا کە من بە حەزی خۆم ئەمکارانەم نەکردووە، منی بە "پیسترین و جەنایەتکارترین کەسی سەردەمی نوێ" ناساند و لە بەڕێوەبردنی ئەرکاکانمدا، تێکەلاوێك لە ترس نانەوە و فریو و ریاکاری و توندوتیژی و قەباعەتم لەخۆم نیشان داوە.

رۆژی دووهەمی ئاڤریل، دادوەر حوکمەکەی خوێندەوە:

لە حاڵەتی وەستانی رێك بەشێوەی سەربازی ئەڵمانی گوێم لێگرت.

ئەوە بوو کە چاوەڕوانیم دەکرد.

حوکمی دادگا ئەمەی راست دەکردەوە کە من، نە لە وەرشۆ، بەڵکوو بەتایبەت دەبێ لە ئۆردوگای ئاوش ویتس و لەشوێنێك بەدار هەڵواسرێم کە خۆم بۆ زیندانییەکانم چەقاندووە.

نەختێك دوای راگەیاندن و خوێندنەوەی حوکمی دادگا، پاسەوانێك کە لای راستی من وەستابوو، بە سەبری لە شانمی کوتا. هێدفۆنەکانم لە گوێم دەرهێنا و لەسەر کوورسییەکەم دانا، رووم لە پارێزەرەکەم کرد و وتم: — زۆر سوپاس کاکی پارێزەر.

سەری بەرامبەر من خوار کردەوە، بەڵام دەستی لەگەڵ لێنەدامەوە.

لەگەڵ نیگابانەکانم لە دەرگایەکی لای راستی تەلارەکە چوومە دەرەوە و لە مەمەرێکی دووردرێژ تێپەریم کە تا ئەوکاتە هیچکات لێی تێنەپەریبووم. پەنجەرەیەکی زۆر ئەم مەمەڕەیان روون کردبوو و دیواری بەرامبەر پەنجەرەکان لەژێر رووناکی خۆر بریقەیان دەدا.

هەوا سارد ببوو.

دوای ماوەیەك دەرگای ژووری تاکەکەسیم بەسەردا داخرا.

لەسەر تەختی خەوم دانیشتم و هەوڵم دا بیر بکەمەوە.

خوولەکێکی زۆر تێپەڕی. هەستم بە هیچ نەدەکرد. وام هەست دەکرد کووشتنی من تایبەت بە خۆم نییە.

لە جێگەی خۆم هەستام و لە درێژایی و بەرینایی ژووری تاکەکەسی دەستم بە هەنگاو نانەوە کرد. لەناکاو ئاگادار بوومەوە کە خەریکم هەنگاوەکانم دەژمێرم.

---------------------------------------- کۆتایی



# پێڕست




"چارەسەری کۆتایی هاتنی جوولەکەکان بەمانای لەناوبردنی هەموو جوولەکەکانی ئەوروپا بوو و من ساڵی ١٤٩١ لە مانگی ژوئەن فەرمانم پێدرا کە لە ئاوش ویتس ئامراز و کەرەستەی ئەم ئەمرە پێکبێنم. سەرەتا سەردانی "ترێبلینکا"م (Treblinka) کرد بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر کاری ئەم ئۆردوگایە وەربگرم. ئەوان لەماوەی شەش مانگدا هەشتا هەزار کەسیان لەناو بردبوو و ئەمکارەشیان بە غازی "مۆنوکسیدی کاربۆن" بەڕێوەدەبرد.

ئەم شێوەیەم بە کاریگەر زانی، بەلام کاتێک هۆلی لە سێدارەدانی ئاوش ویتسم بە کۆتایی گەیاند، غازی "زیکلون -ب"م (Zyklon B) بەکارهێنا و جێگەی مونوکسیدم پێ پڕ کردەوە. ئەم ئەسیدە لە هەواکەشەکەوە دەچووە ناو هۆلەکە و لەماوەی سێ هەتا پازدە خوولەك هەموویانی دەکووشت. یانی کاتێك قیژە و هەرایان کۆتایی پێدەهات ئەوا دەمانزانی کە تەواو بوونە.



دوای نیو کاتژمێر دەرگاکانمان دەکردەوە و ئەنگوستیلە و رووکەشی زێڕینی ددانەکانیانمان کۆ دەکردەوە و کاری سووتاندنی تەرمەکان دەستی پێدەکرد. شتێکی دیکە کە دەبێ باسی بکەم جیاوازی ئێمە لەگەڵ ترێبلینکا ئەوەیە کە هەر تەلارەی (هۆلەی) جێگەی ٢ هەزار کەس دەبووە. لە کاتێکدا کە پێشوتر ئێعدامی ئەم ژمارە یەهوودیە دەبوایە لە دە ژووری دوسەد کەسی بەڕێوەچووبایە.








دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
ڕۆژهەلات